# مێژووی نوێی ئەوروپا



## لە چەرخی ڕێنسانسەوە
## تا کۆنگرەی ڤیەننا

د. عەبدولحەمید بەتریق
د. عەبدولعەزیز نوار

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
خالید هەرکی



# مێژووی نوێی ئەوروپا

## لە چەرخی ڕێنسانسەوە تا کۆنگرەی ڤیەننا


❁ بابەت: مێژوو

❁ نووسینی: د.عەبدولحەمید بەتریق & د. عەبدولعەزیز نوار

❁ وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: خالید هەرکی

❁ نەخشەسازی ناوەوە: محمد حسین خەتی

❁ بەرگ: ئاکار جلیل

❁ چاپ: یەکەم - ٢٠٢٠

❁ تیراژ: ١٠٠٠ دانە

❁ نرخ : ٩.٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٤٢٨ )ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە.

# پێڕست


| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |
| ٩ | پێشەکی : ئەم کتێبە ( ئەزموونێک لە گۆڕانکاری ) |
| ١٣ | بەشی یەکەم: پێشگوتارێکی مێژوویی ئەورووپای نوێ لە سەرەتای چەرخی ڕێنسانسەوە |
| ٣١ | بەشی دووەم: ڕێنسانسی ئەورووپی |
| ٤٥ | بەشی سێیەم: بەرفراوان بوونی ئەورووپی و چالاکیی دۆزینەوە جوگرافییەکان |
| ٦٧ | بەشی چوارەم: فرەنسا و جەنگەکانی ئیتالی |
| ٨٩ | بەشی پێنجەم: بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی |
| ١١٧ | بەشی شەشەم: ئیسپانیا و شۆڕشی زەویە نزمەکان |
| ١٢٩ | بەشی حەوتەم: بووژانەوەی کڵێسای کاسۆلیکی دژە بزووتنەوەی چاکسازی |
| ١٣٧ | بەشی هەشتەم: فرەنسا و بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی |
| ١٦١ | بەشی نۆیەم: جەنگی سیساڵە١٦١٨-١٦٤٨ |
| ١٧٥ | بەشی دەیەم: ئینگلتەرا لە سەدەی شانزەهەم |
| ١٩١ | بەشی یانزەهەم: چەرخی زاڵبوونی فرەنسی |
| ٢٠٩ | بەشی دوانزەهەم: بەریتانیا لە سەدەی حەڤدەهەم |
| ٢٣٣ | بەشی سیانزەهەم: دەرکەوتنی رووسیا |
| ٢٤٧ | بەشی چواردەهەم: دەرکەوتنی پرووسیا و کاریگەریی لەسەر هاوسەنگی هێز لە سەدەی هەژدەهەم |
| ٢٥٥ | بەشی پانزەهەم: جەنگەکانی سەدەی هەژدەهەم ١٧٤٠-١٧٦ |
| ٢٧١ | بەشی شانزەهەم: جەنگی سەربەخۆیی ئەمریکا |
| ٢٨١ | بەشی حەڤدەهەم: ئەورووپا لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم |

بەشی هەژدەهەم: سیستەمی ئیدارە و حوکمڕانی لە فرەنسا، بەر لە شۆڕشی فرەنسی ٢٩١
بەشی نۆزدەهەم: دۆخەکانی ئامادەسازیی شۆڕشی فرەنسی ٣٠٣
بەشی بیستەم: شۆڕش ٣٢١
بەشی بیست و یەکەم: بنیادنانێکی دەستوری و ئابوری و کڵێسایی نوێ بۆ فرەنسای شۆڕش ٣٢٣
بەشی بیست و دووەم: جەنگ و تیرۆر ٢٦ی نیسانی ١٧٩٢ ئەیلولی ١٧٩٤ ٣٣٥
بەشی بیست و سێیەم: حکومەتی بەڕێوەبردن ٣٦١
بەشی بیست و چوارەم: ناپۆلیۆن بۆناپەرت لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە تا پلەی کۆنسولی ٣٧١
بەشی بیست و پێنجەم: فرەنسا لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ناپۆلیۆنی یەکەم ٣٧٨
بەشی بیست و شەشەم: فرەنسا لەسەردەمی ئیمپراتۆر ناپۆلیۆنی یەکەم ٣٩٣
بەشی بیست و حەوتەم: فرەنسا لە دوای روخانی ناپۆلیۆن ٤٠٢
پاشکۆ ا/ خانەوادە حوکمڕانەکانی ئەوروپا ٤١٢
ب/ نەخشەکان ٤١٧

# پێشەکی

## ئەم کتێبە ( ئەزموونێک لە گۆڕانکاری )

وەرگێڕان هونەر و سەلیقە و توانایە، زۆر کتێبی بە سوود لە هەموو بوارەکانی ئەدەبی، رووناکبیری، ئابووری، مێژوویی، ئاینی و سەربازی .. تاد، لە زمانەکانی تری بیانییەوە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی، بە تایبەتی پاش راپەڕینە جەماوەرییەکەی بەهاری ١٩٩١ کە بە مێژووی وەرچەرخان لە کتێبخانەی کوردیدا دادەنرێ، هەر لەو دەمەوە ئازادی بیروڕا و رەخسانی هەلی چاپکردن، هاندەری تەواو بوون بۆ هەموو ئەو کەسانەی توانای وەرگێڕانیان هەیە، ئەمەو دەرئەنجامی بارودۆخێکی نەخوازراو لە هەرێمی کوردستاندا و زۆربوونی پەنابەرانی کورد لە دەرەوەی کوردستان و بە تایبەت وولاتانی ئەورووپا و ئەمریکا و ئوستراليا و فێربوونی زمانی میللەتانی تر و تێکەڵبوون و شارەزابوون لە کەلتووریان و ناسین و بەردەستکەوتنی مێژووی شارستانییەت و کێشە نێودەوڵەتییەکان و دۆزی کورد لە ئەرشیفە نەناسراو و نامۆکان بە گەلی کورد، تا ئەودەم هەموو ئەمانە رۆڵی دیار و بەرچاویان هەبوو لە دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی و بەرەو پێشبردنی تێگەیشتنی کوردی، چون شۆڕشی وەرگێڕان بۆ سەر زمانی کوردی بۆخۆی شۆڕشێکی رووناکبیری بوو لە نێو کۆمەڵی کوردەواریدا هاتە گۆڕێ، گەرچی هێشتا دەرئەنجام و دەرهاوێشتەیەکی وای لێنەکەوتۆتەوە کە وەک ئەورووپییەکان ئەو دەستکەوتەیان چنگ کەوت کە گۆڕانکاری وپێشڤەچوون و بووژانەوە پاش جەنگ و کاولکارییەکانی ئەورووپا پێش سەدەکانی ناوەڕاست بەدەستیان هێنا، وەک هەندێک لە مێژوونووسەکانیش دەڵێن: رووخانی قوستەنتینیە لەسەر دەستی تورکەکان لە ساڵی ١٤٥٣ وای کرد چی زانا و فەیلەسووفە یۆنانییەکان هەبوو رایان کرد و هەڵاتن بەرەو ئەورووپا و لەوێوە گەشەسەندنەکان و پێشکەوتنی زانستی و فەلسەفی سەری هەڵدا. * ( مێژووی نوێی ئەورووپا لە چەرخی رێنساسەوە تا کۆنگرەی ڤیەننا. وەرگێڕانی / خالید هەرکی ). خۆگەر ئەم رەو و راکردنی

زانا و فەیلەسووفانەش هەڵنەهاتبن بۆ لای خۆمان لە ڕێی وەرگێرانەوە هەموو سەرچاوە مەعریفی و فەلسەفی و ڕووداوە هەنووکەیی و مێژووییەکان گوێزراونەتەوە بۆسەر زمانی کوردی و بوونەتە سامانێکی زۆری زانستی و ئەزموون بۆ کوردان .. وەرگێڕان پردی پەیوەندی نێوان شارستانی و میللەتانە، ئەوەندەی ڕەچاویش کراوە لە وەرگێڕاندا زۆربەی وەرگێڕەکان ئەو سەرچاوانەی دیاریان کردووە بۆ وەرگێڕان هاو دەمی ڕۆژگار و پێداویستییەکانی کۆمەڵی کوردەواری بوون.

پێم وایە زۆربەی سەرچاوە وەرگێڕدراوەکان بۆ سەر زمانی کوردی هێندە پەرۆشی نەتەوایەتی تیا بەدیکراوە، تەواو ڕەچاوی پرنسیپەکانی وەرگێڕانیشی تیا کرابێت و توانرا بێت پرۆفیشیۆنالانە بابەتەکان وەربگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی، چون کاتێک وەرگێر بۆخۆی ئارەزوومەندی فێربوون و ڕووناکبیری نەبێ و شارەزایی تەواوی فەرهەنگی لە زمانی دایک و ئەو زمانەی دەقەکەی لێوەردەگرێت نەبێ، ناتوانێت تێگەیشتنی ڕاست و دروست لە دەقە ئەسڵییەکە بەدەست بهێنێت، تا چۆنایەتییەکی چاک و پڕ پێز لە وەرگێرانەکاندا بدات بە دەستەوە. لە وەرگێڕاندا ماڵێک هەنە کە نووسەرێکی بیانی لەگەڵ خوێنەرەکەی لە ڕێی زمانی وەرگێڕەکەوە بەیەک دەگەن و وەرگێڕ خوێنەر بە نووسەر و نووسەر بە خوێنەرەوە دەبەستێتەوە ( فرانس ڕۆسنزوایخ - Rosenzweig. F ).

وەرگێڕان بۆخۆی هەم هونەرە و هەم زانستە , لێرەوە دەقی سەرکەوتوو بەرهەم دێت. کاک ( خالید هەرکی ) نووسەر و وەرگێڕ، کە خاوەنی سەلیقە و توانایەکی بەهرەدارە لە وەرگێڕان و نووسینداو تا ئێستا چەندین کتێبی سەرکەوتووانە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لە کتێبی ( مێژووی نوێ ئەوروپا لە چەرخی ڕێنساسەوە تا کۆنگرەی ئەوروپا )، کە لە زمانی عەرەبییەوە وەریگێڕاوە، توانیویەتی مافی خۆی بداتێ وەک کتێبێکی مێژوویی و دروستانەش بیگەیەنێتە خوێندەواری کورد و لە دووتوێی کتێبێکدا ئامادەی کردووە.

ئەم بەرهەمە گەرچی گەیاندنی مێژووی ئەوروپا و چۆنیەتی گۆڕانکاری و گەشەکردنەکان لە بوارەکانی کەلتووری، ڕووناکبیری، زانستی، ئابووری و سەربازییەکاندا، بە هەموو لێکەوتە و دەرئەنجامەکانییەوە، وانەیەکیشە بۆ فێربوونی بەرژەوەندییەکان لە کوێی ڕووداوەکاندا دەبن، دەسەڵات و ئارەزووەکان چی نەهامەتییەک یان پێشکەوتنێک دەسازێنن. پێم وایە ئەم کتێبە هاودەمی ئەمڕۆی کۆمەڵی کوردەوارییە و دەکرێ سوود و قازانجی زۆری لێ وەربگیرێت، لە کاتێکدا کورد بۆخۆی لە قۆناغێکدایە کە لە دووی چارەسەر و ئاشتەوایی و یەکڕیزی و تەبایی دەگەڕێت و ئەو قۆناغانەی ئەوروپای پێدا تێپەڕیوە دەبێتە

و: خالید هەرکی

بەردەبازێک بۆ کۆمەڵی کوردەواری تا جارێکیتر دیرۆک و مێژووی قۆناغە تاریکەکانی تیا دووبارە نەبێتەوە و ئەم دەقە وەرگێڕدراوانە وەرچەرخانێک بسازێنن، وەرگێڕ وردبینانە درکی بە گرنگی ناوەڕۆکی ئەم کتێبە کردووە ، تیایدا باس لە سەرهەڵدانی دەسەڵاتەکانی ئاینی و ڕووناکبیری دەکات کە چۆن پیاوانی ئاینی، پیاوانی زانا و دانا و قسە ڕۆیشتووش بوون و سالانێکی زۆر دەسەڵاتی یەکەمی وڵاتانی ئەوروپا بوون، بکوژ و ببڕ خۆیان بوون بڕیاریان لە هەموو چارەنووسێک، فتوایەک، دەدا و کۆمەڵانی خەڵکیش بروایان پێدەکردن و بە ناچاریش بوایە هەموو ئەرک و بڕیارێکیان جێبەجێ دەکرد، ئەمە بارگرانییەکی زۆری لەسەر ڕەوتی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و چینایەتی سازاندبوو، ئەوروپا دەرئەنجامی ڕووداوەکان پێویستیان بە گۆڕانکاری و پێشکەوتن هەبوو، هەربۆیە یەکەم هەنگاوی گۆڕانکاریش لە زانکۆکانەوە دەستی پێکرد، بە تایبەت زانکۆی پاریس کە ببووە پێشەنگ بۆ گۆڕانکاری و بڵاکردنەوەی ڕووناکبیری و ئازادییەکان، هەر لێرەشەوە خەڵکی فێری ڕەخنە گرتن بوون، تەنانەت لە ئاینیش واتە کڵێساکان کە قەبەترین و فراوانترین گەورەترین دەسەڵات و هێزیان هەبوو لە وڵاتدا.

مێژووی ئەوروپا، مێژووی ململانێکانی نێوان فیوداڵ و سەرهەڵدانی ئازادی تاک لە شارەکاندا و دروستبوونی بازرگانی و بازرگانەکان بە دەرهاویشتەی ناکۆکییەکانی دەوڵەمەند بوون و دەسەڵاتی فراوان، هەموو ئەمانە ئەزموونێکی ئاشکرا و ڕوون بوون لە چۆنیەتی دەرباز بوون لەو قۆناغانە و مەترسی و لێکەوتەکانی و کارتێکردنی لەسەر ژیانی کۆمەڵانی خەڵک.

ناونیشانی کتێبەکە ڕینسانسە ( بووژانەوە یان نوێبوونەوە ) کە بۆخۆی لە سەدەی چواردەی زایینی تا سەدەی هەڤدەهەمی زایینی وەک بزاڤێکی ڕووناکبیری سەری هەڵدا، گەرچی لە سەرەتاو لە ئیتاڵیاوە دەستیپێکرد، بەڵام هێواشی بە هۆی نەبوونی کاغەزی زۆر و چاپەوە و پاشان بە وڵاتانی تری ئەوروپادا بڵاو بۆوە و گۆڕانکاری و چاکسازی بە دوای خۆیدا هێنا، هەر بۆیە خوێندنەوەی ئەم کتێبە گرنگ و پێویستە بۆ ڕۆژەکانی ئەمڕۆ کە بانگەواز و دروشم و هەوڵەکان بۆ گۆرانکاری و بووژانەوە و چاکسازییەوە، دەکرێ هەموو ئەو چاکسازییانەی لە سیستەمە جۆراوجۆرەکانی ژیانی حکومی میللەتانی ئەوروپادا ڕوویاندا و هاتنە ئاراوە بە جۆرێک لە جۆرەکان خوێندنەوەیان بۆ بکرێت لە کۆمەڵی کوردەواریدا و سوودی لێوەربگیرێت، ئەم کتێبە نەک هەر پێویستە کۆمەڵانی خەڵکی سڤیل، بەڵکوو دەسەڵاتدارانیش بیخوێننەوە و سوودی لێببینرێت.

دوا وشەم دەستخۆشی تەواو لە هاورێ و نووسەر و وەرگێڕی بە توانا کاکە خالید هەرکی دەکەم بۆ هەڵبژاردنی ئەم کتێبە دانسقە و دەگمەنە و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی، جارێکی تر هیوادارم بە دیدێکی پر نرخ و بایەخ و سوودەوە بڕواننە ئەم کتێبە و ناوەرۆکە پڕ بەها و پێزەکەی.

هیوا سەرهەنگ
هۆڵەندا / رۆتردام
٢٠٢٠ / ٠٢ / ٠٢

* (١- جەنەرال دیگۆل... پیاوی جەنگ و حوکمران.
٢- کوردو ئەرمەن .... پەیوەندیە مێژوییەکان..
٣- کوردستان و کوردەکان.
٤- نوری سەعید. پیاوی ئەرکە قورسەکانی ئینگلیز
٥- مێژوی هاوچەرخ. ئەوروپا لە شۆڕشی فرەنسییەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی.
٦- ترۆتسکی .
٧- گیڤارا .
٨- مکیاڤللی، سێبەری شەیتان لەسەر زەوی.
٩- ستالین. سەربوردەی سیاسیی.
١٠- مێژوی بزوتنەوە نەتەوایەتیەکان لە ئەوروپا.
١١- هنری کیسنجەر ،سالانی نوێبوونەوە. لە دوو بەرگدا.
١٢- دەوڵەتداری . دامەزراندن و بەڕێوەبردنی (لە نوسینی خۆی)

# بەشی یەکەم

## پێشگوتارێکی مێژوویی
## ئەورووپای نوێ لە سەرەتای چەرخی رێنسانسەوە

### تێڕوانینێکی گشتی لەسەر چەرخی ناوەڕاست:

هەندێ کەس لایان وایە چەرخەکانی ناوەڕاست سەردەمی دواکەوتوویی و تێکشکان بووە، بەڵام ئەم بیرکردنەوە هەڵەیە دەربڕینی وێنەی راستەقینەکە نییە، دەبێ ئەم بیرکردنەوە بۆ ئەو کاریگەرییە بگەڕێتەوە کە چەرخی نوێی لێ دروست بوو رێنسانسی لەگەڵ خۆیدا هێنا. چونکە ئەم کاریگەرییە ئەوەندە بە هێز بوو رابردووی لەبەر چاوی خەڵک وون کرد، بە دیدی ئەوان ئەو سەردەم سەردەمێکی تاریک بوو.

لە راستیشدا چەرخی ناوەڕاست بۆ ئەورووپا لە گرنگترین سەردەمەکانی مێژووی بووە. بنەمایەکە بۆ ئەوەی لەوێوە لە مێژووی ئەورووپا بگەین و بتوانین تووێژینەوە لەسەر دیاردەکانی چەرخی ناوەڕاست لە ئەورووپا ئەنجام بدەین.

ئەم چەرخانەش بریتین لە دوای نیوەی سەدەی پێنجەمی زاینی لە سەرەتای رووخانی دەوڵەتی رۆمانیی رۆژئاوا لەسەر دەستی بەربەرەکان، بەردەوامیشیان دەبێ تا نیوەی سەدەی پانزەهەمی زاینی، ( ئەمە بە مەزندەیی ).

لەو ماوە گۆڕانکاریی مەزن لەسەر کۆمەڵگای ئەورووپی روو دەدەن، یەکەمین ئەو گۆڕانکاریانە لەسەر دەستی پیاوانی چەرخی ناوەڕاست هەولی بۆدرا بۆ چاککردنەوەی ئەو خەراپکاریانەی لەسەر دەستی بەربەرەکان روویاندا کە بوونە مایەی تێکدانی باری ئارامی و ئاسوودەیی ژیانی خەڵک، خەراپکارییەکان تالانی و تێکدان و ئاژاوەگێڕی بوون، دەبوایە ئەوان ئەورووپا لەم دۆخە نالەبارە رزگارکەن و ئەورووپا بە کەنارێکی ئارام بگەیەنن.

لەم هەوڵانەیاندا سەرکەوتن، توانییان ئاشتی و ئارامی بۆ ئەوروپا بەرقەراربکەن، بەڵام قۆناغەکانی ئەم ماوەیە یەکسان و هاوشێوە نەبوون، بەنمونە ئەوکەسەی لە سەدەی دەیەم ژیاوە هەمان ژیانی ئەو کەسە نەبووە کە لە سەدەی حەوتەم یا هەشتەم ژیاوە، جیاوازیی هەبووە لە رووی ئاستی پێشکەوتنی ژیانی، چونکە لەو سەردەمان پێشوەچوون بەردەوام بووە بۆیە دۆخی ژیانی هاوڵاتیانیش لە بەرەو پێشدا چووە، تەنانەت کاتێک سەدەی دوانزە هەم دێت بە جۆرێک گۆڕانکاری دروست بووە کە لە رووی ئازادی و زانست و شێوازی ژیانی ناوماڵ گۆڕانکاریەکان بەدی دەکراو جیاوازی هەبووە، هەرچەندە زانست و فێربوون خۆیان لە نێوان چوار دیواری کڵێساکان حەشاردابوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵی خۆیان هەبووە لە پاراستنی داب و نەریتی کۆن و رادەستکردنی ئەو سامانە نەتەوایەتییە بە چەرخی نوێ:

لە سەدەی دوانزەهەم پەیوەندییەک لە نێوان شارستانێتی رۆژهەلات و رۆژئاوا لە رێگەی وەرگێرانەوە دروست دەبێ، واتە چەرخی وەرگێڕان دەستپێدەکا، زانستی یۆنانی لە عەرەبیەوە وەرگێردراوە، کۆمەلگاش کەوتە ژێر کاریگەری فەلسەفەی یۆنانیی کۆن، بەڵام ئەوکات زانست بەو شێوە دەخوێندرا کە هەیە بێ ئەوەی بەدواداچوون بۆ سەلماندنی راستییەکان بکەن، ئەمەیە جیاوازی لە نێوان ئەو دوو ئەقلیەتە بوو، ئەقلیەتی چەرخی ناوەڕاست و ئەقلیەی چەرخی نوێ.

خەڵکانی سەردەمی چەرخی ناوەڕاست زانستیان لەسەر بنەمای دروشم وەردەگرت واتە ( بڕوای پێدەکەم تا تێیبگەم )، کاتێک چەرخی ناوەڕاست لە سەروبەندی کۆتاییدا بوو، چەرخی رێنسانس سەرهەڵدەدا ئەوکات ئیتر ئەو دەستەواژە کاری پێدەکرێ کە دەڵێ: ( نابێ بەرلەوەی لە شتێک بگەیت بڕوای پێبکەیت ).. Nothing to be believed unless is is to understond .

لەسەر ئەم بنەمایە ئەقڵییەتەکان ئازاد بوون، بەوهۆیەوە خەڵک روویان لە رەخنەگرتن کرد تەنانەت لە ئاینیش، ئیتر کەسانێک دروستبوون کە رەخنە لە کڵێسا دەگرن، لەم میانە هەرتقەکان ( نوێخوازەکان ) دەرکەوتن کە رووبەڕووی رەخنەی کڵێسای کاسۆلیک ببوونەوە، گیانی رەخنەگرتن لە سەرەتای چەرخی نوێ سەرهەڵدەدا و گەشە دەکا، لەم سەرهەڵدانە بزووتنەوەیەکی چاکسازیی ئاینیی پرۆتستانتی دەردەکەوێ .

یەکێک لە دیاردەکانی چەرخی ناوەڕاست دەرکەوتنی زانکۆکان بوو کە بڵاوبوونەوەی زانست و فێربوونی بەدوای خۆیدا هێنا. خوێندکارەکان لە دەوری مامۆستاکانی زانکۆ

کۆدەبـوونەوە و فێـری زانسـت و ماتماتیـک و فەلسـەفەیان دەکـردن، وانەیـان دەخوێنـد و بەدواداچوونیان بۆ وانەکان دەکرد، هەرچۆنێکی بۆیان بلوابا کۆدەبوونەوە و خولی زانستییان پێک دەهێنا، ئەم دیاردانە بـوونە کـاری رۆژانەی خوێنـدکاران لەو زانکۆیـانە، لەتەک ئەمـانە کۆلیژی دیراساتی زانستی خواوەندی و مرۆیی و یاسایی دادەمەزرێن لە هەمووشیان دیاردەی ئاینیی تیادا بەهێز دەبێ .

## سەرەتای چەرخەکانی نوێ:

ئەوەی شایانی باسە زۆربەی ئەو بۆچوونانەی لە سـەردەمی چەرخـی ناوەڕاسـت بـاو بوون سەردەمانێکیش لە چەرخی نوێ باو بوون، بـۆیە ئاسـتەمە سـەردەمی ئەو دوو چەرخە لە یەک جیـا بکـرێتەوە، لەبەر ئەم هۆکـارە چەرخـی رێنسـانس بە نیشـانەی گواسـتنەوە لە چەرخی ناوەڕاستەوە بۆ چەرخی نوێ دێتە ئەژمار، ئیتر مێژوونوسـەکان لە تواناناینـدا نییـە بە مێژوو ئەو ساڵ ە دیاری بکەن، ئەوەتا هەندێکیان رووخانی قوسـتەنتینیە لە سەردەسـتی تورکەکان لە ١٤٥٣ بە ساڵی دەستپێکردنی مێژووی ئەوروپی نوێ دەزانـن. کە بـووە مـایەی سـەرهەڵدانی بـزووتنەوەی بـووژانەوەی زانسـت لە ئەوروپـا کە لە ئەنجـامی رووخـانی قوستەنتینیە، ژمارەیەک لە زانا و فەیلەسوفە یۆنانیەکـان ئەوێ جـێ دەهـێلن و روو دەکەنە ئەوروپا بەو هۆیەوە جوولانەوە و چالاکیی زانستی لەوێ سەرهەڵدەدەن دەبنە ئامارژەیەک بـۆ رێنسانسی ئەوروپی و بزووتنەوەی بووژانەوەی زانست لەو کشوەرە .

هەندێکی دیکە هەڵگیرسانی شەڕی ئیتاڵی و ململانێی پادشایەتی نێوان ئیسپانیا و فرەنسـا دەکەنە سـاڵی دەسـتپێکردنی چەرخـی نـوێ لە ئەوروپـا . بەڵام لە راسـتیدا بەهـۆی ئەوەی بە دروستی ئەو رۆژە نەزانراوە کە بە دەستپێکی چەرخی نوێ دادەنرێ بۆیە ناتوانرێ لەسەر بنەمای ئەم زانیاریانە ئەو رۆژە یا سـاڵە دیـاری بکەیـن. کەوابـێ ئەمە گۆڕانکـاریەکی هێمنانەیە لە ئەنجامی کاریگەری مرۆڤ لەسەر دۆخەکاندا لە ژیانی مرۆڤدا رووی داوە .

## دیاردەکانی گواستنەوە بۆ چەرخی نوێ:

لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم بۆ سەرەتای سەدەی شانزەهەم چەندین گۆڕانکاری و دیاردەی نوێ لە ئەورووپا بەدی کران، ئەم گۆڕانکاریانە لە سەرەتای ساڵ بەدەر نەکەوتن هەروەها هەموویان بە یەکجار نەهاتن، بەڵام هۆی ئەو گۆڕانکارییانە لە کۆتایی چەرخی ناوەڕاست سەریان هەڵداو دواتر وردە وردە پەرەیان سەند و لە چەرخی نوێ هاتنە بەرهەم.

### ١/ لە ڕووی ڕەوشەنبیرییەوە:

یەکەم دیاردە لە ڕەوشەنبیری بەدیکرا، ئەوکات کڵێسا تاقە سەرچاوەی ڕەوشەنبیری و فێرکردن بوو، بۆیە لە چەرخی ناوەڕاست ڕەوشەنبیری بەرگی ئاینیی پۆشی بوو، پیاوە ئاینییەکان تەنها خۆیان پیاوی زانا بوون، بۆیە ئەوەی پیاوە ئاینییەکان بیانووتایە خەڵکی هەمووی بڕوایان پێی دەکرد ئەوەی ئەوان ڕەتیان بکردبایەوە خەڵک بەتێکڕا ڕەتی دەکردەوە، هەر زانیاری و ڕێنمایەکی ئەوان دەریان بکردبایە کەس تانەی لێ نەدەدا. زمانی لاتینیش ئەو زمانە فەرمییە بوو کە دەبوایە هەموو کەس فێری بێ، زمانی نەتەویش تەنها بۆ دوان و قسەپێکردنی نێوان خۆیان بوو. بۆیە ئەوەی بەدوای زانست و فێربووندا بگەرابا دەبوایە سەرەتا فێری زمانی لاتینی بێ بە نووسین و قسەپێکردن، کە زمانی دانیشگا و مامۆستاکانی فێرکاری بوو. لە فۆرمی خوێندنی دانیشگاکان هەرکەسێک بینووسیبا کە زمانی لاتینی نازانێ وەرنەدەگیرا.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە دانیشگاکان بایەخیان بە کەلتوورو ڕەوشەنبیری نەتەوەکان نەدەدا، ئاستی زانکۆکان بەرز بوو خوێندکارەکان لە سەرجەم وڵاتانەوە بۆیان دەهاتن بۆ خوێندن و وەرگرتنی زانست لەسەر دەستی مامۆستا بەناوبانگەکان.

دواتر لە چەرخی نوێ ئەم زانکۆیانە پەرەدەسەنن تا ئەو ئاستەی ئیتر بایەخ بە کەلتوورو زمان و ئەدەب و ڕەوشەنبیری نەتەوەکانیش دەدەن. لەوکاتەوە ڕەوشەنبیری و زانکۆکان لەلایەن کڵێساکانەوە قۆرخ نەکران، سووکە ئازادییەکیان بەخۆیانەوە بینی، زانکۆکان لەوە سڵیان نەکردەوە کە بەرەنگاری کەڵێساکان ببنەوە و نەکەونە ژێر فەرمانی پاپاکان، پێشەنگی ئەو زانکۆیانەی پێشڕەوی ئەو ڕەوتەیان دەکرد زانکۆی پاریس بوو، بانگخوازیی بۆ سەربەخۆیی کڵێسای فرەنسی دەکرد، هەرواشی لێهات لە سەردەمی لویسی

یـانزەهەم لە ( ١٤٦١-١٤٨٣ ). کڵێسـاکانی فرەنسـا ئـازادی و سـەربەخۆیی خۆیـان لە کڵێساکانی دیکەی ئەوروپا وەرگرت سیمای نەتەوایەتیان پۆشیبوو.

یەکێک لە دیاردەکانی رووناکبیری بۆ گواستنەوەی ئەوروپا بۆ چەرخی نـوێ، پاراسـتنی جوگرافیای جیهان بوو لەلایەن هەندێک لە گەلانی ئەوروپییەوە.

داگیر کردنی سەبتە لە سـەر کەنـاری ئەفریکـی لە سـاڵی ١٤١٥ لەلایەن پۆرتوگالیەکـان یەکەمین سەرەڕۆیی بوو لە زنجیرە سەرەڕۆییەکانی دەریایی کە بـوە مـایەی ئەوەی فاسـکۆ دی گامـا بتـوانێ لە ١٤٩٢ لە دەوری ئەفریکـا بخـولێتەوە، لە ئەنجامـدا ئیمپراتـۆریەت و داگیرکاری پۆرتوگاڵی لە رۆژهەڵات دابمەزرێ. هەر لە ئەنجامی ئەو سـەرەڕۆییانە ئەمریکـاش دەدۆزرێـتەوە و سەرخسـتنی جـوولەی بازرگـانی لە شـارەکانی ئیتاڵیـا بەرەو دەوڵەتـانی سەرکەناری زەریای ئەتڵەسی دەگوازرێتەوە. ئەم گۆڕانکاریانە سەرەتا لە پۆرتوگـال روویانـدا دواتـر لە ئیسـپانیا و فرەنسـا و ئینجـا بەریتانیـا، ئیتـر ئەم دەوڵەتـانە کەوتـنە ملمـلانـێ و کێبەرکێ لە داگیرکاری و ئیمپراتۆریەتی ئەودیو سنوورەکانی دەریا.

ئەم بزووتنەوانەی بۆ دۆزینەوەی کشـوەرەکان ئەنجامـدران بۆچـوونی پیـاوانی ئاینیـان سەلماند کە پێیان وابوو دونیا خڕە ئەمەش دوای گەشتی ماجەلان دێت کە بەدەوری زەویـدا خولایەوە.

لەوکـاتەوە بـازنەی زانـین و فێربـوونی زاناکـان لە چوارچێـوەی کڵێسـا دەردەچـێ و مەوداکـانی بەرفـراوان دەبـن، هاوتـا لەگەڵ دۆزیـنەوەی ئەمریکـا بڵاوبـوونەوەی کتێـب و چاپەمەنی سەرهەڵدەدا، خەڵک ئەوکات بۆیـان دەرکەوت چەنـدە جیـاوازی هەبـووە لە نێـوان ئەو زانیاریانەی لە چەرخی رابردوو دەیانخوێند لەگەڵ ئەو زانیارییانەی ئێستا دەیخوێنن، لەو جیاوازیانە راستییەکانی جوگرافی بـوو کە بە پراکتیکـی سـەلمێندرا. بەم شـێوە ئەو هەسـتە لای مرۆڤ دروست دەبێ کە زانین و زانست هیچ کاتێک سنووریان بـۆ نیـیە، راسـتییەکانیش بە لێکۆڵینەوە سەلمێندران.

## ٢/ لەرووی کۆمەڵایەتی و ئابورییەوە:

سەبارەت بە باری کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، چەرخی ناوەڕاست بەوەوە دیار بوو کە ڕژێمی دەرەبەگایەتیی ( Feudal system ) تیا باو بوو، کە لە چەرخی نوێ ڕووخانی بەخۆیەوە بینی، زەوییەکان بەو کەسانەشەوە کە لەسەری دەژیان، لە نێوان خانەدانەکاندا دابەش کرابوون. حوکمێکی ڕەهای ئەو گیاندارانەیان دەکرد کە لەسەر زەوییەکانیان دەژیان بێ هیچ لێپێچانەوەیەک، بە هەوەستی خۆیان ئەوەی مەبەستیان بوایە بەو خاک و خەڵکەیان دەکرد کە لەژێر دەسەڵاتیاندان، بەوهۆیەوە چینی مامناوەند کە ستوونی کۆمەڵگا و ئابووری وڵاتە بوونی نابێ، کۆمەڵگا لە دوو چین پێکدەهات :

١/ خانەدانەکان کە هەموو دەسەڵاتێکیان هەبوو.

٢/ جووتیارەکان کە وەکوکۆیلەی زەوییەکان بوون خاوەنی هیچ نەبوون .

## پادشا و خانەدانەکان :

کاتێکیش چەرخی نوێ دەست پێدەکا، دۆخی ئابووری لە هەندێک وڵاتی ئەوروپا ڕووەو گۆڕان دەچێ، بەنموونە لە فەرەنسا پادشا لە پاریس خۆی حوکمڕانی و خاوەنداریێتی موڵکەکانی دەکرد سەرەڕای ئەوەی خانەدانەکان دانیان بە گەورەیی ئەوو خانەوادەکەیدا نابوو، بەڵام بەهۆی شەڕو جەنگەکانەوە خانەدانەکان لە توانا کەوتبوون و بێهێز ببوون، ئیتر ئەوکات هەندێک لە پادشاکان دەسەڵاتەکانیان لە دەرەوەی پاریس خستە گەڕ بۆ دەستگرتن بەسەر موڵک و کەرتەکانی ئابووریدا، لە ئەنجام کێشە و ململانێ کەوتە نێوان پادشا و خانەدانەکان، کۆتاییەکەی بە ڕووخانی ڕژێمی دەرەبەگایەتی دێ و جووتیارەکانیش لە کۆیلایەتی ڕزگار دەبن و مافی خاوەنداریێتیش بە جووتیارەکان دەدرێ، ئەمە مەزنترین دارمانی سیستەمی دەرەبەگایەتی دەبێ.

بە سەرەکەوتنی پادشایەتی بەسەر خانەدانەکان خەڵک هەستی کرد کە زەوی تاقە سەرچاوەی سامان و داهات نییە، خەڵک ڕوویان لە بازرگانی و پیشەوەری کرد ئیتر چینی مامناوەندی دروست دەبێ، ئەم چینە کە ساڵەهای ساڵە لە هەوڵی خۆدەوڵەمەندکردن بێبەش بووە ئێستا کار بۆ پەیدا کردنی سامان و سەروەت دەکا و هەوڵی خۆ دەوڵەمەند کردن دەدا بەتایبەتی کاتێک پەیوەندیەکانی بازرگانی لە نێوان ئەوروپا و دونیای تازەی دوای گەشتەکانی دۆزینەوەی دونیا، پەرە دەسێنێ، لەلایەکی دیکەش پەیوەندیەکانی ئەوروپا

و: خالید هەرکی

بە ڕۆژهەڵاتی خاوەن سامان و کانزاکان بەرەو قۆناغێکی نوێ هەنگاو دەنێ و گەشەبوون بەخۆیەوە دەبینێ.

لەگەڵ بووژانەوەی بژێوی ئەم چینە ژیانی ئەورووپیەکان بەگشتی بەرەو ژیانێکی خۆشتر هەنگاوی نا، ئەمەش دەبێتە مایەی ئاسوودەیی و ئارامی و بەرقەراربوونی سەقامگیری و چڕکردنەوەی چالاکییەکان، بەمشێوە بەرژەوەندی پادشاکان لەسەر حسابی چینی خانەدان بە بەرژەوەندی چینی مامناوەندییەوە بەستراوەتەوە، کاتێکیش ئەم بەرژەوەندییە توندتر دەبێ پادشاکان زیاتر هەماهەنگی لەگەڵ چینی مامناوەندی دروست دەکەن و سوود لە تواناکانیان وەردەگرن و لە پەرلەمان و دەزگاکانی راوێژکاری دایان دەمەزرێنن، هەندێکیان بوونە ئەندامی پەرلەمانەکان و حاکمی هەرێمەکان و دادوەرو یاسادانەر.

## سوپای نەگۆڕ:

گۆڕانی دۆخەکان دیدی پادشاکانیشی لەسەر حوکمڕانی گۆڕی، پاش ئەوەی پشتیان بەو سوپایە دەبەست کە چینی خانەدانەکان دروستیان کردبوو هەڵسان بە دامەزراندنی سوپایەکی نەگۆڕی هەمیشەیی کە لە هەموو کاتەکان بەردەستبێ بەتایبەت لە کاتەکانی شەڕدا پشتی پێ ببەستن و وەکو پاسەوانێک بێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی چاوچنۆکی خانەدانەکان لە سامان و دەسەڵاتەکانیان، هەروەها بۆ بەرگری کردن لە وڵات لە دژی هێرشەکانی بێگانە، ئەمانە ئەم سوپایەیان بۆ داگیرکاری و سەرکوتکاری خانەدانەکان بەکار دەهێنا دوای ئەوە ئیتر لە چەرخی نوێ باروود و چەکی نوێ دەدۆزرێتەوە ئاستی شەڕو داگیرکارییەکانیان لە ئاستی شمشێرو سوارسوارێندا نامێنی بۆیە بە ماوەیەکی کورتی خانەدانەکان لەناو دەبەن.

## تاکگەرایی Individualism:

لە چەرخی نوێ رۆحیەتێکی دی سەرهەڵدەدا، ئەویش رۆحیەتی تاکگەرایی دەبێ، خەڵک بەرەو هەستی ئازادی و خۆسەری هەنگاویان دەنا و بەپیر رەفتاری تاکگەرایی دەچون، واتا جیا بوونەوەی تاک لەو نەریتانەی کە بڕوای پێی نیە یا پەیوەندیی بەوەوە نییە لە ناخەوە هەستێکی تاکڕەفتاری دروست دەبێ مرۆڤ هەست بە ئازادیی خود دەکا.

ئەم دیاردە لە بواری هێزی ئاینیش سەری هەڵدا، ئەنجامی ئەو هێزە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی بوو کە چاکسازەکان هەوڵی گۆڕینی ئەو دیاردە و بیرۆکانەیان دەدا کە لە بەرژەوەندی ئاینیدا دەبێ ئەمەش واتای ئەوەدەگەیەنێ کە مرۆڤ لە چەرخی نوێ ئازاد نیە، بەڵکو لە وڵاتەکەی پابەندە بە بیروبڕوای حکومەتەکەی، بەڵام لە توانایدا دەبێ ئەو وڵاتە جێبهێڵێ و بۆ وڵاتێکی دیکە کۆچ بکا، مەزهەبی مارتن لۆسەر کینگ مەزهەبێکی گشتی بوو لە ئەڵمانیا دەردەکەوێ، ئەو کەسەی بڕوای بەو مەزهەبە نەبوو دەیتوانی ئەڵمانیا جێ بهێڵێ و بۆ وڵاتێکی دیکە بڕوا.







گیانی تاکگەرایی لە حکومەت و سیاسەت سەریهەڵدا، لە دۆخی دامەزراندن دەوڵەتی نەتەوی زۆر بەروونی دیارە، هەرچەندە لە سەرەتای چەرخی نوێ پێنەگەیشت پێویستیی بە سێ سەدە هەبوو تا لە ئەوروپا پێدەگا، ئەوەتا ئیتاڵیا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم دەتوانێ یەکبگرێتەوە بەهەمان شێوە گەلانی دیکە هەبوون ماوەی چەندین ساڵ خەباتیان کرد و بەم مەرامە نەگەیشتن تا جەنگی یەکەمی جیهانی. چونکە گیانی تاکگەرایی بە کتوپڕ سەرهەڵنادا و لە هەموو شوێنەکانیش لە یەککاتدا نابێ بەڵکو چەندین نەوە و سەدەی خایاند تا پێگەیشت، وەکو هێز لە سەرەتای چەرخی نوێ دەرکەوت بەڵام تاک لە هەموو ڕوێکەوە ئازاد نەبوو نە لە رووی سیاسییەوە نەلە رووی دەربڕینی راوبۆچوون. دۆخەکان بەم هاوتەریبیە دەچن بەڕێوە، مرۆڤەکان خاوەن بۆچوون و بڕوای خۆیان دەبن تا ئەوکاتەی شۆڕشی فەرەنسی دەست پێدەکا و مافەکانی مرۆڤ رادەگەیەنێ، دروشمی ئازادی و یەکسانی و برایەتی بەرز دەکاتەوە، بەم شێوە ئەم هزرە لە فەرەنساوە پەرە دەستێنێ و لە وڵاتەکانی

دراوسێ بڵاو دەبێتەوە بەڵام ماوەیەکی درێژی دەوێ تا میللەتانی ئەو ناوچە بە مافەکانی خۆیان دەگەن.

## دەرکەوتنی شارەکان:

دەرکەوتنی شارەکان لە سەدەی پانزەهەم کاریگەری خۆی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەوروپا هەبوو، شارەکان لە ئەنجامی پەرە سەندنی بازرگانی و پیشەسازی دروست دەبن دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان لە ژێر دەسەڵاتی خانەدانەکان رزگاریان دەبێ.

دەرکەوتنی شارەکان کاریگەری خۆی لەسەر لاوازکردنی سیستەمی کشتوکاڵیی دەرەبەگایەتی هەبوو، هەندێک شار بەتایبەت لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا توانیان سوود لەو هەلە وەرگرن و بایەخ و پێگەی خۆیان بسەلمێنن تا ئەوکاتەی دەبنە کۆماری سەربەخۆو ئازاد لە نێو دەوڵەتانی پیشەسازی، هەندێک شاریش لە فرەنسا و بەریتانیا هاوکاری پادشاکانیان کردن بۆ لەناو بردنی چینی خانەدانەکان، ئەوان پێیان وابو لە بەرژەوەندی ئەواندایە لە دژی خانەدانەکان پشتگیری پادشاکان بکەن، چونکە پێیان وابو دامەزراندنی حکومەتێکی ناوەندیی بەهێز بە سەرۆکایەتی پادشا دەبێتە مایەی سەقامگیری وڵات. بۆئەوان ئەم جۆرە حکومەتە باشترە لەو دابەشییەی کشتوکاڵی کە لەمپەرە لەبەردەم گەشە سەندنی بازرگانی و پیشەسازی، بەم شێوە لە ئەوروپا هەندێک شار هاوکاری پادشاکانیان دەکەن بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی پادشایەتی لەو وڵاتانە.

ئیتر لەوکاتەوە شارەکان دەبنە سەنتەری رەوشەنبیری و ئازادی و کەلتوری، رەوشەنبیران لێی کۆدەبنەوە و ئاڵوگۆری زانست و داهێنانەکان دەکەن، هزرەکانیان ئاڵوگۆر دەکەن کار بۆ جێبەجێکردنی ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان دەکەن.

هەرچەندە شارەکان لە کۆتایی چەرخی ناوەراست دەردەکەون، بەڵام دیاردەی رێنسانسی لێ دیار و زەلال نابێ تەنها لە کۆمەڵگای نوێی ئەوروپی نەبێ، کاتێک بەهۆی بازرگانی و پیشەسازییەوە سامانەکان زۆر دەبن ئەوسا دەردەکەوێ.

## بووژانەوەی بازرگانی و پیشەسازی:

لەوکاتەی شارەکان دەردەکەون لە دەوروبەری ساڵەکانی هەزاری زاینی، بازرگانی و پیشەسازی بە شێوەیەکی بەرچاو دەوبوژێنەوە تا رێنسانسی ئەوروپی. شارە ئیتاڵیەکان لە هەموویان زیاتر پێیانەوە دیار بوو چونکە ئەوشارانە لە سەردەمی رۆمانیەکانەوە نەریتێکی تایبەتیی بازرگانیان هەبووە کە سەنتەرێکی بازرگانیی جیهانی بوو. دیارە هەڵکەوتی جوگرافیای کە دەکەوتە نێوەڕاستی دەریای سپی ناوەڕاست کاریگەری خۆی هەبووە لەسەر ئەو پێگە بازرگانییەی. ئیتر بەهۆی ئەو هەڵکەوتەی جوگرافیەیەوە ئەو شوێنە بەدرێژایی چەرخی ناوەڕاست و لە سەردەمی رێنسانسەوە دەبێتە پێشکەوتووترین ناوچە لە رووی شارستانی و چڕی دانیشتوانەوە. بەم جۆرە کۆمەڵگای ئیتاڵی پێش کۆمەڵگای ئیسپانی وفرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزی کەوتەوە.

مەزنترین سوود لەم پێگەیەوە ئیتاڵیا بەدەستی هێنا پەیوەندیان بوو بە دەوڵەتی بێزەنتی و وڵاتە عەرەبیەکانەوە بوو کە دەبوونە دراوسێی و بە دەوڵەتە ئیسلامییەکانیشیان بەستنەوە، ئەمانیش بەشێکی زۆری شارستانیان هەبوو دیسان لەو رێگایەوە بۆ بازرگانی دەگەنە چین وهیند.

ئیتاڵییەکان خەونیان بەو سامان و کانزا و بەرهەمە دەستیانەی وڵاتانی دراوسێ دەبینی بەتایبەت وڵاتانی رۆژهەڵات، بۆیە هەوڵیان دا سوود لەو توانا و بەرهەمانە وەرگرن و بۆ بازرگانی بیکەنە ئامرازێکی بەهێزی کارەکانیان.

شارەکانی کەنار دەریای ئیتاڵی وەکو پیزا و جنوا بوندقییە ( ڤینیسیا ) کە دەکەوتنە کەنار دەریا بەهۆی کەشتی و کۆمپانیای بازرگانیەوە لەگەڵ ئەسکەندەریە و یافا و عەکای فەڵەستین بازرگانیان ئەنجام دەدا، ئاوریشم و کاڵای رۆژهەڵاتیان لەو هەرێمانەوە بۆ ئەوروپا دەهێنا، نەک هەر ئەمە هەرچیەک لە ئەوروپا نەبوایە ئەمان بازرگانیان پێ دەکرد، وەکو زێڕ و بەهارات و بۆیاغ و چەندین کاڵا و کەرەستەی خاوی دیکە، بەم شێوە ئیتاڵییەکان ئەو تایبەتمەندیەیان وەرگرت کە سەرجەم بەرهەمەکانی وڵاتانی عەرەبی و رۆژهەڵاتی بگەیەننە ئەوروپا و بەسەر وڵاتانی فرەنسا و ئیسپانیا و ئەڵمانیادا دابەش کەن. لە سەدەی چواردەمەوە ئیتاڵییەکان لە تەنگەئاوی چیای تاریقەوە بۆ کاری بازرگانی خۆیان دەگەیاندە بەریتانیا و ئەو وڵاتانەی دەکەوتنە کەنار دەریای باکوور.

و: خالید هەرکی

بەم شێوە ئیتاڵییەکان دەستیان گرت بەسەر هەموو ئەو کون و کەلێنانەی کە لێیەوە دەگەنە وڵاتان بۆ گەیاندنی بەرهەم و کاڵای ڕۆژهەڵات بە وڵاتانی دونیا وەکو کەرەستەی خاوو خوری و چەرم و بەرهەمە دەستییەکانی دیکە، زۆربەی ئەو کەرەستە خاوانەی ئیتاڵییەکان دەیانگەیاندە وڵاتەکەی خۆیان دوای گۆڕینیان بە بەرهەمی تری پیشەسازی دوبارە دەیانگەڕاندنەوە وڵاتانی ڕۆژهەڵات و پێیان دەفرۆشتنەوە.

ئەم چالاکییە بازرگانییە جموجۆولی زۆری خستە ئەو ناوچەیە بۆیە پێویستکرا بە ڕێگاوبانەکاندا بێنەوە و چاکسازیان بۆ بکەن بۆ ئەوەی پرۆسەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە نێوان وڵاتانی ئیتاڵیا و ئەورووپا بە ئاسانی ئەنجام بدرێ. لەم ڕووەوە بە ڕێگاکانی ڕۆمانیدا هاتنەوە لەسەر کەنارەکان یانە و شوێنی حەوانەوەیان دروست کردن بۆ دڵنیا بوون و متمانەی بازرگانەکان یاسای تایبەت بە بازرگانی و گرێبەست دانا، کردنیان بە یاسای بازرگانیی نێودەوڵەتی. ئەمەو بانکی بازرگانیی نێودەوڵەتی دامەزارن بۆ ئاڵوگۆڕی دراو لە نێوان دەوڵەتان و بازرگانەکاندا تائەو ئاستەنگەی گۆڕینەوەی دراو وەلا بندرێ و کاری بازرگانی ئاسان بکرێ.

بازرگانە ئیتاڵییەکان لەم ڕێگایەوە سوودی زۆریان پێگەیشت بە شێوەیەک دەوڵەمەند بوون کە پارەیان بە قەرزا دەدایە پاپا و میرەکان، کاتێکیش دەستکەوتیان زۆردەبێ و دەوڵەمەند دەبن ڕوو لە ڕابواردن و کەیف و سەیف دەکەن. ئەوان بەدوای کەلەپوورە بەنرخەکانی دەستیی هونەرمەنداندا دەگەڕان و بە پارەیەکی زۆر لێیان دەکرین، بەو هۆیەوە هونەرمەندان زیاتر هاوبەستەگی هونەر بوون بۆ پەیدا کردنی ئەو جۆرە کاڵا بەنرخانە تا بە دەولەمەندە ئیتاڵییەکان بفرۆشن، لە ئەنجام هونەرمەندی بە توانا و بەهرەوەر لەو ناوچە هەڵدەکەون ، ئەو هونەرانەی لەم بوارە لە هەموویان زیاتر بایەخی پێدەدرا وێنە و تابلۆکان بوون، هونەرمەندان بە وێنەی زەیتی دەهاتنە ناسین چونکە بەهای زۆریان دەکرد، ئەو وێنانەی دەستکرد سەرچاوەی زانیاریەکانیان لە ماتماتیکی سەردەمی ڕێنسانس وەردەگرت. وێنەکان ئەوەندە زیرەکانە دەکێشران لە ڕاستی نزیک دەبوونەوە خەریک بوون بە قسە بێن، بۆیە وێنەکێشانێکی ڕواڵەتی بوون دەربڕی دۆخی حاڵی حازریان بوو. بەنموونە ئەو وێنەی کە وێنەکێش بلینی Bellini دروستی کرد وێنەی سەرۆکی چەتەی بەکرێگیراو بوو، هەروەها تابلۆیەکی زەیتیی بەناوبانگ هی هونەرمەندی مەزنی ئیتاڵی ( لیوناردۆ داڤنشی ) Leonardo da Vinci کە دەربڕی ( دوا شیوە )ی مەسیح بوو لەگەڵ حۆریەکان. وەکوو کۆمەڵێک پیاو نیشان دەدرا کە لە دەورەی کۆبوونەوە بەڵام هەریەکەی تایبەتمەندی

و خەسڵەتی خۆی هەبوو، ئەمەو چەندین هونەرمەندی دیکەی وەکو رۆفائیل کە تا ئەمرۆ کاریگەریی رەسمە کانی هەرماون.

* * *

گرنگترین شاری سەرەکی کە بە بازرگانی بەناوبانگ بوون ئەو شارانە بوون کە لە رێرەوی زنجیرە چیای ئەلبەوە نزیک بوون و دەکەوتنە باکووری دورگەی ئیتاڵیاوە، چونکە ئەو رێرەوانە کاریگەریان بەسەر جوولەی بازرگانی ئەوروپاوە هەبوو. بۆیە شارەکانی میلان، جنوا، پۆلۆنیا، ڤیرۆتا، بادوا، ناویان دەرکرد و لە سەرووی هەمووشیانەوە بوندقیە ( ڤینیسیا ) و فلۆرەنسا بوون کە لە رووی بازرگانییەوە پلە یەکیان بەدەست هێنا. بوندقییە ( ڤینیسیا ) یەکەمین شاری ئیتالی بوو بە بازرگانی و دابەشکردنی بەهارات ناوبانگی دەرکرد و فلۆرەنساش سەرەکیترین شاری ئیتاڵیا دەبێ بە چنینی و خوری و ئاوریشم ناو دەردەکا.

لە بەرانبەریاندا شارەکانی فرەنسا هەبوون کە دەکەوتنە باشووری دۆڵی ( رون ) لە باکووریش لە دۆڵی ( سین و مارون )، هەروەها شارەکانی ئەڵمانی بە درێژایی رووباری ( راین ) لە ستراسبۆرگەوە تا کوڵن، هەموو ئەو شارە فرەنسی و ئەڵمانیانە پەیوەندییەکی بازرگانیی توندوتۆڵیان لەگەڵ شارە بازرگانییەکانی ئیتاڵیادا هەبوو، دواتر ئەو پەیوەندییە بۆ هەموو شارو وڵاتەکانی ئەوروپا پەرە دەستێنێ.

بازرگانی کاریگەری زۆری لەسەر ویلایەت و شارە ئیتاڵیەکاندا هەبوو، ململانێ و کێبەرکێیان لەگەڵ یەکدا دەکرد، هەر یەکەو لەم رووەوە سەربەخۆیی خۆی هەبوو بۆیە ئیتاڵیا وەکو یەک دەوڵەت نامێنێتەوە هەستی نەتەوایەتی و یەک دەوڵەت بوون لاواز دەبێ، وەکو فرەنسا و دەوڵەتانی دیکە هەستی نەتەوایەتی هێزی نامێنێ ئەمەش بەهۆی بازرگانییەوە دەبێ، دوا کەوتنی یەکێتی ئیتاڵیاش بۆ دوو هۆ دەگەرێتەوە:

هۆکاری یەکەم/

دەسەڵاتی رەهای پاپا کە رێگە نادا دەسەڵاتێکی بەهێزی تاکرەو لەو وڵاتە دروست بێ، پاپا لە رۆما ئەو دەسەڵاتە بوو کە نەک لە هەموو ئیتاڵیا دەستی دەرۆیشت کەسایەتیی بەسەر هەموو کەس و لایەنێکدا زاڵ بوو، دەسەڵاتی بەسەر هەموو کریستیەکانی دونیادا دەچوو، دەسەڵاتی ئاینی و سیاسیی بەدەستەوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی ئیتاڵیا بکا

بە یەک دەوڵەتی یەکگرتوو لەژێر دەسەڵاتی خۆی. پاپا لە چەرخی ناوەڕاست ویلایەتە ئیتاڵیەکانی بە کێشەی نێوان خۆی وئیمپراتۆر تێوەدەگلاند، ئەم تێوەگلاندنە دۆخێکی مەترسیدار وەردەگرێ چونکە هەندێک لە پاپاکان جاروبار پەنایان بۆ فرەنسا یا ئیسپانیا دەبرد بۆ چەسپاندنی پێگەی خۆیان بەو هێزانە سەرکوتی هاوڵاتیانیان دەکرد. لەمەش زیاتر تاجی گوڵینەی ناپۆلیی نایە سەر خانەوادەی ( ئەنجۆ ) .Anjoi.

## هۆکاری دووەم/

ئەو ململانێ و کێبەرکێی بازرگانییەی نێوان ویلایەتە ئیتاڵیەکان بوو کە هەریەکەو هەوڵی سەربەخۆیی خۆی دەدا بۆ ئەوەی لە بازرگانیکردندا سەربەخۆو خۆسەربن،ئەمەش دەبێتە ڕێگری دووەم لەبەردەم یەکگرتنی ویلایەتەکانی ئیتاڵیا، ویلایەتەکان لە روی پانتاییەوە جیاواز بوون هەندێکیان ئەوەندە بچووک بوون کە هیچ کاریگەریەکیان لەسەر مێژووی ئیتاڵیا دروست نەدەکرد، بەڵام پێنج لەو ویلایەتە ئیتاڵیانە توانیان خۆیان پێبگەیەنن و یەکبگرن کە ببنە سەنتەری هێزی یەکگرتنی ئیتاڵیا و بازرگانیی ئەمانیش: ویلایەتەکانی پاپایی و ناپۆلی و میلان و بوندقییە ( ڤینیسیا ) و فلۆرەنسا بوون.

## ویلایەتەکانی پاپایی:

ویلایەتەکانی پاپایی بریتی بوون لەو ویلایەتانەی لە ناوەڕاستی دورگەی ئیتاڵیاوە دەست پێدەکات، لە باشووری رووباری ( تیبەر ) تا رووباری ( ئەلبو ) کە بریتی بوون لە ژمارەیەک شارو ویلایەت کە بەهۆی پێگەی گرنگی پاپاوە دانیان بە دەسەڵاتی رەهای پاپا دەنا، پاپا ببووە پێشرەوی سیاسەتی ئیتاڵی، ئەو تەنها پێگەی ئاینیی بەهێز نەبوو بەڵکو پێشرەوی ئاینی و سیاسیی ئیتاڵیای دەکرد بەو هۆیەوە ژیانێکی ئاست بەرز دەژیا.

ئەوانەی بڕوایان بە دەسەڵاتی دونیایی پاپا هەبوو سەرچاوەیان لەو بڕوایەوە گرتبوو ( دەسەڵاتی روحیی پاپا کاریگەر نابێ ئەگەر دەسەڵاتی دونیاشی لەگەڵدا نەبێ ) بەو هۆیەوە پشتگیریان لە دەسەڵاتی دونیایی پاپا دەکرد.

لەم روانگەیەوە پاپا دەست لە سیاسەت وەردەدا و تا دەبێتە فاکتەرێکی کاریگەر لە سیاسەتی دەرەوەی ئیتاڵیا و لە نێو دەوڵەتانی ئەورووپیش.

## میلان: Milano

میرنشینێکە دەکەوێتە باکوور، ناوەڕاستی بیابانی لمباردیی بە پیت، بەروبوومێکی بە پیتی هەیە لەتەک بەروبوومی کشتوکاڵی ویلایەتێکی پیشەسازییە بە دروستکردنی چەرم و ئاوریشم بەناوبانگ بوو.

ئەوکات میلان لەژێر حوکمڕانی خانەوادەیەکی دێریندا بوو بەناوی ڤیسکۆنتی Visconti کە لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەم شارە بکاتە بنکەیەکی بازرگانیی گرنگ لەوێوە بەرەو شارەکانی تر بۆ دامەزراندنی حوکمێکی دکتاتۆری سەربازی کاربکا، بۆ ئەم مەرامە یەکێک لە حوکمڕانانی ئەو ویلایەتە خۆی بە شازادەی ئەوێ ڕاگەیاند و میلانیشی کردە میرنشین، ململانێ و کێشە کەوتە نێوان ئەو دوو دەوڵەتە بەهێزەکەی دراوسێی کە بوندقییە ( ڤینیسیا )و فلۆرەنسا بوون.

لە ١٤٥٠ دەسەڵاتی میرنشین دەکەوێتە دەست کەسێکی دکتاتۆری عەسکەرتار کە ( فرانشسکۆ سوفورزا ) دەبێ، بەم شێوە خانەوادەیەکی نوێ دەسەڵات دەگرتە دەست کە لە شازادەیەکی منداڵەوە دەست پێدەکا، چونکە پەیوەندییەکی خێزانی لە نێوان خانەوادەی سوفورزاو پادشاکانی فرەنسا هەبوو بەو هۆیەوە میلان بایەخی دەبێ و پێگەی بەرزتر دەبێتەوە، حوکم دەکەوێتە دەست منداڵێک لە خانەوادەی سوفورزا تا ئەوکاتەی یەکێک لە خانەوادەی سوفورزا پەیوەندی بە پادشاکانی فرەنساوە دەکا بۆئەوەی هاوکاریی بکەن تا دەسەڵات لە برازا منداڵەکەی وەرگرێتەوە کە لەلایەن یەکێک لە ئەندامانی خانەوادەیەوە کرابووە پێسپێردراو بەناوی ( لودوڤیکۆ سوفورزا )، بۆیە مێژوونووسان چارلسی هەشتەم پادشای فرەنسا دەکەنە بەرپرسیار لە داگیرکردنی ئیتاڵیا لەلایەن فرەنساوە، ئەم داگیرکارییە دەبێتە مایەی ئەوەی ئیسپانیا بکەوێتە نێو کێشەکەو شەڕ لە نێوان ئیسپانیا و فرەنسا ڕوو بدا، ئەم شەڕە ماوەی چەند ساڵێکی خایاند، بە ناوی جەنگی ئیتاڵی هاتە ناسین.

و: خالید هەرکی

# بوندقییه (ڤینیسیا) :Venezia

بونـدقییه ( ڤینیسـیا ) گرنگتـرین شـاری ئیتالّیـا بـوو، سـەرەتا لەسـەر ئەو دوورگـانه دامەزرا کە لە بـاکووری دەریـای ئەدریـانیلەوە تـا ئاوەکـانی بەسـتراوە بەو دەریـایە، بـۆیە شەقامەکانی بریتی بوون لەو کەنالانەی بە بەلەم هاتووچۆیان پێدەکرا کە پێیان دەوتـن ( جەندول ). ئاسایی بوو خەڵـکەکەی کـاری دەریـاوانی و بازرگـانی بـکەن چـونکە بە دەریـای ناوەڕاستەوە بەسترابۆوە و لەولاشەوە بە وڵاتانی عەەبی و لە ڕێگەی دەریاوە کالاو بەرهەم و کەرەستەی خاوی بۆ ڕۆژهەلات دەبرد و دەهێنا، هەر بەم هۆیەوە بوندقیه ( ڤینیسیا ) گرێبەست و پەیمانی سیاسی و بازرگـانیی لەگەڵ دەسـەڵاتدارانی میسـر دەبەسـت، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی پابەندی دامەزارندنی بانکی بازرگانیی نێودەوڵەتی بـن بـۆ پشـتگیری لە بازرگانی و نرخدانان، خـاوەن بازرگـانە مەزنەکـان خۆیـان بـوونە دەسـەڵاتداری ئەو شـارانە، نیمچە ئیمپراتۆریەتێکیان لە نێو دەریا دامەزارند، لە کەنارەکانی ڕۆژهەلات و کەناری دلماشیا و دوورگەی کورفو و کریت و قـوبرس و ژمـارەیەکی زۆر لە دوورگەکـانی دەریـای ئـیجە، بەم شێوە بوندقیه ( ڤینیسیا ) بوو بە زنجیرەیەک لە پێگەی بەهێز بە درێژایی ڕێگـای دەریـایی بەرەو ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاست.

بونـدقییه ( ڤینیسـیا ) خـۆی کۆمـارێکی ئولیگـارچی بـوو ( Oligarchz ) (حـوکمی کەمیـنه ) دەسـەڵات لەدەسـت دەسـتەیەکی دە کەسـیدا بـوو ئەو ئەنجـومەنه دەکەسییە حاکمی لە نێو خۆیدا هەڵدەبژارد. منداڵەکانیشیان بەسەر پۆستە باڵاکانـدا دابەش ببوون، ئەم کۆمـارە لەژێـر سـایەی ئەم حـوکمڕانییە بە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتـانی دراوسـێی حوکمێکی ئارام و سـەقامگیری لـێ دەبردبەڕێـوە کە پێگەیەکـی درەوشـاوەی لە سـایەی ئەو حوکمە وەدەست هێنا، تەنـانەت هەنـدێک لە میرەکـان بەهـۆی متمـانە و دڵنیاییـانەوە لەوێ قەرزو گرێبەستیان ئەنجام دەدا.

سـنوورەکانی بونـدقییه ( ڤینیسـیا ) لەگەڵ حـوکمی دوورگەکـانی نێـو دەریـای ناوەڕاست وەکو خۆیان بە تەسکی مانەوە، ڕووی بەرفراوانیی لە ناوەوەی ئیتالّیا نەبوو بـۆیە بەناچـاری زیـاتر بـایەخی بە نێـو دەریـا دەدا، بـۆ ئەم مەبەسـتە چـاوی لە دامەزارنـدنی ئیمپراتۆریەتێکی دەریایی هەبوو.

پێگەی بوندقییە ( ڤینیسیا ) بەم شێوە پرپایەخ دەمێنێتەوە تا ئەوکاتەی رێگەی ( راس الرجاء الصالح ) دەدۆزرێتەوە. چونکە ئیسپانیەکان سووربوون لەسەر ئەوەی بۆ گەیشتنە هیند بەدوای رێگەیەکی دیکەدا بگەرێن تا ئەو رێگەیان دۆزیەوە، لەو کاتەوە بەهۆی کەم بوونەوەی دەرامەت و دەستکەوتەکانی بازرگانیان دەسەلات لەدەست حوکمرانانی بوندقییە ( ڤینیسیا ) سەرەولێژ دەبێ، هۆکارێکی دیکە رووخانی قوستەنتینیە بوو کە لە ١٤٥٣ دەکەوێتە دەست تورکەکان و گەیشتنی تورکەکان بە کەناری رۆژهەلاتی دەریای ناوەراست و دەستگرتنیان بەسەر ئەو دوورگانەی کە بەدەست بوندقییە ( ڤینیسیا )وە بوون، لەگەڵ ئەو گۆرانکارییانە بوندقییە ( ڤینیسیا )کان هیچیان لەدەست نەما ئەوە نەبێ بەرەو ناوەوەی ئیتاڵیا هەنگاو بنێن، بەلام ویلایەتەکانی دیکەی ئیتاڵیا لە گۆرینی سیاسەتی نوێی بوندقییە ( ڤینیسیا ) هەستیان بە مەترسیکرد، چونکە روون بوو هەر فراوانکارییەک لەسەر حسابی خاکی ئەواندا دەبێ، بۆیە لە هەر جوولەیەکی بوندقیە ( ڤینیسیا ) ترسیان هەبوو ناچار دەبن هەریەک لە فلۆرەنسا و میلان و ناپولی هاوپەیمانێتیەک دەبەستن.

## فلۆرەنسا: Florence

فلۆرەنسا لە شارە هەرە گەشەسەندووەکانی ئیتاڵیا بوو، ئابووریی لە بوندقیە ( ڤینیسیا ) کەمتر نەبوو , لە رووی رەوشەنبیریشەوە پێشکەوتوو بوو، بۆ پیشەسازیش لە پلە یەکەمی ئیتاڵیا دەهات، بۆیە کرێکارەکان لەو شوێنە کۆ ببوونەوە بەتایبەت کرێکارانی چنین و رستن. هەر لە کۆنەوە چینێکی دەوڵەمەند لەو شارە دروست ببوون توانیبوویان جڵەوی حوکم بگرنە دەست و ئاراستەکان وەرگێرن و دەست بگرن بەسەر بانک و کارگە مەزنەکاندا , بەو هۆیەوە بتوانن ئاراستەی حوکم بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بگۆرن، سوربوون لەسەر دامرکاندنەوەی جوولانەوەی سەندیکای کرێکاران و پیشەوەران کە ئەندامانی لە هەولی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان دابوون.

سەرەرای ئەو ناکۆکی و ململانێیە سیاسیەی ناوەخۆ ئینجاش خەڵکەکەی سوربوون لەسەر پاراستنی ئازادی سیاسی، فلۆرەنسیەکان توانیان سیستەمێکی کۆماریی دامەزرێنن کە تا ماوەیەکی دوور درێژەی هەبێ، درێژتر لە ماوەی حوکمرانی هەر شارێکی دیکەی ئیتاڵیا.

و: خالید هەرکی

لە نیوەی یەکەمی سەدەی پانزەهەم خانەوادەیەکی بازرگان و خاوەن بانک کە خانەوادەی ( میدیشی ) Midici ناو بوو توانی لە ڕێگەی هەڵگیرساندنی شۆڕشەوە لە دژی دەسەڵاتداری ئەوسا لە ساڵی ١٤٣٤ بە سەرۆکایەتی (کوزیمودی میدیشی ) حوکمێکی کۆماری دامەزرێنێ و ئەندامانی خانەوادەکەی جومگەکانی دەسەڵات بگرنە دەست.

بەناوبانگترین ئەوانەی لەم خانەوادە حوکمیان کرد (لورنزو دی میدیشی ١٤٦٩تا ١٨٩٢ ) کە بە لورنزۆی شاناز ناودەبردرا، لە هەموو ئەورووپا ناوی دەرکردبوو کە چاودێری ڕێنسانسی هونەرە، لە سەردەمی ئەو فلۆرەنسا گەیشتبوە لوتکە لە پێشکەوتن وگەشە سەندندا.

## پادشانشینی ناپۆلی: Napoli

ئەو ویلایەتە ئیتاڵییەی دەکەوتە بەشە هەرە باشوورەکەی کە ناپۆلی بوو جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ویلایەتەکانی دیکەدا هەبوو، پادشانشینی ناپۆلی حکومەتێکی دەرەبەگایەتیی پادشا حوکمڕان بوو. ئەو ڕێنسانەی لە ویلاتەکانی باکووری ئیتاڵیا ڕوویدا هیچ کاریگەرییەکی بەسەر ناپۆلیەوە نەبوو، کۆمەڵگاکەی نەریتی چەرخی ناوەڕاستیان پاراستبوو، بەڵام بەهۆی بەرفراوانی خاک و سنوورەکانی کاریگەری سیاسیی بەسەر ڕوداوەکانی ئیتاڵیادا هەبوو، دوای ئەوەی لە چەرخی ناوەڕاست سێ خانەوادە حوکمڕانیی لێ دەکەن لە سەدەی پانزەهەم دەسەڵات دەکەوێتە دەست خانەوادەیەک کە پەیوەندیەکی خێزانیان لەگەڵ پادشای ئەرجەوانی ئیسپانیدا هەبوو.

ناپۆلی بۆ چەندین سەدە نێچیری نێوان کێشەی دەوڵەتە ئەورووپیەکانی دەرەوەی ئیتاڵیا بوو، سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵ ی ١٢٦٥ ئەوکاتەی پاپا پادشانشینی ناپۆلی بە سیسیلیەوە دەبەخشێتە ( چارلس ئەنجۆی ) برای پادشا لویسی نۆیەم پادشای فرەنسا ( ئەمە لە ئەنجامی ململانێی پاپاو ئیمپراتۆردا بوو)، لە ١٢٨٢ سیسیلیەکان دژی خانەوادەی ئەنجۆ ڕاپەڕین و شۆڕشیان هەڵگیرساند، داوایان لە ئاراجونی پادشای ئیسپانیا کرد حوکمی سیسیلیە بکا، دۆخەکان بەم شێوە مانەوە تا ئەوکاتەی ئەرجوانی پادشا توانی هێرش بەرێتە سەر ناپۆلی و داگیری بکا، لەو کاتەوە ناپۆلی و سیسیلیە کەوتنە ژێر حوکمی خانەوادەیەک کە لە خانەوادەی ئەراجونەوە نزیک بوون. بەڵام فرەنسا بەم حوکمە ڕازی نابێ و دان بەو تاجە نانێ تا ئەوکاتە دەرفەتی بۆ دەرەخسێ لە جەنگی درێژخایەن کە لە نێوان

فرەنسا و ئیسپانیا لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم روویدا کاتێک ( چارلسی هەشتەم ) پادشای فرەنسا لە ١٤٩٤ ئیتاڵیا داگیر دەکا، ئەم داگیرکارییە رووی ئیتاڵیا و پێگەی دەگۆڕێ و کاریگەریی لەسەر مێژوی نوێی ئەوروپا دروست دەکا، ئەم کێشە لەسەر مافی حوکمڕانی لە ئیتاڵیا لە نێوان فرەنسا و ئیسپانیا دروست دەبێ کە هەر یەکەیان بە مافی خۆی دەزانێ.

* * *

**ئەمە تێڕوانینێکی گشتییە لەسەر ئیتاڵیا کە بە دوو بیرۆکە لێی دەردەچین:**

## یەکەمیان/

ئیتاڵیا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ نەیتوانی یەکیەتی نەتەوەیی بە ئەنجام بگەیەنێ، ئەمەش بەهۆی دۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی کە تیایدا دەژیا خۆی لەم دەستەواژە دەبینیەوە کە دەڵێ ( پەرتکە و زاڵ بە )، ئەمەو سەرەڕای ئەوەی رۆڵەکانی لەیەک رەگەز و بە یەک زمان دەدوێن بەلام ئەم یەکێتیەیان بۆ نەهاتەدی تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم.

## دووەمیان/

ئیتاڵیا لانکەی شارستانیەتێکی دێرین بوو، گەلی ئیتاڵیش لە ویلایەتە جیاجیاکان لە نازو نیعمەتێکی ئابووریی باشدا دەژیان لەگەڵ ئاستی زانست وئەدەب و هونەرێکی بەرز کە ئیتاڵیای کردە سەرچاوەی تیشک بۆ رێنسانسی ئەوروپی.

# بەشی دووەم

## رێنسانسی ئەوروپی

کاتێک مێژوو دەخوێنینەوە، دەبینین گەشەکردنی مرۆڤ بە چەند رەوتێکی هزریدا دەڕوا لەگەڵ ئەم رۆیشتنە بۆچوونی مرۆڤ لەسەر شێوازی ژیان و بیرکردنەوەش دەگۆڕێ، بەڵام ئەستەمە بتوانین مێژووی ئەم گۆڕانکارییە دیارکەین، یا ئەو مێژووەی دەکەوێتە نێوان چەرخی ناوەڕاست و چەرخی نوێ دیارکەین، چونکە هەر چەرخێک رەگی لە چەرخی پێشتر داکوتاوە تا ئەو رەگانە لەیەک دەردێن و چەرخە نوێکە سیمای دەردەکەوێ چەندین ساڵی پێویستە، بەکار هێنانی دەستەواژە نوێکان و وەلانانی دەستەواژە کۆنەکان پێویستیان بە راهێنان و بەکارهێنانیان هەیە تا لە مێشکدا جێگیر دەبن و لەسەری رادێن، ئەمەش بۆ هەموو نەتەوەکان بە یەکسانی و لە یەک مەودا تەواو نابێ بەڵکو هەندێک ئەو مەودایە بە کەمتر یا کورتتر لە نەتەوەکانی دیکە دەیبڕن و لەسەر چەرخە نوێکە سەقامگیر دەبن.

ئەمە لە ئەورووپا روویدا کاتێک لە چەرخی ناوەڕاستەوە دەپەڕنەوە بۆ چەرخی نوێ مێژوونووسەکان بە چەرخی رێنسانس Reninainsance ناویان برد واتە بووژانەوەی نوێ یا نوێبوونەوەی نوێ ( ئاژار ) ئەم جووڵانەوە سەرەتا بەر لە نیوەی سەدەی چواردەهەم لە ئیتاڵیا سەری هەڵدا، کەچی لە هیچ وڵاتێکی دیکە ئەوکات ئاسەواری دیار نەبوو.

بە نموونە لە ئینگلتەڕا تا کۆتایی سەدەی پانزەهەم سیمای رێنسانس بەدی نەکرا، چونکە ئەو بزووتنەوە بە هێواشی لە ئیتاڵیاوە بە وڵاتانی ئەورووپا بلاوبۆوە بۆیە درێژەی کێشا، لە سەدەی چواردەمەوە تا سەدەی شانزەهەم درێژەی دایێ لەگەڵ ئەمەشدا دیاردەکانی تا سەدەی حەڤدەهەم لە وڵاتانی ئەورووپا بەدی نەکران. ئاسەوارو دیاردەی ئەم بزووتنەوەش لە وڵاتکەوە بۆ وڵاتێک جیاوازیی هەبوو، بە نموونە لە هەندێک وڵات لە شێوەی چاکسازی ئاینی دەرکەوت وەکو ئەڵمانیا. لە ئیتاڵیا لە رێگەی هونەرەوە دێتە مەیدان. دیاردەکانیشی لە شێوەی نوێکردنەوەی کەلتوورو نەریتە کۆنەکانەوە دەرکەوتن کە

مێژوونووسەکان تێیدا بەشداریان دەکرد، پێیان دەوت بزووتنەوەی بووژانەوەی زانست (Revival of Learning).

## بزووتنەوەی ژیاندنەوەی زانست:

ئەم بزووتنەوە لە دوو سەدەی ڕاگواستنەوە سەری هەڵدا، واتە لە ساڵەکانی ١٣٠٠ تا ١٥٠٠ ڕەوشەنبیرەکان هەوڵی گەڕان بەدوای دۆزینەوەی ئاسەواری کۆن و بووژانەوە و بەدوای پاشماوەکانی ئاینی کۆنی یۆنانی و ڕۆمانیی کۆندا دەگەڕان. هەوڵیان دەدا توێژینەوەیان لەسەر بکەن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بزووتنەوەی زانست خۆی تاقە دیاردەی ڕێنسانس نەبوو بەڵکو دیاردەیەک بوو لە دیاردەکانی سەرەتایی ئەو بزووتنەوە.

ئەوانەی لەم بوارەشدا کاریان دەکرد پێیان دەوترا مرۆڤدۆستەکان (Humanists) چونکە ئەمان بایەخیان بە توێژینەوەی سەر مرۆڤ خۆی دەدا، ئەمەش کارێکی باش بوو بۆئەو سەردەم لەگەڵ چەرخی ناوەڕاست دەهاتەوە کە بایەخدان بوو بە بێگەردی و دەستپاکی و دەستگرتنەوەی خەڵک و کەم مەسروفی. لە چەرخی ناوەڕاست هونەر ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو چونکە بایەخەکان بە ڕۆح دەدران نەک بە جەستە، پێویست نەبوو بایەخ بە ڕێکوپێکی جەستە بدرێ یا بە ئەدەب و هونەر، دواتر گرنگ نەبوو کە گروپی مرۆڤدۆستان لە پیاوانی ئاینی و زانکۆکان بن بەڵکو گرنگ ئەوە بوو لە خەڵکە گشتییەکە بن کە بڕوایان وابوو زۆربەی هزرمەند و بیرمەندە ڕۆمانی و ئەغریقییەکان لە پیاوە ئاینیەکان نەبوون.

مرۆڤدۆستەکان بەوە نەدەوەستان تەنها دیراسەیەکی قووڵی بەرهەمە هزرییەکانی کۆن بکەن، بەڵکو هەوڵی دادگای کردنیان دەدان لەسەر شێوازی نوسینەکانیان. زمانی نوسینیان زمانی ئیتالی بوو چونکە ئیپان وابوو زمانە نەتەویەکان ئەوەندە وورد نییە بتوانن بیردۆز و هزرەکان شی کەنەوە، بۆیە ئەدیب و هزرمەندە ناسراوەکانیش لە سەردەمی ڕێنسانس لەسەر ئەم ڕێچکەیە ڕۆیشتن، وەکو دانتی و بوکاشیو.

سەرەتا دەرکەوتنی مرۆڤدۆستەکان لە ئیتاڵیا سەریان هەڵداو دواتر بە وڵاتەکانی دیکەی ئەوروپا بڵاو بوونەوە، بەتایبەت شارەکانی فەرەنسا و ئەڵمانیا و هۆڵەندا، مرۆڤدۆستەکان لەسەر پشت بەخۆ بەستن ڕاهاتبوون بەتایبەتی مرڤدۆستە ئیتالیەکان، بەدیدی ئەوان کەسی مرۆڤدۆست دەبێ هونەرمەند و فەیلەسوف و سیاسەتمەدار و ڕەوشت

و: خالید هەرکی

بەرز بێ، حەزی لە زانین بێ، بەدوای ناوبانگدا بگەڕێ، ئەوان بە زمانی لاتینی هزر و بیرەکانیان دەردەبڕی، زۆر بایەخیشیان بە شێوازی دەربڕین دەدا.

بزووتنەوەی بووژانەوەی زانست لە دیراسەکانیان پشتیان بەو نووسراوانە دەبەست کە بۆ یۆنانییە لاتینییەکان دەگەڕایەوە و لە کڵێسا و دێرەکانی ئیتاڵیا و ئەڵمانیا دەستیان دەکەوت. دەسەڵاتدارە ئیتاڵییەکانیش لێکۆڵەرەوەیان بەدوای ئەو نوسراوانەدا دەنارد تا لێیان بکڕن، گەلێک جاریش ململانێیان لەسەر دەکردن بۆ وەدەست هێنانیان.

( بترارک ) بە یەکەم سەرکردەی ئەو بزووتنەوە دێتە ئەژمار، چونکە هەموو ژیانی خۆی بۆ توێژینەوەی ئەدەب تەرخان کرد، ئەو لە فلۆرەنسا لە دایک دەبێ و یەکەم ژیانی خوێندیشی لە توسکانیا دەباتە سەر، دواتر باوکی بۆ خوێندن دەینێرێتە مونتیلین تا یاسا بخوێنێ، بەڵام گوێ لەم راسپاردە ناگرێو ئەدەب هەڵدەبژێرێ، لە نوسینەکانی هەندێک هزرو بیرۆکەی سەیر بەدیکران، بە نمونە دەڵێ: ( دەبێ مرۆڤ سەرەتا بایەخ بەو رەهەندانە بدات کە لە ژیانی سەر زەوی پێویستی پێیەتی بەر لەوەی بایەخ بە ژیانی دوایی بدا )، رەخنەی توندیشی لە کڵێسا دەگرت، ئومێدی دەخواست گەلی ئیتاڵی دەست بە ژیانێکی نوێ بکا و جیهان بەرەو فەلسەفەیەکی نوێ بەرێ، بەڵام ئەمەی لەبیرچوو کە ئەوکات گەلی ئیتاڵیا توشی پەتای دابڕان و پارچە پارچەیی ببوو، ئەو توانایەیان نەبوو ئەو ئومێدەی بەجێ بگەیەنن.

هەرچۆنێکی بێ نووسین و هەڵبەستەکانی کاریگەری خۆیان هەبوو لەسەر رێنسانسی ئیتاڵیا، ئەدیبەکانی ئیتاڵی بایەخیان بە هەڵبەستەکانی دەدا لە رێگەی شیکردنەوە و گواستنەوەیاندا.

## رێنسانسی ئەدەبی:

هەر لە سەرەتای چەرخی رێنسانس ئەدەب گەشە دەکا، هەڵبەست و گۆرانییە کۆنەکانیان نوێ دەکردنەوە، بایەخیان بە ووتنەوەی گۆرانییەکان و لاواندنەوە مللییەکان دەدا بە تێخستنی شێوازی نوێی رێنسانسی ئەدەبیی ئیتاڵی و ئەغریقی، بەڵام وێڕای تێکەڵاو کردنی شێوازی نوێ هەندێک داهێنانیشیان بۆ زیاد دەکرد و دەیانرازاندەوە ، ئەدیبە کۆنەکان تەنها نمونەی دەربڕینی هەست و سۆز نەبوون بەڵکو دەربڕی هەستی ئەدەبیی سەدەی شانزەهەم بوون .

تایبەتمەندیی ئەو ئەدەبە ئەوە بوو بۆ دڵخۆشکردنی خەڵک دەوترا، هیچ بایەخێکیان بە فێرکردن نەدەدا تەنها مەبەستیان خۆشگوزەرانی بوو، یانەی رابواردن و کات بردنە سەر، شوێنی شانۆ ئاینییەکانیان گرتەوە کە سیمای چەرخی ناوەڕاستی دەبەخشی.

بەم شێوە ئاداب بووە نەتەوە ئەدیبیش ئەو کەسە بوو کە دەربڕی کەسایەتیی نەتەوەکەی بوو، بۆیە ئەدیبە ئیتالیەکان بوونە پێشەنگی ئەدیبانی نەتەوەکانی دیکە.

هەرچی فرەنسایە ئەدیبەکانیان بایەخیان بە داهێنانی پەخشان و چیرۆک و یاداشت و شیکاری دەرونی و رەوشتی دەدا. لە ئینگلتەرا شانۆی هەمەرەنگی پڕ لە سەرەڕۆیی و شیکاری مرۆڤ لەسەر رەوشت هاتنە مەیدان. لە ئیسپانیاش ئەدیبەکان بایەخیان بە سۆزی سوارچاکی وخەسڵەتە باشەکانی سواری دەدا.

## رێنسانسی هونەری:

رۆحیەتی رێنسانس بە جوانترین شێوازی هونەرە جوانەکان دەرەوشایەوە. ئیتاڵیاش لانکەی ئەو داهێنانە بوو کە لە سەدەی پانزەهەم دەستی پێکرد. کاتێکیش لە سێیەکی یەکەمی سەدەی شانزەهەم بایەخ بە هونەری کلاسیکی کۆن دەدرێ زیاتر پەرە دەسەنێ، گەلێک هونەرمەند پەردەیان لەسەر جوانی ئەو هونەرە هەڵدایەوە، بەڵام لەهەمان کات خاوەنی جوانی و رەوشت پاکی بوون، بە توانا و داهێنان بوون، کاریان بۆ ئەوە دەکرد ئەم هونەرەیان دەربڕی کەسایەتی سەربەخۆی خۆیان بێ پاک و بێگەرد بێ، بابەتی سەرەکیی هونەریش مرۆڤ بوو، مرۆڤیان بە جوانی وێنە دەکرد و ژنیش بە روتی، هونەری ئەوسا هونەرێکی کۆپی نەبوو بە فەرمانی کڵێسا ئەنجام بدرێ بەڵکو دەربڕی کەسایەتی هونەرمەند خۆی بوو،هی ئەقلیەت و بۆچونەکانی بوو.

چونکە شارەکانی ئیتاڵیا ناوەندی ژیانی هونەری بوون بۆیە رۆلی مەزنیان لەم بوارە دەگێڕا، دەسەڵاتداران خۆیان بەخاوەن و پارێزەری هونەر دەزانی، دیارە کە رۆما لە لوتکەی ئەو شارە ئیتاڵیانە بوە کە پشتیوانیی لە هونەر کردوە و هونەری لە باوەشگرتوە. بەهۆی ئەو رۆلەی دەیگێڕا هونەرمەندەکان هاوبەستەی گیانی بەگیانیی ئەوێ ببوون، زۆر لە پاپاکان هاوکاری و یارمەتی هونەرمەندانیان دەدا بۆ پەرە سەندنی رێنسانسی هونەری، بۆیە گەورە هونەرمەندەکان رۆمایان بە سەکۆیەکی تایبەتی خۆیان و هونەرەکەیان دەزانی، ئەوەتا کڵێسای پەتروسی پیرۆز بە نەخشەسازیەکی جوانەوە لەسەر دەستی ئەو هونەرمەندە

و: خالید هەرکی

وێنەکێش و پەیکەرسازانە دەنەخشێندرێ، لە نمونەی بیناساز برامانتە و وێنەکێش رافائیل و میشێل ئەنجیلۆ، لە بەناوبانگترین پاپاش کە یارمەتی هونەرمەندەکانی دابێ پاپا جولی دووەم ( ١٥٠٣-١٥١٣ ) و پاپا لیوی دەیەم ( ١٥١٣-١٥٢١) لە خانەوادەی میدیشی هەر لە سەردەمی ئەوانیش کۆشکی فاتیکان دەنەخشێندرێ، ئەوەی راستی بێ هەندێک لەو پاپایانەی سەردەمی چەرخی رێنسانس مەبەستیان بوە دەولەتێ سکۆلار لە ئیتاڵیا دامەزرێنن، چونکە دەسەڵاتی ئاینی و سیاسیان پیادە کردوە ئەوان لە شێوەی میر رەفتاریان کردوە.

تەنها رۆما نەبووە هونەری لە باوەش گرتووە، بەڵکو میلانیش لەم رووەوە بە لانکی هونەر دێتە ئەژمار چالاکییەکانی رێنسانسی هونەری لەو شارە لە جوولەدا بووە چەندین هونەرمەندی لە باوەش گرتووە لە نموونەی ( لودوفیک لومور) و کوڕەکەی ( فرانسوا سفوررزا )، ئەمەو فلۆڕەنساش بەیداخی رێنسانسی هەڵگرت بەتایبەتی لە سەردەمی ( لورنزو دی میدیشی ) کە کۆشکی خۆی کردبووە ئەکادیمای هونەری. ژمارەیەکی هونەرمەندی لەو کۆشکە پێگەیاند لە نموونەی ( لیوناردۆ داڤنشی ) و ( میشیل ئەنجلو) و (روفائیل )، بە رێگەی ئەو هونەرمەندانەوە رێگاکانی هونەر سازدران، لە سەدەی شانزەهەم چارەسەری پرسەکانی مرۆڤاتیان بە وێنەی دەستی چارەسەر دەکرد، وێنەکان بە گیانێکی مرۆڤدۆستی دنیایی بوون. بەو وێنانە کاریگەریان لەسەر مرۆڤ دروست کرد کە هەوەستی هونەری تەواوکەریان هەبێ، لە پەراوێزیشدا دەربڕینی ئاینی دێت. ئەمە وێڕای ئەوەی هونەرەکەیان تایبەتمەندیی پێدانی جوانی مرۆڤ و رێکوپێکی جەستەییان هەبوو لەگەل بایەخدان بە جوانی سروشت و توانای دابەشکردنی رەنگەکان و سێبەرەکان و بایەخدان بە رونکردنەوەی هەست و سۆزی مرۆڤ لەجیات توندڕەوی لە ئاین و پیرۆز راگرتنی وێنەی کەسەکان.

ئێمە لە رێگەی دیراسە کردنی ژیان و بەرهەمی هەندێک هونەرمەندی چەرخی رێنسانسەوە دەتوانین پەرە بە دیراسەی هونەری وێنە کێشان لە ئیتاڵیا بدەین .

## لیوناردۆ داڤنشی Leonardo da Vinci ( ١٤٥٢-١٥١٩ ):

لیونـاردو داڤنشـی لە شـارۆچکەی ڤنشـی شـاخاویی نزیـک لە فلۆرەنسـا لەدایـک بـووە . کاتێک پێدەگا شەیدای پەیکەرسازی و هونەری بیناسازی و ماتماتیک و نیگارکێشان دەبێ. لە هەمـان کاتیشـدا ئـارەزوی ئەدەب و مۆسـیکا و شـیعر و جیۆلۆجیـا و زانسـتی ئەرکـی ئەندامانی جەستە دەبێ. لە فلۆرەنسا لەسەر دەستی نیگارکێشێکی بەناوبانگ دەرسی خوێند دواتر پەیوەندی بە کاری فەرمانبەرێتی دەکا لە لۆدڤیکۆ سفورزا لە میلان لە ١٤٨٢ ، ماوەی بیست ساڵ لە میلان دەمێنێتەوە لەو ماوە دوو وێنەی بەناوبانگ ڕەسم دەکا هی کچە گرۆتـۆ Virgin of the Drotto و دوا شیوی ئێواران Last Supper، کە وێنەی ئەسوعە لەگەڵ دوانزە خوێندکارەکەی.



لەو دیـمەنە یەسـوع بە خوێنـدکارەکانی ڕادەگەیەنـێ کە لە داهـاتوو یەکێکیـان ناپـاکیی لەگەڵدا دەکا .

و: خالید هەرکی



لیۆناردۆ وەکو ئەندازیارێکی سەرکەوتوو لە میلان درێژە بە خوێندن و کارەکەی دەدا، کاتێکیش لە سەردەمی داگیرکاری فرەنسا لە ١٤٩٩، لودڤیکۆ سفورزا ناچار دەبێ میلان جێبێلێ، لیوناردۆ دەگەرێتەوە فلۆرەنسا. ئەوکات لەوێ وێنەی ( مۆنالیزا ) یا ( جیوکوندا )ی بەناوبانگ دەکێشێ، مۆنالیزا لە ١٥٠٦ کچە شۆخ و شەنگێکی جوان بوو هاوسەری ئەفسەرێک بوە کە لە خۆی بە تەمەنتر بوو بەناوی ( فرانشکودل جیو کوندا) حاکمی فلۆرەنسا بوو بە جوانیەکەی سەرسام بوو بۆیە داوای لە لیۆناردۆ کرد وێنەکەی بۆ بکێشێ. لیۆناردۆ.هەموو تواناو بلیمەتی خۆی لەم وێنەدا دەخاتە گەڕ تا دەتوانێ بە چوار ساڵ وێنەی ئەو کچە شۆخە رەسمکا بە شێوەیەک هەموو جوانی و میهرەبانیی لێ بەدی بکرێ.

لە دوا رۆژەکانی تەمەنیدا هەموو کاتەکانی بۆ خوێندنی زانستی تەرخان دەکا، دوا ساڵ ەکانی تەمەنیشی لە کۆشکی فرانسوا دەباتە سەر تا ١٥١٩ کە کۆچی دوایی دەکا.

## میشیل ئەنجیلۆ ١٤٦٤- ١٥٧٥:

میشیل ئەنجیلۆ یەکێک بوو لە ناودارانی بواری هونەر لە چەرخی ڕێنسانس، لە کاپیرێس ( Caprese) ی نزیک فلۆرەنسا لەدایک بووە، لە ژیانی لاوێتییدا تواناکانی بۆ بواری پەیکەرسازی تەرخان کرد، ئەوکاتە ناوبانگ دەردەکا کە پەیکەریَ مریەم و منداڵەکە دروست دەکا، هەرچەندە هونەری پەیکەرسازیی لە هەموو هونەرەکانی دیکە گرنگتر بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزی لە وێنە کێشان و ئەندازیاری بیناسازی و نوسینی شیعر هەبوو.

پاپا یۆلیۆسی دووەم بۆ نەخشە کێشانی بانی کڵێسای سیستین Sistine Chapel لە فاتیکان بانگی کرد. بۆ تەواو کردنی ئەو نەخشە میشیل ماوەی چوارساڵ پێیەوە خەریک دەبێ تا دەیرازێنێتەوە، لە کارکردن لەسەر پشت رادەکشا دواتر بەرزیان دەکردەوە.

یەکێکی دیکە لە کارە ناوازەکانی دروستکردنی پەیکەری مریەم و عیسا بوو کە لە رۆما لە دەروازەی کڵێسای پەترۆسی پیرۆز دانراوە، هەروەها پەیکەری داوودی لە مەرمەڕ دروستکردوە، ئەم پەیکەرەش لە بەردەم کۆشکی میرنشین لە فلۆڕەنسا دانراوە.

## رافائیل ١٤٨٣-١٥٢٠ :

رافائیل سێیەمینە لەو سێ پیاوە مەزنانەی بواری هونەر، لە فلۆرەنسا دەرسی نیگارکێشانی خوێندووە، سەرەڕای تەمەنی منداڵیی بەڵام ناوبانگی دەرکردوە. یەکەم وانەی لەسەر دەستی دایکی جیۆڤانی سانتی وەرگرتووە، بنەمای هونەریی لە ( پیرو جینو) وەرگرتووە کە هونەرمەندێکی مەزنی پیرۆجیا Perugia بوو.



دواجار دەچێتە رۆما و بە کارەکانی لیۆناردۆ و ئەنجیلۆ سەرسام دەبێ. رافائیل لە پیرۆجینۆ فێری دووربینی بوو لە لیۆناردۆش فێری دابەشکردنی رووناکی و داهێنانی وێنە بوو، لە بلیمەتی میشیل ئەنجلۆش فێری توێژینەوەی جەستەی مرۆڤ بوو، هەرچەندە خوێندکاری ئەمان بوو بەڵام لە بەکار هێنانی رەنگەکان لاسایی نەکردنەوە پشتی بە داهێنانەکانی خۆی دەبەست، لەوە لەگەڵیان جیاواز بوو کە وێنەی روالەتیی نەدەکێشا کۆپیی سروشتی نەدەکردەوە، بەڵکو داهێنانی تیادا بەکار دەهێنا.

پاپا یولیوسی دووەم داوای لێکرد هۆلەکانی فاتیکانی بۆ برازێنێتەوە ئەو توانیی بە ماوەی شەش مانگ بە گەچ نەخشەسازی ئەو هۆلانە بکا ،لەو شوێنانەی کاری تیادا کرد ( خوێندنگای ئەسینا ) کە پوختەی مێژوی فەلسەفە و نهێنی پیرۆزی تیا نەخشاند.

شاکاری دیکەی زۆرن بەڵام لە تۆغیانی لاوێتییدا کۆچ دەکا رێنسانسی هونەری سوودی لە هەموو تواناکانی نەبینی.

## رێنسانسی زانستی:

ژیانی زانستی لە چەرخی ناوەڕاست بەند بوو بە کڵێساوە. بۆیە دۆزینەوە زانستییەکان کەم بوون. زانا و داناکان توانای ئەوەیان نەبوو بە تەنها و بە ئازادی بیر لە دۆزینەوەکان بکەنەوە، دەبوایە لەسەر رێچکەی پێشینەکانیان برۆیشتبانا و رەچاوی ئەوەیان بکردبا داهێنانەکانیان لەگەڵ هزرو بیرکردنەوەی کڵێسا بێنەوە، چونکە هەندێک لە پاپاکان رکابەری و دوژمنایەتیان لەگەڵ ئەو داهێنانە دەکرد کە سەربەخۆ و لەگەڵ رێسا و رێنماکانی ئاین نایەنەوە. بەڵام هامشۆو پەیوەندییەکانی ئەوروپی لەسەرووی هەموویانەوە ئیتاڵییەکان بە شارستانیەتی ئیسلامیەوە لە سەدەی یانزەهەم کاریگەریی لەسەر رێنسانسی زانستیی ئەوروپی هەبوو کە لە سەدەی سیانزەهەم گەیشتبووە لووتکە، لە رێگەی داگیرکاری ئیسلامییەکان بۆ ئیسپانیا و سیسیلیە شارستانیی ئیسلامی بە ئەوروپا دەگا، ئەم پەیوەندییانە سەرەتای بیرکردنەوەی زانستیانەی ئازاد بوون، عەرەبەکان دوای ئەوەی دیراسەی نەریت و کەلتووری ئەغریقییەکان دەکەن دەستکاری و چاکسازیی لێ دەخولقێنن.

ئەمە سەرەتای راستەقینەی رێنسانسی زانستی نەبوو بەڵکو رێنسانسە راستەقینەکە لە سەدەی شانزەهەم دەست پێدەکا و لە سەدەی حەڤدەهەم دەگاتە لووتکە.

بزووتنەوەی مرۆڤدۆستەکان هاوکاریی رێنسانسیان کرد چونکە زۆربەی کەسایەتییەکان لە مرۆڤدۆستەکان بوون و بۆ ئەو مەدرەسە دەگەڕانەوە. بایەخیان بە ئەنجامدانی بیردۆزی زانستی دەدا، لە زانستی گەردوون شارەزاییان هەبوو، ئەوکات بوو بیردۆزی گەردوونی ( کوبرنیک ) دەدۆزرێتەوە کە ئەو بیرۆکە کۆنەی وەلانا کە گوایە زەوی پان و تەختاییە، جووڵە ناکا و مانگ و رۆژیش لە دەوری دەخولێنەوە ، ئەوەشی سەلماند کە هیچ گومانێک لەوەدا نیە زەوی خڕە و لە دەوری رۆژ دەخولێنەوە.

هەر لە سەدەی شازدەهەم رێنسانسی فیزیک و ماتماتیک و زانستی سروشت و فسیۆلۆژی سەرهەڵدەدا. خۆی چەرخی رێنسانسی زانستی چەرخی شیکاری وگواستنەوە بوو لە کۆتو بەندەکانی چەرخی ناوەرساتەوە بۆ چەرخی رێنسانس. ئەوکات ئەزموونە زانستییەکان بوونە مەرجی بنەڕەتی سەلماندنی بنەماکانی زانست و دانانی بیردۆزەکان لەسەر ئاستی یاسای گشتی.

زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیش لە ئیتاڵیا ئەوکاتە پەرە دەسەنێ کە هزرو بیرەکان ئازاد دەبن و دەستەواژەی نوێ دەردەکەون، ئیتر بیرمەندو هزروان دەردەکەون،

و: خالید هەرکی

بایەخ بە خوێندنی بنەمای سیاسەت و کۆمەڵایەتی دەدەن، بەناوبانگترینیان لە بواری هزری سیاسی ماکیاڤیللی بوو ( ١٤٦٩-١٥٢٧ ).

## ماکیاڤیللی ( ١٤٦٩-١٥٢٧ ) Machiavelli:



نیکۆلا ماکیاڤیللی لە فلۆرەنسا پێدەگا، لە سەردەمی میر( لۆرانی نازدار ) هەر لە منداڵییەوە سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆی بە زانیاری مێژوویی و سیاسی رەوشەنبیرکا. گوتار و کتێبە سیاسییەکانی شیشرۆنی دەخوێندنەوە، لەگەڵ کتێبەکانی ئەرستۆ، لە فلۆرەنسا هەر لە سەرەتای دەستبەکار بوونی لە ١٤٩٨ لە پۆستەکانی حکومی پلەو پایە وەردەگرێ. لە ئەمینداری ئەنجومەنی دە کەسییەوە کە بەرپرس بوو بۆ دەستەبەرکردنی پەیوەندییەکانی ئیداری لەگەڵ شارەکانی سەربە فلۆرەنسا، هەروەها لە هەمان کات بەرپرسیارێتی ئەمینداری نهێنیی ئیدارەی کۆماری پێسپێردرابوو.

ماکیافیلی دوای ئەوەی قوول دەبێتەوە لە بەراورد کردنی حوکمی کۆماری لە رۆمای کۆن و چەرخی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانیی ئەلمانی کە مکیافیللی لەگەڵی ژیاوە، پشتگیری سیستەمی حوکمی کۆماری دەکا و رەخنە لە حوکمی ستەمکاری دەگرێ.

رقی لە کلێسا و پیاوەکانی ئاینی دەبۆوە، پێی وابوو کەسانی درۆزن و چەواشەکارن، بەڵام رقی لە سیاسەتمەداری درۆزن نەدەبۆوە کە بۆ بەرژەوەندی گەلەکەی خەڵکیان هەڵدەخەلەتاند.

بەهۆی راسپاردنی حکومەت کاتێک ئەمینداری نهێنیی بوو بەشداری لە زۆربەی کارە ساسییەکانی کردوە، حکومەتی فلۆرەنسا بە نوێنەرایەتی بۆ گەلێک شوێن ناردوویانە، بەتایبەتی بۆ کۆشکی پادشایەتی فرەنسا لە سەردەمی لویسی دوانزەهەم لە ساڵەکانی ١٥٠٠ تا ١٥٠٤، هەروەها بۆ رۆمایان ناردووە لە ساڵی ١٥٠٣ بەهۆی ئەو نێردراویانەی لە سیاسەت و پەیوەندییە ئەوروپی و نێودەوڵەتی ئاگادار بووە.

هەوڵی دا بۆچوونی پێشکەوتوو لە کۆماری فلۆرەنسا بڵاوکاتەوە، پێی وابوو حکومەتێکی لاوازەو چاوچنۆکی تاک بەسەریدا زاڵە بۆ دەست گرتن بەسەر جومگەکانی دەسەڵات، ململانێی حزبیی تیا زەقە. ئەو حکومەتە بەبێ سوپایەکی نیشتمانی دەبردرێ بەرێوە پشتی بە سوپایەکی بەکرێگیراو بەستوە، بۆیە هاواری دەکرد ئەمە هەڵەیە بەڵام کەس گوێی لێ نەگرت و هاوارەکەی بەربا کەوت. هەرکە لە هاوینی ١٥١٢ خانەوادەی مدریشی دەگەڕێنەوە سەر حوکم ئەو رۆلی لاواز دەبێ و کۆماری فلۆرەنساش دەروخێ و ئەو هیچ پێگەیەکی لە کۆشکی نوێ نامێنێ. مکیافیللی بێکار دەبێ کاتەکانی بۆ نووسین تەرخان دەکا و دەست بە نوسینی کتابی ( میر ) دەکا کە تیایدا هەموو هزر و بیرەکانی لەسەر حوکمڕانی و سیاسەتی حوکم دەنوسێتەوە ، سەرچاوەی بیرکردنەوەشی لەم کتابە لە حوکمی یۆنانی و میرنشینە ئیتایەکان وەرگرتووە، هەر لە سەردەمی چەرخی ناوەڕاستەوە تا ئەوکاتەی لێ دەژیا. کاتێک لە کتابەکەی تەواو دەبێ پوختەی بیروڕاکانی لەسەر جۆری حوکمڕان، پێی وابووە باشترین حوکمڕان حوکمی ( ستەمکاری رۆشنگەر ) بووە، کە گوێ بە پەندی رەوشتی و ئاینی نادا ئەگەر رێگر بن لەبەردەم سەرکەوتندا.

ماکیافیللی وای دەبینی کە ئەو کتابەی لەسەر میرێکی نیشتمانپەروەرە نەجاتدەری ئیتاڵیایە، لەو دابەشی و داگیرکارییەی کە تێی کەوتووە. لەم کتێبە ئامۆژگاری و پەند و حیکمەتی سیاسیی پێشکەش کردوە، چاوی بڕیبوە ئەو گوتەی کە دەڵێ ( ئامانج پاساوی رەفتارە ) تەنانەت ئەگەر رەفتارو شێواز لەگەڵ بیروبڕواش ناکۆک بوون ، ئەمە مانای ئەوە نیە کە ئەم بیردۆزە لە هەموو دۆخێکدا دەبێ جێبەجێ بکرێ، ئەوەتا هەر لەم کتابە هەندێک ئامۆژگاری و رێنما دەبینین کە داوا دەکا دەستبەرداری بیروبڕوای رەوشتی نەبین ئەگەر ئەم بیروبڕوایانە تەگەرە نەبن لەبەردەم ئامانجەکانی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوی.

و: خالید هەرکی

بەم دەربڕینەی لە ڕواڵەتی نزیک دەبێتەوە. بەم شێوە ئەو دەوڵەتەی بە پێێ ( میر ) دادەمەزرێ یەکگرتنەوەی پارچەکان و وەلاتانی بەربەستەکانە بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی نەتەوی و ڕزگار کردنی ئیتاڵیا لەو پارچەبیەی تێی کەوتوە کە هەمووی لە بەرژەوەندی وڵاتە، مکیاڤیللی کتابەکەی بەو ئامۆژگاریانە کۆتایی پێدێنێ کە دەبێ مرۆڤ لە یەککاتدا هەم مرۆڤ بێ هەم دکتاتۆر و ستەمکار، ئەگەر وانەبێ بوونی نامێنێ، لەسەر ئەو بنەمایە دەبێ کەسێکی چەواشەکار بێ ئەگەر پێویستکرا، نابێ پابەندی پەیمان و گفتەکان بێ کە بەخۆی داوە. نابێ ئەوەندە ئازادی بە خەڵک بدا کە پێویست ناکا، چونکە گەلێک جار بە خەراپی بەکاری دەهێنن و پێگەیان بۆ سوودی نەرێنی بەکار دێنن، هەر لە میر داوا دەکا شێوازی حوکمڕانیی توند و ووشک بێ، بۆ ئەوەی لێێ بترسن و خۆیان لە کارە توندەکانی بپارێزن، لە هەمان کات هەوڵدە بە کاری چاک و پرۆژەی بەسوود دلخۆشیان کە کە سوودیان پێ بگاو داهاتیان پێ زیادبێ، بەم شێوە هەم ترسیان لێت دەبێ و هەم خۆشیان دەوێی، بەڵام سووربە لەسەر ئەوەی لە ژێر سایەی حوکمڕانیتدا لە ئازادی بێبەش نەبن تا لە ڕق و پیلانەکانیان دڵنیا بیت.

دواجار دەگەڕێتەوە سەر ئەو بۆچوونەی کە هەمیشە بانگخوازیی بۆ دەکا و بڕوای پێی هەیە، دەڵێ: ( ئەو دەوڵەتەی سوپای نیە دەوڵەتێکی ئاسودە و بێ مەترسیی ناوەخۆو دەرەکی نییە ) . بۆیە دەبێ میر سوپایەکی نیشتمانیی مەترسیدار درووستکا و دەبێ وەزیر و دەسەڵاتدارەکانی لە پیاوە زانا و بە تواناکان پێکبێنێ، دەرگاکانیش بۆ خاوەن بەهرە و تواناکان بخاتە سەرپشت تا ببێتە حکومەتێکی کۆماریی نموونەیی، هاوڵاتیانی لێی بترسن و لێی کۆببنەوە.

بۆچوونەکانی ماکیاڤیللی لە گەلێک وڵاتی ئەورووپی بڵاو بوونەوە کە پادشاکانیان پیادەی بیروبڕواکانیان دەکرد، لەوانە فرەنسا لە سەردەمی پادشای دایک ( کاترین دی میدیشی ) و لویسی چواردەهەم لە پرووسیاش لە سەردەمی فریدریکی مەزن و لە گەلێک وڵاتی دیکەی ئەورووپی بیردۆزی ماکیافیللی پێڕەو دەکرا، بەتایبەت لە سەدەی شانزەهەم و حەڤدەهەم.

# بەشی سێیەم

## بەرفراوان بوونی ئەوروپی

## و

## چالاکیی دۆزینەوە جوگرافییەکان

لە چەرخی کۆنەوە بزووتنەوەی بەرفراوانی داگیرکاری دەستی پێکردووە، لەوکاتەی ئەسکەندەری مەزن یۆنانەکانی بەرەو جەنگێکی بەرفراوان پەلکێش دەکرد کە تا سنووری چین رۆیشتن، لەوکاتەوە ئەوروپا ئەم ئۆپەراسیۆنانەی دەست پێکردوە، دوای ئەوە رۆمانییەکانیش لەسەر هەمان رێچکە بەردەوام دەبن بەم شێوە ئیمپراتۆریەتیان دامەزارند، سنووری ئەم ئیمپراتۆریەتە گەیشتە باکووری بەریتانیا و رۆژئاوای ئەوروپا و گۆمی دەریای سپیی ناوەڕاست و رۆژئاوای ئاسیا تا دەریای سووری گرتەوە، دوای ئەوە بزووتنەوە داگیرکاریەکان دێت کە ئەوروپاشی گرتەوە و خەراپترین ئەنجام ولێدەرکەوتەی هەبوو، بەوهۆیەوە سیستەم و رژێمی حوکمڕانی و ژیانی ئەوروپی گۆڕانی تێکەوت.

لە سەدەی پانزەهەم چەندین پارچەی دنیا لە ئەوروپییەکان نادیار بوون و هیچیان دەربارەی نەدەزانی، تەنانەت لەسەر هەندێک کیشوەر هیچ زانیارییەکیان نەبووە، لەسەر ناوەڕاست و رۆژهەلاتی ئاسیا زانیاریەکانیان نادیار و شاش بوون، تەنها ئەو کەمە زانیارییە نەبێ کە لە رێگەی گەڕۆکەکانەوە پێیان دەگەیشتن، لە نموونەی مارکو بۆلۆ. لەسەر ئەفریکاش تەنها هەندێک زانیارییان لەسەر کەنارەکانی باکوورو رۆژهەڵات هەبوو، هەرچەندە ئەوکا ت زانایانی یۆنانی ئەوەیان راگەیاندبوو کە زەوی خڕە بەڵام ئەوەی باو بوو، دونیا تەختاییە زۆریش لەوە بچووکترە کە مەزندە دەکرێ یا کە هەیە، پێیان وابوو پانتایی ئاسیا زۆر بچووکترە لەوەی کە هەیە ئەمە زانیارییەکانی ئەوسایان بوون.

هۆکاری ئابوری یەکەمین پاڵپێوەنەری هەولەکانی دۆزینەوە و گەڕان بەدوای کانزاو سەرچاوەکانی ئابووریدا بووە، بۆیە هەوڵی دۆزینەوە و دروستکردنی ڕێگاویان بۆ گەیشتن بەو سەرچاوانە دراوە و دەستیان بەسەردا گرتووە، ئەوان باجی زۆریان بە دەسەڵاتدارانی میسری و سووری دەدا. جگە لە دەستگرتن بەسەر کۆماری ڤینیسیا و گواستنەوەی کاڵاکان لە بەندەرەکانی میسر و سووریاوە بۆ ئەورپا، بەم شێوە ئەوروپییەکان هەوڵەکانیان بۆ چارەسەری دوو کێشە بوو:

یەکەمیان/ ڕێگە گرتن لە دەستگرتنی ڤینیسییەکان بەسەر بازار و گەیشتنیان بە بازاڕی ڕۆژهەلات.

دووەمیان/ بۆ هێرش بردنە سەر گوندە ئیسلامی و عەرەبیەکان بوو، بۆیە پێیان وابوو دۆزینەوەی ڕێگایەکی دەریایی کە بە میسر و وڵاتانی عوسمانیدا نەڕوات یا لە ژێر دەسەڵاتی ڤینیسیەکانا نەبێ تا زۆرترین بەرهەم وەدەست بێنن و ئەو وڵاتانەش بێبەشکەن باشترین ڕێگایە بۆ سوود وەرگرتن لە بازرگانی.

بێگومان هۆکاری ئاینیش هۆکارێکی بەهێزی ئەو گەڕیدانە بووە کە بەم شێوە چالاکییەکانیان بۆ دۆزینەوە ئەنجام دەدا بەتایبەت ئیسپانییەکان، ئەوان بەدوای وڵاتێکدا دەگەڕان بیکەنە مەیدانی خۆیان بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی کریستی کاسۆلیکی و بەو بیانۆیە بتوانن چنگیان لەم شوێنانە قایم کەن، ئەمەو دیارە هۆکاێکی دیکەی تۆڵە سەندنەوەشیان هەبووە لە موسڵمانەکان، نموونەشمان ئەوەیە گەڕیدەکەی ڤینیسی کە ئیسپانییەکان ڕایانسپاردبوو بۆ دزینەوە ( کریستۆفەر کۆلۆمبس ) کە داوایان لێکردبوو بەرەو ڕۆژئاوا هەنگاو بنێ تا دەگاتە هیند و بازاڕەکانی ڕۆژهەلات، ئەو هەڕەشەی ئەوەی دەکرد ئەگەر سامانی ڕۆژهەلاتی بکەوێتە دەست لە پێناو ڕزگار کردنی ( بیت المقدس ) ی خەرج دەکا تا لە دەست موسڵمانەکانی دەربێنێ. هەروەها شازادەی پۆرتوگالی ( هنریی کەشتییەوان ) ئەویوو جەنگێکی خولڤاند لە جەنگی خاچپەرستەکان دەچوو کە دژی موسڵمانەکان هەڵگیرسابوو لە ١٤١٥ لە باکووری ئەفریکا، بەتەمای دەستبەسەرداگرتنی کەنارەکانی ڕۆژئاوای ئەفریکا بوو، ئەم بیرۆکەشی بۆ دوو مەرام بوو:

یەکەمیان/

گەیشتن بە بازاڕەکانی هیند و ڕۆژهەڵات .

دووەمیان/

و: خالید هەرکی

گەیشــتن بە وڵاتــی پادشانشــینی یوحەنــای پیــرۆز لە رۆژهەڵاتــی ئەفریکــا. کە پادشانشینێکی کریستییە لە ئەفریکا، ئەوروپییەکـان هەرجـار گوێیـان لەم نـاوە دەبـوو و ئەم ناوەیان بۆ یەکتری دەگواستەوە. ئومێدیان وابـوو هاوپەیمانیـان لەگەڵـدا ببەسـتن بـۆ ئەوەی دەسـتیان بە نـاوجەرگەی ئەفریکـا بگـاو دژی دەوڵەتـی ئیسـلامی راپەڕن کە بازرگانییـان قۆرخکردوە.

## دۆزینەوەکانی پۆرتوگالی:

دەولەتی پۆرتوگال یەکەمین دەوڵەتی دەریایی بووە کە ژمارەیەک سەرەڕۆیی ئەنجام داوە بۆ دۆزینەوەی چەند پێگەیەکی گرنـگ و وڵاتـی نـوێ. ئەوەی یاریـدەدەری ئەم کـارانەی بـوو دەستەبەربوونی کەشتیی باش و کەسـانی پسـپۆڕ و شـارەزاو ئـامرازی دەریـاوانی و بەهـرەی پێشکەوتوو لەم بوارە بـوون، کە بەهـۆیەوە شـارەزاییان لە شـەپۆلەکانی دەریـا و ئاراسـتە و قووڵایی و چەندین زانیاری دیکە پەیدا دەکـرد، وەکـو شـارەزا بـوون لە ئەسـتێرەکان و بـڕوا بوون بە خڕی زەوی و گرنگیدان بە زانستی جوگرافیا.

## شازادە هنریی کەشتییەوان ( ١٣٩٤- ١٤٦٠)

بـزووتنەوەی دۆزیـنەوە و بەرفـراوان بـوونی پۆرتوگـال بە ژیـانی شـازادە هنریـی کەشتییەوانەوە بەستراوەتەوە، ناوبراو کـڕی سـێیەمی پادشـای پۆرتوگـال بـوو ( یوحەنـای یەکەم ) هنری کەسێکی ئاینپەروەر و توند بوو، هەر لە منـداڵییەوە بـایەخی بە جوگرافیـا و زانستی گەردوون دەدا، نەخشە جوگرافیاکـانی کـۆدەکردنەوە و بە وردی دیراسـەی دەکـردن، جگە لەمە وانەی لەسـەر رێگاکـانی ئاسـمانی و دەریـایی و جـوولەی بـاو کاریگەریـان لەسـەر کەشـتییەوانی دەخوێنـد، ئەمەش نیشـانەی ئەوەیە بـایەخی بەو بابەتـانە دەدا کە بـۆ کـاری دەریـاوانی سـوودیان دەبـێ و بەو هـۆیەوە دەتـوانێ بخـزێتە قـووڵایی ئەو شـوێنانەی مەبەستیەتی.

دژی وڵاتی مەڕاکش چەنـدین سـەرەڕۆیی جەنگـی لە بـاکووری ئەفریکا ئەنجامـدا، بە بیانووی لەناو بردنی رێگرەکان لە باکووری ئەفریکا، کاتێکیش دەست بەسەر شاری ( سبتە )ی مەڕاکشی دادەگرێ و داگیری دەکا کە دەکەوێتە کەناری باکووری ئەفریکـا، بـاوکی بە حاکمی ئەو شارەی دادەمەزرێنێ، دوای ئەوە هەوڵ دەدا بەرەو ( تەنـجە ) هێـرش بکـا و

داگیری بکا بەڵام شەرکەرە مەراکشییەکان شکست بە هەوڵەکەی دێنن و سەرناکەوێ. دواتر ئاارستەی داگیرکارییەکانی بەرەو کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست دەگۆڕێ بۆ هەمان مەبەست ، دوای ئەوە توانی لە کەنارەکانی ڕۆژئاوای ئەفریکا ڕووباری سەنیگال تا گانا بخاتە ژێر دەستی خۆی، وەکو جێبەجێکردنی بڕواکانی لەو ناوچانەی داگیری کردن ئاینی کریستیی تیادا بڵاو دەکاتەوە، چونکە ئەم داگیرکارییەی پۆرتوگال پێویستیی بە دارایی هەبوو بۆیە باجێکی زۆر دەخاتە سەر ئەو ناوچانە بۆئەوەی لە بەرنامەیدا سەرکەوێ. لەم ڕوانگەیەوە توانی کۆیلەکان یەکخاو بازرگانی کڕین و فرۆشتنیان پێوە بکا، لەم ڕێگەیەوە داهاتێکی باشی لێ وەدەست هات کە بتوانێ ئیمپراتۆریەتێکی پۆرتوگالی دامەزرێنێ و مەبەستەکەشی بڵاو کردنەوەی ئاینی کریستی بوو تا بە ئەنجامی بگەیەنێ، مێژوو نووسەکان دەڵێن هنری مەبەستی بوو هاوپەیمانێتی و دۆستایەتیەکی بەهێزی ئاینی لەگەڵ یۆحەنای حاکمی حەبەشەی کریستی دروست بکا، ئەم کەسە خاوەنی دیرۆکێکی داستانی بوو بە گوتەی ئەوروپیەکان کە لێیان دەگێڕایەوە، وڵاتەکەی ببووە قەڵایەکی پۆلایین لە نێو جەرگەی ئەفریکییەکان بۆ کریستیانی ئەو کشوەرە، ئامانجی هنری ئەوەبوو لە پێناو سەرکەوتنی لەو سەرەڕۆییانەیدا پەنا بۆ یوحەننا ببا، پێیان وابوو ئەگەر پۆرتوگالییەکان لەم پەیوەندی بەستندا سەرکەون دەتوانن لە ڕێگەی پەڕینەوە لە سەنیگالەوە دەستیان پێێ بگاو دواتر لەوێشەوە بگەنە دەریای سوورو بەرەو بەندەرەکانی وڵاتانی عەرەبی هەنگاو بنێن دواتر بۆ هیندو لەوێشەوە بۆ چین. بەم شێوە بە ئەمانجەکانیان دەگەن بە گەیشتن بە ڕۆژهەڵاتی دوور بە کورتترین ڕێگا، ئیتر ڕێگا دوورەکەیان بۆ کورت دەکرێتەوە.

هەرچۆنێکی بێ هنری توانیی لایەنێکی زۆری مەرامەکانی بەجێ بگەیەنێ وسەرکەوتنی لێ وەدەست بێنی کە پانتاییەکی زۆری خستە ژێر دەسەڵات لە زەریای ئەتڵەسی و چەندین دوورگەش لەوناوە بدۆزێتەوە، لەوانە دوورگەکانی ( مادبیرا، ئازۆڤ Azov و کەناری Cannary ).

ئامانجێکی دیکەشی هاتە دی ئەویش هامشۆی بەردەوامی کەناری ڕۆژئاوای ئەفریکا بوو کە بەهۆی هەوڵەکانی ئەوەوە پۆرتوگالییەکان لە ١٤٤١ دەتوانن پەیوەندیی ڕاستەقینە لەگەڵ ئەفریکادا بکەن و دەست بەسەر خاکە بە پیتەکانیدا بگرن، بەم هامشۆیە بەردەوامیان دەبێ و نەخشەی کەنارەکانی ئەفریکی دەکێشن و مەرامەکانی لێ بەجێ دەگەیەنن .

ساڵی ١٤٦٠ کە ئەوساڵە دەبێ شازادە هنریی کەشتییەوان کۆچی دوایی دەکا پۆرتوگالییەکان دوورگەکانی کەنداوی ( سەری سەوز )یان دۆزییەوە و نەخشەی کەنارەکانی سەنیگال وگینیایان کێشا، بەم شێوە شازادە هنری بەر لەوەی بمرێ توانیی هامشۆی سێیەکی کەناری رۆژئاوای ئەفریکا مسۆگەر کا. لەو شوێنانەش بنکەی پۆلایین و سەربازگەیان لێ دامەزارند بۆ بەرگری لێکردن و پاراستنی بەرژەوەندیە بازرگانییەکانیان.

بەر لەوەی هنری رێگای ( راس الرجاء الصالح ) بدۆزێتەوە کۆچی دوایی دەکا و پۆرتوگالییەکانیش لە رێگەی دەریاوە بە هیند دەگەن.

پادشا جونی دووەم ( یوحەنای دووەم ) درێژەی بە کارەکانی شازادە هنری دا. لە ١٤٦٢ نێردەیەکی دەریاوانیی ناردە کەنارەکانی لیبیرەیا، دواتر پۆرتوگالیەکان دەگەنە کەنارەکانی (ساحل الحاج) و (ساحل الذهب) و نیجیریا و کامیرۆن تا دەگەنە سەر روباری کۆنگۆ. بەم شێوە دەستیان بەسەر دەریاوانیی کەناری رۆژئاوای ئەفریکادا گرت بەبێ پسولە و رێگەپێدانی ئەوان کەس بۆی نەبوو دەریاوانیی لێ بکا.

ئەوەی یارمەتی پۆرتوگالیەکانی دا لەم دۆزینەوە و کەشتیەوانیەدا زانیاریی عەرەبەکان بوو کە بە چەندین ساڵ پێش ئەوروپیەکان کەوتبوون، لەم ناوە دەخولانەوە لە زەریای هیند و ئاوەکانی مەلایۆ و دەریای چین زانیاریان لەسەر گەڕان و دۆزینەوە پەیدا دەکرد، ئەمەو سەرەڕای ئەزمونی دەریاوانیان لە دەریای سوور و کەنارەکانی ئەفریکا و ئەوروپا، بۆیە پۆرتوگالیەکان بەر لەوەی دەست بەم گەشت و گەڕانە بکەن عەودالی زانیاری و نەخشەی ناوچەکە بوون کە بەم بەدوادا گەڕانە بەدەستیان دەهێنا و تێر زانیاری دەبوون، لەم دەریا و کەنارانە شارەزاییان پەیدا دەکرد تا ئەوکاتەی لە کارەکانیان سەرکەوتن بەدەست دێنن.

بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان ئیسپانیا و پۆرتوگال لە ساڵ ەکانی ١٤٧٥-١٤٧٩ و رواداوە ناوەخۆییەکانی، هەولەکانی پۆرتوگال بۆ دۆزینەوە و گەڕان بە فیرۆدەچن و بۆ ماوەی چەند ساڵێک دەوەستێ. ئەم وەستانە تا ساڵی ١٤٧٨ بەردەوام دەبێ کە پادشا یوحەنای دووەم نێردەیەک بە سەرۆکایەتی کەشتیەوانی مەزن ( برتۆلۆمیۆ دیاز ) دەنێرێت ئیتر کارەکان دووبارە بەردەوام دەبنەوە.

## برتۆلۆمیۆ دیاز Bartholomeo Diaz :

ئامانجی گەڕانی برتۆلۆمیۆ دیاز گەڕان بەدەوری کەنارەکانی دیکەی ئەفریکی بوو بە مەبەستی گەیشتنە هیند لە ڕێگەی دەریاوە لە جیات ڕێگا کۆنەکە واتە لە ڕێگای دەریای ناوەڕاستەوە بە ڕۆژهەلاتی ولاتانی عەرەبیەوە، دیارە لەم هەوڵەی سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە توانیی لە کەشوهەوایەکی تەم ومژاویدا بەرەو باشوور ڕێگا بگرێتەبەر بۆ کەنداوی ئەلگوا Algoa، بۆیە ناوینا کەنداوی گەردەلولە. بەم شێوە لە ١٤٨٨ دەگەڕێتەوە پۆرتوگال و مژدەی ئەو سەرکەوتنەیان پێدەدا کە ڕێگا بەرەو هیند والآیە، پادشاش ناوی ئەو کەنداوە دەگۆڕێ بۆ کەنداوی ( الرجاء الاالح ) ( تکای چاک ) چونکە تکای نارد تا ڕێگایەکی چاک لە دەریاوە ڕاستەوخۆ بۆ هیند بدۆزێتەوە، بڕوای وابووە تکا و نزای قەبوڵ بووە بۆیە بەم ناوەی ناونا.

لەو کاتەی پۆرتوگال لەم گەڕانانەیدا سەرکەوتن بەدەست دێنێ ئیسپانیاش هەوڵ دەدا لە ڕێگەی ڕۆژئاواوە بە هیند بگا، لە ١٤٩٢ ئیسپانیا ئەم ئەرکە بە گەڕیدەی جنوی ( کرستوف کولمبس ) دەسپێرێ و لە داهاتوو دەبینین چی ڕوودەدا.

هەرکە شەڕ لە نێوان ئیسپانیا و پۆرتوگال ڕوودەدا هەریەکە و هەوڵ دەدا مافەکانیان لە دۆزینەوەکان و شوێنە دەست بەسەرداگیراوەکان و ڕێگاکانی کەشتیەوانیان بپارێزن. کاتێکیش ململانێکە توند دەبێ ڕوو لە پاپا دەکەن بۆ ناوبژیوانی، پاپاش سەیری کێشەکەیانی کرد بڕیاریدا هەردووکیان ئەو شوێنانەی دەستیان بەسەردا گرتوە یا بە کارایی دۆزیویانەتەوە یا لە داهاتوو لە ڕووی ڕۆژئاواوە دەیدۆزنەوە لە نێوان خۆیاندا دابەشیکەن.

ئەم ناوبژیوانییە دواتر دەبێتە بنەمای ئەو ڕێککەوتنەی لە نێوانیان لە ١٤٩٤ ئەنجام دەدرێ، بە ناوی هاوپەیمانی تۆردسیلاس (Tordessillas ) تیایدا هاتووە پۆرتوگال دەست بەسەر ئەو شوێنانەدا دەگرێ کە لە ڕۆژهەلاتن، هەربە گوترە هێلێکیان بە درێژایی زەریای ئەتلەسدا کێشا بە دووری ٣٧٠ میل لە ڕۆژئاوای دورگەی ( ڕاءس الرجاء )، بۆ ئیسپانیەکان هەرچی دەکەوێتە ڕۆژئاوا بۆ ئەوان دەبێ، بەم شێوە بەڕازیل بەر پۆرتوگالیەکان دەکەوێ.

و: خالید هەرکی

## دوای دۆزینەوەی ڕێگای تکای چاک ( الرجاء الصالح ) ( ڤاسکۆ دا گاما :(Vasco da Gama

پۆرتوگالییەکان لە سەرەڕۆییەکانیان بەردەوام دەبن، لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان و دەست گرتن بەسەر کانزاکان درێژە بە دۆزینەوەی شوێنەکان دەدەن، شەڕ لە گەڵ عەرەبەکان دەکەن تا لە بووژانەوەیان بێبەش کەن. دوای ئەوە دەست بە گەشتێکی دیکە دەکرێ لە هەرێمی ئەفریکای باشوور بەسەرۆکایەتی ( ڤاسکۆ دا گاما ) ، بۆ تەواو کردن و زیاد کردنی داگیرکاریەکانیان و درێژەدان بە گەشتەکەیان بەرەو هیند، گەریدەکە لەم هەولەیدا سەرکەوتوو دەبێ، بە دەوری ئەفریکای باشووردا دەخولێتەوە و دەگاتە کەنارەکانی مۆزەمبیق. لەوێ چاوی دەکەوێ بە هەندێک کەشتیەوانانی عەرەب، لەوانە یەکێکیان بەناوی ( احمد بن ماجد ) دەبێ زانیاریی لەسەر ئەو ناوچە و نهێنیەکانی کەشتییەوانی لێ وەردەگرێ. بن ماجد هاوکاری کردوە تا بگاتە کەنارەکانی رۆژئاوای هیند. لەوێ پەیوەندی بە میرە هیندییەکانەوە دەکا و لەگەڵیان دەکەوێتە رێککەوتن، لە ساڵی ١٤٩٩ دەگەرێتەوە پۆرتوگال بە کۆشێک بەهارات و بەرهەمی رۆژهەڵاتییەوە بەم جۆرە پۆرتوگالیەکان رێگا نوێکەی هیندیان دۆزیەوە.

ئەم دۆزینەوە گورزێکی کوشندە بوو بە وڵاتانی عەرەبی و میسر بەتایبەتی دەکەوێ چونکە بەم هۆیەوە سەنتەری بازرگانی لە دەریای سپیی ناوەڕاستەوە گواسترایەوە بۆ زەریای ئەتڵەسی. دیارە کاریگەری ئەم گواستنەوە بەزۆری لەسەر ئەو دەولەتانە دەبێ کە دەکەونە سەر کەنارەکانی دەریای سپیی ناوەڕاست وەکو بوندقییە ( ڤینیسیا )و میسر.

ئەوکات میسری پادشانشین لە سەرەتای سەدەی شانزەهەم گەیشتبووە لوتکەی پێشکەوتن و دەوڵەمەندی، گەنجینەکانی ململانێی گەنجینەی وڵاتی ئیتاڵیا و ڤینیسیا دەکرد لەروی دەولەمەندیەوە، چونکە بازرگانە کانی ڤینیسیا و جنوە لە گواستنەوەی بازرگانیاندا بۆ رژهەڵاتی ئەوروپا دەبوایە لە رێگەی میسرەوە بوایە جا چی بە رێگای ئەسکەندەریە یا بەرێگای کەناڵی سوێس و دەریای سورەوە، لە وێشەوە بەرێگەی کاروانەوە دەگەیەندرایە قاهیرە دواتر بۆ کەشتییەکان لە لقی رووباری رەشید لە نزیک رەحمانیەی سەر رووباری نیل، کاتێکیش دەگەیشتنە ئەسکەندەریە بە کەشتی بەرەو بەندەرەکانی ئیتاڵیا بەرێ دەکران

بەم شێوە ئەو سەردەمە کۆتایی پێدێ کە بۆعەرەبەکان هات بوو، ئەو رۆژگارانەی عەرەبەکان میانگیرییان لە نێوان کەشتیەوانە بازرگانیەکانی هیند و چین لەلایەک، ئەوروپاش لەلایەکدا دەکرد کۆتاییان پێدێ. تا کۆتایی سەدەی پانزەهەمیش کەشتییەکانی عەرەبی لە زەریای هیندی دەخولانەوە و لە بەندەرەکان دەبینران، بەم شێوە پۆرتوگالیەکان کۆتایی بە رۆلی عەرەب دێنن پاش ئەوەی دەست بەسەر بەندەرە گرنگەکاندا دەگرن و دەیپارێزن و رێگای هاتووچۆی نێوان هیندو چین و ئەوروپا دەدۆزنەوە کە بەو شوێنانەدا نەڕوا کە لەژێر دەستی عەرەبدان، ئەو بنکە بازرگانیانەی لە هیند دەستیان بەسەردا گرتبوون بنکەی سەربازییان لێی دانان تا میرە موسوڵمانەکانی هیند بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و ناچاریان کەن ئەوهاوپەیمانێتیە مۆرکەن کە پابەندی ئەوەیان بکا تەنها بازرگانی لەگەڵ پۆرتوگالدا بکەن. بەم هۆیەوە میرە موسڵمانە هیندیەکان هاوار بۆ عەرەبەکان دەبەن تا کۆمەکیان کەن لە دەست پۆرتوگالییەکان زرگاریان بێ ، پادشا میسریەکان بە پیر بانگەوازەکانیاندا دەچن و کەشتیگەلێک رێک دەخەن بۆ بەرەنگار بوونەوەی پۆرتوگالییەکان و هاوکاریکردنی میرە موسڵمانە هیندیەکان، بەڵام لە شەڕێکی سەخت کە بە ناوی ( دیو ) ناونرابوو لە ١٥٠٩ سوپای میسری لەبەرنابەر کەشتیەکانی پۆرتوگالی شکست دێنێ.

و: خالید هەرکی

## ئەلبوکیرک و ئیمپراتۆری:



پۆرتوگالییەکان بەردەوام بوون لە بەهێزکردنی کەشتییەکانیان و پڕچەککردنیان لە دەریاکانی رۆژهەلات و جێبەجێکردنی سیاسەتی فراوانخوازییان. بۆ ئەم مەبەستە یەکێک لە فەرماندەکانیان بە ناوی ( ئەلفۆنسۆ دی ئەلبوکیرک ) Afonso de Albuquerque یان راسپارد کە بەم ئەرکە هەڵسێ، ناوبراو بە کەسێکی دژ بە موسڵمان و درێژە پێدەری سیاسەتی فراوانخوازی ناسرابوو، ئەلبوکیرک تەنگئاوی هورمزی لەسەر کەنداوی عەرەب لە ١٥٠٩ داگیرکرد، هەروەها ( سقوترە ) لەسەر دەریای سووریش و جوە ( Goa ) ی داگیرکرد، یەکەم ویستگەی هەمیشەیی پۆرتوگالیی لێ دامەزراند. دوای ئەوە لە ١٥١١ دەستی بەسەر ( مەلقا )ی نزیک بە سەنگافورا داگرت ، بەم شێوە ئەلبوکیرک بوە یەکەمین حاکمی پۆرتوگالی لەسەر کەنارەکانی هیندی کە داگیری کردبوون.

کاتێک لە ساڵی ١٥١٦ەوە حوکمی وڵاتانی عەرەبی دەکەوێتە دەست سوڵتانەکانی عوسمانی ئیتر ئەرکی بەرگری کردنی ناوچە عەرەبیەکان و خەباتی دژی پۆرتوگالییەکان دەبێتە ئەرکی عوسمانیەکان. بەڵام لەم ئەرکەی شکستی هێنا نەیتوانی بەربەستێک بۆ فراوانخوازیی پۆرتوگالی دابنێ و داگیرکاریەکانی راگرێ کە بەرەو رۆژهەڵات بە مەبەستی بەرفراوان بون پێشرەویان دەکرد، ملایۆیان داگیرکرد، رێگایان بۆ بووەوە تا بەرەو جاوە و سیام هەنگاو بنێن، بەم شێوە چالاکییەکانیان بەردەوام دەبن تا دەگەنە کەنارەکانی چین.

پۆرتوگالییەکان بەم بەرفراوانیەیان توانیان ئیمپڕاتۆریەتێک دامەزرێنن ، بەرایبەکەی بگاتە ئەفریکا و ئاسیا.

## داگیرکاری بەرازیل:

کەشتیەوانی بەڕازیلی کەپرال Pedro alvaroes Capral لە ١٥٠٠ بەرەو هیند بەرێ دەکەوێ، بەڵام رەشەبا ئاراستەی بەرەو رۆژئاوا دەگۆرێ تا لە کەنارەکانی بەڕازیل خۆی دەبینێتەوە.



بەهۆی ئەو هەوڵانەی پۆرتوگالییەکان بۆ رۆژهەڵات دەیاندا، چاوپۆشیان لە بەڕازیل کرد یا بۆ ماوەیەکی دوور پشت گوێیان خست، بەڵام کاتێک پۆرتوگالییەکان بینیان ئامانجەکانیان لە رۆژهەڵات نایەتە دی و ئیسپانیاش لە پیادەکردنی سیاسەتی داگیرکاریی بەردەوامە، بە سود وەرگرتن لەو دەستکەوتانەی لە ئەمریکا وەدەستی هێناوە لە کانزاکانی زێرو زیو، بەو هۆیەوە روویان وەرگێرایەوە بەڕازیل.

له ١٥٢٥ دەستیان كرد به خزانەناو بەڕازیل و ڕێخكستنی سیستەمی پارچەكردن له بەرژەوەندی سوودەكانیان. خاكی بەڕازیلیان كرده چەند پارچەیەک كه هەر پارچەی ڕوویكی بكەوێته سەر دەریا، له سەردەریاوه بەرەو ناوەوه بۆی بچن و پەیوەندی به دانیشتوانەكەیەوه بكەن و دەستیان بەسەردا بگرن، بەم شێوه پۆرتوگالییەكان توانیان بەڕازیل داگیركەن. لەم داگیركارییه سیاسەتێكی ئابووریی تایبەتیان و زمانی خۆیانیان بەسەردا سەپاند، هەروەها ئاینی كریستیی كاسۆلیكیشیان لێ بلاو كردەوه. خاوەن زەویه پۆرتوگالییەكان دانیشتوانه ڕەسەنەكانیان به كارپێكردن له كێڵگەكاندا ماندوو دەكردن، بایەخیان به چاندنی چەوەندەر دەدا، چۆنكه ئەم كاره كرێكاری زۆر پێویست بوو له توانای دانیشتوانەكەدا نەبوو، بۆیه ناچار دەبن كۆیلەیان بۆ له ڕۆژئاوای ئەفریكا دێنن هەروەكو ئیسپانیەكان له كۆلۆنیالیەكانی ئەمریكا ئەم بەرنامەیان پیاده دەكرد.

ئیتر ئەو بزووتنەوه دەستی پێكرد له گواستنەوەی كۆیله كانی ئەفریكی بۆ ئەمریكا و بەڕازیل، بۆ كاری بازوو و چەوساندنەوه، بەڵام بەم شێوه بەرهەمەكان زیاد دەبن و شارەكان ئاوەدان دەبنەوه. هەركه سەدەی شانزەهەم دەست پێدەكا دانیشتوانی بەڕازیل دەبێته ٢٥٠٠٠ كەسی سپی پێست و تێكەله و١٨٠٠ نیشتمانپەروەر كه خوێندەواریان له نێودا بلاو بۆوه، لەگەڵ ١٤٠٠٠ كۆیله و سوخرەچیی بواری كشتوكاڵ و كرێكاری.

## سیستەمی پۆرتوگالی داگیركار:

سیاسەتی فراوانخوازی پۆرتوگالی به گوێرەی گۆڕانی ئامانج و ئاڕاستەكانی دەگۆڕدرێ، فراوانخوازی پۆرتوگال له دوو بوار قەتیسكرابوو:

١/ دونیای نوێ ، كه بەڕازیل تیایدا له پشكی پۆرتوگال دەبێ ، سیاسەتەكانی پۆرتوگال بریتی بوو له هاندانی پۆرتوگالیەكان له جێنیشبون و دەست بەسەرداگرتن و پشتگیری كردنی داگیركەر تا وای لێهات پۆرتوگالییه داگیركەرەكان هەستیان دەكرد له وڵاتی خۆیانن و خاوەنی بەرژەوەندیی تایبەتین لەو وڵاته، بۆیه پۆرتوگال دەتوانێ درێژه به داگیركاری بەرازیل بدا تەنانەت ئەوكاتەی بەرازیل مەرجەكانی ئازادی و سەربەخۆییش تەواو دەكا له سەدەی نۆزدەهەم هەربه داگیركراوی دەمێنێتەوه، ئیتر ئەوكات هۆڵەندا بیر لەوه دەكاتەوه دەست بخاته نێو بەڕازیل و تێی بخزێت.

ب/ بواری دووەم، ئاڕاستەکانی فراوانخوازی پۆرتوگالی مەیدانی رۆژهەڵات لە ئەفریکا و ئاسیا بوو، ئەوەتا پۆرتوگالیەکان ناوەند و وێستگە بازرگانییە گرنگەکانیان داگیرکردن و بنکەی سەربازیان لێ داکوتا تا بتوانن بەرەو رۆژهەلات بازرگانی بکەن، داگیرکاری پۆرتوگال لە رۆژهەڵات نە بۆ خاکەکەی بوو نە بۆ هاوڵاتیانی بوو نەبۆ باج لێوەرگرتن بوو، بەڵکو بۆ مسۆگەر کردنی بازرگانیی بوو تا قازانجێکی زۆری لێ وەدەست کەوێ، بۆیە دەبینین داگیرکاریی پۆرتوگال لە رۆژهەڵات لەسەر بنەمای داگیرکاریی لاسایکەرەوە نەبوو کە بەناوی ئاوەدانکردنەوە دەست بگرێ بەسەر وڵاتەکاندا، بەڵکو بۆ مسۆگەر کردنی رێگاو بانی بازرگانی و وەدەستهێنانی سەرچاوە و کانزای خاو بوو. بۆیە نەیتوانی لە بەرانبەر داگیرکاری ئەوروپا بەرگە بگرێ و خۆی نەدا بەدەستەوە بەو ئەگەرەوە داگیرکاری ئەوروپی شوێن داگیرکاری پۆرتوگال دەگرێتەوە.

داگیرکاری پۆرتوگالی بەر لە هەموو شتێک رووی لە بازرگانی و قازانج دەکرد، بێ ئەوەی باکی بە گۆڕینی سیستەمی حوکم یا سیاسی هەبێ. دواتر ئیمپراتۆریەتی رۆژهەڵاتی یەکگرتوو بەسەر یەکەوە نەبوو بریتی بوو لە کەنارە جیاجیاکانی ئەفریکا و ئاسیا و چەند دوورگەیەکی لەیەک دوور لە نێو دەریاکانی رۆژهەڵات.

ئەگەر پۆرتوگال توانیبێتی بۆ ماوەی سەدەیەک و نیو دەست بەسەر ریگا نوێکەی بازرگانیدا بگرێ بۆ هیند و چین، بەڵام نەیتوانیوە جێپێکانی لەو ناوچانە جێگیر و توند کا، هەر چەندە ئەو هەرێمانە لە ژێر کۆنترۆڵی پۆرتوگالدا بوونە بەڵام کەشتییە عەرەبیەکان دەرفەتیان وەردەگرت لە چەند بەندەرێک بارەکانیان دادەگرت بێ ئەوەی پۆرتوگالییەکان پێیان بزانن و خۆیان دەگەیاندە دەریای سوور و کەنداوی فارسی تا دەگەیشتنە میسر و بارەکانیان دادەگرتن یا بەرەو شام و ئێراقیان دەبردن، لەوێ لە بەندەرەکانی شام بە بازرگانەکانی ڤینیسیایان دەفرۆشتن، بازرگانی بەم شێوە دەبێ تا ساڵی ١٥٤٠ دۆخی بازرگانی دەگۆردرێ و دووبارە روو لە ئەسکەندەریە و حەڵەب دەکرێتەوە، لەوێش بازرگانە کان بەرەو ئیتاڵیا و فەرەنسایان دەبردن.

پادشای ئیسپانیا فیلیپی دووەم هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو خانەوادەکەی دەست بەسەر ئەوروپادا بگرێ تا لە ١٥٧٨ ئەو دەرفەتەی بۆ دەڕەخسێ لەگەڵ پۆرتوگال بەشداری لە بازرگانی دەریایی دەکا، بەم هۆیەوە نیمچە دوورگەی ئیبیریا دەکەوێتە ژێر دەستی ئەو، بە مردنی پادشاکەی ( کاردینال هنری ) لەسەر بنەمای میراتگری داوادەکا کە بیخاتە ژێر تاجی خۆی، سوپایەک بە سەرۆکایەتی شازادە و بە هاوکاری کەشتیگەلێکی مەزنی بۆ

دەنێرێ و داگیری دەکا، ماوەی دوو ساڵ لە ژێر دەستی ئیسپانییەکان دەمێنێتەوە تا لە ساڵی ١٦٤٠ سەربەخۆیی وەردەگرن.

ئەم داگیرکردنە زۆر گرنگ بوو نەک تەنها لەبەر فراوانبوونی دەسەڵاتی ئیسپانیا، بەڵکو لەبەر کەمکردنەوەی دسەلاتەکانی پۆرتوگال و دەستگرتن بەسەر کۆلۆنیالەکانی پۆرتۆگالی لە ئەمریکای باشوورو ئەفریکا و جەزائیر و هیندی رۆژهەلات.

دواجار ئیمپراتۆریەتی پۆرتوگال لە رۆژهەڵات بەرەو نەمان دەچێ، کاتێک دەسەڵاتی پادشایەتیی لە دوای مردنی پادشا ( سبستیان ) Sebastian دوایین پادشا لە سەدەی شانزەهەم دەکەوێتە دەست فیلیپی دووەمی پادشای ئیسپانیا لە ١٥٨٠ ئیتر لەوکاتەوە پۆرتوگال خۆی سەربەخۆیی لەدەست دەدا و دەکەوێتە ژێر دەستی ئیسپانیا و هەردووک دەوڵەت لە ژێر یەک تاج دەمێننەوە هەر لە ساڵی ١٥٨٠ تا ١٦٤٠ .






خۆی لاوازی ئیمپراتۆریەتی پۆرتوگالی لە سەدەی پانزەهەمەوە دەستی پێکرد و بەرەو زیادە لاواز بوون دەچو تا ئیسپانیا داگیری دەکا و دەیخاتە ژێر دەسەڵاتی پادشاکەیان ( فیلیپی دووەم ) ئەویش پشتوگێی دەخا و هیچ بایەخێکی ئەوتۆی پێنادا، سامان و مومتەلەکاتی پۆرتوگال لەلایەن ئیسپانیا بە تاڵان بردران، لەوکاتەی پۆرتوگال لە پێناو وەدەست هێنانی سەربەخۆیی خەباتی دەکرد وڵاتانی ئەورووپی وەکو فەرەنسا و هۆڵەندا بۆ داگیرکاری وململانێکانیان مەیدانی پۆرتوگالیان بە مەیدای خۆیان دەزانی و لەسەر سامانەکانی ململانێ و ناکۆکیان بوو، لەم ڕووەوە هەرسێک وڵاتی فەرەنسا و هۆڵەندا و ئینگلتەرا لەسەر مومتەلەکاتی پۆرتوگال خۆیان دەوڵەمەندو پر دەسەڵات کرد.

## رووخانی ئیمپراتۆریەتی پۆرتوگالی:

ئەوەی بووە یارمەتیدەری روخانی ئیمپراتۆریەتی پۆرتوگالی دەسەڵاتدارەکانی بوون کە حوکمی وڵاتیان دەگێڕا، ئەوەندەی خەمی خەمی بازرگانی و خۆ دەولەمەندکردنیان بوو خەمی حوکمیان نەبوو. پێیان وابوو پێویستیان بە پشتگیری و بەهێز کردنی جومگەکانی دەسەڵات نیە ئەوەی پێویستیانە بەهێز کردنی وێستگەکانی بازرگانی و پرچەککردنیانە تا ڕێگای بازرگانییان مسۆگەر و پارێزراو کا، پێیان وابوو بەو ڕێگایە دەتوانن کەشتیگەلیان بەهێزکەن و ببێتە پشتیوانی بۆ مسۆگەر کردنی بازرگانی و رەخساندن و خۆشکردنی ڕێگای بازرگانی هیندو چین، ئەوەبوو بۆ ئەم مەبەستە لە کەنارەکانی رۆژهەڵات چەندین وێستگەی بازرگانیان دامەزارند، لە دورگەکان و کەناری (مەلاربا) ئیتر هەمویان روویان لەم وێستگانە دەکرد بۆ وەرگرتنی باج، پێگەوجومگەکانی دەسەڵاتیشیان پشتگوێ خست. قەڵاو سەنگەری بەهێزیان لە دورگەی سۆمەترە و مەسقەت و عەدەن و هورمز و مەلقا دروستکرد. واتە لە دەروازە گرنگەکانی دەریاکان، ئەمەو لە وڵاتە دواکەوتوەکان جۆرێک لە سیستەمی حوکمڕانیان دامەزارند کە دوایی هەر ئەو سیستەمە بوە مایەی لەناوچونیان، چونکە هەموو دەسەڵاتەکانیان لەدەست جێگرێکی پادشا کۆکردبۆوە کە لە ( جوا ) دادەنیشت کەس بۆی نەبوو لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکا جگە لە پادشا نەبێ، هەموو دەسەڵاتەکانیشی هەبوو.

دەسەڵات و مانەوەی ئەو جێگرە کەم بوو، سێ ساڵی خایاند بۆیە هەموو هەوڵەکانی بۆ رووتکردنەوەی هاوڵاتیان بوو لە ڕێگەی سەپاندنی باجی زۆر لەپێناو خۆ دەولەمەندکردن، جگەلەمەش پۆرتوگالییەکان لەم شوێنانە لە بڵاو کردنەوەی ئاینی کریستیی کاسۆلیکی

بەردەوام دەبـوون، هەرچەنـدە ئەو خەڵـکە ئـاینی دیکەیـان هەبـوایە بەزۆر بەسـەریاندا دەسەپاندن، بۆ ئەم مەبەستەش لە ١٥٦٠ دادگایەکیان لە جوا دانا بەناوی دادگای پشکنین.

وڵاتـی پۆرتوگـاڵ خـۆی سـودمەند نەبـوو لە ئیمپراتـۆریەتەکەی هەرچەنـدە لشـبۆنە پایتەختی وڵات دەبێ و بازرگانی لەم شارە لە سەدەی شانزەهەم چالاک و بەهێز بـوو لەگەڵ ئەوەشدا گلەیی و گازاندە لە نەبونی خزمەتگوزاری و پشتگوێ خستن هەبوو، چـونکە بـایەخ بە کشتوکالی نەدەدرا، زەویی بەیار بە پانتایی زۆر دەمـایەوە بـێ ئەوەی بچێنـدرێ، چـونکە جووتیارەکان کۆچیان دەکرد و بە هەڵمەتی دۆزینەوە و کەشتیەوانیەوە سەرقاڵ بـوون ، بەم هۆیەوە برسێتی و هەژاری بڵاو دەبێتەوە، مەزنی و رەسـەنایەتی پۆرتوگالییەکـان لەوەدابـوو، خـاڵە لاوازەکانیـان دەشـاردنەوە راسـتییەکان پەردەپـۆش دەکـران کە برسـێتی و هەژاریـی ناوەوەی وڵات بوو.

## دۆزینەوەکانی ئیسپانیا:

ئیسـپانیا لەگەڵ پۆرتوگـاڵ بەشـداری دۆزینەوەکـانی دەکـرد، بـۆ هەمـان مەبەسـتی کە پۆرتوگاڵ بۆی دەردەچوو کە بریتی بوو لە :

١/ ئارەزوومەندی لە پەیوەندیکردن بە دەوڵەتانی رۆژهەڵات لە رێگەی دەریاوە.

ب/ داگیرکردنی بازرگانێتیەکەیان .

ج/ رزگار بوون لە دەسەڵاتەکانی ڤینیسیا و قۆرخکارییەکەی.

کاتێک پۆرتوگالییەکـان بـۆ ئەم مەبەسـتە روو لە رۆژهەڵات دەکەن، ئیسـپانیەکان بـۆ هەمان مەبەست روو لە رۆژئاوا دەکەن ، لە ١٤٩٢ نێردەیەکی دەریاوانیان بە سـەرۆکایەتی ( کریسـتۆفەر کۆلـۆمبس ) رێکخسـت و بەنـاو زەریایانـدا نـارد، ئەم کەشـتیەوانە بە ئاراسـتەی رۆژئاوا درێـژەی بە رۆیشـتن دا تـا دەگـاتە وشـکانییەک، پێـی وابـوو گەیشـتۆتە کەنارەکـانی هیند، دواتر گەشتەکانی بەردەوام دەبن:

لە گەشتی یەکەم و دووەمیدا دورگەکانی ( ئەنتیلی مەزن و ئەنتیلی بچوک و دورگەی واتلینگ Watling ) ی دۆزیەوە، ئەمەی دواییـنیان یەکـێکە لە دوورگەکـانی بەهامـا دواتـر ئەو ناوی لێدەنێ دورگەی ( سان سلفادۆر ):

لە گەشتی دووەمیدا: مەبەستی بوو ئەو شوێنانەی دۆزیویەتەوە داگیریان بکا و ئاینی کریستیی لێ بلاوکاتەوە .

لە گەشتی سێیەمیدا: لە ١٤٩٨ گەیشتە ئاورێژی روباری ئۆرینۆکۆ و بەشێکی لە ئەمریکای ناوەڕاستی دۆزیەوە. بەڵام کۆلۆمبس لەم گەشتەیدا لەگەڵ ئیسپانیەکان بەختەرەش بوو چونکە هەندێک لە یاوەرە ئیسپانیەکانی کە لە پادشاوە نزیک دەبن باشی بۆ نالێن و بۆی تێدەگوشن، دەستکەوتە داراییەکانیش نیشانی پادشا نادەن کارێک ناکەن سود بە دەوڵەت بگات جگە لە وەدەستهێنانی هەندێک کۆیلە نەبێ کە بۆ کاروبار بەکاری دەهێنان. واتە ئیسپانیا ئەوەی چاوەڕوانی دەکرد لە زێڕ و زیو بەدەستی نەکەوت، بۆیە کەشتیەوانەکە بە کەلەبچەیی دەگێڕنەوە ئیسپانیا و یەکیکی دیکەی لە شوێن دادەنێن، ئەمەش لە ئەنجامی چاوچنۆکی ئیسپانیە یاوەرەکانیەو، وە بوو، کاتێک بەم شێوە دەیگەڕێننەوە ئیسپانیا ئومێدەکانی نەزۆک دەبن، دەمێنێتەوە تا ساڵی ١٥٠٦ کۆچی دوایی دەکا.

کاریگەری گەشتەکانی کۆلۆمبسی گەرۆک زۆر بوون لەوانە:

١/ پادشاکانی کاسۆلیک کاریان بۆ چەسپاندنی خاوەنداریتی موڵکە دەست بەسەرداگیراوەکانی نوێ دەکرد، بەتایبەت ئەوکاتەی پۆرتوگالییەکان لە دۆزینەوە چالاک دەبن، مێژوونوس (فیچەر) دەڵێ:

ناتوانین بڵێین ئامانجی دۆزینەوە نوێکانی دونیا لە سنووری سود وەرگرتن لە کانزاکانی زێڕ و زیو رەت ناکا ، چونکە ئامانجی فاتیکانیەکان بلاوکردنەوەی ئاینی کریستی بوو بەسەر هەموو دونیادا. پرۆژەی پۆرتوگالی و ئیسپانیەکان زۆربایەخیان پێدەدرا نەک لەبەر ئەوەی بۆ ئامانجی بلاو کردنەوەی ئاینی کریستی بوو بەڵکو بۆ هێرشکردنە سەر موسلمانەکان، حاکمی حەبەشە نەجاشی کەسێکی کریستی بوو تا ئەوکات پێی وابوو کە لە هیند میرنشینێکی کریستی هەیە پێی دەوترێ خانی مەزن و کەسێکی کریستی حوکمڕانیی دەکا . یاریی بە هەستی ئەوروپیەکان دەکرد وای تێگەیاندبوون کە لە کاتی شەڕکردن لەگەڵ موسلمانەکان ئەو هاوکاری لەو میرنشینانە وەردەگرێ، ئەمە پلانی پاپا بوو لە ١٤٥٤ بە مەرسومێکی پاپایی دەریکردبوو بە پادشای پۆرتوگالی دابوو، ئا لەم دۆخە گرگرتوە کۆلۆمبس دەست بە گەشتەکەی دەکا تا لە رۆژئاواوە رێگایەک بەرەو هیند بدۆزێتەوە.

نابێ ئەمەش لە بیر بکەین کە پاپا ئەسکەندەری شەشەم شوێنە دۆزراوەکانی لە نێوان پادشاکانی کاسۆلیکدا دابەش کرد، ئەم بڕیارە بوو کە بووە بنەمای هاوپەیمانێتی توردیسلاس .

٢/ کاری گەریی دووەمی گەشتەکەی کۆلۆمبس، ڕێگەی بە روی گەشتیارو کەشتیەوان و گەڕیدەکاندا کردەوە . ئەم گەڕیدە نوێیە لە نێوان ساڵەکانی ١٤٩٩ و ١٥٠٨ دا گەیشتنە دورگەی بەهاما و دواتریش روباری ئەمازۆن و بەربەستەکانی پەنەما و دەوروبەری کوبا بەم هۆیەوە دەسەڵاتی ئیسپانیا لە ئەمریکای ناوەڕاست و باشوور باشتر دەچەسپێ. لە پێشەوەی ئەو گەڕیدە سەرەڕۆیە نوێیانە گەڕیدە بالبوا ( Balboa ) بوو کە لە بەرزاییەکانی پەنەما پەڕیەوە تا زەریای هێمنی لێ بەدیار دەکەوێ لەوێ خاوەنداریێتی پادشای ئیسپانیای بۆ ئەم شوێنانە ڕاگەیاند کە لە ساڵی ١٥١٨ بوو.

## فردینان ماجەللان ١٥١٩-١٥٢٢




گرنگترین ئەو رووداوانە لە سەردەمی حوکمڕانی چارلسی پێنجەم روودەدەن، گەڕان بەدەوری دونیا و داگیرکارییەکانی ئیسپانی لە مەکسیک و پیرۆ و ئەمریکای ناوەڕاست و باشوور.

مەبەست لەم گەشتە ئەوە دەبێ ئیمپراتۆری ئیسپانیا چارلسی پێنجەم ( ١٥١٩-١٥٢٢) فەردیناند ماجەلان ( Magellan ) رادەسپێرێ رێگایەک بە ئاراستەی رۆژئاواوە بۆ گەیشتن بە هیند بدۆزێتەوە، هەرچەندە ماجەلان کەشتیەوانێکی پۆرتوگالی دەبێ بەڵام دەچێتە ریز خزمەتی ئیسپانی، ماجەلان بۆ ئەم ئەرکەی لە ١٥٩٩ دەردەچێ وتا دەگاتە بەرازیل لە کەناری شاری ( ریودو جانیرۆ ) دواتر بۆ روباری ( لابلاتا ) و دواتر بەدەوری ئەمریکای باشووردا دەخولێتەوە، لە نۆڤەمبەری ١٥٢٠ دەگاتە ئەو زەریایەی کە بەهۆی گەشبینیەوە ناوینا زەریای هێمن، بەردەوام دەبێ لە گەشتەکەیدا تا دەگاتە فلیپین کە پۆرتوگالییەکان لەرێگەی رۆژهەڵاتەوە پێی گەیشتبوون. بەم شێوە زانیارییەکان لەسەر خڕ بوونی زەوی یەکلایی دەبنەوە و جێگیر دەبن.

و: خالید هەرکی

## سەرەڕۆییەکانی دۆزینەوە لە سەردەمی چارلسی پێنجەم:

ئەو کەشتیە ئیسپانیەی ( جون سباستیان دەل کانۆ ) فەرماندەیی دەکرد دوای مردنی ماجەلان لە دوورگەی بەهار بەردەوام دەبێ، لە زەریای هێمنەوە بۆ رووی باشووری ئەفریکا، لەوێشەوە دەگەڕێتەوە ئیسپانیا، بەم شێوە ئەم گەشتە لە دەوری دونیا دەخولێتەوە کە پێک هاتبوو لە ٥ کەشتی و ماجەلانیش فەرماندەیی دەکرد.

ئیمپراتۆری ئیسپانیا چارلسی پێنجەم بەم سەرکەوتنە وبانگ دەردەکا، پێی وابوو ئەم سەرکەوتنە تایبەتە بەخۆی، خواوەند بە خانەوادەکەی بەخشیوە کە خانەوادەیەکی نەمساوییە بە ناوی هابسبۆرگ بە مەزهەب کاسۆلیک و چارلسیش لە لووتکەی ئەو سەرکەوتنە و خانەوادەکە دایە، بەم سەرکەوتنە ئەو بۆچوونەیان زیاتر لا جێگیر دەبێ کە ( خانەوادەی هابسبۆرگی نەمسایی کاسۆلیک لەلایەن خواوندەوە پەیمانی پێدراوە کە رۆژگارێک دادێ دەسەڵاتی بەسەر هەموو دونیادا دەچێ چونکە ئیمپراتۆریەتی سەرجەم بوونەوەرەکانە) ( Austriae est imperare universo) راوێژکارەکانی چارلسی پێنجەم بروایان وابوو کە نەمسای کاسۆلیک لە داهاتوو حوکمڕانی دونیایەکی کاسۆلیکی دەکا.

## هرنەندۆ کۆرتیز ( Hernando Cortes )



کوبا کەوتبووە کۆش ئیسپانیاوە، کۆرتیز لەوێوە دەستی بە گەشتەکەی کرد، دوای ئەوەی بەسەر دانیشتوانە رەسەنەکەیدا کە پێیان دەڵێن ( ئازتک ) Aztecs زاڵ دەبێ خاکەکەیان لێ داگیر دەکا، کورتیز پادشاکەیان بەناوی ( مونتروما ) بنچاو دەکاو خۆی دەکاتە پادشای وڵاتەکەیان، دانیشتوانەکەی بینیان ئەوەی لە پێکهاتەی سوپاکەیدا هەیە لە ئەسپ و چەک و هاون و سواری چاک و سیستەمی بەڕێوەبردن، پێشتر نەیان بینیوە لایان نوێ بوون و لە دەرەوەی ئەزموونیاندا بوو. بۆیە ئەو گوتەیان بڕواکرد کە کۆرتیز بڵاوی کردبۆوە کردبۆوە گوایە ئەو کەسانەی لە شوێنێکی نادیارەوە هاتوونەتە ناو ئەو خاکە لەلایەن خواوەندەوە راسپێردراون و پڕ چەککراون نابێ نە توورەیان کەن نە بەرەنگاریان بن.

## پیزارۆ، پیرۆ داگیر دەکات ( Pizzaro )



پیـزارۆ Pizzaro تـوانیی دەسـت بەسـەر بڕێکـی زۆر لە زێـڕو زیـودا بگـرێ کە لای ئیسپانیەکان مەبەستی سەرەکیی سـەرەڕۆیەکەیان بـوو، لەم داگیرکاریـانە. پیـزارۆ کەسـێکی ڕەوشەنبیر نەبوو ئەو وەکو هەر هەزارێکی ئیسپانی فێری ئەم پیشەیە ببـو. لە پـایزی ١٥٢٢ لە پەنەما بەدوای ڕزقی خۆیدا دەگەڕا، لەکـاتی کۆبـونەوە لەگەڵ کەشـتیەوانانی ئیسـپانی یەکێکیان پێێ ڕاگەیاند کە خاکێکی بە پیت لەو خوارەوە لە باشووری ئەمریکـا هەیە گەلێـک بەنـاوی ( ئینکـا ) Incas لێـی دەژیـن ، پیـزارۆش تینـوی سـەرەڕۆیی بـوو لە پێنـاو وەدەست هێنانی زێـڕ، بـۆ ئەم مەبەسـتە سـەد ١٠٠ کەشـتیوانی کۆکردەوە کە هەموویـان لە سەرەڕۆکان بوون لەسەر پشتی یەک کەشتی بەرەو ئەو ئامـانجە ڕۆیشـت، بەڵام هەوڵەکەیـان شکسـتی هێنـا، لە ١٥٢٦ واتە دوای دووسـاڵ هەوڵەکەی دووبـارە کـردەوە، ئەمجارەیـان کەشتییەکەیان لە کەنارێکی چێندراو لەنگەری گرت، خەڵکەکەی بینی لە زێڕ ڕازێندرابونەوە، لەوکاتەوە چاوی بڕیە ئەو شوێنە و بڕیـاری دا لەوێ بمێنێتەوە و پەیوەنـدیی لەگەڵ پەنەمـا بپچڕێنێ.

هەستیکرد لەم گەشتەیدا دەوڵەتێکی کشتوکاڵیی ڕێک و پێکی دۆزیـوەتەوە، شـارێکی تایبەتی بوو، دانیشتوانەکەشی شێوازی چاندنی پێشکەوتوویان بەکار دەهێنا هەم بۆ چانـدن هەم بۆ ئامادەکردنی زەویەکان و ئـاودان، جـگە لەمەش کۆشـک و تەلاری پێشـکەوتووی لـێ

و: خالید هەرکی

دروست کرابوو. دوای دۆزینەوە پیزارۆ دەگەڕێتەوە ئیسپانیا و ڕێ پێدراوێک لە ئیمپراتۆر وەردەگرێ لە٢٢ی حوزەیرانی ١٥٢٩ کە ئەو شوێنەی دۆزیویەتەوە دوای ئەوەی دەیخاتە ژێر دەسەڵاتی ئیسپانیا دەسەڵاتی جێگری پادشای هەبێ.

پیزارۆ ئەوپەڕی توندوتیژیی لەگەڵ حاکمی نیشتمانیی پیرۆ بەکارهێنا، دەستگیری کردو لە ماڵ و موڵک دایشۆری و لەبەر چاوی خەڵک بە قەشە و پیاوانی ئاینیشەوە کە بۆ بلاوکردنەوەی ئاینی کریستی هاتبون سوتاندنی بێ ئەوەی هیچ نارەزایەتیەکیان هەبێ، هەر چەندە مێژوو ئەو ستەم و زولمەی موژدەدەرانی ئاینی کریستی لەبیرناکا کە لە شوێنەکانی دیکەی دونیا لە دژی هاوڵاتییە رەسەنەکانی وڵاتە داگیرکراوەکان پیادەیان دەکرد. ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم هەمیشە نیان و میهرەبان بوو، هەرکاتەی کێشە و ململانێ لە نێوان نێردە ئاینیەکان و داگیرکەران رووی دەدا ئەو لایەنگری نێردە ئاینیەکانی دەگرت.

## داگیرکاریی ئیسپانی:

خەسلەتی داگیرکارییە ئیسپانیەکان بە تاڵان و راوڕووت و توندوتیژی ناوی دەرکرد. ئەمە خەسڵەتی داگیرکەران بوە بۆ وەدەست هێنانی قازانجی زیاتر بەڵام زیانی زۆری لەو نیشتمانە و هاوڵاتیە رەسەنەکەی داوە. کاتێک دۆخەکان راستەڕێ دەبن بزووتنەوەی بەرەنگاری سەرهەڵدەدا داگیرکەر سیاسەتێکی نوێ پیادە دەکا، خۆی لە پێدانی برێک ئازادی و پارسەنگ کردنی بەرهەمەکانی کانزا لەگەڵ هاونیشتمانییە رەسەنەکان، بەم شێوە لەوکاتەی پۆرتوگالییەکان بە ئاراستەی قۆرخکردنی بازرگانی لە رۆژهەڵات دەرۆیشتن، ئیسپانییەکان بەرەو دەستگرتن بەسەر کانزاکان و سوود وەرگرتن لە بەرهەمەکانی زێڕ و زیوی دونیای نوێ لە ئەمریکا دەرۆیشتن.

ئیسپانیەکان بە پێچەوانەی پۆرتوگالییەکان شارستانێتی خۆیان بردە ناو ئەو شوێنانەی ئەمریکا کە داگیریان کردبوو، بەڵام پۆرتوگالییەکان لەگەڵ وڵاتانی ئەفریکا و ئاسیا ئەمەیان نەکرد، ئیسپانیەکان جگە لە شارستانێتیان ئاین و زمان و کەلتوری خۆشیان گەیاندە ناو ئەمریکا و بەکاریان هێنا، ئەمەش کاریگەری زۆری لەسەر پێشەکەوتنی سڤیلی و شارستانێتی هەبوو. سەرەتای داگیرکاری ئیسپانی، هاوڵاتیانی رەسەن داگیرکەرانیان قەبول نەبوو پێشوازیان لە کەلتورو شارستانێتیان نەدەکرد، چونکە بەچاوی داگیرکەرانی پێش و سەیر دەکران تا ئەوکاتەی متمانەیان پێکردن و موژدەدەرانی ئاینیش هاوشان لەگەڵ

داگیرکەران ئاینی کریستی و کاسۆلیکیان بلاو دەکردەوەو خەڵکیان لە مەبەستی داگیرکارییەکە دەگەیاند، ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر رازیکردنی هاولاتییە رەسەنەکان، بەم شێوە سیمای شارستانێتی ئیسپانیی لەو شارە داگیرکراوانە دەبینران. داگیرکەرەکان لەتەک کانزاکان شاری نوێیان بنیادنان هاولاتیە رەسەنەکان سەرەتا گاڵتەیان بە کارکردن لەو کارگانە دەکرد، بۆیە ناچار بوون کۆیلە لە وڵاتەکانی ئەفریکاوە بۆ کارکردن بێنن، بەم هۆیەوە نزیکەی ٢٠ ملیۆن ئەفریکی لە ماوەی سێ سەدە واتە لە سەدەی پانزەوە تا هەژدە، هاوردەی وڵاتە داگیرکراوەکانی ئەمریکا کران.

هەرکە داگیرکەران هەستیان بە کەمبوونی بەرهەمی کانزاکان کرد پێیان وابوو کە رۆژێک دادێ ئەم بەرهەمە نامێنێ بۆیە رویان لە کشتوکاڵ کرد، ژمارەیەکی زۆری رەشپێستیان بۆ کاری کشتوکاڵی هاوردەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ماوەیەکی دوور بودجەی زێڕ و کانزاکانی دیکە لە بەرزبوندا بوو بە بەراورد لەگەڵ بەرهەمەکانی دیکە، لە ١٥٩٤ هەناردەی ئیسپانیا لە زێڕو زیو تەنها لە کۆلۆنیالەکانی ئەمریکی گەیشتە ٩٥،٦٢% ی رێژەی هەموو هەناردەکانی دیکەی ئیسپانیا لە ئەمریکا، کەچی هەناردەی بەروبوومی کشتوکالی و ئاژەلی تەنها بە رێژەی ٥% مایەوە، دوای ئەوە لە سەدەی حەڤدەهەمەوە هەناردەی زێڕو زیو لە کەم بوونەوەدا بوو کە گەیشتە ٨٤%.


النمسا
دوقية
ميلان
جمهورية
البندقية
المجر
جمهورية
جنوة
سان
مارينو
دلماسيا
الخاضعة للبندقية
الدولة
العثمانية
جمهورية
فلورنسا
كورسيكا
(جنوة)
جمهورية
سيينا
الدولة
البابوية
جمهورية
راجوزة
روما
بونتيكورفو
مملكة
سردينيا
(مملكة أراغون)
بينيفنتو
نابولي
نابولي
بلرم
مملكة صقلية
(مملكة أراغون)
إيطاليا
1494

و: خالید هەرکی

## چارلسی هەشتەم لە ١٤٩٤ هێرش دەکاتە سەر ئیتاڵیا



لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم، فەرەنسا و ئیسپانیا و ئینگلتەرا بێ رکابەر لە بەهێزترین وڵاتانی ئەوروپا بوون، هەموویان لە ژێر حوکمڕانی یەک پادشا ویراسەتی حوکمیان دەکرد، هەرچی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا بوو لەژێر تاڵانی پارچەبووندا بوون، بەو هۆیەوە لاواز دەبن و لەناو دەچن.

لەگەڵ ئەو پارچەبون و لاوازیەشیدا ئیتاڵیا دەتوانێ لە چەرخی رێنسانس هەڵسێتەوە و ببێتە دەوڵەمەندترین گەلانی ئەوروپا لە بواری هونەرو ئەدەب، بەڵام لەگەڵ ئەو هەڵسانەوەشیدا بایەخی بە هێزی چەکداری و سوپا نەدا، بۆیە وەکو میوەیەکی پێگەییوی لێهات زۆر بە ئاسانی دەکەوێتە چنگ میوەچنەکانەوە.

فەرەنساش بەهێزترین دراوسێێ بوو ئیتر ئاساییە ببێتە مەیدانی بەرفراوانبوونی، پاش ئەوەی فەرەنسا دەبێتە تاقە دەوڵەتی زەبەلاح لە نوخبەی دووەم لە سەدەی سیانزەهەم. لەوکاتیش دەوڵەتۆکەکانی ئیتاڵی لە ململانێ و کێشەدابوون لەگەڵ یەکترا، هەرچەندە

هیچکامیان خاوەنی ئەو سوپایە نەبوون بەرگری لە خۆیان بکەن بۆیە پەنایان دەبردە بەر کرێگرتەکان شەڕیان بۆ بکەن.

دۆخەکان بەم شێوەیە بوون کاتێک چارلسی هەشتەم تاجی پادشایەتیی فرەنسا لەسەر دەنێ ، دوای ئەوەی پادشا لویسی یانزەهەم لە ١٤٨٣ کۆچی دوایی دەکا پادشا نوێکە بە ڕێژەیەکی دیار چاوتێبڕ بوو. پیاوێک بوو حەزی لە سوارسوارێن بوو، گەلێک چیرۆکی کاری سواربازیی خوێندبۆوە بۆیە خۆی بە هاوتای ئەوان دەبینی و لاسایی دەکردنەوە، کاتێکیش ئیتاڵییەکان پەنای بۆ دەبەن وداوای لێدەکەن وەکو ڕزگارکەر بەهانایانەوە بێ نەک داگیرکەر ئیتر ئەو دەرفەتەی بۆ دەرەخسێ مەرام و حەزەکانی بەجێ بگەیەنێ، ئەو خەیاڵەشی بۆهات کە دوای داگیرکردنی ئیتاڵیا دەتوانێ بەرەو هەرێمەکانی دیکەش هێرش بەرێ بەتایبەت بەرەو دەوڵەتی عوسمانی، خەیاڵ دەکا بە سوپاکەی دەتوانێ تورکەکان لە وڵاتەکانی ئەورووپا وەدەر نێ بەو هۆیەوە سۆزی کریستیەکانی ئەورووپا بۆخۆی کێش دەکا، دواتر بەردەوام دەبێ لە هێرش بردن تا دەگاتە قودس و موسڵمانەکان لەوێ دەردەکا.

لە ١٤٩٤ دەستی بە سەرەڕۆیی یەکەمی کرد، هەمیشە دەیانووت کە ناپۆلی موڵکی فرەنسایە و لە مافەکانی خۆیەتی، گوایە یەکێک لە خانەوادەکانی فرەنسی بە ناوی ( ئینچۆ ) کە مافی پادشایەتیی لە خانەوادەی ( ڤلوا) وە بۆ ماوەتەوە لەوێ حوکمڕانیان کردوە بەڵام خانەوادەی ( ئەرجوان ) ی ئیسپانی بە زۆر لە ژێر دەستیان دەرهێناوە، بەم بیانووە دبلۆماسییە مەبەستیان بوو دەست بەسەر ئیتاڵیادا بگرن .

دوای ئەوە دەرفەتێکی تری زێرین بۆ چارلسی هەشتەم دەرەخسێ کە هێرش بکاتە سەر خاکی ئیتاڵیا ئەوکاتەی حاکمی میلان ( لودوڤیچ ) Lodovico داوا لە فرەنسا دەکا لە هێرشەکانی فلۆرەنسای بپارێزێ کە هەڕەشەی داگیرکردنی لێکردوە، لەهەمان کاتدا هەندێک لە چاکسازەکان هانیان دەدا تا پاپا ئەسکەندەری شەشەم دوورخاتەوە کە ناوبانگێکی ئاینیی باشی نییە.

لە ١٤٩٤ کاتێک چارلسی هەشتەم بە هێزێکەوە لە چیای ئەلب دەپەڕێتەوە شەڕ دەست پێدەکا . هێزەکانی فرەنسی گەمارۆی ئیتاڵیایان دا، بۆ یەکەمین جار بوو ئیتاڵییەکان زەبەلاحی سوپای فرەنسا ببین هەم لە ڕووی زۆری و لەڕووی سیستەم و ڕێک و پێکی و دسپلینی سەربازی بۆیە هەوڵی هیچ بەرگریەکیان نەدا. هێزەکانی چارلسی هەشتەم زۆر بە ئاسانی دەچنە نێو میلان و فلۆرەنسا و ڕۆم و ناپۆلی، بەهۆی ڕق و کینەیان لە پادشای ئیتاڵی نەک بەرگریان نەکرد بەڵکو لە هەندێک شوێن پێشوازییەکی باشیان لێکردن

وەکو سوپای رزگارکەر سەیریان دەکردن نەک داگیرکەر، ئیتر چارلسی هەشتەم لەوێ تـاجی پادشایەتیی ناپۆلیی لە سەرنا.

هەرکە حـوکمی چارلسـی هەشـتەم سـەقامگیر، دەبـێ بەهـۆی ئەو بـاج و سـەرانەی خسـتبوویە سـەر هاوڵاتیـان ئەو پێشـوازیە گەرمە دەبێـتە رق و کیـنە و رووبەڕوو بـوونەوە، لەوکاتەوە چارلس توشـی گرفتـی خـۆی بـوو، ئیتاڵییەکـانیش هەسـتیان بەو ستەمە دەکـرد کێشە ناوەخۆییەکان لەسەر چارلس کەڵەکە بوون، هاوڵاتیـان هەلوێسـتیان لە دژی داگیـرکەر وەرگرت، چارلس درکی بەوە کرد کە داگیرکردن ئاسانە بەڵام پاراسـتنی زەوییەکـان کـارێکی سەختە.

لەکاتێکـا چـارلس لەو خەونەدا بـوو کە ئیتاڵیـا کەوتـۆتە ژێـر دەسـتی خـۆی، لە باکوورەوە هاوپەیمانێتیەک لە دژی چارلس بە سەرۆکایەتی ڤینیسیەکان دروست دەبێ.

لە هەمانکـات لە ناوەڕاسـتی ئەوروپـا دەسـتەواژەیەک پیـادە دەکـرێ پێـێ دەوتـرێ ( بنەماکـانی هاوسـەنگی نێـودەوڵەتی ) ئەمەش لە دیـدی نێـودەوڵەتییەوە دروشـمێکی بـێ سـنوورە، بەڵام ئەوەی وونە ئەوەیە کە هاوسـەنگی هێـز دەبـێ بپـارێزرێ ئەگەر لە ئەنجـامی داگیرکاری هێزەکان تێکچون و نابەرانبەر بوون دەبێ هاوپەیمانێتیەکی نێـودەوڵەتی دژی ئەم کردارە بوەستێتەوە.

بـۆیە ئەو سـەرکەوتنەی چارلسـی هەشـتەم لە ئیتاڵیـا بەدەسـتی هێنـا دەبێـتە مـایەی ئەوەی هاوپەیمـانێتیەکی نێــودەوڵەتی لەدژی بوەســتنەوە، ویــلایەتە ئیتاڵییەکــانیش ئەم دەرفەتەیـان قۆسـتەوە. بـزووتنەوە بەرگرییەکـان بە پشـت بەسـتن بە دوژمنـانی فرەنسـا لە پەرەسەندن دابوون، لەلایەن هەریەک لە میلان و ڤینیسیا و پاپاخوازەکان دەربـردرا بەڕێـوە، بە پشتیوانی هاوکاریەکانی فردناند پادشای ئیسپانیا و ئیمپراتۆری مکسملیان.

ئەوکات چـارلس هەسـتی بەو مەترسـییە کـرد کە بەسـەریەوە بـۆتە هەڕەشـە بـۆیە دە بەزووترین کات لێ دەرچێ، بەڵام ئاستەمە بەبـێ زیـان لێـێ دەرچـێ، پێـی وابـو باشـترین بریار ئەوەیە بە زوترین کات لە ناپۆلی بچێتە دەر.

بەر لەوەی هێزەکانی بباتە دەرەوە سوپاکەی لەگەڵ سوپای هاوپەیمانان لە حـوزەیرانی ١٤٩٥ رووبەڕووی یەکتر بوونەوە، بەڵام توانیی بەسەریاندا زاڵ بێ و بەبـێ زیـان بکشـێتەوە، ئەم کشـانەوە ناوبـانگێکی خەراپـی بە سـوپا و شـکۆی فرەنسـا گەیانـد، چارلسـی هەشـتەم دەمرێ بێئەوەی ئەو پەیمانانەی بە فەرەنسییەکانی دابوون جێبەجێیان بکات.

## لویسی دوانزەهەم:



دوای ئەو ئامۆزاکەی لویسی دوانزەهەم دەسەڵاتی پادشایەتی دەگرێتە دەست، بەهۆی کارە باشەکان و چاکسازیەکانیەوە لەلایەن هاوڵاتیانی خۆشەویست بوو بە ( باوکی گەل ) ناودەبردرا. ئەمیش بەختی خۆی لە داگیرکاری و بەرەفراوان بوون لە خاکی ئیتاڵیا تاقی دەکاتەوە، یەکەم هەنگاوی داگیرکردنی میلان بوو لە ١٤٩٩ کە بێ هیچ ئاستەنگ داگیری دەکا، بەڵکو ئەم بێگرگفتیەی بۆ هاوکاریەکانی ڤینیسیا دەگەڕێتەوە کە کێشە و ناکۆکی لە نێوان میلان و ڤینیسیادا هەبوە.

دوای ئەوە بیری لە داگیرکردنی ناپۆلی کردەوە، هەستی دەکرد کە ئەم هەنگاوەی ئاسان نابێ، بەهۆی ئەوەی پادشای ئیسپانیا چاوی لێیەتی کە ئەوکات پادشا فردیناند پادشا Ferdinand Aragon دەبێ، خانەوادەی پادشایەتی ئیسپانیی کە فەردیناند لە سەرووی هەموویانەوە داوای خاوەندارێتی ناپۆلی دەکەن، لویس بۆئەوەی خۆی لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئیسپانیا بپارێزێ، هەڵسا بە ڕێککەوتن لەگەڵ فەردیناند Ferdinand کە لە نێوان خۆیاندا دابەشی سەر فەرەنسا و ئیسپانیادا بکەن، ئەم ڕێککەوتنە ی ساڵی ١٥٠٠ ئەنجام درا پێی وترا ڕێککەوتنی ( جرناندا )، بریتی بوو لەوەی لویس دەست بەسەر باکووردا بگرێ فردیناندیش Ferdinand بەسەر دورگەکانی باشوور.

ناپۆلی لە توانایدا نابێ بەرگەی هێرشی ئەو دوو دەوڵەتە بەهێزە بگرێ بۆیە بێ بەرگری خۆیدا بەدەستەوە بەڵام پرسی دابەش کردنەکە ئاسان نابێ کە بەسەر باکوور و باشووردا دابەشی کەن، لەم میانە لە ١٥٠٢ دەبێتە شەڕ لە نێوان هەردوو وڵاتە زەبەلاحەکەی فەرەنسا و ئیسپانیا، ئەنجامەکەی دەبێتە شکست هێنانی فەرەنسا لە بەرانبەر هێزەکانی ئیسپانیا و هێزەکانی فەرەنسا لە سنوورەکانی ناپۆلی دوور دەخەنەوە.

## هاوپەیمانی کامپری ١٥٠٨ League of Campari

دەرکەوتنی پاپا یۆلیۆسی دووەم لە بواری سیاسەتی ئەوروپی، قۆناغی دووەم لە چیرۆکی دەستێوەردانی ئەوروپا لە ئیتاڵیا دەست پێدەکا. پاپا کەسێکی سیاسەتمەدار و زیرەک بوو، چاوی لە وەدەست هێانی ناوبانگ و پێگەی سیاسی بوو، هەر خۆی رۆڵێکی کاریگەری لە سیاسەتی ئیتاڵیا دەگێرا.

لەوکاتدا پاپا چاوی دوژمنکاریی لەسەر ڤینیسیا بوو کە لەسەر حسابی ویلایەتەکانی ئیتالی پێشتر سنوورەکانی بەرفراوان کردبوو، بۆ پاپا کارێکی قورس نەبوو هاوپەیمانێتیەک لە دژی ڤینیسیا دروستکا، ئەویش هاوپەیمانێتی کامپری بوو لە ١٥٠٨ ئەو هاوپەیمانێتیە دواتر هەریەک لە فەردیناندی پادشای ئیسپانیا و لویسی دوانزەهەمی پادشای فرەنسا وئیمپراتۆر مکسملیان و فلۆرەنسا بەشداریان تێدا کرد، ئیتر ڤینیسیا چۆن دەتوانێ بەرگەی هێرشی ئەو هێزانە بگرێ؟ بۆیە بەناچاری دەستی لە هەندێک لەو زەویانە هەلگرت کە پێشتر داگیری کردبوون.

لە نێوان دوژمنە سەرکەوتووەکانی ڤینیسیا دەبێتە شەڕ لەسەر دابەشکردنی میراتی پاتارکراوی ڤینیسیا. بەم هەنگاوە پاپا هەستی کرد کە هەڵەیەکی مەزنی کردوە بەوەی بانگی هێزەکانی بیانیی کردوە وڵاتەکەی داگیرکەن بەتایبەتی بانگکردنی فرەنسا کە باکووری ناپۆلیان داگیرکرد، بۆیە پێداگریی لەسەر دەرکردنی فەڕەنسییەکان دەکا. بەڵام کە لویس هەستی بە پیلانەکانی پاپا دەکا هاوپەیمانێتیەکی لەدژ پێک دێنێ، لە رێگەی ( ئەنجومەنی گشتیەوە ) داوای لادانی پاپا دەکا، ئەم داوایە لەلایەن وڵاتانی دیکەی ئەوروپی رەخنەی لێدەگیرێ و لە دژی دەوەستنەوە، کاتێک پاپا هەست بەم پشتگیرییە دەکا ئەم دەرفەتە بە هەل دەزانێ تا ئەمیش هاوپەیمانێتیەک لە دژی فرەنسا دروست بکا، بەناوی (هاوپەیمانیی پیرۆز Holy League ) لەم هاوپەیمانیە هەریەک لە ئیمپراتۆر و ئیسپانیا وئینگلتەرا ( ئەوکات پادشاکەی هینریی هەشتەم بوو ) و ڤینیسیا و سویسرا بەشدار بوون.

## هاوپەیمانیی پیرۆز ١٥١١

بەم شێوە ژمارەیەک لە دوژمنانی دژی پادشای فرەنسا هاوپەیمانێتیەک پێک دێنن، توانیان بەسەریدا زاڵ بن و هێزەکانی فرەنسا لە ئیتاڵیا وەدەرنێن. هەر لەوکاتە هنریی هەشتەم پادشای ئینگلتەرا کە ئەندامی هاوپەیمانیی پیرۆزە هێرشێکی توند دەکاتە سەر فرەنسا بۆ گێڕانەوەی ئەو شوێنانەی کەوتوونەتە باکووری فرەنسا و پێشتر لەدەست خۆی بوون. هەرچەندە ئینگلیزەکان نەیان توانی ئامانجەکەیان بپێکن بەڵام ئەم شەڕە تەختی پادشایەتیی فرەنسای هەژاند، بەم هۆیەوە فرەنسا کاری لەسەر ئاشتەوایی لەگەڵ دوژمنەکانیدا کرد، ئەمەش لە ١٥١٥ ئەنجام درا.

# خولی دووەمی جەنگەکانی ئیتاڵیی

## فڕانسوای یەکەم



لە گرتنەدەستی دەسەڵاتی فەرەنسا لەلایەن پادشا فڕانسوای یەکەمەوە ( ١٥١٥-١٥٤٧ ) خولی دووەمی جەنگەکانی ئیتاڵی دەست پێدەکا. فرانسوا گەنجێکی شەڕاوی بوو حەزی لە سەرەڕۆیی جەنگ بوو، یەکەم بیرکردنەوەی هەڵگیرساندنەوەی جەنگەکانی ئیتاڵی بوو، هەرچەندە لەوە ئاگادار بوو کە ئەم جەنگە ئاسان نییە، دەبوایە ئەوە بزانێ کە بێ ئەنجام دانی ئەو حەزەی یا لە حاڵەتی شکستهێنانی دوو هێزی مەزن بە روویدا دەوەستنەوە ئەوانیش ئیسپانیا و پاپاخوازەکانن. ئەمەو لە کاتێکا فەرەنسا زۆربەی هاوپەیمانەکانی لەدەست دابوو.

## ڕووداوی مارجنانۆ ١٥١٥ Marginano

ئەم پادشا گەنجە فرانسوای یەکەم سەرەڕۆییەکەی لە سەپتەمبەری ١٥١٥ ئەنجامدا بە هێرشی کردنە سەر چیای مارجنانۆ لە نزیک میلان و بە ئاسانی بەسەر دوژمنەکانیدا سەرکەوت، لەو شوێنە سەربازی کرێگرتەی سویسری بەرگریان دەکرد بەڵام لە ماوەی دوو ڕۆژ هەموویانی تێکشکاند، ئەم ڕووداوە دوو کاریگەریی هەبوو:

یەکەمیان /

لەکاتی ڕێککەوتن لەگەڵ سویسریەکان بەسەریدا سەپاندن کە نابێ جارێکی دیکە سوپای سویسری لەو شەڕانە بەشدار بێ کە دژی سوپای فرەنسان.

دووەم/

لەگەڵ پاپا ڕێککەوت کە ئەوکات پاپا ( لیوی دەیەم ) بوو لە ١٥١٣ کاری پاپایەتیی گرتبوە دەست لە خانەوادەی ( میدیشی ) بوو، لەسەر ئەوە ڕێککەوت کە لە داهاتوو پیاوانی ئاینیی کڵێساکان دەبێ لەلایەن پادشاوە دابمەزرێن، لە دیدی پاپاشدا ئەوەبوو کە فرەنسا دەبێ ئەو تێچو یا شایستە داراییانەی پاپا بدا کە پێشتر فرەنسا ڕازی نەبوە بیدا. بەم شێوە پادشا دەسەڵاتەکانی بەسەر هەموو کڵێسا و پیاوە ئاینییەکاندا دەسەپێنێ و کارەکانی بۆ مەیسەرتر دەبن کە دامەزراندنی پیاوانی کڵێساکانە بکەوێتە دەست خۆی، ئیتر پەیوەندیەکانی نێوان فرەنسا و پاپاخوازەکان بەم شێوە دیاری دەکرێ و دەمێنێتەوە تا سەدەی هەژدەهەم.

و: خالید هەرکی

## گۆڕانی هەڵوێستی سیاسیی لە ئەوروپا:

## چارڵسی پێنجەم و فڕەنسوای یەکەم:




لەوکاتەی چارلسی پێنجەم تاجی ئیمپراتۆریەت دە نێتە سەر هەڵوێستەکانی ئەوروپا بە تەواوەتی دەگۆڕدرێن، لەم گۆڕانکاریە دروست بونی رکابەرێکی نوێ بۆ فرەنسا.

ئیمپراتۆر مکسملیان لە ١٥١٩ کۆچی دوایی دەکا. دوای ئەوە دەرگای خۆکاندید کردن دەکرێتەوە، رێساکان وابوون کاندید دەبێ بەرەگەز ئەلمانی بێ، بەڵام ئەمە نەکرابووە یاسا تا پابەندی بن بۆیە پادشای فرەنسا فرانسوای یەکەم بڕیاریدا خۆی بۆ ئەم پۆستە کاندید بکا.

رکابەری فرانسوا چارلس بوو کە دەکاتە نەوەی مکسملیان پێشتر لە ١٥١٦ پادشای ئیسپانیا بووە، ئەوکات چارلس لە بەهێزترین پادشاکانی ئەوروپا بوو چونکە حوکمڕانی گەلێکی بەهێزی دەکرد بە پشت بەستن بە ئابوریەکی بەهێز کە لە رێگەی بازرگانی و پیشەسازی بەسەریدا دەباری، وێرای سامان و مومتەلەکاتی ئیسپانیش.

دامەزراندنی ئیمپراتۆر بە تیوری دەبوو بەڵام وەکو پراکتیک بە جێماوی ( ویراسی ) بوو، کاتێکیش دەبوە ئیمپراتۆر سەرجەم سامان و سەرمایەی خانەوادەی ( هەبسبورگ ) دەکەوتە ژێر دەستی و نازناوی ئیمپراتۆریەتی دەوڵەتی رۆمانیی پیرۆزی وەردەگرت.

بەڵام لە ئاسۆی ئەم پرسە رکابەرێکی خەتەرناک دێتە بەرانبەری کە فرانسوای یەکەم بوو پادشای فەرەنسا. ناوبراو خۆی بۆ ئەم پۆستە خەتەرناکە کاندید دەکا لە کاتێکا هەستیاری و مەترسییەکانی دەرهاوێشتەی ئەو پرسە باش دەزانێ ئەگەر لەم هەڵبژاردنە چارلس پادشای ئیسپانیا بە ئیمپراتۆری دەوڵەتی رۆمانیی پیرۆز لە ئەڵمانیا دەرچێ هاوسەنگی ئەوروپا تێک دەچێ.

لە هەڵمەتی هەڵبژاردن هەردووکیان هەولی زۆریان دا پارە و خەرجیەکی زۆریان لەم پێناوەدا سەرف کرد بەڵام چارلس لە فرانسوا بەهێزتر بوو، بۆیە لە ١٥١٩ چارلس بە ئیمپراتۆر دێتە هەلبژاردن. مەزندەکان ئەوە بوون کە کێبەرکێکە توند دەبێ و ململانێ و کێشە دەکەوێتە نێوان هەردووکیان لە ئەنجام جەنگیان لە نێوان روودەدا.

## رووداوی بافیا ١٥٢٥

هەرواشی لێهات لە ١٥٢٢ زنجیرەیەک شەڕ لە نێوانیاندا روویدا بەڵام شێوازی توندی وەرنەگرت تەنها لە ١٥٢٥ نەبێ. پادشای فەرەنسا فرانسوا هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر ئیتاڵیا، لە ناکا و هێزەکانی ئەلمانی پێشی لێدەگرن و شکستی پێدێنن ناچاری دەکەن خۆی رادەستی هێزەکانی ئەڵمانیا بکات، ئەوانیش بە دیلی دەیگرن و دەینێرنە ئیسپانیا.

لە وێ لە مەدرید ئیمپراتۆر چارلس ناچاری دەکا پەیماننامەی ١٥٢٦ی پێ واژۆ بکا. بەپێێ ئەو رێککەوتنە فەرەنسا روبەرێکی زۆر لە خاک و دەسەڵاتەکانی لەدەست دەدا، بە نموونە پادشا دەستبەرداری فەرەنسا لە میلان و ناپۆلی و جنوە رادەگەیەنێ بەو مەرجەی ئازادی بکەن، ئەمەش رسواییەکی زۆر بوو بۆ فەرەنسا، شکۆی فەرەنسا تێکشکا خۆ ئەگەر

ئەو ڕێککەوتنە جێبەجێ بکرابا بەیەکجاری فرەنسا وەکو دەولەتێکی مەزنی ئەورووپی تیادەچوو.

بەڵام لەم سەرکەوتنەی چارلس ترس لە دڵی وڵاتانی دیکە پەیدا دەکا ، فرەنساش دانی بەو ڕێککەوتنەی مەدریدا نەنا بەو بیانویەی کە ئەوکاتەی فرانسوا ئەم ڕێککەوتنەی واژۆ کردوە دیل بوە بە ناچاری واژۆی کردوە و ئەوکات گیانی مۆرالیی تێکچوە بۆیە شەرعیەتی پێنادەن.

بەڵام دوای ئەوەی هاوپەیمانی پیرۆز کە لە ڤینیسیا و فلۆرەنسا و پاپا کلمنتی حەوتەم پێکدێ و هنریی هەشتەمی پادشای ئینگلتەراش بە فەرمی پشتگیریی دەکا، بەو هۆیەوە گلۆری ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم کەوتە لێژی بە تایبەتی لە ئیتاڵیا و دوای ئەوەی نەیتوانی شایستە و موچەی سەربازەکانی بدا، دوو لە پلەدارە بالاکانی، پسکار Pescara و کۆلۆنا Colonna لەدەست دەدا و سەرکەوتنی تورکە عوسمانیەکانیش لە دەریاوە، ئەمانە هەموویان دەبنە هۆی لاوازبوونی.

## بەدیلگرتنی پاپا لە ١٥٢٧

لە ١٥٢٧ ڕوداوێکی ترسناک ڕوویدا بەڵام کار ناکاتە سەر جەنگی ئیتالی کە لە نێوان چارلسی پێنجەم و فرانسوای یەکەم لە ئارادابوو، ئەو ڕووداوە کاریگەری لەسەر پەیوەندیەکانی نێوان ئیمپراتۆر وهەندێک لە شارەکانی ئیتاڵیادا هەبوو، سوپای ئیسپانی کە گەمارۆی شارەکانی ئیتاڵیایان دابوو موچەیان دوادەکەوێ ئەوانیش ڕاهاتبوون بژێویان لەسەر ئەو تالانیەی گوندانەبێ کە لە دەوروبەری شارەکان بوون، کاتێک دواکەوتنی مووچە درێژە دەکێشێ دەستیان بە جوولانەوەیەک کرد بریتی بوو لە تالان کردنی شارێکی ئیتالی، ئەو شارە لایەکی فلۆرەنسا بوو بەڵام تێیدا سەرکەوتوو نەبوون، ئەمجارەیان ڕوویان لە ڕۆما کرد، ڕۆماش کە شارێکی نیمچە کراوەبوو نەیتوانی بەرگری لە خۆی بکا ، ئیتر ئەو شارە دەکەوێتە بەر شاڵاوی تالانچیەکان، پاپا کلمنتی حەوتەمیش کە لەوێ



پاپا کلمنتی حەوتەم

دادەنیشێ بەدیلی کەوتە دەست ئەو تالانچی و راپەڕیوە ئیسپانی و جەرمانیانە، دیارە لەو هەرایە ئاژاوە گێڕە ئیتالیەکانیش دەچنە پالیان، بەم شێوە رۆما رووبەڕووی کاولکاری و تالان و راوڕوتێکی بێوێنە دەبێتەوە کە بەربەرەکانیش ئەمەیان بەسەر ئەو شارە نەهێناوە، بە هەزاران هاولاتی دەکوژرێن بە هەزاران ماڵ تالان دەکرێن و کاول دەکرێن.

بەدیل گرتنی پاپا کاریگەریەکی دیکەی بۆ ئینگلتەرا هەبوو، هنریی هەشتەم پادشای ئینگلتەرا ئەوکات یاداشتێک بۆ پاپا بەرز دەکاتەوە کە رێگەی بدا ئەو هاوسەرگیریەی لەگەڵ کاترینی ئەرجەوانی ئەنجام دابوو هەلوەشێنێتەوە، بەهۆی ئەوەی پاپا بەدیلی کەوتۆتە دەست ئیمپراتۆر ناتوانێ ئەو فەرمانە دەرکا هاوسەرگیری پادشای بەریتانیا ( هنریی هەشتەم ) لە کاترینا هەڵوەشێنێتەوە، کە لەرێگەی خزمایەتییەوە بەیەک گەیەندرابوون، ئەم رووداوە کاریگەری زۆری لەسەر بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی هەبوو، کە لە داهاتوو دێینە سەر باسی .

ئێستا ئیمپراتۆر بوە بەهێزترین کەس لە ئەوروپا، ناحەزانی ترسیان لێ نیشت ، لەدژی ئەو هەریەک لە فرەنسا وئینگلتەرا و ڤینیسیا لەسەر ئەوە رێک دەکەون کە کەلبەی

ئیمپراتۆر بشکێنن و پاپاتی لە ژێر ستەمی ئیمپراتۆر رزگارکەن. بۆ ئەم مەبەستە فرەنسا بە هاوکاری هاوپەیمانانی هێزێک پێکدەهێنێ و هێرش دەکاتە سەر ئیتاڵیا و زۆربەی خاکەکانی فلۆرەنسا و میرنشینی میلان دەخاتە ژێر دەستی خۆی، دواتر روو لە باشوور دەکا بێ ئەوەی توشی هیچ بەرگریەک بێتەوە تا دەگاتە دەوروبەری ناپۆلی و گەمارۆی دەدا، لە حوزەیرانی ١٥٢٨ ئەو شارە لەسەروبەندی کەوتندا بوو، ئەمە دوای ئەوەی فرەنسا گەمارۆکە توند دەکا بە شێوەیەک هێزەکانی فرەنسی پێشرەویان دەکرد هەندێک مەزندەیان وابوو هەموو ئیتاڵیا دەکەوێتە ژێر دەستی فرەنسا، بەڵام قەدەر وادەکا لە دوا ساتەکانیدا سوپای فرەنسی تووشی پەتایەکی کوشندە دەبێ زۆربەی هێزەکانی نەخۆش دەکەون و دەمرن تەنانەت هەندێک فەرماندەی باڵاشی بەم نەخۆشیە دەمرن، ئیتر ناچار دەبن پاشکەشە دەکەن، لە پاشەکشەدا توشی راوەدونان دەبن، هیچ ئومێدێکیان بە سەرکەوتن بەسەر ئیمپراتۆرچارلس دا نامێنێ، هەرکە پاپاش ناچار دەبێ رێککەوتنێک ئەنجام بدا ئیتر گورزێکی کوشندە بەر هاوپەیمانان دەکەوێ، ئەوەبوو پاپا لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٥٢٩ هاوپەیمانی بەرشەلۆنا لەگەڵ ئیمراتۆر واژۆ دەکا، بەپێی ئەو رێککەوتنە پاپا هەموو ویلایەتەکانی پاپایی رادەستی ئیمپراتۆر دەکاتەوە و خانەوادەی مەدیشی دەگەڕێتەوە سەر دەسەڵاتی حوکم لە فلۆرەنسا. لە بەرانبەردا لە شوباتی ١٥٣٠ پاپا تاجی نایە سەر ئیمپراتۆر رەزامەندیش بە پێدانی پادشانشینی ناپۆلی دەدا.

## ئاشتەوایی کامبری ١٥٢٩

سەرەڕای ئەو سەرکەوتنە یەک لە دوای یەکانەی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم بەدەستی هێنا لە دژی فرەنسا، گۆڕانکارییەکانی ناوەخۆ ئەوەندەی سەرقاڵ کرد کە بەری لە کارەکان نەمێنێ،ئەویش روداوەکانی بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی بوو کە پرۆتستانتەکان پێی هەلدەستان بۆیە هێزی لاواز دەبێ و فرەنساش لەولاوە هانی پرۆتستانتەکانی ئەڵمانیی دەدا کە دژی چارلس جولانەوە رێکبخەن، سەرەڕای ئەوەی فرانسوای یەکەم خۆی کاسۆلیک بوو بەڵام ئەمەی لە دژی چارلسی دەکرد بۆ لەبار بردنی تواناکانی.

ئەگەر ئیمپراتۆرچارلسی پێنجەم بە کاری چاکسازی و رووبەڕوو بونەوەیان سەرقال نەبوایە فرەنسا لەوپەڕی لاوازی دابوو بەڵکو لەسەر لێواری روخاندا بوو. بەم هۆیەوە دۆخی ئەنجام دانی پرۆسەی ئاشتەوایی لە نێوان ئەم دوو هێزە دەرەخسێ، ئەویش ئەنجامدانی ئاشتەوایی کامبری دەبێ لە ٣ی ئابی ١٥٢٩ ،ئەم پرۆسە ماوەی حەوت ساڵ دەخایەنێ،

بەپێی ئەو ڕێککەوتنە ئاشتەواییە پادشای فرەنسا فرانسوای یەکەم هەندێک لەوشوێنانەی لە دەستی دابوون بۆی دەگەڕێنەوە بەڵام بە یەکجارەکی دەستبەرداری مافەکانی دەبێ لە میلان و ناپۆلی وئەرسۆ و فلاندوز. دەسەڵاتی نیمچە دوورگەکانی ئیتاڵی بۆ چارلسی پێنجەم دەگەڕێنەوە، دەست بەسەر ناپۆلیدا دەگرێ و فرانسکو سفورزا و میلانیش دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت، جنوەش دەکەوێتە ژێر پاراستنی خۆی و پاپاش دەبێتە هاوپەیمان و ژێر بەرپرسیاریتی خۆی. ڤینیسیاشی بە شێوەیەک لاوازکر کە جارێکی تر نەتوانێ ڕووبەڕووی بوەستێتەوە.

چارلسی پێنجەم لە نیسانی ١٥٣٠ ئیتاڵیا جێدەهێلێ. پاش ئەوەی پاپا تاجی دەنێتە سەر ئەمەش یەکەم ئیمپراتۆرە لە مێژوی ئەوروپا کە بەدەستی پاپا تاجی بکرێتەسەر. لە وێوە ڕووی لە ئەڵمانیا کرد بەڵکو پرۆتستانتە کانی لادەر لە کاسۆلیک لەناو بەرێ. بەمەبەستی چارەسەری کێشە ناوەخۆیی و دەرەکیەکان ماوەی دوو ساڵ لە ١٥٣٠-١٥٣٢ لەوێ دەمێنێتەوە. مەترسیترین لەو کێشانە داگیرکردنی مەجەر بوو لەلایەن تورکە عوسمانیەکان و هەرەشە کردنیان بە داگیر کردنی ڤیەننا، بەم هۆکارە ئیمپراتۆر ناچار دەبێ لەگەڵ پرۆتستانتەکان ڕێککەوێ بۆ لەناو بردنی مەترسی و هەڕەشەکانی دەرەکی، کە پێی دەوترێت ڕێککەوتنی نۆرنبیرگ لە ١٥٣٢، دوای ئەوەی سوپایەکی بەهێز پێکدێنێ ڕاوەدوی تورکەکان دەنێ تا لە ناوچەکە وەدەریان دەخا.

لە کۆتایی ساڵ دەگەڕێتەوە ئیتاڵیا و چاوی بە پاپا دەکەوێ، دوای ئەوە هاوپەیمانێتیەکی بەرگری لەگەڵ سەرجەم ویلایەتە ئەلمانیەکان جگە لە ڤینیسیا واژۆ دەکا، لە بەهاری ١٥٣٣ دەگەڕێتەوە ئیسپانیا.

وێرای ئەو هاوپەیمانێتیەی بەرگری کە لەگەڵ ئیتاڵیا واژۆی کرد بەڵام پێگە و دەسەڵاتەکانی پارێزراو نەبوون. ئەوەتا پادشای فرەنسا فرانسوای یەکەم چاوی تۆڵەسەندنەوەی هەبوو کە پابەندی ڕێککەوتننامەی کامبری نەبێ، لەسەر ئەو بنەمایە هەلی بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی دەدا لەگەڵ پرۆتستانتە ئەڵمانییەکان و سوڵتانی عوسمانی، ئەمەو هەرچەندە پادشای فرەنسا پرۆتستانتەکانی وڵاتەکەی دەچەوساندەوە بەڵام بۆ بەرژەوەندی خۆی و لاواز کردنی پێگەی ئیمپراتۆر ئەم پەیوەندیانەی بەهێز دەکردن، لەهەمان کات هەولی بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ پاپا کلیمنت دەدا کە خۆی لە فرانسوای پادشای فرەنسا نزیک بوو، خۆیشی مەیلی ئەوەی هەبوو جنوە و میلان بگەڕێنەوە ژێر سایەی فرەنسا بەڵام لە ١٥٣٤ پاپا کلمەنت ی حەوتەم کۆچی دوایی دەکا. بە

و: خالید هەرکی

هەڵبژاردنی پاپای نوێ پاپا پۆلی سێیەم، فەرەنسا لەو پەیمانە بێبەش دەبێ کە پاپای کۆن کلمەنت بە فەرەنسای دابوو چونکە هەلوێست و پێگەی ئیمپراتۆر دووبارە بەهێز دەبنەوە.

هەرچۆنێکی بێ پادشای فەرەنسا فرانسوای یەکەم دەستبەرداری هەوڵەکان نابێ دووبارە شیەڕ هەڵدەگیرسێنێتەوە و هێرش دەکاتە سەر ساڤوای و تورین و داگیریان دەکا، هەرکە دەست بەسەر ساڤوای و پودمنتدا دەگرێ ئیمپراتۆر دکەوێتە خۆ بە سوپایەکی زۆرەوە هێرشی دەکاتە سەری، دووبارە شەڕ دەست پێدەکرێتەوە، کە دەبێتە جەنگی سێیەمی نێوان فرانسوا و چارلس، بەڵام ئەم جارەیان وەکو جارانی پێشوو ئەوەندە توند نابێ، شێوازی هێرش و توندوتیژ لەخۆ ناگرێ، لە نیس لە حوزەیرانی ١٥٣٨ ڕێککەوتنێک واژۆ دەکەن بۆ ماوەی دەساڵ. لەسەر ئەوە ڕێکدەکەون کە هەریەکە و لەسەر ئەو شوێنانە بمێنێتەوە کە بەشەڕ داگیری کردوە، بەم شێوە ساڤوای و بەشێک لە پدمونت لەبەر دەستی فەرەنسا دەمێنێتەوە.

چارلسی پێنجەم لەوکاتەوە بە کێشەکانی ناوەوە و دەرەوە خەریک دەبێ، کێشەکان بریتی دەبن لە کێشەی چاکسازی پرۆتستانتەکان لە ناوەوە و کێشەی فەرمانڕەوا موسلمانەکەی باکووری ئەفریکا خیرەددین بربروسە کە عوسمانیەکان بەهۆی ئەوەوە توانیان دەست بەسەر تونس و جەزائیردا بگرن، بەربروسە هێرشی دەبردە سەر کەشتیە ئەورووپیەکان لە دەریای سپیی ناوەڕاست و کەنارەکانی ئەورووپا لە ئیسپانیا و ئیتاڵیا، لە ئیسپانیا توانیی ٧٠٠٠٠ هاوڵاتیی مەغربی ئازاد بکا کە لەوێ دەچەوسێندرانەوە، هەر بەو ئازادکراوانە باکووری ئەفریکای پێ ئاوەدان کردن. ( کامیان چەوساندنەوەیە، لە ئیسپانیا کرێکاری بکەن یا لە باکووری ئەفریکا کاری بەزۆرەملێیان پێبکەن و شاریان پێ بنیاد بنێن؟ وەرگێڕ ).

دواتر هێرشی دەکردە سەر قەڵاکانی ئیتاڵی لە نزیک کەنارەکانی ناپۆلی، هێزی دەریاوانیی مەترسیی لەسەر کەشتیەکانی دروست کرد کە ئێمپراتۆر چارلس خاوەنی ئەو هێزە نەبوو، بەو هۆیەوە چارڵس بە هێزێکی زۆرەوە لە ئۆکتۆبەری ١٥٤١ هێرش دەکاتە سەر جەزائیر، بەڵام گەردەلوولێکی توند هەلدەکا دەبێتە مایەی شکست پێهێنانی هێزەکانی چارلس، بەناچاری و شکستخواردویی دەگەڕێتەوە ئیسپانیا.

فرانسوای پادشای فەرەنسا سوودی لەم هەلە وەرگرت کە چارلس شکستی خواردوە تا دووبارە شەڕێکی دیکەی لەگەڵدا هەلگیرسێنێتەوە بۆیە پێشێلی ئاگربەست دەکا و لە ١٥٤٢ جارێکی دیکە هێرش دەباتەوە، ئەمەش دەبێتە دوایین جەنگی نێوان چارلس و فرانسوا.

چونکە ئەوکات فرانسوا هاوپەیمانیی لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیەکان هەبوو بەوهۆیەوە هەلوێستی لاواز دەبێ لە بەرانبەر گەلانی ئەوروپا، لەبەر ئەم هۆکارە پشتگیری چارلس دەکەن، لەلای خۆیەوە چارلس لە ١٥٤٣ توانیی هنریی هەشتەم پادشای ئینگلتەرا بکاتە لایەنگری خۆی، هەردووکیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بە هاوبەشی هێرش بکەنە سەر فرەنسا، بەڵام هنری ئەو هێرشەی بە تەنیایی ئەنجام دا، لەجیات پێشڕەویکردن بەرەو ناوەوەی فرەنسا کاتەکەی لە گەمارۆدانی بۆلۆنی Boulogne بەفیرۆدا.

هەرچی چارلسی پێنجەمە سنوورەکانی فرەنسا بڕەکا و بەرەو پاریسی پایتەخت هێرش دەبا، چونکە متمانەی بە هنریی هەشتەم نەبوو و بیری لای ئەڵمانیاش بوو کە دەبوایە لەوێ ئامادە بێ لەبەر ئەو ڕووداوە ناوەخۆییانەی، لەپڕ بیرۆکەی ئاشتەوایی دەخاتە بەردەم فرەنسا، دیارە فرانسواش هیچ سەرەکەوتنێکی بەدەست نەهێنابوو بۆیە بەو بیرۆکە ڕازی دەبێ و هەردووکیان ڕێککەوتنی کرسپی لە ١٥٤٤ واژۆ دەکەن.

## پەیمانی کرسپی Crespi

بەپێی ئەو پەیماننامەیە ناپۆلی و تجلۆ هەر داخوازیەکیان لەسەر پیدمنت و سافوای هەبێ، فرەنسا نابێ پشتگریان لێبکا. ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەمیش دەستبەرداری مافی برجندیا دەبێ، دواجار هەردووکیان لەسەر هاوسەرگیرییەکی سیاسی ڕێککەوتن ، کە کچی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم یا کچە خوشکەزای، بدرێتە کورە بچووکی پادشای فرەنسا، فرانسوای یەکەم کە شازادە ئورلیان بوو، مارەییەکەشی کە بوک پێشکەشی دەکا یا زەویە نزمەکان دەبن یا میرنشینی میلان.

## مردنی فرانسوای یەکەم:

لە مانگی مایسی ١٥٤٧ پادشای فرەنسا فرانسوای یەکەم کۆچی دوایی دەکا بێ ئەوەی هیچ لە ئامانجەکانی لە نیمچە دورگەی ئیتاڵیا بهێنێتە دی، دوای ئەو هنری دێتە سەر حوکم کە لەگەڵ یەکێک لە شازادەکانی خانەوادەی مدیشی کە حوکمی فلۆرەنسا دەکەن هاوسەرگیریی کردبوو، ئەویش کترین دی مدیشی بوو کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو، کاریگەری مێژوویی لەسەر فرەنسا دروست کرد لە داهاتوو دێینە سەر باسی.

و: خالید هەرکی

## هنریی دووەم (١٥٤٧-١٥٩٩)




لە کاتی هاتنە سەر دەسەڵات هنریی دووەم دوو کێشەی توش هات:

**یەکەمیان/**

کێشە و ململانێی نێوان فرەنسا و ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم.

**دووەمیان/**

ا. چاوتێبڕینی ئینگلتەرا لە باکووری وڵات . ب. دوژمنایەتی پادشای ئینگلتەرا هنریی هەشتەم لەسەر خاکی فرەنسی لە باکور . ج. داگیرکردنی کەلێنێکی بولونی Boulogne لە کۆتایی ماوەی حوکمڕانیی پادشای کۆچکردوو فرانسوای یەکەم، لەسەر فرەنسا بوو هەول بدا ئەوەی ئەو کەلێنەی بۆلۆنی لەژێر دەستی ئینگلتەرا وەرگرێتەوە، ئەوکاتەی کێشە لە نێوان چارلس و هنری دروست دەبێ ئیمپراتۆر چارلسس لەوپەڕی بەهێزیدا دەبێ. ئەمەش بەهۆی بەسەر کەوتنی بەسەر حاکمەکانی ویلایەتە پرۆتستانتیە ئەلمانیەکان لە ١٥٤٧ لە گەورەترین کێشە رزگاری ببو و چنگی بە تەواوەتی لە ئەڵمانیا گیر کردبوو. هنری پێی وابوو نابێ کارەکان لە بەرژەوەندی ناحەزەکەی ئەنجام بدا.

پەیوەندیی بە سەرکردە پرۆتستانتەکانەوە کرد بۆ وروژاندن و هاندانیان لە دژی ئیمپراتۆر، هەرچەندە خۆی کاسۆلیکێکی توندڕەو بوو، گرێبەستێکی لەگەڵیان مۆر کرد کە لە بەرانبەر هاوکاری کردن و لەخۆگرتنی تێچوی شەڕیان لەگەڵ ئیمپراتۆر مافی دەست بەسەردا گرتنی شارەکانی تول و متز و ڤردانی پێبدەن کە هەموویان فرەنسی زوبان بوون دەکەوتنە سەر سنوورەکانی فرەنسا بەم شێوە سنوورەکانی دەگەنە ئەلزاس و لۆرین.

لە شوباتی ١٥٥٢ هنری هێرش دەکاتە سەر سنوورەکانی ئەڵمانیا و لە روباری میز دەپەڕێتەوە و دەست بەسەر فردان و تول و متزدا دەگرێ ، لەم هێرشەیدا میرە ئەڵمانییە هاوپەیمانەکان هاوکاریی دەکەن، چارلسی پێنجەم ناچار دەبێ بەرپەرچی ئەم هێرشەی بداتەوە و شارەکانی لەدەست دەربێنێ، بە هێزێکی زەبەلاح لە ئەڵمانیا و ئیسپانیاوە

گەمارۆی دا، بەڵام هێرشەکەی بێ سود دەبێ و شکست دێنێ، بەو هۆیەوە دەست لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی هەڵدەگر ئەمەش کارەساتێکی مەزن بوو بۆئەو دەست لەکار کێشانەوەکەی بۆ فەردیناندی برای جێهێشت ، مومتەلەکاتی ئیسپانیاش کە بریتی بوو لە زەویە نزمەکان ودونیای نوێ، هەمووی بۆ فیلیپی کوری جێهێشت کە ماوەیەک پێش ماری تیۆدۆری کچی پادشای ئینگلتەرای بۆ هێنابوو، ئەمەش دیارە هاوسەرگیرییەکی سیاسی بووە بۆ ئەوەی ئینگلتەرا لەتەک ئیسپانیا بوەستێ ، ئەم دەست لەکارکێشانەوە بە فەرمی لە ئۆکتۆبەری ١٥٥٥ راگەیەندرا و ئەو چەند ساڵەی لە ژیانیدا مابوو لە ئیسپانیای بردە سەر تا لە ساڵی ١٥٥٨ کۆچی دوایی دەکا.

## بەردەوامیی جەنگی ئیتاڵی:

ئێستا فیلیپ بوە پادشای ئیسپانیا و بەرپرسی زەویە نزمەکان کە بریتی بوون لە ناپۆلی و میلان لە ئیتاڵیا کە دوای سەرەکوتنەکانی بەسەر پادشای فرەنسا وەدەستی هێنا . وێرای وەدەست هێنانی ئەو شوێنانەی هەرەشەی لە رۆمای بارەگای پاپا دەکرد.

پاپا دوژمنی سەرسەختی ئیسپانیەکان بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم پرۆسەی ئاشتەوایی لەگەڵ پرۆتستانتەکانی دوژمنانی کاسۆلیک ئەنجامدا، بۆیە پاپا رق و کینەی لە خانەوادەی هابسبورگ هەڵگرتبوو، لە ئیمپراتۆر فەردیناردیش تورە بوو چونکە پەیمانی ( ئەجزبرگ )ی واژۆکردوە کە ئازادی ئاینی بە لایەنگرانی لۆسەر دەبەخشێ.

بۆیە پاپا بیری لە هاوکاری فرەنسا کردەوە و داوای لێکرد، پادشای فرەنساش بەپیر داواکەیەوە چوو هێزێکی مەزنی بە فەرماندەی ( فرنسوا دی گیز )ی بۆ نارد، ناوبراو فەرماندەیەکی بەهێزو بەتوانای فرەنسی بوو . لە سەپتەمبەری ١٥٥٦ جەنگی ئیتالی لە سەرخاکی ئیتاڵیا دووبارە دەبێتەوە. ئیسپانیەکان لە ناپۆلیەوە هێزەکانیان بەرەو رۆما جوڵەیکردو هێزەکانی پاپایان بەزاند، فەرماندە فرەنسیەکە نەیتوانی قەڵا و سەنگەرەکانی ناپۆلی گەمارۆ بدا، بەو هۆیەوە پاپا ناچار دەبێ بەو ئاشتەواییە رازی بێ کە ئیسپانیەکان خستیانە بەردەمی، بەپێی ئەو رێککەوتنە ئیتاڵیا دەکەوێتە ژێر پاراستنی ئیسپانیا و ئەو هاوپەیمانیەی لە نێوان پاپا و هنریی دووەم ئەنجام دراوە دەبێ هەلوەشێتەوە، پاپاش وەکوو یەکێک لە دلسۆزانی کڵێسا دەبێ پێشوازی لە پادشای ئسیپانیا بکا.

و: خالید هەرکی

وێڕای ئەو شکستەی، فرەنسا جارێکی دیکە لە ١٥٥٦دێتەوە مەیدانی شەڕ دژی ئیسپانیا بەڵام ئەم جارەیان ئینگلتەرا دەکەوێتە سەنگەری ئیسپانیا، ئەمە بە کاریگەری فیلیپ لەسەر هاوسەرەکەی (ماری تیۆدۆر) بوە کە شازادەی ئینگلتەرا بوو، هێزەکانی ئیسپانیا و ئینگلتەرا توانیان گەمارۆی کرێگیراوان بدەن لە شاری سانت کوینتین Saint Quentin لە باکووری فرەنسا بەسەریاندا زاڵ بوون، لە بەهاری ١٥٥٧ ئەو شارە دەکەوێتە دەست ئیسپانیا و ئینگلتەرا. ئیتر رێگای بەرەو پاریس والا دەبێ، هێرشەکان بەردەوام دەبن بۆ گرتنی پاریس تەنانەت چارلسی پێنجەم ئیمپراتۆری لەکار کەوتوو کە لە گۆشەگیری لە کڵێسایەک ژیانی دەبردە سەر لەپشکۆی ئاگر گەرمتربو، پەلەی بو تابینێ فیلیپی کوڕی پاریسی داگیرکردوە، بەڵام ئەم ئامانجەیان سەری نەگرت فرەنسیەکان گەڕانەوە مەیدانی شەڕ هێرشەکانیان توند کردن توانیان شار( کالیە ) لە ١٥٥٨ لە ئینگلیزەکان بستێننەوە، بەم دژە هێرشە ئینگلیزەکان دوایین پێگەی داگیرکراوی فەرەنسییەکان لەدەست دەدەن.

## پەیمانی کاتو کەمبرسیس ١٥٥٩ Cateau Cambersis

هەردووک لایەنی شەڕکەر ئیسپانیا و فرەنسا هەستیان بەوەکرد کە شەڕ ماندووی کردوون لەو ماوەی پەنجاساڵەی شەڕدا توانای مادی و گیانی زۆریان لێ لەبەین بردوون بێ ئەوەی هیچکامیان بتوانێ بەسەر ئەوی دیکەدا سەرکەوێ یا لەناوی بەرێ، جگە لە دەستکەوتنی هەندێک پێگەی داگیرکراو لەلایەن ئیسپانییەکانەوە، لە ١٥٥٨ دەرفەتێک دەرەخسێ بۆ پەیوەندی و ئامادەسازی کۆتایی هێنان بەو ناکۆکیانە کە بە جەنگی ئیتاڵی ناوی دەبردرێ، داجار رێککەوتنێک لە شاری کاتو کمبرسیس ئەنجام دەدرێ کە شارێکی بچووکە لەسەر سنوورەکانی نێوان فرەنسا و بەلژیک، بەپێێ ئەو رێککەوتنە:

یەکەم/

فرەنسا دەستبەرداری ئەو مافەی دەبێ کە گوایە لە ناپۆلی و میلان هەیەتی و داوای دەکرد، بەم پێیە حوکمی ئیسپانیی لێ دەچەسپێ، ئەمە و دەستبەرداری مافەکانی لە سافۆری دەبێ کە بریتی بوو لە سافۆی و پیدمنت ( یا پادشانشینی سەردینیا کە واوتر ئەم ناوەی لێنرا ) .

**دووەم/**

فرەنسا مافی خاوەندارێتی سێ ئەسقوفی هەیە کە هنریی دووەم دەستی بەسەردا گرتوون، ئەمانیش: متز، تول. فردان بەڵام بەناو سەربە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی پیرۆز دەبێ، ئەم دەستکەوتەی فرەنسی کاریگەری ئەرێنیی هەبوو بۆ ئەوکاتەی دوای دوو سەدە لە واژۆکردنی ئەو ڕێککەوتنە هەرێمی لۆرین داگیر دەکا، ئەم ڕێککەوتنە زیاتر دەچەسپێ کاتێک هاوسەری فیلیپ پادشای ئیسپانیا ( کاترینای شازادەی پادشای ئینگلتەرا ) دەمرێ دوای ئەو هاوسەرگیری لەگەڵ ئێلیزابیتی کچی هنریی دووەمی پادشای فرەنسا دەکا.

هاوپەیمانی کاتو کەمبرسیس سەردەمێکی نوێی لە ئەوروپا و دونیا داهێنا. کۆتایی هێنان بوو بە جەنگێکی چل ساڵەی نێوان فرەنسا و ئیسپانیا ، دواتر کۆتایی بە مشتومڕەکانی نێوان فرەنسا و خانەوادەی هابسبورگیشی هێنا، بەڵام مێژوونوسەکانی هاوچەرخ دەڵێن ئەو ڕێککەوتنە کارەساتی بەسەر فرەنسادا هێنا، پێیان وابوو پادشای فرەنسا هنریی دووەم سازشی لەسەر خاک و مافی فرەنسا کردوە، بایەخی بە بەهاکانی فرەنسی نەداوە، پێیان وابوو کە پادشای ئیسپانیا فیلیپ لەو شەڕانە ماندوو ببو نەختێکی دیکە ئارامی بگرتبا ئەو خۆی سازشی بۆ فرەنسا دەکرد، بەڵام پادشا فرەنسایان هار دەکرد بۆ ئەوەی کۆتایی بەو جەنگە بێنی و ڕوو لە لەناوبردنی ئەوانە بکا کە لەکاتی بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی لە ریزەکانی کاسۆلیک دەرچوونە.

لە ڕاستیدا جەنگی ئیتاڵی کە بە هاوپەیمانی کاتو کەمبرسیس کۆتایی هات بەڵام کەوتبووە سەردەمێک جەنگی ئاینی لە هەموو وڵاتەکانی ئەوروپا و لە نێو گەلانیدا گری سەندبوو، تا ساڵی ١٦٤٨ ئەو جەنگە ئاینیە بەردەوام دەبێ، ئەو ساڵە ساڵی کۆتایی هاتنە بە جەنگی سی ساڵە کە بە پەیماننامەی وستفالیا کۆتایی هات.

* * *

# بەشی پێنجەم

## بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی

بزووتنەوەی ئاینی لە ئەوروپا شۆڕشێکی کتوپڕی نەبوو، بەڵکو بزووتنەوەیەک بوو ریشە و رەچەلەکی لە مێژوی کڵێسای کاسۆلیکدا هەبووە. لە سەدەکانی ناوەڕاست و چەرخی نوێدا گەلێکجار رووبەڕووی مەترسی بۆتەوە بەڵا هەموو جارێک توانیویەتی ئەم مەترسییانە تێپەڕکا. دەتوانین ئەو مەترسیانە بکەین بە دوو بەشەوە:

### مەترسی یەکەم/

ئەو مەترسیانەی لە چەرخەکانی سەرەتاوە رووبەڕووی دەبوونەوە لەسەر پرسێکی ئاینیی دیار. لەوانە دەرکەوتنی ئیسلام و بڵاو بوونەوەی لە سەدەی حەڤدەهەم، دەرئەنجامەکەی دەبێتە رووخانی قوستەنتینیە بەدەستی تورکەکان لە سەدەی پانزەهەم ( ئەمە کەی دەرەنجامی دەرکەوتنی ئیسلامە کە حەوت سەدە دواتر روو دەدا.. ( وەرگێڕ) هێرشی مەغۆلەکان لە رۆژهەلاتەوە بەرەو ئەوروپا، بەڵام لە راستیدا ئەم مەترسییانە بوونە مایەی یەکگرتنی کڵێسا لە دژی مەترسییە دەرەکیەکان.

### مەترسی دووەم /

ئەوکاتە دەست پێدەکا کە فشارەکانی دەرەکی بۆ سەر کریستی و ئاینەکەیان کەم دەبنەوە ئەوکات پاپا بەر فشارو هەژانێکی توند دەبێتەوە، ئەمەش لە سەدەی دوانزە و سیانزە بووە کاتێک دەسەڵات و پێگەی پاپا لە بەهێزیدا دەگاتە لوتکە بەڵام دواتر بەم شێوە نامێنێ وەکو سەرۆکی کەلیسای کریستی وحاکمێکی دونیایی کە دەسەڵاتەکانی لە هی پادشا و حاکم کەمتر نبوون، دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو، ململانێ و کێبەرکێی لەگەڵ پادشاکاندا دەکرد چونکە هەمان دەسەڵات بەڵکو زیاتریشی هەبوو خاوەن کۆشک و تەلاری حوکمڕان بوو، بەڵام پاپا لە سەدەی چواردە ئەم دەسەڵاتانە لە دەست دەدا بەتەواوەتیش

لە نێوانساڵەکانی ١٣٠٥-١٣٧٧ کاتێک ئەنجومەنی کاردیناڵەکان سەرۆکی ئەسقوفەکانی ( مەتران ) بۆردۆی لە فرەنسا هەڵبژارد وکردیانە پاپا، ڕێورەسمی پاپاییان لە جیات رۆما لە لیون بۆ پاپا کلمەنتی پێنجەم ئەنجامدا، شاری ( ئەڤینون ) کەدەکەوێتە سەر رووباری ( رون ) وەکو بارەگای نوێی پاپا دەست نیشانکرا، ماوەی ٧٢ ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە و سەر بە پادشایەتی فرەنسا دەبێ، لەو ماوەیەش ناویان لێنا خانەوادەی پاپایی، بەم شێوە پاپا زۆر لە ناوبانگ و پێگەی لەدەستدا.

## دابەشبوونە مەزنەکە:

لە ١٣٧٨ لەتبوونێک لە نێو پاپایی مەزن Great Papal Schism لە ١٣٧٨-١٤١٧ رویدا پێگەی پاپا زیاتر لاواز دەکا، ئەم دابەش بوونە لەنێو کاردیناڵەکان رودەدا لەم میانە دوو پاپا هەڵدەبژێردرێن یەکیان بۆ ئەڤینون ئەویتریان بۆ رۆما، لەوکاتەوە نیشانەکانی دابەشبوون و جیابوونەوە لە نێو دونیای کریستی دەردەکەوێ. ئەمەش لە ئەنجامی ناکۆکی و دووبەرەکیی نێو پاپای فرەنسییەوە بوو.

دوای ئەوە دەسەڵاتەکانی پاپا دەبنە مایەی گومان و مشتومڕ، دواجار دونیای کریستی بۆ چارەسەری ئەم کێشە و دابەشبوونە لە کۆنستانس Constance لە ١٤١٤-١٤١٧ کۆدەبنەوە تا یەک پاپا بۆ دونیای کریستی هەڵبژێرن ئەویش مارتن ی پێنجەم بوو کە رۆما تاقە بارەگای ئەوبێ. کە پێگەی پاپا لاوازبوو ئەوان پشت لە کڵێسا دەکەن و ئەوەی گرنگ دەبێ لای ئەوان کۆکردنەوەی سامان و سەروەت و نزیککردنەوەی خزم و دۆستانیان دەبێ. بەو هۆیەوە نارەزایی لە رەفتارەکانی پاپا سەرهەڵدەدەن و داوای چاکسازی دەکەن، بزووتنەوەی چاکسازی کە دروست دەبێ بە دوو قۆناغدا تێدەپەڕێ:

### قۆناغی یەکەم/

بانگخوازانی ئەم قۆناغە داوایان لە کڵێسا دەکرد چاکسازی لە نێو خۆیاندا ئەنجام بدەن، کارەکان بخەنە دەست ئەوکەسانە بە پاکی کاری کڵێسا دەبەن بەڕێوە و دەتوانن کارەکان ڕێک بخەنەوە.

و: خالید هەرکی

**قۆناغی دووەم/**

بانگخوازانی ئەم قۆناغە داوایان دەکرد کاربەدەستانی کڵێسا بەوە رازی بن لایەنێکی دەرەکی چاکسازییان بەسەردا بسەپێنێ چونکە ئەوان لە بەڕێوە بردنی کارەکان سەرکەوتوو نەبوون و چاکسازییان پێنەکرا.

لە قۆناغی یەکەم چاکسازخوازان یوحەنا روکلن ( ١٤٥٥-١٥٢٢) و ئیرزم (١٤٧٧-١٥٣٦) بوون، یەکەمیان بە نووسین و کتێبەکانی رەخنەی توندی دەگرت و خەڵکی بیرمەند و رەوشەنبیری دەوروژاند، بەو هۆیەوە بوونە خاوەنی هەوادارو و لایەنگرێکی زۆر، بەدوای لایەنە نەرێنیەکانی کڵێسادا دەگارن و خەڵکیان بە بیرۆکەی چاکسازی ئاشنا دەکرد.

هەرچی ( ئرزم ) بوو رای گشتیی لە دژی پاپا پێدەگەیاند، لایەنە خەراپەکانی پاپای ئاشکەرا دەکرد، بیرۆکەی باشی نیشان خەڵک دەدا، باشترین کار کە کردی وەرگێڕانی کتابی پیرۆزی یۆنانی کۆن بوو ، کاریگەری ئەم کتێبە لەسەر ئازاد کردنی هزری مرۆڤ زۆر بوو، بۆ رزگار بون لە چنگ دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی، یەکێک لە کاریگەریەکانی، ئەم کتابە لە ١٥١٦ بلاو کرابۆوە لە دەقی یۆنانی وەرگیرابوو، لەوێ دەردەکەوێ کە دەقە ئۆرجینالەکەی کتابی پیرۆزی لاتینی کە کلێسا پشتی پێبەستبوو بەڵگەنامەیەکی ئۆرجینال نییە و هەلەی زۆری تیایە، بۆیە ئەمە بووە رێگایەک بۆ لە ئاین گەیشتن بە شێوەیەکی تەندروست. شیکارییەکانی بۆ سەرزمانی ئینگلیزی وەرگێردرا، بەم شێوە هەردووک ( روکان و ئرزم ) دۆخێکیان خولقاند کە بەرەنگاری کڵێسا ببنەوە و زەمین خۆشییەک بێ بۆ قەبولکردنی بیرۆکەی چاکسازی ئاینی، هەرچەندە ئەوان داوای دەرچوونیان نەدەکرد لە کڵێسای کاسۆلیکی بەڵکو داوای چاکسازی کڵێسایان دەکرد لە ناوەوەیدا. دوای ئەوەی کڵێسا رازی نابێ بەو بیرۆکەی چاکسازییە لە ناوەوە ئەنجام بدرێ. ئیتر قۆناغی دووەمی چاکسازی دەست پێدەکا کە بە رێگەچارەکانی دیکە دەبێ، خەڵکانێکی دی دێنە مەیدان بە شێوازێکی جیا، یەکێک لەو چاکسازاخوازانە مارتن لۆسەر دەبێ، یەکەم فەرماندەی چاکسازی ئاینی لە مێژوی ئاینی کریستی ئەو شۆڕشەی کە لە ئەڵمانیا سەر هەڵدەدا.

ئەم شۆڕشە بۆیە لە ئەڵمانیا سەری هەڵدا چونکە ئەڵمانیا دۆخێکی تایبەتیی هەبوو ، ئاینی کریستی و بیروڕاکانی لە ئیتاڵیا و لە بارەگای پاپا دەبێ، ژمارەیەک لە بیرمەند لە ئەنجامی رەخنەگرتن لە رەفتارەکانی پاپا تووشی تەنگ و چەڵەمە هاتن، بڵاو بوونەوەی چاپخانە لە باکووری ئەڵمانیا کاریگەریی هەبوو لەسەر بلاوکردنەوەی بیرو بۆچوونەکانیان،

بەهۆی ئاسانی بڵاوکردنەوە ڕەوشەنبیران لە بیروبۆچوونەکانیـان ئاگـادار دەبـوونەوە و گەورە نووسەرانیش لەو ڕەخنانە بەشداریان دەکرد.

دیارە هەڵوێستی سیاسیی ئەوکاتی ئەڵمانیا کاریگەریی هەبووە لەسەر ئاسانکاری بـڵاو بوونەوەی ئەو هزرو بیرۆکانە و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئاینی. ئەڵمانیا ئەوکات بەسەر سـەدان ویلایەتی بوکدا دابەش ببـو، تەنها بەنـاو خۆیـان بە بەشـێک لە ژێـر سـایەی دەسـەڵاتەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەزانی کە نە مولکیەتی بۆیان دەگەڕێتەوە نە دەسـەڵاتی بەسـەریاندا دەشکا.

وڵات هەمـووی بە قەیرانێکـی ئـابووری و دەروونـی و کۆمەڵایەتیـدا تێـدەپەڕی، ئەم قەیرانانە هەموویان لە گەڵ سەرەتای چەرخی نوێ سەرهەڵدەدەن، چینی مامناوەندی بۆرژوا لە هەوڵی بەدەست هێنانەوەی سامان و سەروەتەکانیان دابوون کە لە چەرخی ناوەڕاسـت لە سایەیدا دەژیان، ئەوکات ئەڵمانیاش لە ناوەڕاستی ئەوروپا  بە ئاستێکی بژێوی بەرز دەژیا.

هەروەها ژمارەیەکی کەمی خانەدانی بچووک چینێکی تایبەتیان بۆخۆیان پێـک دەهێنـا بەناوی چینی ( سـوارچاکان ) Knights ئەوان لە چەرخـی ناوەڕاسـت ڕۆڵێکـی شـەڕکەرو مەترسـیداریان دەبـێ. هەرکە ئیمپراتـۆر گەمـارۆی ئەو ویـلایەتە بچوکـانە دەدا کە هەریەکەو میرێک ڕابەرایەتیی دەکرد، سـوارچاکەکان پـێگەو بایەخیـان لەدەسـتدا، هـیچ سـەرچاوەیەکی پەیداکردنی ڕزق و خۆدەوڵەمەند کردنیان نەما جـگە لە دزی و ڕاووڕوت کـردن نەبـێ، لەگەڵ ئەمەشدا پاشخان و پێگەی باڵای خۆیان لەبەر چاو بوو بـۆیە هەمیشـە بە گلەیـی و گازانـدە بوون.

چینی میر و خانەدانەکانیش لە سامان و پێگەی خۆیان دڵنیا نەبوون کە کەس هەبێ پشتگیریان لێ بکا، باج و شایستەکانی حکومەتیش فشـاری خستبوونەسـەرو باریـان قـورس کردبـوون، لەمەش ئاگـادار بـوون کە سـامان و سـەروەتی وڵات دەچێـتە گیرفـانی کڵێسـا و پاپاکانەوە ئەمـانیش بارەگاکانیـان لە دەرەوەی وڵاتە . ئەو وڵاتە بێگانـانە بارەگـا و پـێگەی بەهێزیان لە وڵاتەکەی ئەمان دامەزراندوە ئەمەش مەترسیيەکی مەزنیان لەسەر دروست دەکـا کە دەست لە کاروباری کڵێسا و دامەزراندنی ئەو فەرمانبەرانەدا وەردەدەن کە داهاتی کڵێسا کۆدەکەنەوە و لە چنگی بێگانەی دەکەن.

ئەمە هەموو ئەو گلەیی و گازاندانەی هاوڵاتیـانی ئەڵمـانی بـوون لە کڵێسـای ڕۆمـانی، بەو هۆیەوە ئەڵمانیا زەمینەی خۆش بـوو بـۆ بـزووتنەوەی چاکسـازی ئـاینی و سـەرهەڵدانی

و: خالید هەرکی

شۆڕشی ئاینی، لەم ساتە بزووتنەوەی مارتن لۆسەر سەر هەڵدەدا وەکو بزووتنەوەیەکی چاکسازی بۆ چاککردنی دۆخی ئەوسای ئاینی کریستی و کڵێساکەی.

## چاکسازی ئاینی لە ئەڵمانیا:

ئەڵمانیا بەر لە چەرخی نوێ بریتی بوو لە پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆز. ئەو ئیمپراتۆریەتەش بریتی بووە لە یەکگرتنی سەدان ویلایەتی نیمچە سەربەخۆ، کاتێکیش مکسملیانیی دەبێتە ئیمپراتۆر لە ١٤٩٣-١٥١٩ لە ئەڵمانیا رێنسانسێکی نەتەوی سەرهەڵدەدا بەڵام ناگاتە ئاستی دامەزراندنی حکومەتێکی ناوەندیی بەهێز، بزووتنەوەی رێنسانس لە ئەوروپا کاریەگریی هەبوو لەسەر داهێنانی هزری لە ئەقلی ئەڵمانیەکان. بەهۆی دۆخی تایبەتیی ئەڵمانیاوە ئەو رێنسانسە لە شێوازی ئاینی و بەناوی بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی دەردەکەوێ. لەو کاتەی لە چەرخی ناوەڕاست ئەو گوتەیە جێگیر دەبێ کە دەڵێ ( پاپا سێبەری خواوەندە لەسەر زەوی ) لەوکاتەوە کڵێسای ئەڵمانیا بە شێوەیەکی مەترسیدار دەست بەسەر بڕیارەکانی ئەڵمانیادا دەگرێ و کۆنترۆلی دەکا. ئەم بیردۆزە ئەوەیە کە پادشا و ئیمپراتۆرەکانی ئەوروپا لە دەسەڵات دوور بکەونەوە، ماف بە پاپا دەدا دەست لە کاروباری سیاسی و ئاینی وڵات وەردا، بەپێێ ئەوەی کە دەسەڵاتەکان لە خواوە پێی دراوە، چونکە پادشاکان بڕوایان وابوو دەسەڵاتەکانی پاپا لە خواوەیە بۆیە مافی هەموو دەستێوەردانێکیان هەیە، بەو هۆیەوە پاپا دەسەڵاتەکانی لە هی پادشا کەمتر نەبوو سامان و سەروەتی کڵێساش لە هی پادشا کەمتر نەبوو، پاپا بە هەوەستی خۆی باجی دەخستە سەر کاڵا و زەوی و زار، باجەکانی وەردەگرت و بەبێ لێپێچانەوە لەو بوارەی کە خۆی مەرامیەتی خەرجی دەکرد، هەر خۆی پیاوانی ئاینیی بۆ کڵێساکان دادەمەزراند بێ ئەوەی هیچ لە کارمەند یا پادشای وڵات دەسەڵاتی لەسەربێ.

لە چەرخی رێنسانس لە هەندێک وڵاتی ئەوروپی وەکو ئینگلتەرا و ئیسپانیا و فرەنسا پادشای بەهێز دەسەڵات دەگرنە دەست و تاجی پادشایەتی دەنێنە سەر هەلدەستن بە سنووردار کردنی دەسەڵاتەکانی پاپا تا ئاستێکی باش تێیدا سەردەکەون.

لە فرەنسا چارلسی پێنجەم لە ١٤٣٨ مەرسومنامەیەک دەردەکا بەپێی ئەو مەرسومنامە دەسەڵاتەکانی پاپا و دەستوەردانی لە کاروباری کڵێسای کاسۆلیکی لە فرەنسا دیاری دەکا،

ئەوو ئەوانەی دوای ئەویش دێن خۆیان مەتران و پیاوانی دیکەی ئایینی دادەمەزرێنن کە پێشتر دەسەڵاتی پاپا بووە .

لە ئیسپانیا لە سەردەمی فەردیناند وئیزابیلا مافی پادشا بوو پیاوە ئاینیەکان دامەزرێنێ، لەم ڕووەوە یەکەمین مەرسومنامە لە ١٤٤٢ دەردەچێ، فەرمان درا ئەو بڕیارانەی لە دادگای ئاینی ئیسپانیا دەردەچن، نابێ لەبەردەم دادگا باڵا لە ڕۆما پێداچوونەوەیان بۆ بکرێ.

لە ئینگلتەرا دەسەڵاتەکانی پاپا لە سەدەی چواردەمەوە وردە وردە کەم دەکەن تا بە یەکجارەکی لە دەسەڵاتەکانی پاپا و دەستوەردانیان لە کاروباری ئاینی وڵات ڕزگاریان دەبێ.

بەڵام لە ئەڵمانیا بەهۆی لاوازی ئیمپراتۆر فەردیناندی سێیەم کە ٥٣ ساڵ حوکمی گێڕا ١٤٤٠-١٤٩٣ کڵێسای ڕۆمانی دەسەڵاتەکانی دەپارێزێ، بەڵکو بەهێزتریش دەبن، ئەم دەسەڵاتەی پاپا لە ڕێککەوتنی ڤیەنا لە ١٤٤٨ ئیمپراتۆر دانی پێدا دەنێ بەو هۆیەوە پاپا مافی لە ئەڵمانیا دەپارێزرێ و هەمان دەسەڵاتی دەبێ کە پێشتر لە سەدەکانی ناوەڕاست هەیبووە.

لە ئەڵمانیا هەندێک لە پاپاکان ستەمیان لەو خەڵکە دەکرد و خۆیان بەسەریاندا دەسەپاند، پیاوە ئاینیەکانی خۆیان دەناردنە ئەڵمانیا بۆ کۆکردنەوەی پارە لەو خەڵکە. نێردەکانیان هەموو کارێکی نەشیاویان ئەنجام دەدا، لە بێزار کردنیان و وەرگرتنی بەرتیل لە هاوڵاتیان لە بەرانبەر دامەزارندنیان، بەبیانوی نزیک بوونەوەی جەنگی خاچپەرستی پارەیان لەو خەڵکە کۆدەکردەوە گوایە لەگەڵ تورکەکان دەکەونە جەنگ، ئەمەو بە چەندین بیانوی دیکە، لەو سەردەم پاپاکان لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا بوون لەسەر حسابی هاوڵاتیان و بە ڕێگای ناڕەوا.

ئەنجومەنی نوێنەرانی ویلایەتەکانی ( ریخستاج ) ئەڵمانی بێدەنگ نەبوون لە دەربڕینی ناڕەزایی و ئاشکەرا کردنی کارە ناڕەواکانی پیاوە ئاینییەکان، نامەی یەک لەدوای یەکیان بۆ ڕۆما دەنووسی.

ناشیرنترین کاری قێزەوەنیان فرۆشتنی کارتی لێبووردن بوو کە بە هاوڵاتیانیان دەفرۆشت گوایە لە بەرانبەر کرینی ئەو کارتانە گوناهیان نامێنی. خۆی داهێنانی ئەو کارتانە ( چەک ) بۆ ساڵەکانی ١٣٠٠ دەگەڕێتەوە، لە داهێنانی پاپا ( بۆنیفاسی حەوتەم Boniface VII ) بوو کە مەرسومنامەیەکی پیرۆز دەردەکا دان بە بێگوناهی

Indulgence دەنێ، لەو مەرسوومنامە دەڵێ هەرکەسێک دان بە گوناهەکانی خۆیدا بنێ و پەشیمانی خۆی لێ رابگەیەنێ و برێکی دیاریکراو پارە بدات ئەوا هیچ گوناهی نامێنێ، ئەم نەریتە تا چەند نەوەیەک کاری پێدەکرا تا کاتێک پاپا یەکێک لە قەشەکانی بەناوی ( تتزل Tetzel لە سا ڵی ١٥١٧ بۆ بڵاو کردنەوەی چەکی لێخۆشبون نێرێتە ئەڵمانیا، پاپا سەرفرازی کردبوو هەموو ئەو پارانەی کۆی دەکاتەوە لە کڵێسای پتروس لە رۆما لە خەرجبکا. ئەوەی ئیماندار بێ بەو نامەی پاپا برێکی لە پارە دەدا، ئەم کارە چاکسازی ئاینی مارتن لۆسەری تورە کرد و بزووتنەوەکەی راگەیاند، لەوساوە مەزهەبی پرۆتستانتی دەردەکەوێ، ئەو مەزهەبە مەزهەبێکی شۆرشگێریە داوای تەنها چاکسازی لە خۆیان ناکا بەڵکو داوا دەکا چاکسازی لە نێو کلێسا ئەنجام بدرێ، کڵێسایەک لەسەر بنەمای پشتبەستوو بە ئینجیل دابمەزرێنرێ.

## مارتن لۆسەر و بزووتنەوەی چاکسازی ١٤٨٣-١٥٤٤:




مارتن لۆسەر لە گوندی تورینجیا لە هەرێمی سەکسۆنیا لە دایک و باوکێکی جووتیار لەدایک بووە. سەرەتای تەمەنی دۆخێک بوو خەڵک لە خەیال و ئەفسانەییدا دەژیا بیرکردنەوەی بێبنەما باو بوو خەڵک بە هزری بێبنەما دەتۆقێندرا، عیسا بە تۆڵەستێن و ئازاربەخش وێنەی کێشرابوو، هەرچی دەیکرد ئەو ترس و خەیاڵە مەترسیدارانە لە مێشکی دەرنەدەچوو، دوارۆژیان لێ کردبوە رۆژی تۆلەسەندنەوە و ئازار و ئەشکەنجەدان، بۆیە ئەو ترسە بەسەر مارتندا زاڵ بوو کە خواوەند تۆلەی لێدەکاتەوە، بۆ ئاسوودەیی و هێور کردنەوەی دەرونی هیچ بڕوای بە وتەکانی کڵێسا نەدەهات.

باوکی وێڕای هەژاریی ناردیە بەر خوێندن دواتریش بۆ زانکۆی ئێرفۆرد تا یاسا بخوێنێ. بەڵام بەهۆی ئەوترسەی لەدڵیدا جێگیر ببو لە ١٥٠٥ روی لە خوێندنی ئاینی کرد بەڵکو لەو ڕێگەیەوە خوا لێی خۆشبێ و لە دوارۆژ ئەشکەنجە نەدرێ، دەچێتە دێری ئۆگستۆس و خروە دەکێشێ، بە نوێژ و خۆ برسی کردن و ئازاردانی خود لەم کونجە ئارامی و بێدەنگی دەکێشێ بەڵکو خوا لە گوناهەکانی خۆش دەبێ، لە ١٥٠٧ دەبێتە ( کاهین ) لەهەمان کات وانەی زانستی ئاینگەرایی دەوتەوە، بڕوانامەی دکتۆرا وەردەگرێ ئەوسا بانگی دەکەن تا لە زانکۆی ڤیتنبێرگ Wittenberg لە هەرێمی ساکسۆنیا لە ١٥٠٨ وانە بڵێتەوە. لەوێ خوێندکاران لێی دەئالێنەوە و بە هزرو زانستەکەی سەرسام دەبن، بەتایبەت ئەو بابەتەی پسپۆریی لێی هەبو کە پرسی خۆپاککردنەوە بوو لە گوناهەکان.

و: خالید هەرکی

له ١٥١٠ سەردانی رۆما دەكا. لەوێ خۆی چاوی به گەندەڵییەكانی پاپا دەكەوێ زیاتر گومان پەیدا دەكا، بەردەوام دەبێ له پشكنین و گەڕان بەدوای راستییەكاندا، ئەو بڕوایه به تەواوەتی لەدڵی دەچەسپێ كه وەكو بیردۆزی تایبەتی خۆی بوو بریتی بوو له ( بڕوابوونی رەها به میهرەبانی خوا له سزا دەتپارێزێ، نوێژ و خوا پەرستیش بەس نیه بۆئەوەی له گوناهەكان بشۆردرێی، به هەبوونی دڵێكی بێگەرد و پاك بەرانبەر به خوا گوناهەكانت دەشۆردرێن ). ئەمه ئەو بڕوایه بوو كه مارتن لۆسەر له كتابی پیرۆزی داوای له خەڵك دەكرد لەگەڵ نامەی نێردەی پۆلس كه بۆ كریستیەكانی رۆمای ناردبوو، پێی ووترا بیروبڕوای پاكانەی به ئیمان Justofocation by Faith. لۆسەر بەم بیروبڕوایه به ئارامی و دڵنیایی ماوەی چەند ساڵێك ژیاوە، ئەم بیروبڕوایەی له نێو خوێندكارەكانی بڵاو دەكردەوە و بانگخوازیی بۆ دەكرد بێ دەستێوەردانی دەسەڵات و كڵێسا، تا كاتەكەی پێدەگا و به ئاشكەرا بیروبڕواكانی رادەگەیەنێ وكاریگەریی لەسەر هەموو ئەورووپا دروست دەكا .

هەروەكوو وتمان له ١٥٠٧ قەشه تتزل دێته ئەڵمانیا تا چەكی لێخوشبوون به هاوڵاتیان بفرشێ، ئەم كاره مارتن دەورووژێنێ، پێی باش بوو ناڕەزایی خۆی لەم كاره دەرببڕێ، دەرفەتی كۆبونەوەی ساڵانی هاوڵاتیان له كڵێسای فیتنبرگ به هەل زانی كه له یەكی نۆڤەمبەری هەموو ساڵێك ئەنجام دەدرا، لەو رۆژه له دەرگای كڵێسا لیستێكی ناڕەزاییەكانی به ٩٥ خاڵ بەدەرگای كڵێساكەوه هەڵواسی كه دژی چەكی لێخۆشبوون بوو، له بەڵگەنامەكەیدا نوسیبووی بیروبڕوای پاكانەی به ئیمان، لێخۆشبوون تەنها به میهرەبانی خواوه مەرجداره و هەر بەدەستی ئەوه. پاپا ناتوانێ دەست له كاری گوناهبەخشین وەربدا، دواتر داوای له زانایان كرد هەركەسێك ئامادەبێ گفتوگۆ لەسەر ئەم پرسه بكا با بێته پێش.

له میانی مشتومڕ و دیالۆگی لەگەڵ یوحەننا تتزل و لایەنگرانی كڵێسا، لوسەر رووبەڕووی رەخنەی توند دەبێتەوە، رایگەیاند كه تەنها كتابی پیرۆز ئەو یاسایەیه ببێته سەرچاوه و دەتوانین بۆ شیكاریه بیروبڕواییەكان بۆی بگەڕێینەوە، ووتی: هەموو كەسێك بۆی هەیه ئنجیل بخوێنێتەوە، به پێی تێگەیشتنی خۆی لێكدانەوەی بۆ بكات، نابێ پاپا ئەم لێكدانەوه قۆرخ بكات، هەروەها دەبێ رێگه به هاوسەرگیری پیاوانی ئاینی بدرێ و بكەونه ژێر دەسەڵاتی دونیایی.

ئەم بۆچونانەی لۆسەر بوه مایەی دلخۆشی و رەزامەندی ژمارەیەكی زۆر له توێژی رۆشەنبیر، ئەوانەی له رەفتارو دەسەڵاتەكانی پاپا و كڵێسا بێزار بون كه خۆیان بەسەر

ئەستۆی خەڵکدا سەپاندوە و گوایە ئەوان هۆکاری لێخۆشبونن لەلایەن خواوەندەوە. لە ساڵەکانی ١٥١٩-١٥٢٠ ئەو راو بۆچوونانەی لە چەند کتێبێکدا کۆکردنەوە بەناوی لێکدانەوە و توێژینەوەی بیروبڕوای نوێ، تیایدا بۆچونی پیاوانی ئاینیی بە درۆ دەخستەوە کە گوایە دەسەڵاتی ئەوان لەگەڵ خەڵک جیایە چونکە ئەوان لەلایەن خواوەندەوە رێگەیان پێدراوە، دەبێ خەڵک راستەوخۆ بەخۆی لە کتابی پیرۆز بەدوای راستیەکاندا بگەرێ. لە هەمان کات داوای لە میرە ئەڵمانیەکان و سوارچاکەکان کرد پێشڕەوایەتی ئەم بزووتنەوەی چاکسازییە بکەن. ئەم داوایەی لەسەر بنەمای ئەوە کرد کە پاپا لەژێر دەسەڵاتی دونیاییدایە ئەو تەنها کاری ئاینی لە وڵاتەکەی خۆی دەبا بەرێوە کاری بە شتەکانی دیکەوە نییە نابێ ئەو کتابی پیرۆز بخاتە ژێر دەستی خۆی و قۆرخی بکا، داوای کرد دێرو کڵێساکان دەبێ کەم بکرێنەوە و پێویست ناکا خەڵک بچێتە رۆما بۆ حەج، هەروەها رێگەی بە ژن هێنانی پیاوانی ئاینیدا، رەخنەی توندیشی لە کاردیناڵەکان ( مەتران ) گرت لەسەر ئەو ژیانە خۆشگوزەرانیەیان.

لە وەڵامی لۆسەردا پاپا لیوی دەیەم لە دیسەمبەری ١٥٢٠ بڕیارێکی دژی لۆسەر دەرکرد تیایدا کڵێسای لێ قەدەغەکرد، لۆسەری بە ئاشکەرا ئەو بڕیارەی لەبەردەم خەڵک و لە مەیدانی ( ڤوتنبرگ ) سووتاندی بەم هۆیەوە هەموو پەیوەندیەکانی لۆسەرو کڵێسا پچڕان، دۆخەکان بەشێوەیەک توند بوون پاپا داوا لە ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم دەکا لۆسەر دەستگیربکا بەتۆمەتی ئەوەی بڕیارەکانی کڵێسای پێشێل کردووە و لە ریزی ئاینی کریستی دەرچووە.

بەم تۆمەتە لە جەنیوەریی ١٥٢١ لۆسەر بانگێشتی ئەنجومەنێک دەکرێ کە نوێنەرایەتی ئیمپراتۆر دەکا، بۆ دادگایی کردن لە ڤورمس Worms. کاتێک خەڵکی ڤۆرمس و تەکانیان وشەبە وشە خوێندەوە هەموو ئەوانەی پێشتریش نووسیبونی شیان کردنەوە بۆیان دەرکەوت کە لۆسەر لە ئاینی کریستی دەرچووە دەبێ خوێنی حەڵاڵ بکرێ و لە مافەکانی سڤیلی لە ئیمپراتۆریەت بێبەش بکرێ.

بەڵام فریدریکی میری سەکسۆنیا و چەند میرێکی دیکە لە باکووری ئەڵمانیا داڵدەیاندا و خستیانە ژێر پاریزبەندی خۆیانەوە. مارتن لۆسەر دەچێتە نێو قەڵایەکی قایم لەژێر پارێزی فریدریک، ماوەی یەک ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە،لەو ماوە توانی ئینجیل وەرگێرێتە سەر زمانی ئەلمانی، ئەم وەرگێڕانە کاریگەریی زۆری لەسەر تێگەیشتنی خەڵک هەبوو لە لێکدانەوەی کتابی پیرۆز، ئەمەش بۆ پیاوانی ئاینی ببوو بە رووداوێک.

لەو کاتە چارلسی پێنجەم بە چەند کارێکی گرنگ لە ئەڵمانیا دەردەچێ بەرەو ئیسپانیا بەڵام بـزووتنەوەی چاکسـازی لەکـار ناوەسـتێ بە شـێوەیەک پەرە دەسـتێنێ کە هەمـوو چینەکانی ئەڵمانیا دەگرێتەوە، دواتر ئەم بزووتنەوە بەپێـێ دۆخـی ئـابووری و کـۆمەڵایەتیی ئەڵمانیا دەتەقێتەوە. هەندێک لە چینەکان شۆڕشی لۆسەریان پێ ئامرازێک بوو بۆ بەدەست گەیاندنی ئەوەی چاویان لێیەتـی و هەوڵـی بـۆدەدەن، تونـدوتیژی بـوە شـێوازی گەیشـتن بە ئامانج، دوای ئەوە دوو شـۆڕش هەڵدەگیرسـێن دەبـنە مـایەی بەگـژ یەکداچونی دەسـەڵات و گەل، ئەمە لۆسەر بێزار دەکـا، ناچـاردەبێ لە قەلای وارتبـورگ Wartbourg دەردەچـێ بۆئەوەی رایبگەیەنێ کە بزووتنـەوەی چاکسازی ئاینی لەم رەفتـارەی تونـدوتیژییە بێبەریـیە، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانمان نامـانەوێ خـوێن بـرژێ، گرنگتـرین بـزووتنەوەی شۆڕشـگێری . جەنگی سوارچاکان وجەنگی جووتیاران بوو.

## جەنگی سوارچاکان

چینی سوارچاکان بریتی بوون لە چینێک لە هەموو ڕووێکەوە لەگەڵ چینەکـانی دیـکەی گەل جیـاواز بـوون، هەر سـوارچاکێک خـاوەنی پـارچەیەک لە زەویـی کشـتوکاڵی بـوو، لە ناوەڕاستیدا خانووێکی مەزن یا قەلاو زیندانێکی دروست کردبوو، دانیان بە هیچ دەسەڵاتێکدا نەدەنا جگە لە ئیمپراتۆر خۆی نەبێ، هیچ یەکیان لە ئەنجومەنی نوێنەران ئەنـدام نەبوون. بۆیە دەبوایە پشت بە هێزی خۆیان ببەستن تابتوانن لە دژی میرەکانی ئەڵمانیا و هەنـدێک جاریش ئیمپراتۆر بوەستنەوە و پێگەی خۆیانی پێ بپـارێزن، بەڵام لە چەرخـی ناوەڕاسـت و دای روخانی دەرەبەگایەتی پێگە و هێزی خۆیان لەدەست دەدەن شکۆو دەسەڵاتیان نامێنێ، بـۆئەوەی خۆیـان بە لاواز نیشـان نەدەن و قەرەبـووی لەدەسـتدراوەکانیان بـکەنەوە، زولـم و زۆرداریان لەو خەلکە دەکرد، هێرشیان دەکردە سەر زەویی جووتیاران وبەرهەمەکانیان تـالان دەکـردن، یـا بازرگانەکانیـان بە زۆرلێکـردن بێـزار دەکـردن. کاتێـک بـزووتنەوەی لۆسـەر سـەرهەڵدەدا ئەمەیـان بە دەرفەت زانـی تـا رق و کینـەی لە کڵێسـایان هەلگرتـوە بەسـەریدا برێژن و دەسەڵاتە لە دەستچووەکانیان لەم ڕێگایەوە بگێرنەوە.

بـۆیە بە تونـدی بەشـداری ئەو بـزووتنەوە دەکەن کـاری گێرەشـێوێن ئەنجـام دەدەن، کڵێساو دێرەکان تالانی دەکەن، پیاوە ئاینییەکانیان لە دێرو کڵێسا دەردەخستن. نـاودارترین سـوارچاکیان ( ئـولرخ ڤـان هـوتن ) بـوو Ulrich Von Hutten کە فەرمانـدەیی بـزووتنەوەی نەتەویـی مـارتن لۆسـەری دەکـرد لە دژی پاپـا. گـوایە پاپـا کەسـێکی لایـدە و

بێگانەیە سامانی وڵات دەباتە دەرەوە، ئەم دەرفەتەشیان بۆ رزگاربوون لەژێر دەسەڵاتی میرەکان بەکار هێنا.

یەکێکی دیکە لە سوارچاکە ناودارەکان ( فرانز ڤون سکنچن ) بوو کە لەگەڵ یەکێک لە میرەکان دەکەوێتە کێشە لە دژی دەوستێتەوە و دەبێتە سوارچاکێکی فەرماندەی ئەو بزووتنەوە، ئاسایی بوو میرەکان هاوکاری پیاوە ئاینییەکان بکەن بۆیە سکنچن لە بەرانبەر چەکە نوێکان نەیتوانی بەرگری بکا رایکرد، دواتر دەکەوێتە ژێر قەلا روخاوەکە و دەکوژرێ. سوارچاکەکەی تر ( هوتن ) رادەکاتە سویسراو لە ١٥٢٣ دوای ماوەیەک کۆچی دوایی دەکا.

بەم شێوە بزووتنەوەی سوارچاکەکان لەناو دەچن، بە کۆتایی هاتنی ئەوانیش ئەو کەمە دەستکەوتەی بۆیان هێشتبۆوە لەدەستیان دەچێ و زیانی زۆریان پێدەکەوێ، لەوکاتەوە وەکو فاکتەری ژیانی ئەڵمانی دور دەخرێنەوە.

بزووتنەوەی لۆسەر زۆر بەم رووداوە کاریتێکرا هەرچەندە بەردەوام لۆسەر رایدەگەیاند کە نابێ کاری توند و تیژی لە شۆڕشەکەدا ئەنجام بدرێ، ئیتر پاپاش تاوانی رووداوەکانی خستە ئەستۆی ئەو، دواجار میرەکانیش بوونە دوژمنی شۆڕش ئەمەش ئاماژەیەکی ترسناک بوو بۆ چینەکانی گەلی ئەڵمانی کە بەسەر دوو بەشدا دابەش بوون.

## شۆڕشی جووتیاران ١٥٢٤:

چینی جووتیارانی ئەڵمانیا لەرووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە لە خەراپترین دۆخدا دەژیان، لە ژێر باری گرانی باج و سوخرەی کاردا دەیان نالاند، هەرکە پیاوە ئاینیەکان و دەرەبەگەکان هەرکاتەی مەبەستیان بوایە بۆ کاری سوخرەیان دەبردن و لە داهات و بەروبومەکەشیان بێبەش دەکردن، سەرباری ئەوەی لەو مافەش بێبەش بوون کە هاوڵاتیی ئاسایی لە راوەماسی و ئاژەڵداری هەیبوو.

شۆڕشی لۆسەر لەکاتێک سەرهەڵدەدا کە جووتیارەکان لەوپەڕی ژیانی کۆلەمەرگی و نەهامەتیدا دەژیان، کاتێک لۆسەر بانگەوازیی بۆ ئازادی و یەکسانی دەکرد ئەوان پێیان وابوو مافەکانیان بەم بانگەوازە دەگەڕێتەوە و ئەوان یەکسان دەبن لەگەڵ باقیی گەل و لە ستەم و زۆرداری دەرەبەگ و پیاوانی ئاینی رزگاریان دەبێ و باجیان لەسەر کەم دەبێتەوە و

و: خالید هەرکی

مافی هەڵبژاردنی پیاوانی ئاینیان دەبێ. ئەمانە و کۆمەڵێک خەیالی تر لە مێشکی جووتیارەکان دەخولانەوە. باسیان لەو یەکسانییە دەکرد کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتوە گوایە جیاوازی نابێ لە نێوان یەسوع و هەر کەسێکی دیکەی ئاسایی ، لەم دروشمانە ژمارەیەکی زۆری جووتیارەکان جۆشدران هەلسانە سەرپێ و شۆڕشیان راگەیاند، یەکەم تەقینەوەیان لە کۆتایی ساڵی ١٥٢٤ بوو، کلپەی شۆڕش زۆربەی ویلایەتەکانی ئەڵمانیای گرتەوە بەتایبەت ویلایەتەکانی باشوورو لەوێشەوە پەڕیەوە بۆ رۆژهەلات.

یەکێک لە سەرکردەکانی چاکسازی حاکمی ویلایەتێک بوو بەناوی ( تۆماس مونزر Thomas Munzer ) هەڵچوونی جووتیاری بە دەرفەت زانی تا بە توندی دەستیان لێ بوەشێنێ و رووبەڕووی سەرکردەکانی شۆڕش بێتەوە کە دژی دەسەڵات راپەڕیون، چونکە سەرکردایەتی شۆڕش ئەوەندە یەکگر و چالاک نەبوون بۆیە جلەوی کارەکانیان لەدەست دەرچوون، خەڵکانێکی زۆر بەشداری ئەو راپەڕینەی جووتیاریان کرد و لە دروشمەکانیان زیادەرۆییان بەکار هێنا، داوای ئازادی مافی خاوەندارێتی زەوییان دەکرد، هەرچەندە ئەمە لە پەیامی چاکسازاندا نەبوو، بەو هۆیەوە میر و خانەدانەکان زۆر بەتوندی بەرپەرچیان دانەوە و بەگژیانداچوونەوە، دواتر سوارچاکانیش بونە هاوشانی میرو خانەدانەکان بۆ لێدانی شۆڕشی جووتیاران، لەم میانە بەهەزاران جووتیاریان کوشتن، دەولەتیش سەرکردەکانی جوولانەوەکەی دەستگیر کردن و لەسێدارەیدان، بەم شێوە شۆڕشی جووتیار لە کۆتایی ساڵی ١٥٢٥ بێ ئەوەی هیچی لێ وەبەرهەم بێنن دادەمرکێ و جووتیارەکانیش دەگەڕێنەوە سەر پیشەی پێشوویان کە ژێردەستی بوو.

شۆڕشی جووتیاران لە نێو بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی دەنگۆیەکی مەزنی هەبوو بەڵام بزووتنەوەی چاکسازی وێڕای ئەوەی رەخنەی لە سیاسەتی میرو پادشاکان دەگرت، بەڵام ئەم شۆڕشە هیچ پەیوەندیەکی بە بزووتنەوەی چاکسازیەوە نەبوو چونکە دروشم و ئامانجەکانیان یەک نەبوون، جووتیارەکان دروشمی ئابووری و کۆمەلایەتی بەسەریاندا زاڵ بوو، بەو ئەگەرەوە لۆسەر و بزووتنەوەکەی شۆڕشی جووتیاریان پێ جولانەوەیەکی تێکدەر بوو نەک بنیادنەر، کاریان بۆ لەناوبردنی دەکرد. چونکە دژی ئەو هاوکاریەی حکومەتی ئەلمانی بوو کە بە بزووتنەوەی چاکسازیی دەکرد هەر بەو هۆیەشەوە حکومەت پشتی لە داواکانی لۆسەر دەکرد هەرچەندە هانی میرەکانی دەدا شۆڕشی جووتیار لەناو بەرن و درێغیان پێ نەکەن بەڵام هاوکاریی لۆسەر بۆ میر و خانەدانەکان هیچ سوودێکی نابێ و لە رق وکینەیان بۆ لۆسەر کەم ناکاتەوە، چونکە ئەوان بزووتنەوەی لۆسەریان بە مەترسی

دەزانی و ئاسۆی بزووتنەوەکەشیان لێ دیار بوو کە کار دەکاتە سەر چارەنوسیان، دواتر پێیان وابوو بەهۆی بزووتنەوەی ئاینیەوە بوو جووتیارەکان هاندران و شۆڕشیان لە دژی میرو دەسەلات هەڵگیرساند، هەر بەم هۆیەوە ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەمیان لێ هاندا تا دژی بوەستێتەوە نەبادا لە داهاتوو لە ژێر سێبەری لۆسەر شۆڕشی تر هەڵگیرسێ یا بواریان بۆ برەخسێنێ، ئەمەش دەبێتە دابەش بونی سیاسی کە دابەشبوونی ئاینیشیان خولقاندوە.

## هەڵوێستی ئیمپراتۆر :

ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم ئەوەندەی ئاگاداری هەڵوێستی سیاسیی ئیمپراتۆریەت بوو بەرانبەر بە ئەوروپا ئەوەندە ئاگای لە پابەندی ئاینی خۆی نەبوو، چونکە کێشەی نێوان ئەو و پادشای فەرەنسا لە بەردەستدا بوو. لە بێ بەختی کاسۆلیکیەت مەزهەبی لۆسەری لە ئەڵمانیا بلاو دەبێتەوە، لەو کاتەشدا هەڕەشەی تورکە عوسمانییەکان لەسەر ئیمپراتۆریەت بوو بۆ گرتنی نەمساو مەجەر، بۆیە ئیمپراتۆر سەرقاڵی ئەو کێشە بوو پرسە ناوەخۆییەکانی هێور دەکردنەوە تا روو لە ئامادەسازی و بەرپەرچ دانەوەی هێزەکانی تورکە عوسمانیەکان بکا و هاوکارییە سەربازییەکان بۆ بەرەکانی جەنگ دابین بکا، لەبەر ئەم هۆکارە ماوەیەکی زۆر ئیمپراتۆر نەیتوانی چارەسەری پرسی لۆسەری بکا، ئەوانیش لە ناوەوە هەر بەهێز دەبوون، پەیوەندیەکانی پاپا و ئیمپراتۆری باش نەبوون چونکە پاپا کلمنتی حەوتەم لە ئەیاری ١٥٢٦ هاوپەیمانێتیی پیرۆزی لە دژی ئیمپراتۆر دامەزارند، بەمەبەستی بنبڕ کردنی دەسەلاتەکانی لە ئیتاڵیا.

## ئەنجومەنی ئیمپراتۆری لە سپیر Speier لە ١٥٢٦

کێشەی ئاینی تەواو نەدەبوو کە ئیمپراتۆر بڕیار دەدا ئەنجومەنی ئیمپراتۆری لە سپیر لە مانگی حوزەیرانی ١٥٢٦ بۆ لێکۆڵینەوە لە پرسی ئاینی کۆببێتەوە، هەر لەو کۆبونەوە لە پرسی ئەو بڕیارە کۆڵدرایەوە کە لەسەر لۆسەر درابوو گوایە لە یاسا دەرچووە ( دەرچوونیش لە یاسا مانای خوێنرشتنی ) لەگەڵ دەستگرتن بەسەر کتابەکانیدا، ئەم بڕیارە لە لایەن کۆمەلەی ( ورمز ) لە ساڵی ١٥٢١ دەرکرابوو.

ئەنجـومەنی سـپیر کـۆدەبێتەوە بەڵام بڕیارێـک دەردەکـا لە بەرژەوەنـدی کڵێسـای کاسۆلیکدا نەبوو، بڕیارەکە دەڵێ: ( سەبارەت بە ( بڕیاری ورمز )هەر میرێک ئازادە لەوەی کامە مەزهەب لە بەرژەوەندی ویلایەتەکەی دایە بگرێتە بەر ) .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ لۆسەریەکان دانـی شـەرعیان پێنـراو دەتـوانن بە ئـازادی کـاری خۆیان بکەن، ئیتـر میرەکـان ئەوانەی مەیلی مەزهەبـی لۆسـەریان هەبـوو دەسـتیان کـرد بە دەستگرتن بەسەر مومتەلەکاتی کڵێسا و پاپا و پیاوە ئاینییەکانیان، ئەوانەی لایەنگری پاپـا بوون و رازی نەبون بڕوا بە مەزهەبە نوێکە بێنن لە ویلایەتەکانیان ودەرنان .

دیارە هەڵوێستی سیاسی و دۆخی ئەڵمانیا گونجاو بوو بۆ دەرکردنی ئەم بڕیارە، پاپـا کلمنتـی حەوتەم لە لـوتکەی ( هاوپەیمـانی کـونتین ) بـوو لە ١٥٢٦ کە داوای دەرکردنـی هێزەکانی ئمپراتۆریان لە ئیتاڵیا دەکرد. لە کاتێکا ئیمپراتۆر لەوپەڕی پێویسـتیی بە پـارە و سامان بوو تا لە پێویستییەکانی شەڕی تورک خەرجکات کە خەریک بـوو مەجەریـان دەگیـر دەکرد.

ئیتر هێزەکانی ئیمپراتۆر هێرش دەکەنە سەر رۆمـا و داگیـری دەکەن، سـەروبن تـاڵانی دەکەن و پاپاش بە دیل دەگرن کە پێشتر ئامـادە نەبـوو هاوکـاری ئیمپراتـۆر بکـا بـۆ لەنـاو بردنی شۆڕش و بزووتنەوەی لۆسەری.

## ئەنجومەنی ئیمپراتۆریی دووەم لە سپیر ١٥٢٩

ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم بەباشی زانی پێداچونەوەیەک بە دۆخـی وڵاتـدا بکـا کە لە ئەنجامی بزووتنەوەی لۆسـەری دابەشـبونێکی خەتەرنـاکی تـوش هـاتوە، ئەمەی بە هەڕەشـە دەزانی لەسە دەسەڵاتی ئیمپراتۆر، بۆیە لە ئاداری ١٥٢٩ داوا دەکا ئەنجـومەنی ئیمپراتـۆری بـۆ جـارێ دووەم لە سـپیر کـۆببێتەوە، ئەم ئەنجـومەنە ( دییـت ) لە بڕیارەکـانی پێشـوی پاشـگەز دەبێـتەوە و بڕیـاری نـوێ دەردەکـا، بریتـی دەبـن لە ( هەڵوەشـاندنەوەی بڕیـاری ئەنجومەنی ئیمپراتۆریی یەکەم، واتە:

١/ پێداچوونەوە بکرێ لە بڕیـاری ورمـز ی سـاڵی ١٥٢١ کە رژانـی خـوێنی لۆسـەر حەڵاڵ کراوە و شۆڕشەکەیان لەناو ببردرێ.

ب/ میرەکان ئازاد بن لە گرتنەبەری ئەو مەزهەبەی کە لە بەرژەوەندی ویلایەتەکەیان دەزانن .

ج/ کڵێساکانی لۆسەری لەو ویلایەتانەی کەهەن پارێزراو بن و کاری ئاینداری خۆیان بە ئاسایی پێڕەوکەن، بە پێێ مەزهەبە نوێکە بەو مەرجەی رێورەسمە ئاینیەکانیان بە پێێ سیستەمی کاسۆلیکی ببەن بەرێوە.

ئەم بڕیارە میرەکانی لۆسەرانی بێزار کرد چونکە ئازاد کردنی میرەکان لە هەلبژاردنی هەر مەزهەبێک واتە لۆسەریەکان بۆیان هەیە دەست بەسەر مومتەلەکاتی کلێسادا بگرن کە دەچنە ناو ئەو مەزهەبە نوێیە، بەڵام بڕیارە نوێکە ئەم رێگەیان لەداهاتوو لێدەگرێ تەنها ئازاد دەبن لەوەی مەزهەبداریەکەیان ببەن بەریوە، بەم هۆیەوە نارەزایی خۆیان لەم بڕیارە دەردەبڕن و دەلێن دژی ئەم بڕیارەین و نارازین لێی بۆیە پابەندی نابین، لەوکاتەوە لۆسەریەکان ناویان نرا بە ( نارزازیەکان ) Protestant ئەمە ئەو ناوەیە کە پێیانەوە نووسا .

ئەم نارەزاییە بەهێزە رکابەرییەکی توند بوو لەگەڵ ئیمپراتۆر و دەسەڵاتەکەی، بەڵام هەلوێستەکان وا پێویست دەکرا نیانی بنوێنرێ و کریستەکانی ئەوروپا یەکریزی بپارێزن، چونکە لەشکری تورکەکان هەرەشەی لەسەر دروست دەکردن بۆیە دەبوایە لە بەرانبەر ئەم هەرەشانە یەکریزی دروست بوایە، لەم کاتەدا شەرِی ئاینی و مەزهەبی زیانی زۆری لێدەدان، ئەوکات سوپای تورکە عوسمانیەکان گەمارۆی ڤیەننایان دابوو، تا قوربانیەکی زۆر نەدرا نەتوانرا ئەو گەمارۆیە تا ئۆکتۆبەری ١٥٢٩ لەسەر ڤیەنا هەڵگرن، بۆ رەواندنەوەی مەترسیەکانی دووبەرەکی و شەرِی ناوەخۆ ئیمپراتۆر ئەوپەری نیانی دەنوێنێ و لە حوزەیرانی ١٥٣٠ داوای کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئیمپراتۆری دەکا لە شاری ئوگزبورگ تا بەرێگای ئاشتی ئەم پرسە چارەسەرکا .

## ئەنجومەنی ئوگزبورگ ١٥٣٠

بڕیاری بەستنی کۆبوونەوەی ئەم ئەنجومەنە درا، تا میرە پرۆتستانتەکان لەگەڵ میرە کاسۆلیکەکان کۆببنەوە و ئەم کێشە چارەسەر کەن، کە هەردوولا بە ئەنجامەکەی رازی بن، ئەمە ساڵی ١٥٣ بوو ئەو ساڵە بوو کە ئاشتەوایی کامپاری ئەنجام درا ئەو ئاشتەواییە بۆ ماوەیەکی کورت پشوویەکی لە شەرِەکانی دژی فرەنسا وەرگرت، بۆیە ئیمپراتۆر توانیی خۆی

و: خالید هەرکی

لەم کۆبونەوە لە شاری ئوگزبورگ ئامادە بێ. لەم کۆبوونەوە هەولێستی ئیمپراتۆر هەڵوێستێکی دوودلی و شپرزەیی بوو، چونکە هەر گروپە و لەسەر داواکەی خۆی نەهاتنە خوار، هەلوێستی میر و پیاوە ئاینیەکانی کاسۆلیکیش توند و دەمارگیرانە بوو، داوایان لە ئیمپراتۆر دەکرد بە دەستێکی پۆلایین لە پرۆتستانتەکان بدرێ، بەلام ئیمپراتۆر مەبەستی نەبوو داواکەیان جێبەجێ بکا و دژی ویلایەتەکانی ئەڵمانی هیچ کاریکی لەم بابەتە بکا، ئەو کاریگەری پیاوە کاسۆلیکەکانی دەوروبەری لەسەر بوو بۆیە دژی هەلوێستی پرۆتستانتەکان بوو.

داوا لە نوێنەری پرۆتستانتەکان کرا داواکانیان بە یاداشتێک بدەنە ئیمپراتۆر، یەکێک لە سەرکردەکانی پرۆتستانت بەناوی فیلیپ میلانچتون Melanchton بەم ئەرکە هەڵسا، ناوبراو یاریدەدەری دەستی راستی لۆسەر بوو. ( لەوکات لۆسەر لە دوورخراوەییدابوو بۆیە نەیدەتوانی لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکان بەشدار بێ ترسیشی لەوە هەبوو میلانچتۆن لەژێر فشارەکاندا نەرمی بنوێنێ و دەستبەرداری بیروبڕواکانی لۆسەری بێ ) میلانچتو بیروبڕواکانی لۆسەری زۆر بە میانڕەوانە خستنە بەردەمی. ئەمەش ناونرا بە دانپێدانانی ئوگستانا Augstana Confession یا دانپێدانانی مەزن. ئیمپراتۆر بۆ لەیەک نزیککردنەوەی بۆچوونەکانیان ئەوەی لە توانایدا بوو خستیەگەر بەلام کێشەکە زۆر لەوە مەزنتر بوو لەوەی بیری لێدەکردەوە، سەرکردەکانی کاسۆلیکی یاداشتێکیان دەرکرد و دایانە ئیمپراتۆر رەتی ئەو بۆچوونانەیان کردەوە کە پرۆتستانتەکان لە یاداشتەکەیاندا نوسیبویان، ئیمپراتۆریش رەزامەندیی لەسەردان.

ئەنجومەن لە سەپتەمبەری ١٥٣٠ تەواو دەبێ، پاش ئەوەی ئیمپراتۆر مۆلەتێکی کورت بە پرۆتستانتەکان دەدا لە پێناو رێگە گرتن لە خوێن رژان دەستبەرداری بۆچونەکانیان بن . ئیمپراتۆر بێئومێد بوو لەوەی بۆچونەکانیان بگۆڕن یا دڵیان نەرم بێ لە پێناو پەرۆشی یەکریزی و رێگە گرتن لە خوێن رشتن، ناچار رێگەی توند دەگرێتە بەر، بریار دەدا هەموو دیاردەکانی لۆسەری قەدەغە بکرێن، داواش لەو خەڵکە دەکا ئەو مەزهەبە دەستکردە واز لێبێنن، بە پێچەوانە سزای توند دەدرێن.

## پەیمانی شمالکالد دیسەمبەری ١٥٣٠

پرۆتستانتەکان هەستیان بەو مەترسییەکرد کە پێی گەمارۆ دراون، بۆیە بڕیاریان دا بەیەکەوە لە شاری شمالکالد لە هیس Hesse دانیشن، هاوپەیمانی شمالکالد خەتەرناکترین هاوپەیمانی بوو لە سەدەی شانزەهەم، ئەندامانی ئەو هاوپەیمانێتیە بە ئاشکەرا بڕیاریان داو رایانگەیاند کە سەر بۆ هیچ هێزێک دانانوێنین و لەسەر بیروبڕواکانمان بەردەوام دەبین، بڕیاریان دا بە هەموو توانایەکەوە بەرگری لە ماف و بیروڕاکانی خۆیان بکەن ، ئەگەر تیمێک لە تیمەکانیان بەهۆی بەرگری لە خواوەند و کتابی پیرۆزەوە توشی هەر مەترسی یا هێرشێک بۆوە ئەوا هەموویان بۆ یارمەتیدانی ئەو تیمە دەبێ بگەنە شوێنی مەبەست و هاوکاریی بکەن.

کۆبوونەوەی شمالکالد باسیان لە پێکهێنانی هێزێکی سەربازیی پڕچەک کرد بۆ بە رگری کردن لە بەرژەوەندیەکانی ، لەگەڵ پێکهێنانی هێزێک لە باشترین چەک و تەقەمەنی بە سەرۆکایەتی میریساکسۆنیا میری ساکسۆنیا، ئەو ویلایەتەی بە تەواوی بڕوای بە مەزهەبە نوێکەی لۆسەر هێنابوو، هەروەها بە بەشداریی حاکمەکانی هیس و برنزویک و لونبیرگ Luneberg و ئانالت Anhalt و ستراسبۆرگ و ئولم Ulm کونستانس و بریمن و هی تریش لە باکوورو باشوور.

لەراستیدا ئەم هاوپەیمانێتیە وەکو کاکلی بوژانەوەی پرۆتستانت و بڵاوبوونەوەی بوو. ئەمە بوو بە رێکخستنێکی سڤیلی و سیاسی ،خاوەنی کڵێسا و هێزی سەربازی خۆی بوو، رۆژانە خەڵکی دەچوونە ریزو لایەنگرانی زیاد دەبوون، ئەوانیش مۆرالیان لە بەرزبوونەوەدا بوو، جارێکی دیکە لە ١٩ی شوباتی ١٥٣١ لە هەمان شاری شمالکالد کۆدەبنەوە بۆ نوێ کردنەوەی پەیمانەکەیان. پێیان باشبوو داوای هاوکاری لە پادشای فەرەنسا و ئینگلتەڕا بکەن چونکە ئەوان رقیان لە ئیمپراتۆر دەبۆوە، دیارە پادشای فەرنسا فرانسوای یەکەم شکستی ئیتاڵیای لەبیر نەچۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە توانایدا نەبوو هاوکاری میرە پرۆتستانتەکانی ئەڵلانی بکا، تەنها هانی دەدان، تا بەرووی ئیمپراتۆر بوەستنەوە.

هەرچی پادشای ئینگلتەڕا هنریی هەشتەم بوو داخی لە دڵدابوو، چونکە کاتی خۆی کە پاپا لای ئەو بەدیلی گیراوە هانی پاپای داوە تا پرسی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری هنری دوابخا، چونکە کاترینای هاوسەری ئەم لەیەک جیابوونەوەی نەدەویست، لەهەمان کات

لەبەرژەوەندی هنریی هەشتەمدا بوو پەیوەندیەکانی لەگەڵ پاپا و کڵێسای رۆما بپچڕێنێ بەڵام لە توانایدا نەبوو خۆی لە شەڕێکی دژ بە ئیمپراتۆر تێوەگلێنی، بۆیە هاوکاریەکانی بریتی بوون لە هاندانی میرە ئەڵمانیەکان و پێدانی بڕێکی کەم لە هاوکاری ماددی.

## ئەنجومەنی ئیمپراتۆری لە نورنبێرگ Nurnenberg

ئیمپراتۆر دڵنیابوو لەوەی بەکار هێنانی توندوتیژی لەگەڵ پرۆتستانتەکان ریزەکانی گەلی ئەلمانی شەق دەکا، ئەمەشی لەبەرچاو بوو کە لەبەر رەچاوکردنی پاپا رێگەی راستی لەخۆی ون کردوە، کەوتۆتە ناو زەلکاوێک کە لە بەرژەوەندی سیاسەتی سەرجەم گەلی ئەلمانیدا نیە، بۆیە بەباشی نازانی هیچ رەفتارێکی توند لەگەڵ پۆرتستانتەکاندا بکا، هەر رەفتارێکیش لەم جۆرە دەبوە مایەی هەلگیرسانی شەڕی ناوەخۆ، لەکاتێکا تورکە عوسمانیەکان لەدەرگای مەجەریان دەدا.

بۆیە بڕیاریدا بانگێشتی ئەنجومەنی دییت بکات لە شاری نورنبیرگ لە ساڵی ١٥٣٢. گفتوگۆو بڕیارەکانی ئەو ئەنجومەنە زیاتر بە گیانێکی نیان و تەبایی دەچوو، چەند بڕیارێکیان دەرکرد ناونرا بە ( ئاشتیی نۆرنبیرگ ):

١/ داوا کرا هەموو وتار و کارەکانی توندوتیژی دژ بەیەکتری راگرن .

٢/ روو لە ئاشتی و پێکەوە ژیان بکەن.

٣/ دوژمنانی کریستیان تەنها بە ئاشتی وەدەر دەنرێن .

ئاشتەوایی نورنبێرگ هۆکارێکی دیکەی بڵاوبوونەوەی مەزهەبی پرۆتستانت و گەشەکردنی بوو، لەو میانە لایەنگری زیاد دەبن خەڵک زیاتر بروا بەم پێڕەوە دەکا لە نموونەی ویلایەتی ( ئوگزبورگ، فرانکفورت، هامبورگ، هانۆڤەر ) پرۆتستانتەکانی بانگەوازی ئیمپراتۆریان قەبول کرد بە یەکخستنی ریزەکانی گەلی ئەڵمانی و بەشداریان لە هاوکاری سەربازی دژی هێزەکانی تورک تا ئەوکاتەی لە کۆتایی ساڵی ١٥٣٢ دەکشێنەوە.

## ئەنجومەنی ترنت ١٥٤٥

ڕۆژ دێت و دەڕوا ئیمپراتۆر بە شەڕی تورکە عوسمانییەکان و شەڕی ئیتاڵیا و ناکۆکییەکانی ناوەخۆیی نێوان پرۆتستانت و کاسۆلیکەکانەوە سەرقاڵ بوو، بەڵام مەترسیەکانی شەڕی ئیتالی بە بەستنی ( ئاشتەوایی کرسی ) لە ١٥٤٤ کۆتایی هات و هەڕەشەکانی تورکیش نەمان. بەم شێوە مەترسیەکانی دەرەکیی لەکۆڵ بۆوە مایەوە کێشە ناوەخۆییەکان کە بە ڕشتی کاری لەسەر دەکا بۆ یەکلایی کردنەوەی پرسی پێڕەوانی مەزهەبی لۆسەری، بڕیاریدا دوا هەوڵ لەم بابەتە بدا بە هاندانی پاپای نوێ ( پۆلی سێیەم ) بۆئەوەی بانگێشتی ئەنجومەنی ئاینیی کاسۆلیک و پرۆتستانتەکان بکا تا لە شاری ترنت Trent لە ناوچەی تیرول لە ١٥٤٥ کۆ ببنەوە .

داوای لە پرۆتستانتەکان کرد نوێنەریان بۆ ئەو کۆبوونەوە بنێرن، بەڵام پرۆتستانتەکان گوێیان بە داواکەی پاپا نەدا. چونکە ئاگادار بون لەوەی زۆرینەی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە لە ئیتاڵییە کاسۆلیکەکانە ئیتر چ پێویست دەکا خۆیان پابەندی ئەم کۆبوونەوە بکەن بە کەلەپچەکردنی خۆیان، ئەم کۆبونەوەیان بە یەکێک لە فرت و فێڵەکانی ئیمپراتۆر دەزانی کە کاتی پێوە بکوژێ.

بۆیە ئیمپراتۆر بڕیار دەدا هێزیان لە دژ بەکار بێنێ، بەڵام لەم ئان و ساتە مارتن لۆسەر لە ١٧ی شوباتی ١٥٤٦ کۆچی دوایی دەکا و ئەمەش زیانێکی مەزن بەر پرۆتستانت دەکەوێ کە فەرماندە و ڕێنیشاندەرێکی مەزن لەدەست دەدەن، لەو کاتەوە شەڕ لەگەڵ سوپاکەی ئیمپراتۆر دەست پێدەکا کە سەربازەکانی زۆربەیان ئیسپانی و ئیتالی دەبن بە فەرماندەیی ئیسپانیەکی مەزن  شازادە ئەلفا.

لە ڕووداوی مالبورگ Mahlburg لە نیسانی ١٥٤٧ هێزەکانی ئیمپراتۆر زیانی زۆری بە هێزەکانی پرۆتستانت گەیاند و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و بەدیل گرتن، فەرماندەکانیە شکستیان خوارد بەم شێوە سەرتاپای ئەڵمانیا دەکەوێتە ژێر چەپۆکی ئیمپراتۆر، بەڵام لەجیات لەناوبردنی مەزهەبە نوێکە جارێکی دیکە هەول دەدا نێوەندگیری لە نێوان پرۆتستانت و کاسۆلیکدا بکا بۆ گونجان  و سازان لە نێوانیاندا، ئەمەش لە ڕقی پاپا بوو چونکە پاپا پۆلی سێیەم بڕوای پێی نەدەکرد و دوژمنداریی دەکرد، هەرچەندە سەرکەوتنی ئیمپراتۆر لە شەڕی مالبورگ لە بەرژەوەندی کڵێسای کاسۆلیکدا بوو بەڵام پاپا ترسی لەو سەرکەوتنانەی ئیمپراتۆر هەبوو نەبادا بەهۆی ئەو سەرکەوتنانەوە دەست لە

و: خالید هەرکی

ئیتاڵیاش گیربکا و کۆنترۆلی باکا تا کڵێسا و پاپا ناچار بکا بکەونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەوە، لەسەر بنەمای ئەو مەترسیانەوە پاپا پەیوەندی بە هنریی دووەمی پادشای فرەنساوە دەکا تا لە دژی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم هاوپەیمانێتی ببەستن، لە هەمان کات ئیمپراتۆر لەوە ئاگادار بوو پرۆتستانتەکان چەندە پابەندی بیروبڕواکانی خۆیانن و فەرماندەکانیش سوورن لەسەر بەرگری کردن لە دەستکەوت و سەربەخۆیی خۆیان، بەو هۆیەوە ئیمپراتۆر داوای کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئیمپراتۆر دەکا لە ئوگزبێرگ لە ١٥٤٨.

## ( ئەنجومەنی ئۆگزبێرگ Augzberg ) و سیستەمی کاتی Interim :

ئەم ئەنجومەنە بە ئاشتەواییەکی ئاینی گەیشت، گرتنگترین خاڵەکانی بریتی بوون لە:

**یەکەم/**

کار بە بڕیاری ئەنجومەنی سپیری یەکەم لە ١٥٢٦ بکرێ کە میرەکانی ئازاد کردوە بە هەڵبژاردنی ئەو مەزهەبەی لە بەرژەوەندی ویلایەتەکەیان دەبینن، هاوڵاتیانیش ئەوەی رازیە لەژێر سایەی ئەو مەزهەبە بژی دەتوانێ بمێنێتەوە ئەوەی رازیش نیە دەتوانێ ئەو ویلایەتە هەڵبژێرێ بۆ ژیان کە لەگەڵ مەزهەبەکەی دەگونجێ.

**دووەم/**

مومتەلەکاتی کڵێسای کاسۆلیک کە بەر لە ١٥٥٢ لەلایەن مەزهەبی لۆسەری یا هەر کەسێکی دیکە لە یاوەرانی ئاینیی دەستی بەسەردا گیراوە دەبێتە مولکی ئەو، بەڵام ئەو مولکانەی کە لە دوای ١٥٥٢ کڵێسای کاسۆلیک لەدەستیداون دەبێ بۆی بگێردرێنەوە بۆ کڵێسای کاسۆلیک لە رۆما.

لە راستیدا ئاشتبونەوەی ئۆگزبێرگ لە روی ئاینیەوە سەرکەوتنێکی باش بوو بۆ پرۆتستانتەکان بەڵام ئەڵمانیای دابەش سەر چەندین دەولەتۆکە کرد، بە شێوەیەکی گشتیش پرۆتستانتەکان لە باکوری ئەڵمانیا و میرنشینی ڤورتنگورگ و هەندێک لە شاری تر لە دۆڵی روباری راین و لە مومتەلەکاتی ئیمپراتۆر کە ساڵی ١٥٥٥ درێژ دەبێتەوە تا باکوری زەویە نزمەکان (هۆڵەندا )ش دەگرێتەخۆ.

بزووتنەوەی پرۆتستانت لە ئەڵمانیا نەوەستا بەرەو باکور هەڵکشا، یەکەمین کڵێسای نەتەوی لە دانیمارک لە ١٥٦٠ دادەمەزرێ، ئینجیلیان وەرگێرایە سەر زمانی دانیمارکی، لە

نەرویژ چونکە ئەوکات نەرویژ سەربە دانیمارکەوە بوو، هەروەها لە سوێد لەسەردەمی پادشا چوستاڤ فاسا (١٥٢٣-١٥٦٠) پرۆتستانتەکان چوونە قۆناغێکی دیکە، کڵێسایەکیان دور لە کاسۆلیکەکانی ڕۆما دامەزارند. دوای ئەوە مەزهەبی پرۆتستانتی دەگاتە سویسرا و ئینگلتەرا و فرەنسا و دەست بە چاکسازی ئاینی دەکا.

ئەڵمانیا بۆ ماوەیەک دوور لە شەڕی ناوەخۆ وچانێک دەدا، هەردوو گروپ لە بەرانبەر یەک دەوەستن ئەگەر چی ئاشتەوایی ئۆگزبێرگ چارەسەریەکی یەکجارەکیی بۆ کێشەکە نەدۆزیبۆوە بەڵام سنووری بۆ شەڕی سی ساڵەی ناوەخۆ دانابوو، دوای ئەو ماوەیە شەڕی مەزهەبی ناوەخۆ دووبارە دەبێتەوە ئەمجارەیان لەسەر ئاستی دەوڵەتۆکەکان بەڵام هەریەک لە ئەڵمانیا و دانیمارک و فرەنسا و سوێدیش دەگرێتەوە کە بە شەڕی سیی ساڵە ناوبانگی دەرکرد لە (١٦١٨-١٦٤٨).

## زونگلی و کالڤن ( Ulrich Zwingli & John Calvin )

خۆی بزووتنەوەی چاکساز ئاینی لە هۆشیاری خەڵکەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە ویژدانی مرۆڤی لە چەرخی ڕێنسانس خۆشحاڵکرد. بەڵام بە پیی وڵات شێواز و ئامانج و سیماکانی دەگۆڕدرێن، هەروەها کەسایەتی و ڕابەرەکانیان، لەو ڕابەرانەی ئەو بزووتنەوە ( ئولریچ زونگلی Ulrich Zwingli ( ١٤٨٤-١٥٣١) و( جۆن کالڤن John Calvin ( ١٥٠٩-١٥٦٤ ) ئەمەیان کاریگەری زۆری لەسەر بزووتنەوەی چاکسازی هەبوو.

هەردووکیان سویسرایان وەکو ناوەندی بانگەوازەکە هەڵبژارد، سەیر نیە سویسرا بۆ بانگەوازی چاکسازی دێتە دەستنیشان کردن چونکە سەنتەری ئازادی فکر بوو. ئەگەر بمانەوێ هۆکارەکەی بزانین دەبێ مێژوی گۆڕانکارییەکانی یەکێتی سویسرا بزانین.

و: خالید هەرکی

## یەکێتیی سویسری:

سویسرا یەکەیەکی جودا نەبوو لە ئیمپراتۆریەتی سویسری، بەڵکوو پارچەیەک بوو بەسەر ئەڵمانیاوە لەو ئیمپراتۆریەتە. بەڵام دەسەڵاتی ئیمپراتۆر بەسەریەوە هەر ناوەکە بوو، لە سەدەی سیانزەهەم حاکمی ئیمپراتۆریەت لەم ویلایەتە خەڵکانی باش نەبوون بۆیە ئاژاوە و گێرەشێوێنی بڵاو دەبێتەوە، لە نێو ئەو حاکمانە میری خانەوادەی هابسبورگ هەبوون کە دەرفەتیان لەم پاشاگەردانیە وەرگرت تا دەسەڵاتەکانیان لەسەر دراوسێکانیان بەرفراوان کەن، جێگای نشینی ئەمانیش ویلایەتە مەزنەکەی سویسرا بوو بەناوی سوڤالیا Suvalia کە ئێستا سویسرای حاڵیحازر دەگرێتەوە، حوکمڕانی ئەم خانەوادە بەردەوام دەبێ تا کۆتایی سەدەی سیانزەهەم، کاتێک سێ ویلایەت لەسەر دەریای لوسەرن لە نێوان خۆیاندا پێکدێن لەسەر پێکهێنانی یەکیەتییەک لە پێناو بەرگری لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە دژی ئەو خانەوادە ستەمکارە، ئەم یەکیەتییە بچوکە بوە ناوکی سویسرای ئێستا.

دەبوایە ئەم یەکێتییە بەرگری لە خۆیان بکەن لە پێناو مانەوە و رزگار بوونیان لەدەست ئەم خانەوادە دیارە، هەرچەندە ئەمنایش درێغی ناکەن لە هەوڵدان بۆ دەسگرتن بەسەر سویسرادا، ئەم ململانێ و ناکۆکیە ماوەی دوو سەدە درێژەی دەبێ تا بە دوو ئەنجام کۆتایی دێ:

**یەکەمیان/**

یەگرتن و یەکێتیی نێوان ویلایەتەکان پتەو و توندتر دەبێ.

**دوەمیان/**

قارەمانی و خەباتی نەپساوەی گەلی یەکێتی هانی گەلانی دەوروبەریدا بێنە ریزو هاوکاریان بکەن تا دەبێتە بزووتنەوەیەکی خۆبەخشی سەرتاسەری. خەباتگێرەکان لە شەڕی مورگانتن Morganten لە ساڵی ١٣١٥ لە شەڕێکی سەختدا بەسەر هێزەکانی لیوپۆلد لە خانەوادەی (هابسبورگ) و هێزەکانی ئیمپراتۆردا سەرکەوتن، بەم سەرکەوتنە سەربەخۆییان دەستەبەر کرد، بەم سەربەخۆییە هەرێمەکانی دیکەی سویسراش دێنە پاڵی، وەکو لوسەرن و زیورخ و برن وهیتریش، ئەم بەشداریە زیاتر لە شەڕی سمپاک لە ساڵی ١٣٨٦ یەکگرتر دەبێ کە لە دژی هێزەکانی ئیمپراتۆر سەرکەوتنێکی مەزنیان بەدەست هێنا، لە نیوەی

یەکەمی سەدەی پانزەهەم هەرێمەکانی دیکەش لەگەڵیان یەکدەگرن تا دەبێتە ئەو سویسرایەی ئێستا.

لە ١٤٩٩ سەربەخۆیی یەکێتی سویسری لە سەردەستی حاکمی ئیمپراتۆر مکسملیانی یەکەم دەکەوێتە ژێر هەڕەشە، کاتێک هەوڵی چاکسازی دەستور دەدا ئەنجومەنی دییت پێک دێنێ ئەرکی ئەم ئەنجومەنە پاراستنی ئاسایش و کۆکردنەوەی باج دەبێ. چونکە ئیمپراتۆریەت دانی بە سەربەخۆیی سویسرا نەهێنابوو، دەبوایە سیستەمی دەستوری نوێ لە هاوشێوەی ئەڵمانیا لەسەر سویسرا جێبەجێ بکرێ، بەڵام سویسریەکان کە شانازیان بە سەربەخۆیی وڵاتەکەیانەوە دەکرد لە ئەنجامی خەبات و قوربانییەکی دوورودرێژ وەدەستیان هێنابوو ئامادە نەبوون بچنە ژێرباری ئەو سیستەمە و دەستکاری ئازادی و سەربەخۆییان بکرێ، بەو هۆیەوە شەڕ لە نێوان ئیمپراتۆر مکسملیان یەکەم و یەکێتی سویسری روو دەدا، یەکێتی سویسری توانیی لە شەڕەکاندا شکست بە هێزەکانی ئیمپراتۆر مکسملیانی یەکەم بێنێ تا ناچاریان کرد بێتە ژێرباری ڕێککەوتنی ئاشتەوایی بال ( Bale )، بەپێی ئەم ڕێککەوتنە چیتر یەکێتی سویسرا سەربە ئیمپراتۆرەوە نابێ تەنها بە ناو، ئەویش لە ١٦٤٨ لە پەیمانی وستفالیا کۆتایی پێدێ، لەوکاتەوە یەکێتی سویسرا بە کارایی دەبێتە وڵاتێکی سەربەخۆ.

لە سنووری یەکێتی سویسری بانگەوازی هەریەک لە زونگلی و کالڤن لە دژی کڵێسای کاسۆلیکی لە ڕۆما سەرهەڵدەدەن.

# زونگلی Ulrich Zwingli




ئولریخ زونگلی Ulrich Zwingli ( ١٤٨٤- ١٥٣١) کەسایەتیەکی ئاینیی سویسری بوو، لە شاری زویرخ دەستی بە بانگخوازی کرد، دوای ئەوەی خوێندنی ئاینی و دیراساتی یۆنانی و رۆمانیی کۆن تەواودەکا دیراسەی هزری چاکسازیش لەسەر بیردۆزەکانی ئەرزمس درێژە پێدەدا، خەڵکانێکی زۆری سویسری پێیەوە سەرسام بوون. لەئەنجامی کاریگەری بیروڕاکانی هەرێمەکانی سویسرا بەسەر دوولەتی هزری پرۆتستانتی و کاسۆلیکیدا دابەش دەبن، رابەرایەتی بزووتنەوەی پرۆتستانتیی لە سویسرا کرد کە شێوازەکەی جیاواز دەبێ لەگەڵ بزووتنەوەی لۆسەری لە ئەڵمانیا، ئەو لە کاتێکدا رەخنەی لە کڵێسای رۆما دەگرت و دژی دەوەستایەوە لە هەمانکاتدا پاراستنی چاکسازی سیاسی و کۆمەلایەتیی دەکرد و رەخنەی توندی لە رەفتارەکانی دەسەڵات دەگرت کە دژی هەژارەکان پیادە دەکرێ، کاری

لەسەر نەهێشتنی سیستەمی سەربازی کرێگرتە دەکرد کە بژێوی ئازووقەیان لەسەر سوپاکانی فەرنسی وئەڵمانی و ئیتاڵی پەیدا دەکرد.

کاتێکیش پاپا کەسایەتییەکی ئاینی خۆی لە ١٥١٩ دەنێرێتە زویرخ بۆ فرۆشتنی چەکی بێگوناهکردن ئەم دژی دەوەستێتەوە و رێگریی لێدەکا، سەرەتا پێدەچو سەربە بزووتنەوەی لۆسەری بێ، بەڵام دواجار دەرکەوت لە هەندێک شتا ناکۆکە لەگەڵی، وەکو پرسی قوربانیدان و دیدی لەسەر کڵێسا، ئەو پێی وابو کڵێسا دەزگایەکی دیموکراسییە لە رێگەی هەلبژاردنەوە خەڵکانێک بەرپرسیاریتی وەردەگرن بۆ دەست نیشانکردن و یەکلایی کردنەوەی پرسەکان و دامەزارندن و پرکردنەوەی پۆستە ئاینیەکان، لۆسەری پێ حاکمی ویلایەت و سەرۆکی کڵێسا و سەرپەرشتیاری کاروبارەکانیەتی.

لە ١٥٢٨ ەوە دابەش بون لە نێوان لایەنگرانی پرۆتستانت و کاسۆلیک سەریهەڵدا، شەڕ لە نێوان ئەو دوو تیمە دەستی پێکرد زونگلی خۆی بەشداریی لەو شەڕانەدا کرد، لە ١٦٣١ هێزەکانی پرۆتستانت شکست دێنن ، زونگلیش لە شەڕی کاپل Cappel دەکوژرێ و کاسۆلیکەکان لاشەی دەسوتێنن، دواجار لە ١٥٣٢ رێکدەکەون پەیمانێکی ئاشتەوایی واژۆ دەکەن لەسەر ئەوەی کە هەر ویلایەت و شارێک مافی هەلبژاردنی ئەو مەزهەبەی هەبێ کە بڕوای پێیەتی بۆ بڕیاردان لەسەر پرسە ئاینیەکانیان بۆخۆیان و لایەنگرانیان.

و: خالید هەرکی

## جۆن کالڤن John Calvin



جۆن کالڤن John Calvin له ۱۵۰۹ له شاری نایون Nayon ی نزیک به پاریس له دایک بووه. بۆخوێندنی زانستی خواوەندی دەچێته زانکۆی پاریس، کالڤن له تەمەنی ۲٤ ساڵ یدا ئاسۆی دونیای ئاینی کریستیی بۆ دەکرێتەوه. وانه و گوتارەکانی چاکسازه ئاینیەکانی دەخوێندەوه له سەروی هەموویانەوه مارتن لۆسەر، ئەم خوێندنەوانه ئامادەسازیەک بوو بۆئەو تا رۆلی سەرکردەی ئەو هەڵمەته بگرێته دەست که هەڵمەتی بزووتنەوەی چاکسازی بوو.

له ئەیاری ۱۵۳٦ دەست له کاری وەزیفی هەڵدەگرێ، بەهۆی ئەوەی پادشای فەرەنسا فرانسوای یەکەم پرۆتستانتەکان دەچەوسێنێتەوه فەرەنسا جێدێلێ، ئەم شار و ئەو شار دەکا تا دواجار له ۱۵۳٦ له سویسرا جێگیر دەبێ. ئیتر لەوێ کتابه بەناوبانگەکەی بەناوی ( رێکخستنەکانی کریستی) Institutes of Christian Regilion دەردەکا که پوختەی رێنماکانی پرۆتستانته. تیایدا:

١/ بڕواکانی کالڤن بەهۆی پشتبەستنیان به کتابی پیرۆزەوه لەگەڵ یەک گونجاو بوون ، بۆ هەموو پرسه ئاینییەکان دەگونجان که بڕوایان وابوو تەنها عیسا دەتوانێ رێگای بەندەی خودا پاککاتەوه.

٢/ پاکانه به بڕوابوونه نەک به کردار.

٣/ کالڤنیزم له رووی بەخشین و بێگوناهکردن لەگەڵ لۆسەردا یەک نەبوون، کالڤن بڕوای وابوو لێخۆش بوون کاری قەدەره نەک کردار، لێخۆشبوون بەخشینێکی خواوەنده کێی خۆشبوێ یا پێی باشبێ بەو دەبەخشێ، بەم پێیه کالڤن زیاتر له لۆسەر بڕوای به قەزاو قەدەر هەبوو ، ئەم بڕوایەش پێی دەوترێ ( قەدەری) Predestination.

هەروەها لەسەر کۆمەڵگا و دەوڵەت لۆسەرو کالڤن ناکۆک بوون.

٤/ کالڤن بڕوای وابوو بۆ پرسە ئاینیەکان نابێ کڵێسا سەر بۆ هیچ حکومەتێک یا پادشایەک دانوێنێ. بە پێچەوانەوە لەسەر کۆمەڵگا، کالڤن بڕوای وابوو کە کۆمەلگا کۆمەڵگایەکی ئاینیە، خەڵکەکەی کەسانی چاک و خاوەن خەسڵەتی پیرۆزن، پادشا دەبێ خزمەتی ئەو خەڵکە بکا هەروەکو خواوەند فەرمانی پێی داوە و لە کتابی پیرۆز بۆی دیاری کردووە.

کالڤن لە سویسرا نمونەی کۆمەڵگایەکی کریستیی دامەزارند کە بریتی بوو لە دەستەیەکی پیاوانی ئاینی بۆ حوکمڕانی کڵێسا، لەگەڵ کۆمەڵگایەکی کڵێسایی لە قەشە و پیاوانی چاک بۆ حوکمڕانی شار، حوکم و سزاکانیان لەسەر ئەو کەسانەی پابەندی ڕێنماکان نەدەبون توند بون، ڕێورەسمە ئاینییەکان زۆر بایەخیان بە گوتاری ئاینی و ئامۆژگارییەکان دەدا، وێنەی مریەم و عیسایان هێنایە خوارەوە، مۆمیان لە جیات چرا بەکار هێنا، گۆرانیە ئاینییەکانیان گۆڕانکاری تێدا کردن و بەکار هێنانی مۆسیکیان لە نێو کڵێسا قەدەغە کرد، بە کۆی گشتی کالڤن دەیەویست بە پێی ئینجیل کڵێسا ببا بەڕێوە.

بەهۆی فشارو چاودێریی لەلایەن حوکمرانان کالڤن دەکەوێتە ژێر چاودێری و سانسۆرەوە ، ئەوانەی لە پەیڕەوی ئاینی دەردەچن سزای توند دەدرێن بەو هۆیەوە کالڤن ناچاردەبێ ژنیف لە نیسانی ١٥٣٨ ژنیف بەجێ بێلێ.

لە ژیانی دورخراوەییدا چەند شارو وڵاتێک دەگەڕێ تا لە ( شاری بال ) لە سویسرا جێگیر دەبێ و داوا دەکا لە ستاسبورگ کڵێسایەکی فرەنسی لەسەر ئەو شێوازەی کە خۆی حەزی لێیەتی دامەزرێنێ. لەوێ بانگخوازی بۆ ڕێبازەکەی دەکا لەم میانە لایەنگری زۆری بۆ پەیدا دەبێ. ئەوەندە نابا بەهۆی شپرزە بوونی دۆخی ژنێڤ هاوڵاتیانی داوای گەڕانەوەی دەکەن، لە ١٥٤١ دووبارە دەگەڕێتەوە ژنێڤ ئیتر ئەمجارەیان درێژە بە بڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەی دەدا بەو شێوەی کە خۆی مەبەستیەتی تا ئەوکاتەی لە ١٥٦٤ لەوێ کۆچی دوایی دەکا.

دوای ئەویش مەزهەبی کالڤنی لە مەجەر و بوهیمیا و فەرەنسا و پۆڵەندا کە پرۆتستانت بوون بڵاو دەبێتەوە، وەکو شێوازی دژایەتی حوکمڕانی خانەوادەی هابسبورگ، لە فەرنسا هیجونوت کە پرۆتستانت بون بونە لایەنگری مەزهەبی کالڤنی، لە زەوییە نزمەکانیش ( بەلژیک و هۆڵەندا ) ئەم ڕێبازە بڵاو دەبێتەوە تا دەگاتە سکۆتڵەندا و ئینگلتەرا.

# بەشی شەشەم

## ئیسپانیا و شۆڕشی زەوییە نزمەکان


فلیپی دووەم، پادشای ئیسپانیا

کاتێـــک ئیمپراتـــۆر چارلســـی پێنجەم دەست لەکار دەکێشـێتەوە و دەستبەرداری هەموو سـەنتەنەتەکانی دەبێ، لە دوای ئاشتەوایی ئوگزبورگ لە ١٥٥٦ لە یەکێک لە دیرەکان خۆی گۆشـــەگیر دەکـــا و دووردەخـــاتەوە، ســـامان و ســـەروەتەکانی لە نێـــوان فردینانـــدی بـــرای و فلیپـــی کوڕیـــدا دابەش دەکـــرێ. فەردینانـــد دەبێـــتە ئیمپراتۆری دەوڵەتی ڕۆمانیی پیرۆز، نەمســـــا و مەجەر و بوهیمیـــــاش دەکەونە ژێـر دەسـتی، مومتەلەکـاتی دیـکە دەبـنە بـۆ فیلیپـی کـوری کە دەبێتە پادشای ئیسپانیا لە ١٥٥٦ تا ١٥٩٨، سەرجەلەی خانەوادەی پادشایەتیی ئیسپانیا لە سـەرجەلەی خـانەوادەی پادشـایەتی نەمسا هەر لە دێر زەمانەوە مەزنتر بووە، دیارە فلیپی دووەم تەنها پادشای ئیسـپانیا نەبوو دیارە بە میرات لە ١٥٨٠ دەبێتە پادشای پۆرتوگالیش.

دەسەڵاتەکانی تا زەویە نزمەکان و میرنشینی بەرجندیای ئازاد.یش دەگرێتەخۆ کە هەموویان دەکەوتنە ناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی پیرۆز.

فیلیپی دووەم پیاوێکی کاسۆلیکی بوو، لە ئاینپەرستییدا توندڕەویش بوو بۆیە پێشڕەوی ژیاندنەوەی مەزهەبی کاسۆلیکی دەکرد نەک تەنها لە وڵاتەکەی بەڵکو لە هەموو دونیا، دیارە لە ئەنجامی دەرکەوتنی چاکسازانی دژ بە کاسۆلیک دابەش بونی ئاینی لە ئەوروپا ڕوودەدا بە شێوازی خەباتی بەرگری لە پێناو دوو هێز لەم میانە دەکەونە ململانێ یەکێکیان پرۆتستانتی کالڤنی دەبێ بارەگاکەی لە ژنێف بوو ئەویتریان کاسۆلیکی و بارەگای لە ڕۆما، ئەم ململانێیە گەلێک لە دەولەتانی ئەوروپی تێیەوەگلان هەر لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەم پێیەوە سەرقاڵ بوون، زەویە نزمەکان مەیدانی ئەو ململانێیە بوو کە شۆڕشەکانی لێ هەلدەگیرسا و خەباتی ئاینیان تێکەڵ بە خەباتی سیاسی دەکرد، شۆڕشی زەویە نزمەکان مەزنترین کارەسات بوو بۆ ئیسپانیا دوای لێکەوتنی زیانێکی مەزنی گیانی و مالی کۆتایی دێ .

زەوییە نزمەکان بریتی بوون لە حەڤدە هەرێم کە ( شازادەکانی بەرجەندی ) لە سەدەی پانزەهەم دەستیان کەوتبوو دواتر بەهۆی هاوسەرگیری لەگەڵ ئیمپراتۆرمکسملیانی ماریی بەرجندیەوە دەکەوێتە ژێر تاجی ئیسپانیا، دواتر بۆنەوەکەی چارلسی پێنجەم دەمێنێتەوە لەویشەوە بۆ فلیپی کوڕی، هەرچەندە بەشێک بوو لە ئیمپراتۆریەت بەڵام بە هیچ شێوەیەک ئیمپراتۆر دەسەڵاتی بەسەردا نەدەشکا بۆیە هەمیشە دەچەوسێندرانەوە بەتایبەت لەسەردەمی چارلسی پێنجەم کە داهات و سامانەکەی بۆ ئیمپراتۆریەت خەرج دەکرا.

هەموو هەوڵی سەرکردەکانیان یەکخستنی هەرێمەکانیان بوو، بەڵام گرفتی گەورەیان لە بەردەم بوو چونکە جیاوازی ئاینی و مەزهەبی و نەتەوی هەبوو لە نێوان هەرێمەکانی باکوور وباشوور، دەبونە ڕێگر لەبەردەم ئەو یەکبونە، دانیشتوانی هەرێمەکانی باکوور زۆربەیان پرۆتستانت و لە ڕەگەزی ( تیوتونی ) بوون، ئارەزوی حوکمی دیموکراتیان هەبوو، بەڵام دانیشتوانی باشوور سەربە کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمانیەوە بوون و لە ڕەگەزی ( کللی ) بوون مەیلیشیان لە حوکمی ئۆتۆکراسی بوو.

کاتێک فلیپی دووەم دەسەڵاتی ئیسپانیا دەگرێتە دەست، بیری یەکخستنی هەرێمی زەویە نزمەکانی لەسەردا بوو، هەندێک بیرمەندیش ئەو بیرۆکەیان بۆ دەوڵەمەند و ڕازاندبۆوە، دیارە دەرفەت و بوار بۆ ئەو بیرۆکە ڕەخسابوو بۆیە ئامانجی سەرەکیی شۆڕش، ڕزگار بوون بوو لەدەست حوکمی بێگانەی ئیسپانی لەسەر وڵاتەکەیان.

و: خالید هەرکی

فلیپی دووەم ماوەیەکی زۆر لەوێ ژیا تا ساڵی ١٥٥٩ کاری لەسەر نەهێشتنی مەزهەبی پرۆتستانت دەکرد چونکە ئەو مەزهەبە لەوێ گەشەی کردبوو ئەوانیش پێیان وابوو تا ئاینی یەک نەخرێ خاک یا هەرێمەکان یەکناخرێن.

یەکێک لە هەڵە مەزنەکانی ئەوەبوو کاتێک حوکمی زەویيە نزمەکان دەگرێتە دەست ناچێ شازادەی بارمای کورێکی بکاتە حاکمی، مارگرێتی خوشکی دەسپێرێ ( ١٥٥٩-١٥٦٧) ( مارگرێت کچی ناشەرعیی چارلسی پێنجەم بوو )، فەرمانبەری ئیسپانی و سوپای ئیسپانیشی لێ دامەزارند، ئیتر گەندەلی و بێزاری بڵاو دەبێتەوە، خانەوادەی شۆڕشگێڕان کۆ دەبنەوە و لەو دۆخە ستەمە بێزار دەبن. دەسەلاتە راستەقینەکە لەدەست کاردینال گرانڤیلای برجەندی بوو Granavelle پیاوێکی جێی متمانەی فیلیپ بوو توند و بەناوبانگ بوو. پانتایی شەڕ ئەوکاتە جۆش دەدرێ، سوپای ئیسپانی بە کردار لەگەڵ خەڵکی زەویە نزمەکان دەکەوێتە شەڕ و داوا لەو وڵاتانەی ژێر دەسەلاتی دەکا هاوکاری مادیی بکەن بۆ بەرێوە بردنی جەنگ و دادگاکانی پشکنین کە باوکی لە زەیویە نزمەکانی دامەزارندبوو، کارەکانیان بەرفراوان دەبن لە ئەنجامدا نارەزایی و بێزاری لە حکومەت لەلایەن کاسۆلیک و پرۆتستانتەکان پەرە دەسێنێ. چونکە فلیپ پێشبینی ئەو شۆڕشەی دەکرد بۆیە هێزی زیاتری رەوانەی زەوییە نزمەکان دەکرد، لە ئەنجامی ئەمە هەستی نەتەوایەتی زیاتر پێدەگا، هەرکە فلیپ هەست بەو مەترسیانە دەکا هێزەکانی دەکێشێتەوە و چاوپۆشی لەو باجانە دەکا کەبەسەریاندا سەپاند بووی بەڵام بەرەنگاریەکان ناوەستێن و نارازیەکان زیاتر هانی خەڵک دەدەن بۆ بەرپا کردنی شۆڕش. ئەوکات بنەماکانی کالڤن بڵاو دەبنەوە و خەڵکی بە پیریەوە دەچن، حکومەتیش بە ئاگر و ئاسن رووبەرووی ئەو نارەزاییانە دەبێتەوە، حوکمەکانی کە دادگای پشکنین دەریدەکردن زۆر بە توندی جێبەجێ دەکران، هەندێک لە گەنجەکان هەڵسانە سەرپێ و خانەدانەکانیش ژمارەیەکی زۆریان چوونە ریزیان و هاوکاریان کردن بە دامەزارندنی کۆمەڵەیەک بەناوی ( هاوپەیمانی سازش ) Compromise، ئامانجەکانیان رایانگەیاند، گرنگتین هەڵوەشاندنەوەی دادگاکانی پشکنین و رزگار بوون لە حوکمی ئیسپانی لە زەوییە نزمەکان.

ئەم بزووتنەوە نەتەوایەتییە سێ فەرماندەی خانەدان سەرۆکایەتیان دەکرد:

١/ ( ولیام ئۆرەنج ) کە بە ولیامی بێدەنگ ناسرا.

٢/ کونت ئیگمۆنت Egmont .

٣/ میری دەریا ( هورون )، بەڵام ولیام ئۆرەنج بەتواناترینیان بوو، لە کۆشکی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم پەروەردە کرابوو، کەسێکی خۆشەویست بوو لە دوا رۆژەکانی حکومرانیی بە حاکمی هۆڵەندا و زێیلاند و ئوتریخت دانرابوو، بەڵام لە سەردەمی حوکمی فیلیپی دووەم لە شێوازی حوکمڕانیی بێزار بوو بۆیە بڕیاری دابوو هاوکاری هەر بزووتنەوەیەکی نەتەوی بکا کە ئامانجی دەرکردنی ئیسپانیەکان بێ لە زەوییە نزمەکان.

لە ساڵی ١٥٦٣ هەرسێ خانەدانەکە ولیام و میری دەریا هورن و کونت ئیگمۆنت، یاداشتێکیان دایە پادشا تیایدا داوای دەرکردنی گرانڤیلایان کرد، فیلیپ پادشا داواکەیانی جێبەجێ کرد بەڵام لە بڕیارەکانی دیکەی وەکو دادگای پشکنین و بەدواداچوونی پرۆتستانتەکان و سوتاندنی ئەو کەسەی گومانی لێدەکرێ کە دژی مەزهەبی کاسۆلیکە پەشیمان نەبۆوە. توندی بڕیارو حوکمەکان هەردوو مەزهەبی کاسۆلیک و پرۆتستانتی بێزار کرد و دەنگی نارەزاییانی زیاد کرد، نزیکەی پێنج کەس لە کەساتیەکانی خانەدان چونە ریز ئەوان و داوای نەهێشتنی دادگای پشکنین و راگرتنی چەوساندنەوەیان کرد، بەم شێوە پێگەی نارازیەکان بەهێز دەبێ و شاندێک پێکدێنن بۆلای حاکمی وڵات، مارگرێت پارما بۆ پێشکەش کردنی نارەزایی لەسەر دادگای پشکنین کە ئیسپانیا هێناویەتە نێو زەویەنزمەکان، شازادە لەم یاداشتە ترسی لێ نیشت بەڵام یەکێک لە راوێژکارکانی هانیدا و ووتی ئەم ( سواڵکەرانە ) چین لێیان دەترسی گوێیان پێمەدە، لەوکاتەوە ئەو هاوپەیمانییە بەوناوە ناونرا ( رۆژی دواتر یەکێک لە ئەندامانی ئەو گروپە لەکاتی کۆبونەوە دەڵێ پێمان دەڵێن سواڵکەر دەبا لە ئێستاوە ئەمە ناومان بێ ).

## شۆڕش و دەرهاوێشتەکانی ١٥٦٦-١٥٦٧

حکومەت داواکەی هاوپەیمانانی رەت کردەوە. لە دەرهاوێشتەی ئەو رەتکردنەوە ئاگری شۆڕش هەلگیرسا و هەموو وڵاتی گرتەوە، پرۆتستانتەکان بەتایبەت کالڤینیستەکان کەوتنە تێکدان و تالان و پاتارکردنی کڵێساکانی کاسۆلیک. لە ماوەی یەک هەفتە ٤٠٠ کڵێسا سووتێندران و تالانکران، وێنەکان دابەزێندران جام و دەرگاکان شکێندران، کاسە پیرۆزەکانی زێرینی قوربانی بەتاڵان بردران، شۆڕش لە سنووری شارێک گیری نەخوارد بەڵکو هەموو شارەکانی گرتەوە تەنانەت دەگاتە ئەمستردام و ئەنتڤێرپنیش، ستونی ئەم شۆڕشە هاوڵاتیانی زەحمەتکێش بوون کە هەست و ئامانجی ئاینیان تێکەڵ بە ئامانجی ئابوری کردبوو بۆ تالانی و تێکدان.

و: خالید هەرکی

ئەم کارە تێکدەریانەی رووخان و تالانی لە دژی کڵێساکانی کاسۆلیک ئەنجام درا، کاسۆلیکەکانی توورەکرد بەو هۆیەوە چیتر پشتگیری هاوپەیمانیان نەکرد کە بە هەماهەنگی لەگەڵ پرۆتستانتەکان دژی حکومەت دەوەستانەوە، هەر بەو هۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە خانەدانانی لایەنگری پرۆتستانت و کاسۆلیک کشانەوە، خانەدانانی پرۆتستانت رەفتاری لایەنگرانیان پێ هەلە بوو، پێیان وابوو بۆیە ئەم رەفتارانەیان کرد تا ئەوان جڵەوی شۆرش نەگرنە دەست، مارگرێت ئەوەندە ترسی لێ نیشت خەریک بوو لە وڵات راکاتە دەرەوە، ئەگەر ولیام ئۆرانج ئامۆژگاریی نەکردبا کە وڵات جێنەهێڵێ. لەهەمان کات پشتگیری و هاندانی خانەدانەکانی وەدەست هێنا تا ئەوکاتەی شۆرشی دامرکاندەوە و دۆخەکانی کۆنترۆل کردەوە، مارگرێت ناڕەزایی و توڕەیی خەڵکی کاسۆلیکی بە هەل زانی تا لە پەیمانەکانی پەشیمان بێتەوە،سەبارەت بە یاداشتی ژمارەیەک لە خانەدانەکان کە بۆ هەلوەشاندنەوەی دادگای پشکنین دابویان، لە جیات ئەمە چەندین تیپی سەربازی دەنێرێتە ئەو ناوچانەی کاسۆلیک نشینن بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان.

فلیپی دووەمیش لە پێشێلکردنی شکۆی کڵێساکان توڕە و ناڕازی بوو، بڕیاری دا تۆلە نەک لە پرۆتستانتەکان بە تەنها بکاتەوە بەڵکو لەو خانەدانانەش بکاتەوە کە بەر لە شۆرش پشتگیریان لە پرۆتستانتەکان دەکرد بۆ کاری دژ بە حکومەت. کاتێکیش ولیام ئۆرەنج بەمەی زانی لە نیسانی ١٥٦٧ هەردوو هاورێکەی جێدێلێ و روو لە یەکێک لە گەرەکەکانی خۆی لە ئەڵمانیا دەکا، بەم شێوە لە چارەنوسی نادیاری رزگاری دەبێ.

فیلیپ دادگای پشکنینی لە زەویە نزمەکان دامەزارند و یەکێک لە شازادە بەهێزەکانی بەناوی شازادە ئەلڤای لێ کردە بەرپرسیار ( Alva )، ئەلڤا بە کەسێکی توند هاتە ناسین دواتر ناونرا بە جەلادی خاکی نیشتمان، شازادە بە فەرماندەیی سوپایەکی بەهێزی ئیسپانی وئیتاڵی دەگاتە نیشتمان، گەیشتنی ئەو ئامارە بوو بۆ هەرکارێکی نایاسایی و توندوتیژ لە پێناو دامرکاندنی شۆرش و لەناوبردنی سەرکردەکانی.

چونکە فیلیپ دەسەڵاتێکی بالاو زۆری بە ئەلڤا دابوو، مارگرێت لەم دەسەڵاتە رەهایە بێزار دەبێ و جێگەی پێ تەنگ دەبێ ناچار وڵات جێدەهێڵێ و لەدەسەڵات دور دەکەوێتەوە، دوای ئەو یەکەمین رێکار کە ئەنجام درابێ دامەزارندنی دەستەیەکی چارەسەری پشێوی بەناوی (ئەنجومەنی خوێن)، ئەم ئەنجومەنە دەسەڵاتێکی یەکجار فرەی پێدرابوو هیچ دەسەڵاتێک لە سەروی ئەوەوە نەبوو بڕیارەکانی رەت نەدەکرانەوە، ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە هەموویان ئیسپانی بوون، بەهەزاران کەس درانە دادگا و لەسێدارە دران، ئەلڤا شانازیی

بەخۆیەوە دەکرد کە لە سەردەمی حوکمی ئەو ١٨٦٠٠ هەژدە هەزارو شەش سەد کەس لە هاوڵاتیانی زەویە نزمەکان لەسێدارە دراون، ئەوانەی لە وڵاتیش رایان کردوە سێبەرانبەری ئەو ژمارەن، زۆربەیان بۆ ئینگلتەرا رایان کردبوو ، بەڵام ( هورن و ئەجمنت ) بەبێ دادگایی لە ناوبردران، ولیام ئۆرەنج رەتی کردەوە لەبەردەم دادگای ( ئەنجومەنی خوێن ) بۆ دادگایی کردن ئامادە بێ ، رایگەیاند کە ئەو میرێکە لە میرەکانی ئەوروپا بۆیە ئامادە نیە لەبەردەم داداگیەکی ناشەرعی ئامادە بێ، لە ١٥٦٨ بانگخوازیی لە نێو خەڵکدا بڵاو کردەوە بەناوی پاکانە Justofocationتیایدا هەموو رووداوەکانی زەوییە نزمەکانی روونکردەوە ئەم نامەی بۆ چەندین زمان وەرگێردرا و لە ئەوروپا بڵاو کرایەوە.

ئەم رووداوانە شێواز و سروشتی ولیام ئۆرەنجیان گۆڕی، لە بێدەنگی دەرچوو کەوتە کارکردن بۆ تۆلە سەندنەوە لە ئیسپانیەکان، هەموو هەوڵەکانی خستنە گەڕ بۆ پێکلهێنانی سوپایەکی بەهێز تا تۆلە لە داگیرکەرانی زەویە نزمەکان بکاتەوە، بەو سوپایە هێرشی کردە سەر شازادە ئەلڤا و هێزەکەی، هەرچەندە دەیزانی نابێ رووبەرووی هێزێکی مەشقپێکراوی وەکو هێزی ئیسپانی ببێتەوە ، بەڵام ئەو پشتی بە مۆرالی سوپاکەی و دڵسۆزیان بۆ دۆزەکەیانی بەستبوو، بۆیە دژی داگیرکەر کەوتە رکەلەبنان.

دیارە مۆرال و خرۆشی سەربازان کافی نیە بۆ سەرکەوتن لە مەیدانی جەنگا، چونکە سوپای ئیسپانی لەروی چەکەوە بەراورد ناکرێ لەگەڵ سوپای ولیام کە بەسەرۆکایەتی براکەی (لویس) ناردبویە سەر هێزەکانی ئەلڤا، ئەلڤا توانیی هێزی هێرشبەر تێکبشکێنێ و سەرکردەکەی بەدیل بگرێ دوای ئەوە بە دەستێکی ئاگر و ئاسن حوکمڕانیی وڵاتی دەکرد و باجی زۆری لەو خەڵکە هەژارە دەسەند کە تەوقی دابون و باجەکەشی بۆ ئیسپانیا دەنارد کە ئەوکات لە دۆخێکی ئابوریی خەراپدا بوو.

هاوڵاتیەکی زۆر ناچار دەبن کۆچ دەکەن و دەگەنە راوچییەکانی دەریاوانی و رێگرانی، هەموویان پیشەیان بووە رێگریکردن لە کەشتی و بەلەمە ئیسپانیەکان و هێرش بردنە سەر بەندەرەکانی، هێرشی کتو پریان دەکردە سەر شارو کەشتیە ئیسپانیەکان کڵێساکانیان خاپور و تالان دەکردن پاتارەکەشیان دەگەیاندە دۆڤەری ئینگلتەراو لەوێ دەیانفرۆشتن، سەرەتا ئینگلتەرا هاوکاریی ئەو نەتەوانەی دەکرد بەڵام دواتر بە هۆکاری سیاسییەوە ئەم هاوکاریەی بری.

ئەورێگرانە کە ناویان لەخۆیان نابوو سواڵکەرانی دەریا لەلایەن ولیام دی لامارکەوە William de la March سەرۆکایەتی دەکران بە کەشتیەکەی هێرشی کردە سەر

کەنارەکانی زێیلاند و لە ساڵی ١٥٧٢ دەستی بەسەر دەربەندی بریل Brille داگرت، دەستگرتنی ( سواڵکەرانی دەریا ) بەسەر ئەم دەربەندە دەبێتە سەرەتای دامەزارندنی کۆماری هۆڵەندا

ئیسپانیەکان لە تۆلەی ئەمە رێکارێکی توندیان گرتەبەر، لەبەرانبەردا دەستیان بەسەر مولکەکانـدا گـرتن وەکـو رێـگە چـارەیەک و تـۆڵە سـەندنەوە لە کـاری تێکـدەرانەی شۆڕشگێرەکان، دادگاکانیشی ئاگادار کردنەوە کە رێکارو بڕیارەکانیان توند کەن بەڵام ئەم کارانە تەنها تووڕەیی و بێزاری هاوڵاتیانی زیاد کرد بۆیە ئەوان بڕیاری خۆیان دابوو تا دوایین سەربازی ئیسپانی لەسەر خاکیان دریغی نەکەن و بەرگری بکەن. بەرەنگاری و راپەڕین لە باکوور زیاتر بوو لەوەی باشوور، نوێنەری ویلایەتەکانی هۆڵەندا، ئوتریخت و خلدرلاند و زێیلاند بڕیاریان دا ولیام ئۆرەنج بکەنە سەرۆکی وڵاتەکەیان و بانگخوازی سەرۆکایەتی هێزەکانیان کرد.

سەرەتا پێدەچوو سەرکەوتن ئاستەم بێ، کارێکی ئاسان نەبوو ژمارەیەکی کەمی سەربازی مەشق پێنەکراو بەسەر سوپایەکی زەبەلاحی وەکو سوپای ئیسپانیادا سەرکەوێ، بەڵام سروشتی جوگرافیا هاوکار بوو بۆیان سوپاکەیان خۆیان لە شەڕی رووبەڕوو دوور دەخستەوە، کاتێکیش دەکەوتنە بەرانبەریان یا گەمارۆ دەدران و پردەکانیان دەخستن و ئاو دەوری دەدان نەجات بوونیان ئاسان نەبوو.

ئەوەی هاوکار بوو بۆ سەرکەوتنی شۆڕشگێران، ئیسپانیا لە دۆخێکی ئابووریی قورسدا بوو سوپاکەی تا چەند مانگێک رەت دەبوو ئەوساش موچەیان پێ نەدەدرا، جگەلەمەش ئیسپانیا تەنها بە شەڕی زەوییە نزمەکانەوە خەریک و سەرقاڵ نەبوو، بەڵکو لەگەڵ فەرەنسا و ئینگلتەراش لە حالەتی جەنگدا بوو، بەم هۆکارانەوە و لەبەر خۆڕاگری خەڵکی هۆڵەندا توانیان بەسەر هێزەکانی ئیسپانیادا سەرکەون و بەشێک لە خاکەکانیان رزگار کەن و وڵاتێکی سەربەخۆی لێ دامەزرێنن.

## پەیمانی خنت Ghent نۆڤەمبەری ١٥٧٦



زۆربەی شەڕەکان شەڕی گەمارۆدان بوون، هۆلەندیەکان خۆراگرانە لەودیو شورەکە بەرگریان دەکرد، یەکەمین سەرکەوتنیان لە لایدن بوو کاتێک گەمارۆ درابوون ماوەیەکی زۆر توانیان بەرگەی گەمارۆ بگرن، کاتێک ئۆقرەیان لێبڕا ولیام ئۆرەنج بڕیاری دا ئاویان بەسەردا بکاتەوە، ئیتر توشی شپرزەیی بون و پەرشو بڵاو بوونەوە، لە یادی ئەم سەرکەوتنە مەزنە و بۆ زیندوو راگرتنی، ولیام بڕیاری کردنەوەی زانکۆی لایدنی بەناوبانگی دا وەکو زیندوو راگرتنی ئەو بەرگریە مەزنەی هۆلەندیەکان.

لە ساڵی ١٥٧٦ ولیام ئۆرەنج توانیی هانی هاوڵاتیان ی باشوور بدا دژی ئیسپانیەکان راپەڕن، پێنەدانی مووچە بۆ چەندین مانگ و بەتاڵان بردنی داهاتی وڵاتەکەیان بۆ ئیسپانیای کردە بابەتی وروژاندن و هاندانی هاوڵاتیان، بەڵام ئیسپانییەکان لە نۆڤەمبەری ١٥٧٦ هێرش دەکەنە سەر شاری ئەنتڤێرپ Antuverp و بە هەزاران کەسی لێ سەردەبڕن و شار تاڵان دەکەن و بە خاپووری جێی دەهێڵن.

لە ئەنجامی ئەو هێرش و تاڵانکارییە هاوڵاتیانی باکوورو باشوور لەیەک نزیک دەبنەوە ژمارەیەک لە نوێنەرانی حەڤدە ویلایەتەکە لە پرۆتستانت و کاسۆلیک کۆدەبنەوە، پەیماننامەی خینت دەبەستن کە ئامانجی سەرەکیان دەرکردنی هێزەکانی ئیسپانی و دامەزراندنی حوکمی ئۆتۆنۆمی دەبێ. لە نێو خۆشیاندا رێککەوتن کە هیچ جیاوازیەکی ئاینی و ناکۆکییەک لە نێوانیاندا نەمێنێ، چەکیش دانەنێن تا سەرجەم هێزەکانی ئیسپانی دەرنەکەن، بەڵام گونجاندن و بەیەکەوە هاتنەوەی هاوڵاتیانی باکوورو باشوور ئاسان نەبوو، ئەگەر ئەو هاوپەیمانییە درێژەی هەبوایە دەکرا سەرجەم زەویە نزمەکان ئازاد بکرێ بەڵام بەهۆی قووڵی ناکۆکییەکان و جیاوازی سروشت و بەرژەوەندیی هەردوکیان درێژەی نابێ، بەهاتنی دون جۆنی پادشای ئیسپانیا بۆسەر حوکم لە جیات فلیپی برای و دانانی حاکمێک بە خۆ نزیک کردنەوە لە خەڵکی باشوور و رازی بوون بە جێبەجێ کردنی پەیمانی خینت

بەو مەرجەی حـاکمێکی ئیسـپانی قەبوڵ کەن و خەڵکانیشـی رادەسـت کەن، ئەمـانە بـوونە هۆکاری جیاکاری لە نێوان باکوورو باشوور.

## حکومەتی دون جون Don John و یەکێتی ئوتریخت:

هەرکە دون جـون دەسـەڵات دەگـرێتە دەسـت، پـێگە و لایەنگرانـی ولیـام ئـۆرەنج لە باشوور بەرتەسک دەبێت و لە بە کـاور قەتـیس دەبـێ، لەو کـاتەوە نـابێتە سـەرۆکی هەمـوو زەوییە نزمەکان چونکە خانەدانانی باشوور لە رووی بیروباوەرەوە ناکۆکیان لەگەڵی هەبـوو ، بۆیە هەستی کرد کە ناتوانێ هەمو ویلایەتەکانی زەویـیە نزمەکـانی بـاکوورو باشـوور لە یەک قەوارەی دەوڵەتدا کۆکاتەوە، چونکە باشـوورییەکان ئامـادە نـین مەرجەکـانی هاوپەیمـانی یـا رێککەوتنـی خنـت Gent جێبەجـێ بـکەن و پابەنـدی خالەکـانی بن، ناچـار کـاری لەسـەر یەکخستنی حەوت ویلایەتەکەی باکوور کرد کە رازین بە سـەۆکایەتیی، لەم هەوڵەیـدا تـوانیی حەوت ویلایەتەکە لە ١٥٧٩ لە ژێر ناوی یەکێتی ئوتریخت یەکبخا و ئەویش بە سـەرۆکی ئەو یەکێتیە بێتە هەڵبژاردن.

## مردنی دۆن جون و دامەزارندنی ئەسکەندەر میری پارما

کاتێک دون جون کۆچی دوایی دەکا فیلیپ پادشا ( ئەسکەندەری میری پارمـا ) بە جێگـرەوەی دون جـون دەکـاتە حـاکمی سـەربازی و مەدەنیـی وڵات. هەمـوو خەمەکـانی ئەسکەندەر تێکشکاندنی بەرەی نەتەوایەتی و لەناوبردنی یەکێتی ئوتریخت بوو.

تـوانیی رەزامەنـدی ویلایەتەکـانی هەرە باشـوور بۆخـۆی مسـۆگەرکا. رەنگدانەوەی ئەو تەرەفگیـریە بـوە خـۆراگری حەوت ویـلایەتەکەی بـاکوور و دووپـاتکردنەوەی پشـتگیریان بـۆ سەرۆکایەتی ولیام ئۆرەنج.

هەرکە ئەو دەنگۆیە دەگاتە فیلیپ پادشا، بەرچاوی تاریک و لە ولیام ئـورەنج شـێت و هار دەبێ ، بریارێک دەردەکا کە ولیـام دوژمنـی مرۆڤـایەتیە ،هەر لەو بریـارە خـوێنی ولیـام حەلاڵ دەکا وپاداشتێکی دەستکراوەش بۆ ئەو کەسە دیاری دەکا کە دەتـوانێ بیکـوژێ. ئەم هەرەشـانە کاریـان کـردە سـەر هەڵوێسـتی هاوڵاتیـانی حەوت ویـلایەتەکەی بـاکوور و پاشگەزبونەوەیان لە گەرم و گوڕی پشتگیری کردنی ولیام، بەئاشکەرا دەرچوونی خۆیان لە

پاڵپشتی ولیام راگەیاند، ووتیان (ئەگەر پادشا بۆ هاوڵاتیانی وەکو شوانێکی باش نەبێت پشتگوێیان بخا تا بەرەو ستەم و زولم بچن، مافی خۆیانە دەستبەرداری بن و چاو لە یەکێکی دیکە بگێرن )، ئەم بەیاننامە بۆ شۆڕەکانی دواتریش بوو بە بنەمای کارکردنیان هەروەکو لە ئینگلتەراو فرەنسا و ئەمریکا شۆڕش هەڵگیرسا و کاریان بەو بنەمایە دەکرد.

بەو هۆیەوە ولیام بریاریدا پەنا بۆ دەوڵەتانی بێگانە بەرێ، داوای لە شازادە ( ئەنجۆ ) برای پادشای فەرنسا کرد ببێتە هاوپەیمان و پارێزەری، شازادە بە داواکەی رازی دەبێ، بەڵام لە پەنای ئەو رازیبوونە هەندێک چاوتێبرینی سیاسیی هەبوون کە شاردبوونیەوە.

شازادە چوی لێبوو ببێتە پادشای ئەو ویلایەتانە. بە چەند دەسەڵاتێکی سنووردار رازی نەبوو هەولیدا هێز بەکار بێنی بۆ سەپاندنی دەسەڵاتەکانی بەسەر ئەو ویلایەتانە و داگیریان بکا، لە روانگەی ئەو سووربونە هێرشی کردە سەر شاری ئەنتفێرپن بەڵام خەڵکەکەی بەرگریەکی قارەمانانەیان لە شارەکە کرد. کە ناتوانێ داگیریکا و شکست دێنێ دەگەڕێتەوە فرەنسا لە ساڵی ١٥٨٤ کۆچی دوایی ەکا.

لە راستیدا ئینگلتەرا سۆزی بۆ هۆلەندیەکان هەبوو ژمارەیەکی زۆریش لە ئینگلیزەکان لە ریزی سوپای هۆلەندی بە خۆبەخشی خزمەتیان دەکرد ، بەڵام هیچ هاوکاریەکی ئەوتۆی ولیام نەکرا.

دوای دەرکردنی میری فرەنسی شازادە ( ئەنجۆ )، ویلایەتەکانی باکوور حکومەتێکی دەستوریان بەسەرۆکایەتی ولیام ئۆرەنج پێکهێنا. بەڵام ژیانی ئەو پالەوانە دوای ئەو رووداوە ئەوەندە درێژ نابێ، کە لە ئەنجامی راگەیاندنی خەڵاتی کوشتنی دا لەلایەن فیلیپ پادشاوە دوای هەوڵێکی حەوت کەرەتی لە حوزەیرانی ١٥٨٤ یەکێک دەتوانێ ئەو خەلاتە بباتەوە و دەستی پێبگا و بیکوژێ.

بۆ دامەزارندنی دەولەتی نوێی هۆلەندی چاکە مەزن و ئازاتیەکە بۆ ولیام ئۆرەنج دەگەڕێتەوە، ئەو وێڕای کەمی زانیاریی لەسەر هونەری جەنگ و تاکتیکەکانی بەڵام کەسێکی بەتوانا بوو لە بەیەک گەیاندنی لایەنە ناکۆکەکانی و خۆراگر و قارەمان بوو.

دوای ئەو ( مۆریس )ی کوری دێتە سەر دەسەڵات ،مۆریس کەسێکی بەتوانا و لێزان بوو لە هونەری جەنگ، توانیی سەربەخۆیی ویلایەتەکانی باکووربە یەکگرتوویی بپارێزێ، دیارە ئەمەش بە هاوکاری ئیلیزابیتی پادشای ئینگلتەرا بوو لەگەڵ هنریی چوارەمی پادشای

فرەنسا. لەو کاتە هەموو هەرێمەکانی باشوور لەژێر سایەی داگیرکاری ئیسپانیا دەمێنێتەوە کەبە هەرێمەکەی زەوییە نزمەکانی ئیسپانیا دێتە ناسین.

هاوڵاتیانی پرۆتستانت لەبەردەم دوو بژاردەدا بوون: یادەبێ ببنە کاسۆلیک مەزهەب، یا دەبێ وڵات جێبێڵن و بەرەو باکوور کۆچ کەن، بەم شێوە باشوور کە بەلژیکی ئێستا دەگرێتەوە بەیەکپارچە دەبێتە کاسۆلیک مەزهەب و ژمارەی پرۆتستانتەکانیش لە باکوور زیاد دەبن، بەڵام بەم کۆچکردنە ژمارەی کاسۆلیکەکانی باکوور کەم نابێتەوە ئێستا رێژەیان دوو لەسەر سێی دانیشتوانی هۆڵەندا یە، ئەوان دەست بەسەر مەزهەبەکەی خۆیاندا دەگرن و دەیپارێزن رێگریش لە مەزهەبەکانی دیکە ناکەن تا هۆڵەندا دەبێتە وڵاتی فرە مەزهەبی پێکەوەژیان و لێبووردەیی ئاینی.

پرۆتستانتەکانی ئەو وڵاتە زۆرینەی رەهایان لەسەر مەزهەبی کالڤنن. ئەوەی بوە هاوکار بۆئەوەی هۆلەندیەکان سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن سەرقاڵبونی فیلیپ بوو بە کێشەکانی مولکداری کە هەمیشە کۆتاییان نەدەهات. سەرباری سەرقالیی بە شەڕی ئینگلیز و لەناو چونی کەشتیگەلییە مەزنەکەی بەناوی ( ئەرمادا ) لە ١٥٨٠ و ناچار بوونی بە ناردنی هاوکاری بۆ کاسۆلیکەکانی فرەنسا. لەگەڵ سەرقالبونی بە پێدانی فەرمانی جوولەکردن بە ئەسکەندەر پارما میری زەوییە نزمەکان کە ناوە ناوە فەرمانی هێرشبردنی پێدەدا دژی فرەنسیەکان، بەو هۆیەوە بە ناچاری لە وڵات دوور دەکەوتەوە.

شەڕ بەردەوام دەبێ لە نێوان هۆلەندیەکان بە سەرۆکایەتی موریس ئۆرەنج و هێزەکانی ئیسپانی کە لە ژێر باری قورسی شەڕەکانی ئەوروپا دەیناڵاند، بەو هۆیەوە ئابوریی داتەپی بوو، بۆیە هیچ یەکیان دانیان بە دیفاکتۆ نەدەنا و شکستی خۆیان رانەدەگەیاند.

لە ١٦٠٩ ئاگربەستێکیان خستە بەردەم کۆماری هۆڵەندا بۆ ماوەی دوانزە ساڵ، لە راستیشدا ئەم داوایە مانای دان نانە بە سەربەخۆیی هۆڵەندا، بە تەواو بوونی ماوەکە شەڕ لە نێوان ئەو دوو وڵاتە دەستپێدەکاتەوە، تا پەیماننامەی ویستفالیا لە ١٦٤٨ واژۆ دەکرێ کە تیایدا ئیسپانیا و ئیمپراتۆریەت دانیان بە سەربەخۆیی هۆڵەندا نا.

سەرکەوتنی شۆڕشی هۆڵەندی کاریەگریەکی مەزنی لە ناخی گەلانی خەباتگێر دروست کرد ، ئەم دەولەتە بەم سەرکەوتنە بوو بە هێزێکی دیاری ئەوروپا، چاکەی زۆریشی بەسەر

پرۆتستانتەکانەوە هەیە لەوەی بە کاریگەری ئەو هێزو قەوارەی پرۆتستانتەکان هاتە پاراستن.

ئیتر هەر لەو کاتەی هۆڵەندا سەربەخۆیی وردەگرێ پرۆسەی ئاوەدانی و پێشکەوتن رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو پێش دەچێ. بەهۆی کۆچی پرۆتستانتەکان لە باشوورەوە، ویلایەتەکانی باکوور ژمارەی دانیشتوانیان زیاد دەکا، ویلایەتەکانی باشووریش ماوەیەکی زۆر لەژێر سایەی حوکمی ئیسپانیدا دەمێننەوە، جگە لە پرۆتستانتەکانی باشوور پرۆتستانتەکانی فرەنسا و ئەڵمانیاش روویان لە ویلایەتەکانی باکوور کرد کە هۆڵەندای ئێستایە.

بەهۆی زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوانی، دەریاکان دەبنە سەرچاوەی بژێوی و پەیدا کردنی رزقی هاولاتیان و دواتریش بۆ مەبەستی بازرگانی کردن هەموو شارەکانی کەنار دەیا بۆیان کراوە دەبێ، بەلەم و کەشتییەکانیان روو لەو کەنارانە دەکەن، گەلێک گۆم و زەلکاوی ناوەوەی ولات بەهۆی زیاد بوونی دانیشتوانی ووشک دەبن.

دوای ئەم رووداوە پێگەی هۆڵەندا لەرووی بازرگانی بەهێز دەبێ، کەشتی و بەلەمەکانی بەئالای هۆلەندیەوە بەندەرەکانی ئەم ولات و ئەو ولات دەکەن بۆ مەرامی بازرگرانی دەستەواژەی ( سواڵکەری دەریا ) کە پێشتر بەو ناوە ناسرابوون ناوبانگ وەردەگرێ، دەستێکی بالایان دەبێ لە دەسترۆیشتویی و بەتوانابونی ولات لە سەربەخۆیی بەتایبەت لە سەدەی شانزەهەم و حەڤدەهەم، هەر ئەوکات هۆڵەندا کێبڕکێ لەگەڵ کەشتیگەلی ئیسپانی و پورتگالی دەکا لە قۆرخکردن و دەست بەسەردا گرتنی بازرگانی لە دورگەی هیندیی رۆژهەلات.

لەساڵی ١٦٠١ کۆمپانیای هیندیی رۆژهەلاتیی هۆڵەندی بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر بازرگانی رۆژهەلاتی دوور دادەمەزرێ، کار و چالاکیەکانی ئەم کۆمپانیایە بوونە مایەی دامەزارندنی ئیمپراتۆریەتی داگیرکاری هۆلەندی لە ئەرخەبیلی مەلایۆ.

کۆماری هۆڵەندا لەسایەی سامان و سەروەتەکەیدا تا ناوەراستی سەدەی حەڤدەهەم لەخۆشی دەژیا، دوای ئەوە داگیرکاری فرەنسا و ئینگلتەرا لەگەڵی کەوتنە هەوڵی کێبرکێ، بەوهۆیەوە ئیمپراتۆریەتی هۆڵەندی رووەو لاوازی دەچێ.

# بەشی حەوتەم

# بووژانەوەی کڵێسای کاسۆلیکی

## دژە بزووتنەوەی چاکسازی

پرۆتستانتیزم بە شێوەیەکی بەرچاو لەسەر دەستی مارتن لۆسەر و زونگەلی و کالڤن لە ئەوروپا بڵاو دەبێتەوە و یەکێتی رۆحیی کریستیش لەسەر دەستی ئەوان وەکو دەستکەوتێک تێکدەشکێ کە بە دەستکەوتی شۆڕشی ئاینی پرۆتستانتیی دەزانن.

وێڕای ئەوەی پرۆتستانتەکان لە نێو خۆیاندا بەسەر چەند رەوتێکدا دابەش ببون و لە چەند پرسێکیش هاوڕا نەبوون بەڵام هەموویان لەسەر دەسەڵاتەکانی پاپا و دکتاتۆریەتیی و لەسەر داننەنان بە پیرۆزیی چینی ئەکلیرۆس هاوڕا و تەبا بوون پێیان وابوو نەک ئەمان بەڵکو کەس لە سەروی ئاستی سروشتی جەماوەر و گەڵدا نین هەموو هاوڵاتیان یەکسان و یەک ئاستن.

پوختەی بڕواکانیان لەم خالانە قەتیس ببون:

١/ ئازادی هاوسەرگیری بۆ قەشەکان. بەو هۆیەوە لە نێو پرۆتستانتەکان رەبەنی ژن یا پیا و نەمان.

٢/ زمانی کڵێساکانیان بوو بە زمانی نەتەوی لە جیات زمانی لاتینی.

٣/ بڕوایان بە لێخۆشبوون لە رێگەی ئیمانەوە بوو نەک بە کڕینی چەکی لێخۆشبوون.

٤/ئەمەو لە گەلێک بڕوای دیکە هاوڕا بوون، نکۆڵیان لە قوربانیدان دەکرد لە پێناو خوێن و گۆشتی عیسا .

٥/ بڕوایان بەو لێخۆشبوونە نەبوو کە پیاوانی ئاینی لە بری کارتی لێخۆشبوون بۆیان دەخواستن تا گوناهەان بشۆردرێن، بڕوایان وابوو ئەم لێخۆشبوونە بە ئیمانداری دەکرێ نەک بە خواستن و بەخشین.

٦/ کتابی پیرۆزیان بە تاقە سەرچاوەی ئاینی کریستی دەزانی.

بێگومان هۆکارەکانی ئابووری یەکێک بوو لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی مەزهەبی پرۆتستانتی و بڵاو بوونەوەی لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپی، وەکو وڵاتی ئینگلتەرا و هۆڵەندا . چاوتێبڕینی خەڵک لە دەستگرتن بەسەر مولکەکانی کڵێسا و تالانکردنی فاکتەرێکی گرنگ و سەرەکی بوو بۆ سەرهەڵدانی پرۆتستانت، بەڵام بێ هۆکاری سیاسیش نەبووە لەکاتێکدا هۆکاری سەرەکی و ئامانجەکە چاکسازی ئاینی بوو کە خۆی لە سەرکەوتنی بزووتنەوەکە دەبینیەوە.

دوای ئەم ڕووداوانە کەم و کوڕیی کڵێسای کاسۆلیک بۆ سەرکردە کاسۆلیکەکان باشتر ڕوون بۆوە و هۆکاری سەرهەڵدانی پرۆتستانتەکانیان بە ڕوونی بۆ دەرکەوت. بۆ مەبەستی چارەسەری ئەو پرسە هەندێک لە بیرمەندانی ئیتاڵی لە پێناو یەکخستنی ڕیزەکانی کریستی هەوڵێک دەدەن بۆ لە نزیک کردنەوەیان و ئەنجام دانی سازانێک لە نێوان هەردوو مەزهەبی کاسۆ؛لیک و پرۆتستانت.

بەڵام لەبەر چەند هۆیەک هەوڵەکانیان بێ ئەنجام دەبن:

١/ بانگخوازەکان کە لە ناو میلەت هەڵنەقوڵابوون و دەربڕی ناخی ئەوانیان نەدەکرد، بۆیە پشتگیری هاوڵاتیانیان بەدەست نەهێنا.

٢/ پاپا ئامادە نەبوو هیچ سازشێک لەسەر دەسەڵاتەکانی بکا، پێی وابوو دەستبەرداربون لە هەر دەسەڵاتیک ئیمپراتۆری پێ بەهێز دەبێ کە بە دوژمنی سەرسەختی خۆی دەزانی. پاپا خۆشحاڵ بوو لەو دۆخەی ئیمپراتۆر تێی کەوتوە کە کێشەی ناوخۆیەتی، لە ئەنجامی شۆڕشی پرۆتستانت کەلێن کەوتۆتە نێوان میرەکانی پرۆتستانت و بەو هۆیەشەوە دۆخی وڵات شپرزە بووە.

پاپاکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی شانزەهەم سەرگەرمی کاری سیاسی و کێشەکانی ئیتاڵی بون، تەنها بۆ چەسپاندنی پێگەی ئاینی خۆیان بایەخیان بە کاروباری دونیایی دەدا.ئ ەوان پۆستی ئاینی خۆیان پێ لە هەموو پرس و کارێک گرتنگتر بوو بۆیە لەبەر کاری دونیایی و سەرقاڵیان بە کاری سیاسییەوە ئەوەندە ڕوویان لە کاری ئاینی و چاکسازی ئاینی نەبوو تا ئەوکاتەی پرۆتستانتەکان سەرهەڵدەدەن.

پاپا کلمنتی حەوتەم بەهۆی ناکۆکیی لەگەڵ ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم هاوکاری پرۆتستانتەکانی دەکرد، بەڵام بەهۆی زوو گەشە کردنی پرۆتستانتەکانەوە ئەو هاوکاریانەی

و: خالید هەرکی

پاپا هیچ سودێکی بۆ ئەو نەبوو، ئەوەتا سێ لەسەر چواری ئەلمانیەکان بوون بە پرۆتستانت و بڕوایان بە رێبازەکەی هێنا کاریگەریشی لەسەر فرەنسا و زەوییەنزمەکان و ئینگلتەرا کرد، ئەو کاریگەریە بوو ئینگلتەرا پەیوەندیەکانی لەگەڵ کڵێسای رۆما دەپچڕێنێ، هەروەها گەلانی دانیمارک و نەرویژ و وژمارەیەکی زۆری پۆلەندا و بوهیمیا و تەنانەت ئیتاڵیاش بڕوایان بە رێبازی پرۆتستانت هێنا، لە ئەنجام کڵێسای رۆما دەکەوێتە ژێر فشار و هەرەشەوە بە ناچاری پێویست دەکا هەندێک رێکاری چاکسازی بگرێتە بەر بۆ کەم کردنەوەی ئەم فشار و مەترسیانە. بۆیە پاپاکانی نیوەی دووەمی سەدەی شانزەهەم لە روی کارکردنیانەوە جیاواز دەبن لەگەڵ پاپاکانی پێشووتریان، ئەمەش چونکە ئەوان هەستیان بەو هەرەشانە کردووەو لە ئەنجامی ئەو هەرەشانەش گەیشتون کە پێگەیان پێ لاواز دەبێ ئەگەر لەدەستی نەدەن. لەم میانە و بۆ ئەم مەبەستە هەندێک رێکاری خۆپارێزی دەگرنە بەر.

لە کۆشکی پاپا ووردە ووردە پارتی کاردینالە چاکسازەکان دەردەکەون ، داوای ئەنجامدانی چاکسازی دەکەن ، بڕوایان وابوو کاتەکەی هاتوە و بەم چاکسازیانە کڵێسا بەهێز دەبێ و دەکەوێتەوە سەرپێ.

بە کۆتایی هاتنی سەدەی شانزەهەم پرۆتستانتەکان لە پاشەکشێدا دەبن، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کڵێسای کاسۆلیک هەندێک چاکسازیی ئەنجامدا، ئەو کارانەی بوونە مایەی لەدەست دانی پێگەی کڵێسا دەستی بەسەردا گرت و چاکسازیی لێ ئەنجامدا، لەو کاتە هێرشی سەر پرۆتستانتەکان گەرم و گوڕیەکی تێدەکەوێ، داوایان لە سەرکردە و جەماوەری پرۆتستانت دەکرد بگەرێنەوە ژێر سایەی کڵێسای کاسۆلیکی رۆمانی.

ئەم رووداوە لە مێژوو بە دژە بزووتنەوەی چاکسازی هاتە ناسین Counter Reformation.

گەورە پیاوانی ئاینی کۆبونەوە و لەسەر ئەوە رێککەوتن کە لە پێناو پاراستنی پێگەی کڵێسای کاسۆلیک و رێگەگرتن لە تۆمەتە هەڵبەستراوەکانی پرۆتستانت دەبێ چاکسازی لە ناوەوە ئەنجام بدرێ، ئەمەش بە وەلانانی هۆکارەکانی دوورکەوتنەوەی بڕوادارانی پرۆتستانت دەکرێ، هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوەی دژە چاکسازییە بریتی بوون لە سێ خاڵ:

١/ پێشتر ئاماژەمان پێیدابوو کە ژمارەیەک لە پاپاکانی نیوەی دووەمی سەدەی شانزەهەم بڕوایان وابوو دەبێ هەندێک چاسکازی ئەنجام بدرێن.

٢/ دامەزراندنی بزووتنەوەی عیساخوازان ( حەزویت ).

٣/ زیاد بوونی ئاستی بێزاری لە دادگای پشکنین کە فلیپی دووەم داهێنەری مەزنی بوو.

دیارە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ( عیساخوازان ) فاکتەرێکی کارای بووژانەوەی کاسۆلیک و گەڕانەوەی ژیانی روحیی بووە.

## کۆمەڵەی عیساخوازان ( حەزویت )

دەرکەوتنی گروپی دیکەی کاسۆلیک یارمەتیدەر بوو بۆ بوژانەوەی مەزهەبی کاسۆلیک لەو گروپانە گروپی (فرانشسکا و دومینکان و بزکتین ) و هیتریش لە شێوەی تایفە و پارتی ئاینی نوێ، بەڵام گرنگترین و کاریگەرترین گروپ کە رۆڵی هەبوو لە پاراستنی کڵێسا (عیساخوازەکان ) بوون کە لەسەر دەستی سەرۆکەکەیان ( ئەجناتیوس لویولا ) Ignatius Loyola لە ١٤٩١-١٥٥٦) دامەزرابوو. ناوبراو سوارچاکی ئیسپانی و سەربە خانەوادەیەکی دێرینی ئیسپانیا بوو، لە تەمەنی لاوێتییدا سەربازێکی خەباتگێر بووە، رۆحی خەمخۆری و ئاینپەروەری پەرۆشیەک دەخاتە دڵیەوە، روو لە خوێندنی ئاینی و وورد بوونەوە لە ژیانی تایبەتی عیسا دەکا، خۆی بۆ خزمەتی کڵێسای کاسۆلیک و پاپاکانی نەزردەکا، لەسەرەتای سەرهەڵدانیدا پەیوەندی بە خزمەتی فەردیناندی حاکمی ئەرجەوان دەکا لە ئیسپانیا.

لە ١٥٢١ بریندار دەبێو دەبێتە پەککەوتە،و لەسەرجێ دەکەوێ، ئەو ماوەی لەسەرجێ بە خوێندنەوەی کتێبی ئاینیەوە خەریک دەبێ، ژیاننامەی هەردوو قەدیسەکە دەخوێنێتەوە و چوە ناو ناخی هزرو بیرەکانیانەوە. هەرکە چاک دەبێتەوە زیارەتی حەجی پیرۆز دەکات ژیانی نەزری خزمەتی کرستیاندەکا، لەوکات گروپێک بەناوی کۆمەڵەی عیساخوازان دادەمەزرێنێ. بۆ بەئەندام بون لەو کۆمەڵە مەرجی قورس دادەنێ، پاپا پۆلی سێیەم رەزامەندی لەسەر ئەو کۆمەڵە دەدا، رەوشتی بەرز و خۆراگری دەبێتە مەرجی بەئەندام بوون، سیستەم و پرسەنسیپەکانی کۆمەڵە ئەوەندە توند بوون هەر لە سیستەم و پرەنسیپەکانی سەربازی دەچوو.

لە ١٥٣٤ سەردانی پاریس دەکا، لەوێ ژمارەیەک لە لایەنگر و بڕواپێکراوانی لێی دەئاڵێنەوە، پەیمانی ئەوەی پێدەدەن کە دەستبەرداری خۆشییەکانی ژیانبن و کار بۆ سەرخستنی ئاینی کردیستی بکەن، بڕوایان بەو رێنمایانە هێنا کە لە کتابەکەیدا بەناوی ( مەشقەکانی رۆحی ) هاتبوون.

و: خالید هەرکی

سەرەتای دامەزرانـدنی کـۆمەڵەکە ژمـارەی ئەنـدامانی حەوت کەس بـوون، هەموویـان پابەندی بە ڕێنما و بنەماکانی ڕێبـازەکە بـوون کە خۆشەویسـتی و کەم مەسـرووفی لە دونیـا پیـادە بـکەن، لە دوای خوێنـدنیش ئەگەر کاتیـان هەبـوو زیـارەتی حەج ( بیـت المقـدس ) بکەن، ژیانیشیان تەرخانکەن بۆ دەرهێنان و ڕزگارکردنی ( بیت المقدس ) لە ژێـر دەسـتی تورکە موسڵمانەکان.

کاتێـک بەهـۆی شـەڕ و ئاشـوبی لەگەڵ تورکەکـان نـاتوانن زیـارەتی حەج بـکەن ( ئەجناتیوس لویـولا ) خزمەت کردنـی پاپـا پـولی سـێیەمیان بۆ پێشنیار دەکا. بۆ ئەم مەبەستە بە یاوەری براکانی دەچێتە ڕۆما.

سیاسـەتی پاپـا ئەوکـات ڕوو لە چاکسـازی بـوو، بـۆ پێشـگرتن لە گەشـەکردنی پرۆتستانتەکان بۆیە پێشوازی لەم بیرۆکە و بڕواکانی کۆمەڵەکەیان دەکا.

سیسـتەمی کـۆمەڵە ئەوەنـدە تونـد بـوو هـیچ هەلەیەک لە سـەروی خۆیـانەوە بەدی نەدەکـرد، سـەرۆک لە هەمـوو هەلەیەک پـارێزراو بـوو، پارێزبەنـدی سـەرۆک لە شـێوەی پارێزبەندی کڵێسا وابوو، ئەندام دەبوایە سوێند بخوا کە بە هـیچ شـێوەیەک لە فەرمانەکـانی پاپا دەرناچێ و بەبێ دوودڵی جێبەجێیان دەکا، دەرکەوتنی ئەم کۆمەڵە لەوکاتە کاریگەریی دەبێ لەسەر بووژانەوەی دەسەلاتەکانی ڕۆحیـی پاپـا لە ئەورویـا. لەهەمـان کاتـدا کـۆمەلەی عیسـاخوازەکان سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا لە بەگژداچـونەوەی ڕەوتـی پرۆتسـتانت و هەڵکشـانی کێرفـی ئەوان، بەتـایبەت لە فرەنسـا و پۆلەنـدا و مومتەلەکـاتی خـانەوادەی هابسـبورگ. هەلکشـانی پرۆتسـتانتەکانی لە ئیتاڵیـا و ئیسـپانیا ڕاگـرت و لەسـەر لایەنگـری کڵێسای کاسۆلیکی هێشتنەوە. دواتر بە پشـتگیری ئەوانەوە بـوو کاسـۆلیکەکانی ئەڵمانیـا و ئینگلتەرا و سکۆتلەندا لەسەر ڕێبازەکانیان مانەوە.

گروپی ( حەزویت ) ەکان ڕۆلێکی گرنگیان لە ژیانی گشتیی کریستەکان بینـی، هەر لە خزمەتـی کڵێسـاوە دەسـتیان خسـتە نێـو سیاسـەت و لەم نێوەنـدە پـلە و پۆسـتی بالایـان وەدەست هێنا، هەندێکیان بوون بە ڕاوێژکار و وەزیری خاوەن پـێگەی جەمـاوەرو دەسـەلات، لە هەمووی گرنگتر لە بواری پەروەردە سەرکەوتنی باشیان وەدەست هێنا و خزمەتـی باشـی ئەو توێژەیان کرد، سەرپەرشتی سەدان خوێندنگەیان دەکرد لە ئەوروپا، بەهـۆی پەروەردەی باش و سەرکەوتنی مەزن لە خوێندنگاکان باوکان کێبرکێیان بوو لە ناردنی منداڵەکانیان بـۆ ئەو خوێندنگایانەی سەربە ئەوانەوەن، کاتێکیش ئەجناتیوس لویولا دەمرێ سەد خوێندنگا و ژمارەیەک لە پەیمانگـای ئـاینی لەدوای خـۆی جێدێلێ، سـەدەیەک بەسـەر دامەزرانـدنی ئەو

کۆمەلە تێناپەڕێ کە ژمارەی خوێندنگاکانی دەگەنە ٧٠٠ خوێندنگا. لە کاریگەری پیاوانی کۆمەلە نەوەی دوای ئەوانیش کەوتنە ژێر هەژمونی کۆمەلە و ڕێبازەکەیان، لە ئەوروپا ئەرکیان تەنها خزمەتی کاسۆلیک و بلاوکردنەوەی دەسەلاتەکانی نەبوو، بەڵکو هەر بەهۆی کاریگەری ئەوانەوە بوو کاسۆلیک لە هەردوو ئەمریکاکە و ڕۆژهەلاتی دوورو دورگە بێخزمەتەکان بڵاو دەبێتەوە.

ئەوەی حەزویتی لە کاسۆلیکەکانی دیکە جیا دەکردەوە ئەوەبوو ئەوان بە چاوی دەزگایەکی خواوەندی سەیری کڵێسایان دەکرد لە کاتێکا کاسۆلیکەکان خۆیان بەچاوی بزووتنەوەی چاکسازی لە چوارچیوەی نەتەوایەتی چاویان لە کڵێسا دەکرد.

## دادگای پشکنین:

ئەم بزووتنەوانەی پاپا پۆلی سێیەمیان بەهێزکرد و پشتیان گرت بۆ دامەزراندنی دادگای پشکنین لە ڕۆما لە ١٥٤٢، لەسەر شێوازی دادگاکانی ئیسپانی. دیارە ئەمەش بۆ کپکردنی پرۆتستانتەکان وبێدەنگ کردنیان لە ئیتاڵیا لە ڕێگای ئەم دادگایەوە، بۆ ئەم مەبەستە شەش گەورە پیاوی ئاینی (کاردینال) دادەمەزرێنێ، دەسەلاتی لێکۆلینەوە لەسەر هەموو پرسێکیان پێدەدا کە پەیوەندیی بە ئاینەوە هەیە. مافی لەسێدارەدان و زەوتکردنی مولک و مالی تاوانباران و دادگایی کردنی بیرمەند و سەرکردەکانی پرۆتستانیان هەبوو بە دەستگرتن بەسەر نوسین و کتابەکانیانەوە. لەم دادگاییکردنانە پاپا پۆلی سێیەم پشتگیریان بوو، ئەم دادگاییە بووە کار و تایبەتمەندی دادگاکانی پشکنین، لەدوای ئەوانیش هەمان ڕێچکە گرترایە بەرو درێژەی پێدەدرێ، دەسەلاتەکانیان ئەوەندە فراوان بوون لە هەموو پرسێکی تایبەت بە ئاینیان دەکۆڵیەوە ئەو شوێنانەی دیاردەی ناوازەیان لێ بەدی دەکرا پشکنەریان بۆ دەناردن بۆ چارەسەری و لەناو بردنی تێکدەران، بەم شێوە دادگای پشکنین لە ئیتاڵیا لە کاری لەناوبردنی پرۆتستانتەکان سەرکەوتنی بەدەست هێنا ، گیانی توندڕەوی و لایەنگرانی کڵێسا بەرز دەبێتەوە. لە ڕاستیدا دامەزراندنی ئەم دادگایانە لە ١٥٤٢ بە سەردەمی چاکسازی کاسۆلیک دێتە ئەژمار بەلام لە ڕوانگەیەکی تەسکەوە، کاری ئەو دادگایانە تەنها لەناوبردنی پرۆتستانتەکان نەبوو بەڵکو چاودێری و لێدانی ئەو کەسانەش بوو کە کاسۆلیکن و لەسەر بنەمای لە یەکبووردن داوای چاکسازیان دەکرد.

و: خالید هەرکی

## کۆمەڵگای ترنت

پارتی چاکسازیی کاسۆلیک کە کاردینالە چاکسازەکان داوای بەپەلەی چاکسازییان دەکرد، گەڕانەوە لای پاپا و بۆ چاوپێداخشاندنی پرسە ئاینییەکان داوای پێکهێنانی ئەنجومەنێکی کڵێسایی گشتیان لێی کرد. سەرەتا پاپا پێی لە داواکەیان خشاند بەڵام لە ١٥٤٥ لەسەر داوا و سووربونی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم ناچار دەبێ ڕەزامەندی لەسەر پێکهێنانی ئەو ئەنجومەنە دەدا بۆگەیشتن بە چارەسەری لەتبونی ئاینی لە ئەڵمانیا. ئەم ڕەزامەندیە لە ئەنجامی قەبولکردنی پاپا پۆلی سێیەم بوو بۆ داواکەی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم، لە بڕیارێکا داوای کۆبونەوەی ئەو ئەنجومەنەیکرد لە شاری ترنت ببەسترێ، ترنت خۆی شارێکە دەکەوێتە سەر چیای ئەلب نێوان ئەڵمانیا و ئیتاڵیا، لە سەردەمی پاپا پۆلی سێیەم ئەو ئەنجومەنە بەردەوام و ناوە ناوە لە بیست ساڵ جارێک کۆدەبۆوە.

جیاوازییەکانی ئەنجومەنی ترەنت لە دوو خاڵی ئامانجەکانیدا بەدی دەکرا:

**یەکەمیان/**

پشتگیریکردنی مەزهەبی کاسۆلیک و بڕیارەکانی.

**دووەمیان/**

ئەنجامدانی چاکسازی لە کڵێسا و گوێگرتن لە سکاڵی لایەنگرانی کاسۆلیک. لە کۆبونەوەکانی ساڵی ١٥٦٣ ئەو ئەنجومەنە گەیشتە چەند بڕیارێک، کە بۆ دووبەش دابەش دەکرێن:

**بەشی یەکەم :**

پەیوەندیان بە سیستەمی کڵێساوە هەبوو. لەم بوارە چەند بڕیارێک دران گرنگترینیان:

١/ بە زەروری دەزانن زمانی لاتینی لە کاتی نوێژدا بەکار بێنن چونکە زمانی خواپەرستیی ئاینییە.

٢/ حەرام کردنی هاوسەرگیری قەشەکان و پابەند بوون بە سیستەمی دێرو سۆفیگەری.

٤/ بیردۆزی پێدانی چەکی لێخۆشبوون بە دروستی جێبەجێ دەکرێ.

٥/ دەسەڵاتەکانی پاپا ڕاستەوخۆ لە عیساوە بۆی هاتوون.

**بەشی دووەم:**

پەیوەندیی بە بیروبڕوای کاسۆلیک خۆیەوە هەیە. لەم رووەوە بڕیاردرا:

١/ بیروڕای لۆسەرییەکان کە دەڵێن لێخۆشبوون پەیوەندیی بە ئیمانەوە هەیە و کەس ناتوانێ لێخۆشبوون مسۆگەر بکا، ئەمە کوفر و هەڵبەستە و درۆیە.

٢/ رەتکردنەوەی گوتەی لۆسەر و کالڤن کە دەڵێن کتابی پیرۆز تاقە سەرچاوەی ئاینە.

٣/ جەختی لەسەر چاکە و رەوشت جوانی و راستگۆیی قەشە و رەبەنەکان کردەوە کە لەگەڵ کردەوەکانیان یەک بگرنەوە.

٤/ پیاوە ئاینییەکان دەبێ لە شوێنی کارەکانیان نیشتەجێ بن و سووربن لەسەر کارەکانیان بە شێوەیەکی رێک و پێک.

٥/ فەرمانی بە ئەنجومەن کرد بەرنامەیەک بۆ پیاوانی ئاینی دارێژێ بۆ فێرکردن و رەوشەنبیر کردنیان.

٦/دامەزارندنی قوتابخانەی خواوەندی لە هەموو ئەبریشەکان بۆ فێرکردنی قەشەکان.

بەم شێوە بڕیارەکانی ترەنت هەنگاوێکی باشیان بۆ بوژانەوەی کاسۆلیک برین. زۆربەی دیاردە نەرێنیەکان کە خەڵکیان بێزار کردبوو چاکسازیان لێ ئەنجامدا، بیروبڕواکەی لە پیسی و گەندەڵی پاک کردەوە، وێنەیەکی جوانی بە بیروبڕوای کاسۆلیک بەخشی، هیچ لێکدانەوەیەک بۆ دیاردەیەکی ناڕون نەمایەوە، کۆمەڵگا خۆی لە هەموو پێشنیارەکان دورخستەوە کە بۆ جێهێشتنی بیروبڕوا نوێکە لە ناوەندی رێگا بیدەن.

دواجار ئەنجومەنی ترەنت بڕیاریدا پاپا سەرفرازکا بۆ دارشتنی پێرسکێکی تەواو بەناوی ئەو کتێبانەی رێگە پێدراو نین لەلایەن کڵێساوە کە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لۆسەرو کالڤن و زونجەلی و هیتر نوسیویانە ئەوانەی کڵێسا پێی وایە لە ئاین دەرچوین، لیستی پێرستەکە بەناوبانگترین نووسەری ئەورووپای تێدابوو کە کتێبەکانیان قەدەغە کران هەر لە سەردەمی رێنسانسەوە.

# بەشی هەشتەم

## فرەنسا و بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی

لە سەرەتای چەرخی نوێ خانەوادەی ( ڤالوا ) حوکمڕانی فرەنسای دەکرد. لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەهەم بەهێزترین کەسایەتیی ئەو خانەوادە لە کۆشکی پادشایەتی دادەنیشێ، ئەویش لویسی یانزەهەم بوو (١٤٦١-١٤٨٣)، چاکە و ئازاتی چەسپاندنی سنوورەکانی فرەنسا بە پەنای هێز و پێکهێنانی سوپایەکی پادشایەتی و لەناو بردنی دەسەڵاتی خانەدانەکان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.



هەرخۆی ئەنجومەنی نوێنەران کە دەکاتە ئەنجومەنی چینەکان سڕ دەکات بە تاکڕەوی حوکمی وڵات دەگێڕێ، بە درێژایی ماوەی حوکمڕانیی تەنها یەک جار کۆدەبێتەوە، پادشا خۆی مەرسومنامە و بڕیارەکان دەردەکا و هەر خۆشی یاساکانی دادەڕشت، ئازادی و سەربەخۆیی گەلێک لە شارەکان کە بەدەستیان هێنابوو لەناوی بردن، هەر خۆی گرێبەستی لەگەڵ وڵاتەکان دەبەست و کاروباری دەرەوەی فرەنسای دەبر بەڕێوە.

فرەنسا بەهۆ پرۆژەی پادشاکەیەوە (چارلسی هەشتەم) کە داگیر کردنی خاکی ئیتالیا بوو ١٤٩٤،خۆی لە کێشەکانی ئەوروپا تێوەگلاند، بەم کارەی تۆی دوژمنکاریی لە نێوان پادشا و خانەوادەی ڤالوا و هابسبۆرگ چاندبوو، لە هەولی ئەوەی خانەوادەی هابسبورگ لە کشوەری ئەوروپا لە دەسەڵات بێبەریکا، پادشاکانی داهاتووی فرەنسای بە شەڕی ئیتالی سەرقاڵ کرد، بەڵام پێیان باش نەبوو لە ڕێگەی دژایەتیی خانەدانەکان و ململانێ هەرێمیەکان پێگەی خۆیان بەهێز کەن، ئیتر دەسەڵاتی پادشایەتی بەهێزتر دەبێ.

بەڵام لە میانی ناکۆکییەکانی ئاینی کە تایفەی هیگونوت Huguenots لە فرەنسا هەڵیگیرساند تاجی پادشایەتی و دەسەڵاتەکانی لەق دەبن و دەهەژێن، ئەو دروشمەی کە لەسەرەتا پادشا فرنسوای یەکەم بەرزی کردبۆوە دەی ووت ( یەک پادشا، یەک ئاین، یەک یاسا ) ئەمە وون بوو و نەما.

بەڵام دوای ئەوەی هنریی چوارەم دێتە سەر کورسیی حوکم لە ١٥٤٩ ئاشتی دەگەڕێتەوە وڵات و پادشا بە هەوڵی دوو وەزیری پێگەیشتوو کە کاردینال ریشیلییە و کاردینال مازارن دەبن دەتوانێ پێگە و دەسەڵاتەکانی بگێڕێتەوە، بەتایبەت لە سەردەمی پادشا لویسی چواردەهەم (١٦٤-١٧١٥) چاکەی یەکەم لە گەڕاندنەوەی دەسەڵات و پێگەی فرەنسا لە کشوەری ئەوروپا بەگشتی بۆ دۆخی جاران بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

## پرۆتستانتیەتی فەڕەنسی:

بەر لەوەی لویسی یانزەهەم دەسەڵات بگرێتە دەست. پیاوە ئاینیەکان بەهۆی مافی نایابیانەوە ( ئیمتیازات ) لە پێشەوەی چینەکانی نەتەوەی فەڕەنسیدا بوون، پێگەی کڵێسای رۆمانی لە فرەنسا بەهێز بوو چونکە پیاوە ئاینیەکانی فرەنسا، زیاتر لەوەی پابەندی دەولەت بن پابەندی پاپای رۆما بوون، پەیوەندیەکان بەم شێوە دەمێننەوە تا ١٥٦١ کە پادشا فرانسوای یەکەم دێتە سەر حوکم لەگەڵ پاپا لیوی دەیەم لە رێککەوتنی پۆلۆنیا Concord Bologne دەگەنە ئەنجامێک، لەو رێککەوتنە پاپا مافی دامەزراندنی قەشە

و سەرۆکی دێرەکانی فرەنسا بە پادشا دەدا، بەم شێوە دەسەڵاتەکانی پادشا لەسەر پیاوە ئاینییەکان زیاد دەبن و پەیوەندیەکانی ئەوانیش لەگەڵ پاپای ڕۆما لاواز دەبن، بەڵکو ئەمە هۆکاری ئەوە بێ پادشاکانی فرەنسا تامەزرۆی مەزهەبی پرۆتستانت نەبوون چونکە هیچ بەرژەوەندێکی خانەوادەییان لەم مەزهەبە نەدەبینی بۆیە لە ماوەی چل ساڵ لە ساڵی ١٥٦٢ تا ١٥٩٨ بەم شێوە دەمێننەوە، دیارە هاندەری ئەم شەڕە تەنها ئاینی نەبووە بەڵکو سیاسی بوە زیاتر لەوەی ئاینی بێ، ئەمە وێڕای ئەوەی هەردوو تیمەکە بەناوی ئاینەوە شەڕیان دەکرد و لەپەنای بزواندنی سۆزی ئاینیەوە شەڕەکەیان دەبرد بەڕێوە.

سەرەتا پێڕەوی لۆسەری لە فرەنسا جێگیر دەبێ بەڵام دواتر چونکە بڕواکانی ئەو لەگەڵ خوو ڕەوشتیان دەگونجا دەبنە کالڤنی. جگە لەمە کالڤن خۆی فەڕەنسی بوو ڕێنما و بڕواکانی بە زمانی فەڕەنسی نوسیبۆوە بۆیە زیاتر لەگەڵ ئەوان دەهاتەوە، نازناوی هیگونوت لە کالڤنە فرەنسییەکان نرا، ژمارەیەکی زۆر لە خانەدان و دەرەبەگەکان ئەم مەزهەبەیان لە خۆگرت و بڕوایان پێی هێنا، کار و پیشەی خۆیان کردە چاکسازی و ئەم ئەرکەیان لەخۆ گرت، ئەمەش وەکو لاسایی کردنەوەی میرە ئەڵمانیەکان بوو کاتێک بڕیاردرا هەر میرێک لە هەرێمەکانی ئەڵمانیا مافی دیاری کردنی ئەو مەزهەبەی هەیە کە بە بەرژەوەندیی هەرێمەکەی دەزانێ بۆیە ئەمانیش مافی هەڵبژاردنی مەزهەبی گونجاویان بەخۆیاندا وکاریان لەسەر کرد، زۆربەیان ڕکابەریان لەگەڵ قەشەو پیاوە ئاینییەکان دەکرد خۆسەری قەشەیان لە کڵێساکان دادەمەزراندن و مەزهەبی پرۆتستانتیان دەکردە مەزهەبی فەرمیی ئەو کڵێسایە کە هەمویان لەسەر ڕێبازی کالڤن دەڕۆیشتن، ئیتر لەو کڵێسانە بە بڕوای کالڤنی نوێژەکان دەکران و بە فرەنسی دەخوێندران.

سەرەتا پرۆتستانتی لە باشووری فرەنسا بڵاو دەبێتەوە دوایتر بەرەو شارەکان دەڕوا تا هەموو وڵات دەگرێتەوە، لەتەک جووتیارو کرێکار چینی بۆرژواش لە شارەکان بڕوای پێدێنن، بەشێوەیەک ئەو مەزهەبە بڵاو بۆوە تەنانەت ئەو کرێکارانەش بڕوایان پێی هێنا کە کەوتبوونە ژێر هەژموونی خاوەن کارەکانیان.

لە سەردەمی پادشا فرانسوای یەکەم ( ١٥١٥-١٥٤٧ ) ناکۆکیی نێوان بزووتنەوەی ئاینیی کاسۆلیک و پرۆتستانت توند دەبێ، لە کاتێکا فرانسوا خەریکی پیلانگێڕان بوو دژی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم و بە شەڕی توندی ئیتالیی سەرقاڵ دەبێ کە دواجار لە شەڕی شکستخواردوی پاڤیا Pavia لە ساڵی ١٥٢٥ بە دیلی دەکەوێتە دەستیان و دەچێتە ژێر میهرەبانی ئیمپراتۆر و ڕەوانەی ئیسپانیا دەکرێ، هەرکە ئازادیش دەکرێ لە ١٥٢٦ و

دەگەڕێتەوە فرەنسا بەهۆی دژایەتیی لەگەڵ پاپا و مەیلی لەسەر بڕواکانی چاکسازی، وا پێدەچێ لە بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی رازی بێ. بەڵام رووداوەکان وا دەکەن بەرژەوەندیی دەسەڵات لە سەرووی حەزو ئارەزووەکانی دابێ، ترسی لەوە هەبوو ناکۆکییەکانی ئاینی فرەنسا لەتکا، هەروەکو لە ئەڵمانیا روویدا بوو، ئیتر لە ١٥٣٥ەوە هەڵوێستێکی توند وەردەگرێ و بزووتنەوەی ئاینی بەتوندی سەرکوت دەکا. کالڤن ناچار دەبێ لە فرەنسا رابکا و بچێتە بازل لە سویسرا، لەوێ کتابەکەی بەناوی ( بیروبڕواکانی ئاینی کریستی )ی دانا، نامەیەکیشی ئاراستەی پادشای فرەنسا پادشا فرانسوای یەکەم کردبە ناوی ( Epitre Dedocatoire a Francois نامەیەک بۆ فرانسوای یەکەم، لەو نامە دیدی کالڤنی لەسەر بیروبڕواکانی بزووتنەوەی چاکسازی ئاینیی دیارکرد، ئەم دوو کتابە لە فرەنسا کاریگەری خۆیان لەسەر ئەوە هەبوو کە پرۆتستانت لە فرەنسا پێڕەوی بنەماکانی کالڤن بکا نەک لۆسەر.

لەوکاتەوە بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی بەسەر دوو قۆناغی سەرەکیدا دابەش دەکرێ:

## قۆناغی یەکەم:

ئەو ماوە دەگرێتەوە کە لە سەردەمی حوکمڕانی فرەنسوای یەکەم مابۆوە و دواتریش سەردەمی پادشا هنریی دووەم ١٥٤٧-١٥٥٩ ) و سەردەمی فرانسوای دووەم ( ١٥٥٩-١٥٦٠) و چارلسی نۆیەم لە ( ١٥٦٠-١٥٧٤ ) ماوە و سەردەمی حوکمڕانی ئەو پادشایانە بە سەردەمی حوکمی ستەم و زۆرداری و کوشتن و کاولکاری و شەڕی بەردەوام ناسرابوو، دواتر سەردەمی هنریی سێیەم دێت کە ململانێکان زیاتر سیاسی بوون لەوەی ئاینی بن.

## قۆناغی دووەم:

دوای هنریی سێیەم، هنری ناڤار دێت کە پادشایەکی پرۆتستانت بوو بە ناوی هنریی چوارەم هاتە ناسین لە ( ١٥٨٩- ١٦١٠) بە دەستبەکاربوونی ئەو قۆناغی دووەم دەست پێدەکا لەسەردەمی ئەو پرۆتستانتەکان دەستکەوت بەدەست دێنن بەوهۆیەوە فرەنسا وەکوو دەوڵەتێکی دابەشکراو دێتە بەرچاو، ئەم لەتبوونە بەردەوام دەبێ تا ئەوکاتەی لە سەردەمی لویسی سیانزەهەم ریشلیو Richelieu کابینەی وەزاری دەگرێتە دەست ئەو بە درێژایی سەردەمی حوکمڕانیی لەسەر بنەمایەکی تەندروست کار لەسەر یەکخستنی فرەنسا دەکا، ئێستا دەتوانین هەنگاو بە هەنگاو باس لە بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی لە فرەنسا بکەین:

## هنریی دووەم ( ١٥٤٧-١٥٥٩ )

هنریــی دووەم درێــژەی بە پرۆســەی فرەنســای یەکەمــی بــاوکی دا لە لێــدانی پرۆتستانتەکان بە مەبەستی لەناوبردن و ریشەکێش کردنیان، فەرمانی بە سەربازەکان دەدا هێرشیان بکەنە سەر، دوای کوشتنیان خانوو بەرەکانیان بەسەردا بروخێنن کارەکان بە ئاســتێک گەیشــتن کە بە هەزاران لە پرۆتســتانتەکان دەکــوژرێن ژمــارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانیان حوکمی کوشتنیان بەسەدا دەسەپێندرێ و لاشەکانیان دەسوتێندرێ، زوڵم بە ئاستێک گەیشت پرۆتستانتەکان لە توانایاندا نەما بەرگە بگرن، لەگەڵ ئەوەشدا پادشا و داروەدەســتەکەی نەیــانتوانی ئەو خەڵــکە لە بیروبڕواکانیــان دوور خەنەوە، ئەم ســتەم و زۆرداریەی لە هیجونوت کرا سۆزی خەڵکی زیاتر بەلای ئەواندا کێشا و لایەنگر و پێڕەوانی بەسۆزتر دەبن، ئیتر ئەو مەزهەبە لە نێو چینی رەوشەنبیر و جووتیار و پیشەوەران بڵاو دەبێتەوە، وێرای ئەوەش ژمارەیەکی زۆری خانەدانەکانی بەلای خۆیدا کێشا، ئەم کێش کردنە لە بڕوای ئاینەوە نەبوو بەڵکو لەبەر ئەوەی دەرفەتێک بوو بۆ وەدەست هێنانی مومتەلەکاتی تاجی پادشا و ئومێدیشیان بە دەستگرتن بەسەر سامانەکانی کڵێسا بوو.

## کاترین دیمدیشی Medici



لە ساڵی ١٥٥٩ لەکاتی ئەنجامدانی هەندێک یاری سوارسوارێن، پادشا هنریی چوارەم ژیان لەدەست دەدا و دەمرێ. ئەم چالاکیە وەکو ئاهەنگێک بوو بەبۆنەی پەیمانی ( کتــو کمبرســیس ) کە کۆتــایی بە شــەڕی نێوان فرەنسا و ئیسپانیا هێنابوو ئەنجام درا. چوار منداڵی لەدوای خۆی بەجێهێشت، گەورەکەیان تەمەنی نەگەیشتبوە پانزە ساڵ، هەموویان لەژێر چاودێری کاترین دی مدیشی مانەوە، هەرسێ پادشای دواتر دێنە سەر حوکم لە لاوازترین پادشای فرەنسا بوون چونکە دەسەڵات لەدەست دایکیان بوو.

کاترین لە خانەوادەی مدیشیی دێرینی سەربە ئیتاڵیا بوو، ئەوکات تەمەنی لە سی ساڵ ڕەت نەکردبوو، بەڵام خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و هەڵگری خەسلەت و خوی خۆبەهێز زان و تاکڕەو بوو. لە ژیانی هاوسەرێتییدا لە پشتی پەردەکانەوە دەژیا، باری هاوسەرەکەی قورس نەدەکرد.

کاتێک هاوسەری دەمرێ ئەو دەرفەتە دەقۆستەوە و بەهێزەوە دێتە مەیدان بۆ کاروباری دەوڵەت. سەرەڕای بەهێزیی بەڵام بەهۆی دۆخی نالەباری ئەوکات نەیوتانی وەکو پێویست دەسەڵات توند کات، دۆخەکان ئەوسا دابەشی و ئاژاوە و پیلانگێڕی باڵی کێشابوو بەسەر وڵاتدا، گروپە هەلپەرستەکان کێبەرکێیان بوو بۆ سود وەرگرتن لە هەلی حوکمڕانی پادشا بچوکەکان، خۆیان لێی نزیک دەکردەوە بۆ سوود وەرگرتن. لەو گرپانە هەندێکیان سەربە هیجونوت بوون هەندێکیشیان کاسۆلیک، کاترین لەهەولی پێکەوەژیانێکی ئاشتیانە و گونجاندندا بوو لە نێوان کاسۆلیک و پرۆتستانت، بەڵام گیانی لێبوردەیی نەکردە بنەمای کارپێکردنی.

لەو ماوە لە پێناو دەستگرتن بەسەر سەروەری وڵات ململانێی توند لە نێوان خانەوادەی فرەنسی دروست دەبێ، یەکەمیان خانەوادەی گیزس Guises کە زۆر پێداگر و بەرگریکار بوو لەسەر کاسۆلیکەکان ، سەرکردەی ئەم خانەوادە سێ کەس بوون ئەوانیش دووبراکە، فرانسوا شازادە گیز و چارلس کاردینالی لورین و لویس کاردینالی گیز، خوشکێکیان هەبوو هاوسەرگیریی لەگەڵ جەمسی پێنجەم پادشای سکوتلەندا کردبوو، مەزنترین ئامانجی ئەو خانەوادە ئەوەبوو فرەنسا لەلایەن خۆیان و خانەوادەی دێرینی دووەم ( خانەوادەی بۆربۆن) حوکمڕانی بکرێ کە دوژمنی سەرسەختی خانەوادەی گیز بوون و سەربە مەزهەبی پرۆتستانت بوون لەسەر ڕێبازی کالڤن.

فرەنسا سەرکردەیەکی کالڤنیی بەرێزیان بوو کە ئەدمیراڵ گسپارد دی کۆلینی Gaspard de Coligny بوو لە خا نەوادەی موگورتسی ئەنتوانی پادشای ناڤا و برای لویس کوندیە بوو فەرماندەی زۆربەی شەڕەکانی هیجونونی دەکرد.

لە باشوور و ڕۆژئاوای فرەنسا پێگەیان بەهێز بوو بەم هۆیەوە ژمارەیەکی زۆری خانەدانە بچووکەکان و پیاو ماقولانی گوندەکانی لە ململانێکان بەشداری پێکردن.

و: خالید هەرکی

## جەنگە ئاینییەکان:

پادشا بچووکەکە فرانسوای دووەم دەسەڵاتی فرەنسا دەگرێتە دەست، ئەوەندە ناژی وەکو پادشا تەنها هەژدە مانگ نەبێ و لە دێسەمبەری ١٥٦٠ کۆچی دوایی دەکا، دوای ئەو پادشاکەی تر دێت براکەی کە تەمەنی تەنها دە ساڵ دەبێ، کاترینی دایکی دەبێتە چاولێکەری، ئەو ژنە دەرفەتی بۆ رەخسا مەرامەکانی بێنێتە جێ کە نانەوەی ئاژاوە بوو لە نێوانِ خانەوادەی گیزو بۆربۆن، بۆئەوەی هێزیان لەبەر ببڕێ و ئەویش بە ئارامی بتوانێ دەسەڵاتەکانی خۆی بەسەر جومگەکاندا بسەپێنێ بە پشت بەستن بەو خانەوادانەی کە میانڕەو و دلسۆزی بوون.

ئەوکات خانەوادەی گیز خاوەنی زۆرترین دەسەڵات و پێگەی بەهێز بوو بەتایبەتیش کە کاترینای دایک پادشای فرەنسا هانی ئەو خانەوادەی دەدا چونکە پارێزەری کاسۆلیک بوو، ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ تورەکردنی خانەوادە مەزنەکانی پرۆتستانتی بەتاییبەت خانەوادەی بۆربۆن و مورمونس ( خانەوادەی مورمونس دلسۆزی بیروبڕوای پرۆتستانتی بوون بەڵام چونکە رقیان لە دایکە پادشا و خانەوادەی گیز دەبۆوە بۆیە چونە ریز هیجونوتەکان ). هەر ئەو خانەوادە بوو وێڕای خەسڵەتی ئاینی خەسلەتی شۆڕشگێڕی و سیاسیان بە کالڤنی بەخشی، ململانیی نێوان ئەو خانەوادانە لەسەر دەسەڵات هۆکارێکی بەهیزی جەنگەکانی ئاینیی بوون لە فرەنسا.

بەمەبەستی لەناوبردنیان کوشتارێکی مەزن لە هیجونوتەکان کەوت لەلایەن خانەوادەی گیزەوە ، وا هەڵکەوت ( فرانسوا دی گیز) لە مارسی ١٥٦٢ بەرەو پاریس بەرێ دەکەوێ بە شاری ڤاسیدا دەروا ( Vassy ) ئەم شارە شارێکی قایم و شوربەندە، بینی کە خەڵکانی هیجونوت لە شوێنێکی ئاشکەرا رێورەسمی نوێژکردن بەرێ دەکەن، سەربازانی فرانسوا دەوریان دەدەن و بەگژ یەکدیدا دێنەوە، لەوکاتە شازادە گیز فەرمان بە سەربازەکانی دەدا دەستیان لێبوەشێنن و تەقەیان لێبکەن، لە ئەنجام ژمارەیەکی زۆر لە هیجونوتەکان دەکوژرێ و دەبێتە کوشتارگەیەکی مەزن، کاتێک ئەم هەواڵە لەنێو کاسۆلیکەکان بڵاو دەبێتەوە دەنگو سەدایەکی زۆری دەبێ ئەوانیش لەلای خۆیانەوە وەکوو هاورێکانیان دەستیان لە هیجونوتەکان وەشاند و لە هەرشوێنێک چاویان پێیان بکەوتبا دەیانکوشتن، بەم کارە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هیجونوتەکان دەکوژرێ.

هیجۆنۆتەکان لە بەرانبەر ئەم هەڵوێستە دەست لەئەژنۆ ناوەستن هێرش دەکەنە سەر کڵێساکانی کاسۆلیک و تالانیان دەکەن ژمارەیەکی زۆر لە پیاوە ئاینیەکانیان دەکوژن و کڵێساکان خاپور دەکەن، لەو کاتەوە شەڕی نێوان مەزهەبەکان لە فەرەنسا دەست پێدەکا و ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەیەکتری دەکوژن و ماوەی سی ساڵ ئەم شەڕە درێژەی دەبێ. هەردووک گروپ هەوڵی خۆپڕچەککردن دەدەن پەنا بۆ لایەنە دەرەکییەکان دەبەن، پرۆتستانتەکان پادشا ئێلیزابێت دەکەنە دۆست و هاوپەیمان، ئلیزابێت بە مەزندەی خۆی ئەگەر لایەنی کاسۆلیک سەرکەوێ هاوکاری ماریی پادشای سکۆتلەندا دەدا ،بۆیە دەبێ بەدوای ناحەزانی ماریدا بگەڕێ ، چونکە ئەوکات ماری لەهەوڵی لێسەندنەوەی تاجی پادشایەتیدا بوو لە ئلیزابێت، پادشا ئیلیزابیت بەو مەرجە هاوکاریی ناحەزانی ماری دەکا کە پەیمانی گرتنی دیپ Dippe و هاڤر Havreی پێبدەن. لە هەمان کاتدا کاسۆلیکەکانی فەرەنسا پشتگیری فیلیپی دووەم پادشای ئیسپانیان وەدەست هێنا.

بە شێوەیەک شەڕ لە نێان ئەو دوو مەزهەبە هەڵدەگیرسێ کە شەڕی وا لە ئەوروپا ڕوی نەداوە. ئەمە شەڕێکی ناوەخۆ نەبوو لە نێوان گەڕەک و گەرەکێک یا شار و شارێک هەروەکو شەڕی ناوەخۆی ئەمریکا و ئینگلتەرا لە سەدەی حەڤدەهەم، بەڵکو شەڕێک بوو لە نێوان هاوڵاتیان کە نەیاسایەک هەبوو بیانپارێزێ نە حکومەت دەیپاراستن و نەدەیتوانی ئەو شەڕە لە نێوان هاوڵاتیانی لە گوند وشارەکان بوەستێنێ .

هەرچەندە سەرکردە لە نێو ئەو دوو مەزهەبە دەردەکەوتن زیاتر خەڵک دەوری دەدان و ئەوانیش شەڕەکانیان خۆشتر دەکردن، جووتیارەکان لە ترسی کوشتن و تالانکردن ڕوویان لە دارستانەکان دەکرد ، چینی مامناوەندی لە شار دەرگایماڵەکانیان لەسەر خۆیان دادەخست، هەندێک لە شارەکان دانیشتوانەکەی لە نێو خۆیاندا تیمی خۆپاراستنیان پێکهێنابوون بۆ پاراستنی سەرو ماڵیان.

ئەم شەڕانە لە ١٥٦٢ تا ١٥٩٣ بەم شێوە بەردەوام دەبێ هەردوو خانەوادەی گیزو مونت موارانسی بە هاوکاری پادشا فیلیپی دووەم سەرۆکایەتی کاسۆلیکیان دەکرد، هەرچی پرۆتستانتەکان بوون ( هیجونوت ) ئەدمیراڵ کولینی Coligny و شازادە کوندێ Conde ڕابەرایەتیان دەکرد، ئەمانیش پشتیان بە هاوکارییەکانی ئلیزابێتەوە بەستبوو. لە قۆناغی یەکەمی شەڕەکان کاسۆلیکەکان سەرکەوتن بەڵام شازادە دیگیزیان لەدەستدا، کاترین دی مدیشی پێی باش بوو خانەوادە کاسۆلیکە خانەدانەکە خۆشی بە سەرەکوتن نەبا، بە ڕێککەوتن لەگەڵ سەرکردەی پرۆتستانتی کوندێ مەرسومنامەی ئەمبواز

Amboise یان لە مارسی ١٥٦٣ دەرکرد. بەپێی ئەو مەرسومنامە هیجونوت لە هەموو شارەکانی هەرێم ئازادی خواپەرستیی پێدەدرێ، ئەم رێککەوتنە و ئاشتی بەردەوام دەبێ ودوای پێنج ساڵ هیجونوت هەست دەکا پیلانێک لە دژیان دەهوندرێتەوە.

## ئاشتەوایی سان جرمان St .germain :

ساڵی ١٥٦٨ شەڕ دووبارە دەست پێدەکاتەوە، لە زۆربەی شەڕەکان هیجونوت شکست دێنن و سەرکردەکەیان کوندێ دەکوژرێ. بەڵام کاسۆلیکەکان ناتوانن درێژە بە سەرکەوتنەکانیان بدەن، بەتایبەت دایکە شاژن کاترین ترسی لە خانەوادەی گیز هەر هەبوو کە خۆیان لەسەر دەسەڵاتا قیم کەن، کە ئەوکات بەهۆی سەرکەوتنەکانیان لەخۆیان بایی ببون، لەخۆیان دەگرت لەژێر دەسەڵاتی ئەواندابن یا دەسەڵاتی فرەنسا بکەوێتە دەست ئەوانەوە، بۆیە جارێکی دیکە روو لە هیجونوت دەکا و لە مەرسومنامەیەکی دیکە بەخششێکی دیکەیان لە مەرسومنامەی سان جرمان پێدەدا بە مەرجی کراوەتر لە مەرسومنامەی پێشو، ئەویش پێدانی ئازادی خواپەرستییان لە دوو شار لە هەر دوانزە هەرێمەکانی فرەنسا، لەگەڵ رێگە پێدان بە کۆبوونەوەیان لە چوار شار، ئەم شارانەش بۆ ماوەی دوو ساڵ پاراستنی بەدەست خۆیانەوە بێ، ئەمەش وەکو دڵنیایی بۆ جێبەجێ کردنی ئاشتەواییەکە، رێگەشی بە خانەدانە هیجونوتەکان دا لە کۆشکەکانیان رێورەسمی ئاینی ببەن بەرێوە بە مەزهەبی پرۆتستانت و ئەوەی نیازیان بێ ئامادەبێ رێگە پێدراوبێ.

ئاشتەوای سان جرمان St. germain کاریگەریی لەسەر نوێبونەوەی ئومێد لە دەرونی هیجونوتدا پیدا کرد، دەرفەتێکیش بۆ کۆلینی رەخسا تا کار لەسەر نزیککردنەوەی کەلێنی نێوان هیجونوت و کاسۆلیکدا بکا. هانیدان تا لە پێناو بەرژەوەندیەکانی فرەنسا ناکۆکیەکانیان وەلانێن. پادشا بچوکەکە چارلسیی نۆیەم بەم سیاسەتە رازی بوو، هاورێتی لە نێوان چارلس و کۆلینی زیاد دەبێ و لەیەک نزیک دەبنەوە بەڵام شاژن لەم نزیک بوونەوە دەترسێ لەوەی کۆلینی بەم رێگایە پێگەی خۆی بەهێزکا و دەسەڵاتی بەسەر کوڕەکیدا بشکێ. لەوەش دەترسا کە خانەوادەی گیز سوود لە دەستپێشخەرییەکە وەرگرن وگورزی خۆیان بوەشێنن، لەو حاڵەتەی ئەگەر بە ئەرکی خۆی هەڵنەستێ بەرانبەر بە هیجونوت، لە ئەنجام بۆخۆیان دەسەڵاتی فرەنسا بگرنەدەست.

خۆی پادشا چارلسی نۆیەم تەمەنی گەیشتبوە بیست و یەک ساڵ بەڵام لە رەفتارەکانی دایکی زۆر بێزار بوو کە شاژن دەسەڵاتەکانی بەکار دێنێ، رقیشی لە فلیپ پادشای دووەم دەبۆوە چونکە داوای رابەرایەتی کاسۆلیکی ئەوروپای بۆ ئیسپانیا دەکرد و لە هەمان کاتیشدا رازی نەبوو لەوەی ئیسپانیا دەسەڵاتی زۆر بەسەر کۆشکی فرەنسیدا دەشکێ، بۆیە رووی لە هیجونوت و سەرکردەکەیان کولینی کرد تا بۆخۆیان کێشکا، بۆ ئەم مەرامە سیاسەتی دەرەوەی فرەنسا بە شێوەیەک گۆڕی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی پرۆتستانت بێنەوە کە دژی پێگەی ئیسپانی بوون لە ئەوروپا. یەکێک لەو رێکارانەی رەزامەندیی لەسەر پەیمانی بەرگری دا کە کۆلینی لەگەڵ ئینگلتەرا لە بلۆا Blois لە نیسانی ١٥٧٢ واژۆی کرد، لەو ماوە پێگە و دەسەڵاتەکانی هیجونوت بەشێوەیەک لەبار بوە کە لە فرەنسا ئەمەی بەخۆیەوە نەدیبوو.

## کوشتاری سان پرتلیمو ١٥٧٢:

کاترینی شاژن هەستی کرد کاتەکەی گەیشتووە خۆی لەو هەڕەشە رزگارکا کە لەسەر دەسەڵاتەکەیەتی، بڕیاریدا لە یەک تۆپەراسیۆندا هیجونوت و سەرکردەکانی لەناو بەرێ. لە کولینیی سەرکردەکانیەوە دەستی پێکرد، لە مانگی ئابی ١٥٧٢ پاریس لە هیجونوت پنگابۆوە ، هاتبون بۆ بەشداریکردن لە رێورەسمی ئاهەنگی هاوسەرگیری هنری ناڤار لە شازادە مارگریت خوشکی پادشا ، دیارە کولینی لە لوتکەی بانگێشتکراوەکان بووە، لە ٢٥ی ئابی ١٥٧٢ لەوکاتەی کۆشک جێدەهێلێ بە پیلانی شاژن یەکێک لە کاسۆلیکە توندڕەوەکان پەلاماری دەدا بەنیازی کوشتنی، بەڵام کولینی نەجاتی دەبێ و بەرناکەوێ، تەنها بە سوکی بریندار دەبێ، کاتێک پیلانەکە رسوادەبێ شاژنیش تەنگەتاو و شپرزە دەبێ، بە ناچاری پیلانە مەزنەکە دژی هەموو سەرکردەکانی هیجونوت جێبەجێ دەکا، . ئەمە دوای ئەوەی بەخەیال گوایە هیجونوت لە دژی تاجی پادشا پیلانیان دارشتوە.

لە بەرەبەیانی رۆژی ٢٤ی ئاب کە رۆژی قەدیس پارتلمیویە، ئاماژەی بە هێزەکاندا کوشتارە مەزنەکە ئەنجام بدەن کە بە هەزاران هیجونوت و سەرکردەکانیان بە شێوەیەکی درندانە لەناو بردران، ئەم کوشتارییە تەنها لە پاریس ئەنجام نەدرا بەڵکو لە هەموو شارەکانی دیکەش ئەنجام درا، زۆربەی کوشتنەکان خانەوادەی گیز ئەنجامی دان، وەکو تۆڵە

سەندنەوەیەک لە هیجونـوت، لەم شـەڕانە کـولینی دەکـوژرێ و سـەری دەپەرێـنن بـۆ پاپـای دەبەن، ئەویش فەرمان دەدا لە بۆنەی ئەو ڕۆژە خۆشە مەدالیایەک بنەخشێنن.

هنری نافا لە مردن رزگاری دەبێ بەهۆی ئەوەی لە کۆشکی پادشایەتی داوای لێدەکەن یا مـردن یـا بـون بە کاسـۆلیک، ئەویـش لە پێنـاو رزگـار کردنـی گیـانی رازی دەبێـت ببێـتە کاسۆلیک، دوای ئەمە کوندیەش هەمان کاریکرد.

ئەم رودا‌وە هێتمەیەکـی مەزن بـوو بـۆ سـەرجەم پرۆتسـتانتەکان نەک تەنهـا لە فرەنسا بەڵکـو لە هەمـوو ئەوروپـا، بەڵام ئەم کارەسـاتە بـۆ هیجونوتەکـانی لەژیانـدا مـابوون نەبـوە مایەی ترس و ورە بەردان بەڵکو سورتر بوون لەسەر ڕێابزەکەی خۆیان و پێداگرتر بوون بـۆ سەندنەوەی تۆڵەی قوربانیەکانیان، بێ ئومێـد نـابن لە خەبـات و تێکۆشـان بڕیـار دەدەن لە پێناو بیروبڕواکانیان درێژە بە خەباتی خۆیان بدەن، بۆیە ئەم کوشتارە نابێتە کۆتایی هێنان بە شەڕ و پێکدادان بەڵکو درێژەی دەبێ بۆ ماوەی بیست ساڵی دیکە.

## هنریی سێیەم:

لە ١٥٧٤ پادشا چارلسی نۆیەم دەمرێ و براکەی هنریی سێیەم دەبێتە شـوێنگرەوەی کە خۆشەویسـتترین کوڕەکـانی شـاژن کـاترین دەبـێ، لە مـاوەی حوکمڕانییـدا هـیچ توانـا و داهێنانێکی بەدیار نەبوو، بە پێچەوانەوە پادشایەک بوو بەدوای رابواردن و جوانکاری و زێرو جلی جوان و کەشخەوە بوو، لە سـەردەمی ئەو هەلوێسـتەکان دەگـۆڕدرێن، هنـری شـازادەی نافار کە لە کۆشک دەستبەسەر بوو لە سەردەمی ئەو رادەکافو دەگەڕێـتەوە سـەر مەزهەبـی پرۆتسـتانتی جـارانی و دەچێـتەوە لای هیجونـوت و درێـژە بە کارەکـانی خـۆی دەدا، سەرۆکایەتی لایەنگرانی دەکا لەدژی تیرۆری کاسۆلیک و هێزەکانی پادشایەتی.

لەو ماوە پارتێکی نوێ لە نێو کاسۆلیکەکان لە فرەنسا سەرهەڵدەدا ناویـان لە خۆیاننـا ( سیاسەتمەداران ) پێیان وابوو بایەخی سیاسەت دەبێ لەسەروی بایەخی مەزهەبەوە بێ و کـاربکرێ بـۆ ئاشـتی و ئـارامی و دڵنیـایی لە وڵات ئەمەش بە لێبـووردەیی دەکـرێ لەگەڵ هیجونـوت و ڕێگەیـان پێبـدرێ پێـڕەوی مافەکانیـان بـکەن، ( سیاسـەتمەداران ) هـیچ سەرکردەیەک یا لیستێکی ڕێکخستنی کاریان نەبوو.

بە پێچەوانەی ئەو پارتە، گروپێکی دیکەی کاسۆلیک دەرکەوتن ڕێبازێکی دژی ئەوانیان گـرتە بەر، رەخنەیـان لە پادشـا وشـاژن دەگـرت کە سیاسـەتێکی لاوازیـان گرتـۆتەبەر بـۆ

**هێنانەدیی ئاشتی لەگەڵ هیجونوت، گوایە هەر بۆنەیەک سازشێکی نوێیان لەگەڵ ئەنجام دەدەن، چەندین شاریان بۆ تەرخان کردون بۆ ئەنجامدانی رێورەسمی ئاینی و کۆبونەوە لە بۆنەکان، ئەوەتا پرۆتستانتەکان بەپێی ئەو مەرسومنامانە ئەوپەڕی ئازادیان پێدراوە، لە هەشت شاری فرەنسا ئازاد و رێگەپێدراون، ئەوەی ئەو کۆمەڵە کاسۆلیکە پێیەوە سەرقل بون پرسی جێگرەوەی تاجی پادشایەتیی فرەنسا بوو بۆ داهاتوو. کاتێک دوا تاقەبرای هنریی سێیەم دەمرێ و هنریش هیچ منداڵی نەبوە شوێنی بگرتەوە، کەواتە جێگرەوەی دەبێتە هنری ناڤار لە خانەوادەی بوربون. بۆیە دەیانویست ئەم کارەساتە روونەدا و سەرکردەیەکی پرۆتستانتی ببێتە پادشای فرەنسا کە فەرماندەی هێزەکانی هیجونوت دەکا، بۆ رێگری گرتن لەم کارە لاریبیان نەبوو لەگەڵ ئیسپانیا رێککەون و خۆیان بخەنە باوەش پادشا فلیپی دووەمەوە.**

## هنريی سێیەم، هنری دی گیز، هنری ناڤار:







لەوساوە مێژووی فرەنسی دەکەوێتە بەر تارماییەکی ناروون. هنریی سێیەم سەرەڕای ئەوەی کەسێکی کاسۆلیک مەزهەب بوو، یەکێک بوو لە پیلانگێڕانی کۆکوژیەکەی سانت پرثلومیو. بەڵام لەو گرێی کوێرەی کاسۆلیکەکان گیری خواردبوو کە ئەندامانی لایەنگری پادشایەتی فرەنسایان نەدەکرد و هەندێک جاریش بانگخوازیان بۆ فیلیپی دووەم، پادشای ئیسپانیا دەکرد کە ببێتە پادشای فرەنسا. هنریی سێیەم لە رق و کینە دژ بە هنریی شازادە گیز پڕکرابوو، بەڵام ئەو خۆی کەسێکی لاوازو بێتوانا بوو، ئەوەتا بێتواناییی ئەوکاتە دەردەکەوێ کە بە ( رۆژی سەنگەر ) دێتە ناسین لە ١٢ی ئایاری ١٥٨٨ کە پاریس رادەپەڕێ و دێنە سەر شەقام بۆ پشتگیری لە هنری شازادەی گیز، ئیتر هنریی سێیەم رادەکا و لە پاریس دەردەچێ، هێزەکانیش لە توانایاندا نابی بچنە ناو پاریسەوە تا راپەڕیوەکان دامرکێننەوە، ئەوسا پادشا شکۆی خۆی لە نێو کاسۆلیک و پرۆتستانت لەدەست دەدا، هیچی لەدەست نامێنێ تا شکۆو دەسەڵاتەکانی بگێڕێتەوە جگە لە کوشتن نەبێ، بۆیە هنری شازادەی گیزو براکەی کاردینال لورین لە کۆتایی ساڵی ١٥٨٨ دەکوژێ.

دایکە پیرەکەی لە نەخۆشیا لەسەر جێ کەوتبوو کاتێک کوڕەکەی ئەو هەواڵەی پێدەداو دەڵێ : ( ئێستا بووم بە پادشایەکی راستەقینەی فرەنسا، پادشای پاریسم کوشت ) بەڵام لایەنگرانی پادشای مردوو نابنە لایەنگری ئەو، لە نێو کاسۆلیکەکانیش پێگەی

لەدەستدا، چونکە بە دوژمنی بیروبڕواکانیان زانی، کاتێک بێ ئومێدی باڵ دەکێشێ بەسەریدا روو لە هنری ناڤاری ناحەزی دەکا، کە بەپێی یاسای جێگرەوە ئەو دەبێتە خاوەنی دەسەڵات لەکاتێکا خاوەنی پێگەی جەماوەریش هەر بەخۆیەتی، ئیتر لەو بێئومێدیە ناچارە دان بە راستیەکاندا بنێ و پەیمانی ئەوەشی پێبدا کە سیاسەتی داهاتووی لەگەڵ هیجونوت سیاسەتێکی لێبووردەیی دەبێ.

دواجار هنریی پادشای کاسۆلیک و هنری ناڤاری پرۆتستانت لەسەر ئەوە رێکدەکەون کە بەرژەوەندیەکانیان هاوبەشن وا پێویست دەکا بەیەکەوە هێرش بکەنە سەر هاوپەیمانێتی کاسۆلیک. ئەو هاوپەیمانێتیە لە نێوان کەسانی توندڕەو ئەنجام درابوو بڕیاریان دابوو دەسەڵات لە هنریی سێیەم بسێننەوە و لە هەمان کاتیشدا رایانگەیاندبوو کە هنری ناڤار شایەنی جێگرەوەی دەسەڵات نیە. هاوپەیمانێتیی نێوان پادشا و ئامۆزا پرۆتستانتییەکەی. پێگەی پادشای پێ بەهێز دەبێ و هاوپەیمانی کاسۆلیکیش لاواز دەکا کە بەلایەنگرەکانی دەستیان بەسەر پاریسدا گرتبوو. یەکەم هەنگاوی هاوبەشی هنریی سێیەم و ئامۆزاکەی گەمارۆدانی پاریس دەبێ، لە ئابی ١٥٨٩ یەکێک لە کاسۆلیکە توندڕەوەکان پادشا تیرۆر دەکا ، ئیتر لەو کاتەوە هاوپەیمانی کاسۆلیک و هنریی ناڤار رووبەڕووی یەکتری بوونەوە.

خاوەنی تاجی شەرعیی فرەنسا هنری ناڤار رێگاکەی بۆ خۆش نەکرابوو، هێزێکی زۆر لە دژی وەستانەوە، لەو کەسانە پیاوانی دەسترۆیشتوی کۆشکی پادشایەتی کە دڵسۆزیان بۆ پادشای پێشو هەبوو، لایەنگری بوون، دواتر کاسۆلیک بوون خزمەتی زۆری پادشاکەیان کردبوو، هیچ کاتێک بیریان لەوە نەدەکردەوە پادشایەکی پرۆتستانتی دەسەڵات و کۆشکی پادشایەتی بگرێتە دەست، ئیسپانیا هاوکاری هاوپەیمانی کاسۆلیکیی دەکرد بۆیە هێزەکانیان لە زەوییە نزمەکانەوە بەرەو فرەنسا هەنگاویان نا بۆ هاوکاری کاسۆلیکە لێقەوماوەکان.

ئەم کێشە و ململانێیە دوو ساڵی خایان، هنری ناڤاری بێتاقەت کرد ناچار بوو کاسۆلیک بونی خۆی رابگەیەنێ، ئەم چارەسەریەی بە تاقە رێگە دەزانی بۆ دەرچو لەم کێشە، تا بتوانێ لەسەر پێگە و سامانی پادشا کۆنەکە داکوتێ و بە سەر چاوتێبرینەکانی ئیسپانیادا زالبێ، چونکە ئەم رێگایەی بە تاقە چارەسەر زانی کە ئاینی فەرمیی فرەنسا کاسۆلیکە دەبێ بۆ رازیکردنی خەڵکەکەی بچێتە سەر مەزهەبەکەیان. هەرکە ئەم بڕیارەی راگەیاند هاوڵاتیانی پاریس دەرگای شاریان بۆ خستە سەر پشت و پێشوازییان لێی کرد، ئەویش لە ساڵی ١٥٩٤ بوە هنریی چوارەمی پادشای فرەنسا، دوای ئەوە شارەکان یەک لە دوای یەک پێشوازیی لێدەکەن و شەڕی ئاینی لە فرەنسا کۆتایی دێت.

و: خالید هەرکی

# هنریی چوارەم ١٥٨٩-١٦١٠




بە هاتنی هنریی چوارەم بۆ کۆشکی پادشایەتی دەسەڵات لە خانەوادەی ( ڤالوا ) دەگواسترێتەوە بۆ خانەوادەی ( بۆربۆن )، پادشا نوێکە سەلماندی کە سەربازێکی ئازاو سیاسیەکی پلە یەکەمە. رێگایەکی راستی لە کاسۆلیک گرتەبەر و سەرکردە کاسۆلیکەکانیش لێی ئالانەوە تەنانەت هەندێک لە سەرکردەکانی هاوپەیمانی کاسۆلیکیش، بەم شێوە حوکمی چەسپا و پاپاش ئەو بریارەی قەدەغە کە خستبویە سەری، هەڵیگرت و وەکو پادشای فرەنسا دانی پێدانا.

خەمی یەکەمی هنریی چوارەم کۆتایی هێنان بوو بە ململانێی چەکداری لە نێوان کاسۆلیک و لایەنگرە کۆنەکانی لە پرۆتستانت ( هیجونوت ) بۆیە داوای لەیەک بووردن و ئاشتەوایی کرد، بانگی سەرکردە کانی هیجونوت کرد بەوە رازیی کردن کە ئازادی ئاینپەریان پێبدا. دواجارلە نیسانی ١٥٩٨ مەرسومنامەیەکی دەرکرد بەناوی ( نانت) Edict of Nantes پێی وابو بەم مەرسومنامە کۆتایی بە کێشەکان دێت و هیجونوتەکان پێی رازی دەبن چونکە لە ئەنجامی دانوستانێکی سەخت لەگەڵ سەرکردە هیجونوت گەیشتنە ئەم رێککەوتنە.

بەپێی ئەو مەرسومنامە ئازادی ئاینپەرستی بە هیجونوت درا لە قەلای خانەدانەکان پێرەو بکرێ، واتە هەرلایەک لە تواناياندا بوو رێورەسمی ئاینی پرۆتستانتی لە سنووری ئیدارەکەی خۆیدا ببات بەرێوە، بەو پێیە ئەو شارانەی دەسەلمێندرێ کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی پرۆتستانتن دەتوانن رێورەسمی ئاینی پرۆتستانتی ببەن بەرێوە، بەلام لە پاریس و دەوروبەری کە زۆرینەی کاسۆلیکن یا قەشەکانیان کاسۆلیکن رێگە پێدراو نەبوو.

هەر ئەم مەرسومنامە رێگەی بە پرۆتستانتەکان دا هاوشان لەگەڵ کاسۆلیکەکان هەموو مافەکانی ئازادی و خوێندن لە زانکۆکان و مافە مەدەنی و ئاینیەکانیان پارێزراو بێ، بە مافی پاراستنیانەوە، لە نزیکەی سەد شاری پرۆتستانتی رێکاری پاراستن وئاسایش دابینکرا بۆ پاراستنی سەروماڵیان، مەزنترین ئەو بنکەی پاراستنانە لە شارەکانی (لاروشیل و مونبلیە و سەمیر) بوون. بەم شێوە پرۆتستانتەکان بەپێی مەرسومنامەی نانت هەموو مافەکانیان بەدەست هێنان کە کاسۆلیکەکان هەرگیز ئامادە نەبوون ئەم مافانەیان پێبدەن، بەم رێکارانە پادشا هنریی چوارەم توانیی بەسەر ناکۆکیە ناوەخۆییەکاندا زاڵ بێ، بەلام بیری لەوە نەدەکردەوە هەموو هاوکارییەکان بە ( جزويت ) بدا لە فرەنسا.

لە راستیدا نانت دەوڵەتێکی بچوکی هیجونیتی لەناو هەناوی فرەنسا دروست کرد، ئەم دەولەتۆکە خاوەنی سوپا و ئیدارە و سیستەم و ئاینی تایبەتی و مافی دامەزارندنی ئەنجومەنی هەبوو کە هەر سێ ساڵ کۆببێتەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە کاروباری لایەنگران و هەوادارانی. بەلام لەم پرۆسە پادشا لە بەرانبەر هیجونوت بە لاواز نەهاتە بەرچاو، ئەم مافانە خۆی پێی دابون بە زۆر لێیان نەسەندبوو، دەسەلاتەکان هی پادشان ئەو دەیبەخشێ هەر ئەویش قەدەغەی دەکا.

پاش ئەوەی ئاژاوەی ئاینی هێور دەبێتەوە هنریی چوارەم روو لا چاکسازی وڵات دەکا لە بوارەکانی ئابوری و بیناسازی. چونکە بەهۆی کێشە ناوەخۆییەکان و دەرەکیەکانەوە وڵات نغرۆی کاولکاری و تێکچون ببو، ئەو بوارە نەدەرەخسا چاکسازی و ئاوەدانی ئەنجام بدرێ، بۆ ئەم مەبەستە پۆستی وزارەتی دارایی بە دۆستێکی دێرینی خۆی سپارد کە ( شازادە ( میر) سوللی بوو Duke Sully ) تا کاروباری دارایی وڵات ببات بەرێوە،

سوللی زیرەکانە توانیی کێشەکانی دارایی وڵات چارەسەر کا، کشتوکاڵ وێران ببو، باجەکان چەند توێژێک دەستیان بەسەردا گرتبوو، بە گەندەڵی دەیانخستە گیرفانەوە، ووردە ووردە داهاتی وڵات لە خزمەت ئاوەدانی و ژێرخانی ئابوری خەرج دەکرێ تا وڵات دەکەوێتە سەرپێ.

هەریەک لە پادشـا و وەزیـر پێیـان وابـوو کشـتوکاڵ سـتوونی ئـابووری وڵاتە، ئەگەر بایەخی پێبدرێ دەتوانێ وڵاتی پێ ئاوەدان بکرێتەوە، جووتیاریش لەم وڵاتە کـاراکتەری ئەم بـوارەیە دەبـێ بژێـوی جووتیـار خـۆش بکـرێ و ژیانیـان بەرەو پـێش ببـردرێ، ئەمەش بە سوککردنی باجەکانی سەر جووتیار دەکرێ، بۆیە دەستکاری سوککردنی بـاجی کشـتوکالیان کرد وەکو پشتگیری جووتیارو هاوکاری کردنی بۆ بەرەو پێش بردنی کشتوکاڵ و چـاککردنی بەرهەمەکانی و کەم کردنەوەی باج لەسەر ئامێری کشتوکاڵ و ئاژەڵ و بەروبومی کشتوکالی. هنری پادشای چـوارەم بـایەخی دیکەشـی بە پیشەسـازی و بازرگانیـدا ، پیشەسـازی کـۆنی بووژاندەوە و نوێکردەوە کارگەی قومـاش و مـافوور و حەریـری دامەزارنـد، هەنـدێک رێکـاری گرنگیشـی لە بـواری بازرگـانی گـرتەبەر، وەکـو دروسـتکردنی رێگەوبـانی نـاوەخۆ و هێلـی شەمەندەفەر و پرد و پەرستگا، چاوی لەوە بوو فرەنسا ببێتە دەوڵەتێکی دەریـایی خـاوەن کۆلۆنیال وەکو کۆلۆنیالیزمی ئیسپانی و پۆرتوگالی.

چاکسازییەکانی ناوەخۆ سیاسەتی دەرەوەیـان لەبیـر نەبردەوە، بـایەخی بە سیاسـەتی فرەنسای بازرگانی و سیاسیی دراوسێکانیدا، چەند گرێبەستێکی بازرگـانیی لەگەڵ ئینگلـتەرا و هۆڵەندا و تورکیا واژۆکرد، چەند هەولێکی داگیرکاریی دا بۆ دۆزینـەوەی وڵاتـانی نـوێ لە ئەمریکای باکووری و کەنەدا، کاریشی لەسەر لەناوبردنی خانەوادەی هابسبۆرگی نەمسـایی و ئیسپانی دەکرد لە ئەوروپا. بڕوای وابوو ئەمە بەتەنیا بەو جێبەجێ ناکرێ ئەگەر هەوڵەکانی دوژمنـانی یەکنەخـرێ کە دەولەتـانی ئینگلـتەرا و فرەنسـا و ئیتاڵیـا و هەمـوو هەرێمەکـانی زەوییە نزمەکان و سـەرکردە پرۆتسـتانتەکانن، چـونکە ئەگەر دەسـەڵاتی ئیسـپانی و نەمسـا لەناو بردران ئەوکات مەیدانەکە بۆ فرەنسا خۆش و ئاسـان دەبـێ دەسـەڵاتی بەسـەر هەمـوو ئەوروپادا بشکێ.

بەڵام هنریی چوارەم ئەوەندە نەژیـا تـا ئومێدەکانی بێنە دی، یەکێـک لە تونـدڕەوانی کاسۆلیک لە شەقامەکانی پاریس لە ئاياری ١٦١٠ تیرۆری دەکا، دیارە بکوژ هەروەکو خەڵکە عەوامەکەش پێیان وابوە هنریی چوارەم ناپاکیی لەگەڵ پرسی کاسـۆلیکدا کـردوە و نیـانی و لێبـووردەیی لەگەڵ هیجونـوت نوانـدووە و هاوپەیمـانێتیی لەگەڵ پرۆتسـتانتەکانی ئەڵمانیـا ئەنجام داوە.

## ماوە سەختەکە (١٦١٠-١٦٢٤)






دوای کوشتنی لویسی چوارەم، کورە نەوجەوانەکەی لویسی سیانزەهەم دێتە سەر تەختی پادشایەتی فرەنسا ، بەڵام بەهۆی بچوکی تەمەنیەوە ماری دی مدیشی Marie de medici دەبێتە راسپاردەی ئەو، لەو ماوە فرەنسا بە دۆخێکی سەخت و دژواردا تێدەپەڕێ ، دەستەیەک لە خانەدانانی هەلپەرست و بەرژەوەندخواز و ماستاوچی دەیکەنە نێچیری خۆیان، کۆشکی ماری دی مدیشی دەکەوێتە دەست ژمارەیەک لە ئیتاڵییەکان، ماری کاتیخۆی بە هاوسەرگیریی لەگەڵ هنریی چوارەم ئەوەندە دڵخۆش نەبو، چونکە لە روی سیاسی و بۆچونەکانیەوە یەکگر و هاوڕا نەبوو، ئەو بە پێچەوانەی سیاسەتەکانی مێردی بیری دەکردەوە، پێی وابوو دەبێ هاوپەیمانی لەگەڵ ئیسپانیا ببەسترێت بۆ هەماهەنگی و گونجاندنی سیاسەتەکانی لەگەڵ فرەنسا، هەروەها سیاسەتی پیادەکراوی هاوسەری لەگەڵ هیجونوت پێی وابوو راست نیە . لەپێناو هەماهەنگی لەگەڵ ئیسپانیا سیاسەتی هاوسەرگیریی لەگەڵ ئیسپانیا ئەنجام دا بۆ لەیەک نزیک کردنەوەی هەردوو خانەوادەی پادشایەتی:

و: خالید هەرکی

لە ١٦١٦ کچی پادشای ئیسپانیا فلیپی سێیەم شازادە ئانی نەمسایی لە کورە یانزەساڵ انەکەی لویسی سیانزەهەم مارە دەکا، لەهەمان کاتدا ئێلیزابێتی خوشکی پادشای فرەنسا لە شازادەی ئیسپانی فلیپ کوری پادشا پلیپی سێیەم مارەکرد، ئەو شازادە بوو کە دواتر دەبێتە فلیپی چوارەم ، پادشای ئیسپانیا.

وەزیرەکەی ئەو، خاوەن پێگە بەهێزەکەی ئیتالی بوو خەلکی تسکانیا بوو، بە ناوی کونەینی Coneini ، ئەوبەهۆی هاوسەرەکەی کە کارکەری شاژن ماری پادشا بو بە پلەی (مارشالی فرەنسا ) دەگا، هەندێک لە زیان پێگەیشتوانی خانەدانانی فرەنسا هەولی کودەتا و دەسەلات گرتنەدەست بوون، بەلام هەولەکانیان بە فیرۆو بێ ئەنجام دەگەیشتن بەهۆی دەم کوتکردنیان بە زێر و خشلی بەها، بۆ ئەم مەبەستە و مەبەستی دیکە ئەو زێر و خشلەی وەزیر ( سوللی ) لە خەزینەی دەولەت دایکردبوو خەرجیانکرد.

کاتێک لویسی سیانزەهەم تەمەنی دەگاتە بالقی بانگێشتی ئەنجومەنی نوێنەران دەکا چاوێک بە کاروباری ولات و داراییەکەیدا بخشێنن. ئەم ئەنجومەنەش پێکهاتبوو لە ئەندامانی خانەدان و پیاوانی ئاینی و چینی بۆرژوا، هەر چین و توێژێک لەم چین و توێژانە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەبوو پێیەوە بەسترابۆوە بۆیە ئەو ئەنجومەنە نەیتوانی بگاتە هیچ رێککەوتنێکی چارەسەری بۆ دارایی ولات و چاکسازییەکانی، هەرکە پادشا بینیی ئەم ئەنجومەنە ناگاتە هیچ رێککەوتنێک بریاریدا بۆ هەمیشە هەلبوەشێتەوە، هەر وایلێهات ئەم ئەنجومەنە بۆ ماوەی سەدو شەست سال کۆنەبۆوە، تا شۆرشی فەرنسی لە ١٧٨٩ وون دەبێ.

ئێستا دەسەلاتەکانی پادشا بەهێزتر لە، بەرلە تەمەنی بالقیی. بیری لەوە کردەوە لە دەسەلاتەکانی کونەینیی Coneini سەرۆک وەزیران رزگار بێ کە دایکی دایمەزارندبوو، دوای ئەوە هاوسەری کە کارکەری شاژن ماریی دایکی بوو بە جادووکەر تۆمەتباری کرد و سوتاندی، ماریی شاژن لەم رەفتارانەی بێزار و توورە دەبێ بەهۆیەوە ماوەیەک گۆشەگیر دەمێنێتەوە و لە کۆشکی پادشایەتی دوور دەکەوێتەوە، دوای ماوەیەک حەزی دەچێتەوە دەسەلات هەولی گەرانەوەی کۆشکی پادشایەتی دەدا، بۆ ئەم مەبەستە کاردینال ریشلیۆ پەنا بۆ قەشەی لوسوف دەبا، ئەویش میانگێریی بۆدەکا لەلای پادشا و ئاشتیان دەکاتەوە، بەم شێوە ماری دی مدیشی دەگەرێتەوە کۆشکی پادشایەتی.

کە هیجونوت هەست دەکا مافەکانیان پێشێل دەکرێن ئەوەی لە مەرسومنامەی نانت بەدەستیان هێناوە خەریکە لەبەین دەچێ شۆرشیان دژی ئەم دۆخە راگەیاند، شەری

**سیساڵەی ئاینی لە ئەڵمانیا لە نێوان کاسۆلیک و پرۆتستانت هەڵدەگیرسێ کاریەگری دەرونیی خۆی دەبێ لەسەر پارتە ئاینیەکانی فرەنسا. ئامانجی هیجونوت ئەوەبوو لە شارەکانیان لە باشووری فرەنسا سەربەخۆ بن، بەڵام لویسی سیانزەهەم دژیان وەستایەوە و بە توندی لێیدان، هێرشی کردە سەریان لە شارەکانی (مونبیلیە ولاروشل و منتوبان)، هیجونوت زۆر قارەمانانە بەرگریان کردو بە رویاندا وەستانەوە، بەڵام کاتێک مونبیلیە دەکەوێتە دەست لویسی سیانزەهەم ناچار دەبن دانوستان دەکەن و بە ئاشتەوایی رازی دەبن، گرنگترین مەرجەکانی دانوستان، رەچاوکردنی خاڵەکانی مەرسومنامەی نانت بە پاراستنی شارەکانی هیجونوت جگە لەو شارەی لەدەستیان داوە کە دوو شار دەمێنێتەوە لاروشل و مونتوبان دەبن بە سەربەخۆیی لەدەستایندا دەبێ، هەر لەو رێککەوتنەدا هاتوە هیجونوت لە نێوان خۆیاندا هیچ کۆبوونەوەیەکی سیاسی ئەنجام نەدەن.**

## كاردينال ريشليۆ (١٦٢٤-١٦٤٢)

هەركە شاژن دەگەڕێتەوە کۆشکی پادشایەتی، کەسایەتیەک دێتە ناو کۆشکی فرەنسی نوێنەرایەتی راوێژکارێکی بەهێزو بەرێز دەبێ ئەویش کاردینال ریشلیۆ بوو کە لە ساڵی ١٦٢٤ پۆستی وەزارەت دەگرێتە ئەستۆ بۆ ماوەی هەژدە ساڵ لێێ بەردەوام دەبێ لەو ماوە حوکمێکی راستەقینەی فرەنسا بەدەست ئەو کەسایەتیە دەبێ ، خۆی داینەمۆی سیاسەتی ئەوروپا دەبێ، دروشمەکانی خۆیان لە یەک دەستەواژە دەبینیەوە ئەویش (زاڵبونی فرەنسا) بوو. ئەمە بە دیدی ئەو دوو ئامانج دەپێکێ:

**یەکەمیان** / یەکێتی گەلی فرەنسا لە ژێر تاجە گولینەی فرەنسی و لەژێر سێبەری حکومەتێکی ناوەندیی بەهێز، ئەمەش بە پشتگیری پادشا و بەهێز کردنی پێگەی ئەو و ناچار کردنی خانەدان ولەباربردنی سەربەخۆیی هیجونوت دەکرێ.



**دووەمیــان/** ئامــانجێکی سیاســەتی دەرەوەیە بە لەنــاوبردنی خــانەوادەی هابســبۆرگی نەمسایی وئیسپانی لە ئەوروپا بۆئەوەی فرەنسا ببێتە خـاوەن دەسـەڵاتی بـاڵا و پێگەیەکی مەزن لەم کشوەرە.

یەکەم تەگەرە هــاتە پێشــی لاوازکردنــی ناوەنــدی سیاســیی هیجونــوت و قەوارە سـەربەخۆکەی بـوو کە لە نـاو دەولەتـی فرەنسـا دەوڵەتێکیـان دروسـت کـردووە، پێـداگری وسوربونیان لەسەر بەرگری کردن لە هەر دەسـتکاریەک پەیوەنـدیی بە مافەکانیـانەوە هەبێ کە بەپێی رێورەسمنامەی نانت پێیان بەخشراوە گرفتێکی مەزن بوو لەبەردەمـی، ئەم گـرفتە رێگـر بـوو لەبەردەم ئەنجـام دانـی یەکێتـی فرەنسـا لەژێـر سـایەی پادشـا.، هیجونوتەکـان پێشبینی ئەوەیان دەکرد لەسەر دەستی کاردینال ریشلیۆ مافەکانیان زیاتر پێشـێل دەکـرێن، بۆیە بەباشیان زانی تا زووە و ریشلیۆ بە ژمارەیەک ناحەز دەوری دراوە لەوانە خانەدانەکـان کە بەرژەوەنـدییەکانیان لە مەترسـیدایە لەدەسـت ئەو، باشـتر وایە ئەوان گـورزی خۆیـان بوەشێنن، لە هەمان کات ئومێدیان وابوو ئینگلتەرا هاوکارییان بکا لەم کارەیان.

لە ١٦٢٥ دەستیان بە تۆپەراسیۆنەکە کرد، دەستیان بەسەر کەشتیەکی فرەنسیدا گرت کە ریشلیۆ مەبەستی بوو بیکاتە کاکلی کەشتیگەلی فرەنسی، دواتـر دەسـتیان گـرت بەسـەر چەند کەشتیەکی دیکە لە هۆڵەندا و ئینگلتەرا بەڵام ریشلیۆ بە دەستێکی تونـد لێـی دان و پەیمانیدا هەموو دەستکەوتەکانی سیاسیی هیجونوت لەناو بەرێ.

لە ١٦٢٧ ریشـلیۆ فەرمـان دەدا هێـرش بکـرێتە سـەر بەنـدەر و قەلای (لاروشـڵ) کە گرنگتـرین مـۆلگەی پرۆتسـتانتەکانی فرەنسـا بـوو، هیجونـوت پشتبەسـتن بە هاوکاریەکـانی ئینگلتەرا بریاری بەرگریاندا، بەڵام گەمارۆی هێزەکـانی ریشـلیۆ تونـد دەبـێ درێـژە دەکێشـێ هاوکارییەکانی ئینگلتەرا سوودی نابێ و بەهانایـانەوە نـایەت برسـێتی و قـاتوقڕی دەکەوێتە نێو شارەکە، هیجونوت ناچار دەبێ ئالای سپی بەرزکاتەوە و خۆیان رادەستی ریشلیۆ بکەن، بەڵام ریشلیۆ لەگەڵیان توند نابێ ئاشتەوایيەکی نـوێ بەنـاوی پەیماننـامەی ئەلایـس یـان لە ١٦٢٩ لەگەڵ واژۆ دەکا ، بەپێی ئەو پەیماننـامە هیجونـوت ئـازادی ئاینیـان بـۆ دەمێنێـتەوە بەڵام ئازادی سیاسی لەدەست دەدەن، چونکە ریشلیۆ پێی وابو بە پێـڕەو کردنـی ئەم خـاڵە یەکێتی فرەنسا دەکەوێتە مەترسی، لە هیچ شارێک پارێزبەندیان بۆ نەمایەوە، ئیتر بـوون بە هاوڵاتیی ئاسایی فەڕەنسی، دوای ئەوەی خەسڵەتی سیاسیی کۆنیان لەسـەر هەڵگیـرا بـوونە دڵسۆزترین پیاوانی پادشا.

و: خالید هەرکی

بـۆ تەواو کردنـی پرۆسـەی یەکێتـی فرەنسـا روو لە کێشـەی خانەدانەکـان کـرا، لە لاوازکردنیان سەرکەوتوو دەبێ، هـیچ ئەنـدامێکی خـانەدان بۆی نەبـوو بە هاوتەریـب مـامەلە لەگەڵ حکومەتدا بکا، بەڵام ئەوان بۆ دەولەمەنـدی و دەسـەڵاتی دەرەبەگـایەتی وەکـو خـۆی دەمێننەوە تەنها خەسلەتی سیاسی و پلەی تایبەتیان نامێنێ ئەمیش بە خەیالی ئەوەی ئەم جیاوازیەش چارەسەر دەکا ، وێرای ئەو هەموو گورزەی پێیـان کەوتبـوو بەرگەی مانەوەیـان هەبوو، لە هەمـووی سـەیرتر لە نێـو ئەنـدامانی خـانەوادەی پادشـایەتی هەنـدێک لایەنگریـان هەبوون لە دژی پادشا، شاژن مـاری دی مدیشـی سازشـی لەگەڵـدا دەکـردن و هاوسـۆز بـوو لەگەڵیان دژی پێشێلی مافەکانیان بـوو، بـۆیە خانەدانەکـان ئەو نیانییەیـان لە بـرای پادشـا جاسـتون شـازادەی ئورلیـان بینـی کە هاوکاریـان بکـا بـۆ سـەرنگونکردنی ریشـلیۆ و دوورخستنەوەی لە دەسەڵات، ئەوەندەی نەمابوو نـاحەزانی لە پیلانەکەیانـدا سـەرکەون بەڵام پێێ زانی و لەناوی بردن، جاسـتۆنی بـرای ناچـار دەبـێ راکـاتە لـورین، مـاری دی مدیشـیی دایکی بەرەو برۆکسل هەڵات، بەم شێوە ریشلیۆ بەسـەر هەمـوو ئەو پیلانـانەدا سـەردەکەوێ کە لە دژی دەهۆنـدرێنەوە و بەردەوام دەبـی لە جێبەجێکردنـی بەرنـامەکەی کە ریشـەکێش کردنی خانەدانەکـان لە سـەروی هەموویـانەوە دەبـێ، بـۆ ئەم مەبەسـتە سـوپایەکی نیزامیـی رێکوپێک دادەمەزارند لەژێر فەرمانـدەی خـۆی، تـایبەت بـێ بـۆ ئەم جـۆرە ئەرکـانە لەکـاتی پێویست، مەزنترین گورز کە لە خانەدانەکانی دا، دامەزارندنی حـاکمی هەرێمەکـان لە چینـی مامناوەند بوو بە پێدانی دەسەڵاتی تەواو کە پێشتر ئەم پۆستە هـی خانەدانەکـان بـوو، ئەم سیستەمەی بە پادشا وازۆ کرد و بەسەر هەموو هەرێمەکاندا گشتگیر کـرد بـۆ کـار پێکـردن، لە ١٦٣٧ بەدواوە ئیتـر دەسـەڵات دەکەوێـتە دەسـت ئەم حاکمـانە لە هەمـوو هەرێمەکـانی فرەنسا.

دەسـەڵاتی ئەوەنـدە فراوانـی پێـدان هەنـدێک پێیـان دەوتـن پادشـای هەرێمەکـان ئەم دەسەڵاتانەش پشتبەست و بە خودی پادشا و لەژێر تاجی ئەو دەبن.

ریشـلیۆ کـاری بـۆ سـەپاندنی دەسـەڵاتەکانی ئەنجـومەنی نـوێنەران نەکـرد، بەڵکـو دژی هەمـوو ئەو دەسـەڵاتانە بـوو کە رێگـر بـوون لە سیسـتەمی عـورفی فرەنسـی، ئەنجـومەنی نوێنەرانی فرەنسـی تەنهـا سـێبەرێک بـوو، دەسـەڵاتی ئەوەی نەبـوو بەشـداری لە گفتوگۆ و دیالۆگی یاساداناندا بکا.

سیاسەتی دەرەوەی وەکو ئاماژەمان پێیدا تەرخان کرابوو بۆ لەنـاو بردنـی خـانەوادەی هابسبۆرگ کە لە ئەوروپا بالا دەست بوو. دیارە سیاسەتی ئیسپانی لە لای چیای ئەلبـرانس

و دەریای سپیی ناوەڕاست و بەلژیک و بەرجندیای ئازادەوە گەمارۆی فرەنسای دابوو، خانەوادەی هابسبۆرگی نەمسایی خاوەنداریێتی ئەڵمانیا و ناوەڕاستی ئەورووپایان بە مافی خۆیان دەزانی، ئەم داواکاریەیان دەرفەتی بۆ ریشلیۆ رەخساند تا خانەوادەی هابسبۆرگ لە شەڕی ناوەخۆ تێوەگلێنێ کە ئەوکات لە ئەڵمانیا سەری هەڵدابوو، ئەویش ئەو جەنگە بوو کە پەرەی سەند و ماوەی سی ساڵی خایاند.

# بەشی نۆیەم

## جەنگی سی ساڵە

## ١٦٤٨-١٦١٨

پرۆسەی ئاشتەوایی ( ئەجز بورگ ) لە ١٥٥٥ شکستی هێنا لەوەی هەموو لایەنەکان پێی رازی بن، ئیمپراتۆر نەیتوانی مەزهەبی کاسۆلیک بەسەر هەموو ئەڵمانیادا بسەپێنێ، بۆیە حاکمی ویلایەتەکانی سەرفراز کرد لە وەی کامە مەزهەب بەبەرژەوەندی ویلایەتەکەیان دەزانن هەلیبژێرن بێ ئەوەی هاوڵاتیان ناچارکەن پێڕەوی مەزهەبێکی دیار بکەن.

ئەم ئاشتەواییە لایەنگرانی مەزهەبی کالڤنی نەگرتەوە، لە کاتێکا زۆربەی ئەڵمانیەکان بروایان بە مەزهەبی کالڤن هێنابوو، مەرجی ئاشتەوایی لە هەندێک لە ویلایەتەکانی ئەڵمانیا وەکو براندنبورگ و پلاتین تەنها بۆ لۆسەریەکان بوو بە هیچ شێوەیەک بەلای کالڤنیەکاندا نەدەچون و ئەوانی نەدەگرتەوە، لەئەنجام رق و کینەیان لەیەکتری هەڵگرت و ئەو دوو گروپە پرۆتستانتییە زیاتر لەیەک دوور دەکەوتنەوە تا گەیشتە ئەو ئاستەی، لەیەک جیا دەبنەوە، لە دیاری کردنی رێورەسمی ئاینیی مەزهەبی پرۆتستانت جیاوازی و ناکۆک دەبن، ئەمە لە کاتێکا مەزهەبی کاسۆلیک بەهۆی دژە بزووتنەوەی چاکسازییەوە گەشە دەکا وەهەولی عیساخوازەکانیش کاریگەری خۆی دەبێ لەو گەشەکردنە، بەم هۆیەوە کاسۆلیک لە پۆڵەندا و زەویە نزمەکان و ئیسپانیا و فرەنسا دەچەسپێ، مەزهەبی کاسۆلیک لە ئیسپانیا و ئیتاڵیا بە دروستی جێگیر دەبێ، بەم گەشە کردنەی کاسۆلیک ئومێدێک کەوتە دڵی کاسۆلیکەکان، کە دەکرێ پرۆتستانتەکان لەنا وببردرێن و ئەڵمانیا بگێرنەوە باوەش کڵێسای رۆمانی، لە راستیشدا ئاشتەوای ئەجزبورگ تەنها پشوو هەناسە خواردنەوەیەک بوو، چارەسەری کێشەی ئاینیی نەکرد، ئەوەندەی نەبرد دوای سێ ساڵ دوو بارە لە ١٦١٨ دەتەقێتەوە کە بە ئاشتەوایی وستفالیا لە ١٦٤٨ کۆتایی دێ.

کێشەی ئاینی و ئامانجە سیاسییەکان تێکەڵ بەیەکتری ببون، ئیمپراتۆر سەرکردەی سروشتی و پارێزەرانی کاسۆلیک بوو لە ئەڵمانیا، بەڵام میرە ئەڵمانیە کاسۆلیکەکان ترسیان

لە وە هەبوو ئەگەر پشتگیری ئیمپراتۆر بکەن دواجار دەسەلاتی بەسەر هەموو میرە کاسۆلیک و پرۆتستانتەکانی ئەلمانیادا دەشکێ، بۆیە میرانی کاسۆلیک کە رقیان لە پرۆتستانت بوو لە هەمانکاتدا حەزیان لێ نەبوو ئیمپراتۆرێکی بەهێزیان هەبێ، هەلوێستی هەندێک میر لە شەڕی سی ساڵە، ئەم لێکدانەوە دەسەلمێنێ.

هەندێک کێشەی دیکە بوونە مایەی تێکچونی پەیوەندیەکانی نێوان کاسۆلیک و پرۆتستانت لە ئەلمانیا، میرەکانی پرۆتستانت لە ویلایەتەکانی باکور و باشوور لە ساڵی ١٦٠٨ کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامدا بۆ پێکهێنانی یەکێتی پرۆتستانتی، لە بەرانبەردا لە ١٦٠٩ یەکێتی کاسۆلیک دادەمەزرێ.

ئەم دۆخە زەمینسازییەک دروست دەکا بۆ هەلگیرساندنی جەنگێکی ئاینی لە ئەلمانیا. لەو کاتەوە شەڕی سیساڵ ە لە ئەلمانیا هەلدەگیرسێ، بەلام کە بلاو دەبێتەوە وەکو جەنگی ئاینی نامێنێ دەبێتە شەڕی نەتەوە و دەولەتان دژی دەسەلاتەکانی خانەوادەی هابسبورگ بۆ پاراستنی هاوسەنگی لە ئەوروپا.

جەنگی سیساڵە بۆ چوار قۆناغ یا خول دابەش دەبێ ئەمانیش:

خولی یەکەم/ جەنگی بوهیمی (١٦١٨-١٦٢٥)

خولی دووەم/ جەنگی دانیمارکی (١٦٢٥-١٦٢٩)

خولی سێیەم/ جەنگی سوێدی (١٦٣٠-١٦٣٥)

خولی چوارەم/ جەنگی سوێدیی فرەنسی (١٦٣٥-١٦٤٨)

## (خولی یەکەم) جەنگ لە بوهیمیا دەست پێدەکا:

یەکەم بلێسەی هەلگیرساندنی جەنگ لە بوهیمیا سەرهەلدەدا، کە مۆلگایەک بوو لە مۆلگاکانی پرۆتستانت. وا رێکدەکەوێ لە ساڵی ١٦١٨ فەردیناندی میری نەمسا لە خانەوادەی هابسبورگ وەکو ئیمپراتۆر دێتە هەلبژاردن بەناوی فەردیناندی دووەم ، لە هەمان کاتیشدا پادشای بوهیمیا بوو، وا ناسرابوو کە لە هەرزەکارانی کاسۆلیک و دوژمنی سەرسەختی پرۆتستانت بوو،

و: خالید هەرکی




بۆهیمیەکان هەستیان بە مەترسیی چارەنوسی مەزهەبەکەیانە کرد کاتێک فەرمان دەرکرا کڵێساکانیان بروخێنن، ئەوان دژی ئەو بڕیارە وەستانەوە بەڵام ستەمیان لێکرا، گەلی پرۆتستانتی لە پراگ دژی ئەم بڕیارە رادەپەڕن، گەل بەرگریەکی توند دەکا، لە ئەنجامدا شەڕی نێوان هاوڵاتیان و هێزەکانی کاسۆلیک دروست دەبێ، شۆڕشگێڕەکان دەستدرێژیان کردە سەر سێ فەرمانبەری حکومەت کە نێردەی ئیمپراتۆر بوون، لە پەنجەرەی بینای شارەوانیەوە فرێیان دانە خوارەوە، ئەمە دەستپێکی جەنگەکە بوو، فەردیناند لە وەڵامی ئەو دەستدرێژییە هێزی ناردنەسەر بۆ کپکردنی شۆڕشکەیان.

پرۆتستانت هیچ ئومێدێکیان نەبوو بەبێ هاوکاریی دەرەکی لەم شۆڕشەدا سەرکەون ، بۆ ئەم مەبەستە روویان لە فریدریکی حاکمی پالاتین کرد کە یەکێکە لە سەرکردەکانی پرۆتستانتی کالڤینی، ئەویش داواکەیانی قەبوڵ کرد و بوو بە فەرماندەی بزووتنەوەکەیان وتاجی پادشایەتی بۆهیمیی لەسەرنا، بە فریدریکی پێنجەم ناونرا، هێزەکانی یەکێتی پرۆتستانتی بۆ هاوکاری بۆهیمیەکان جوولەیانکرد، ئیمپراتۆر فەردیناندیش هاوکاری دارایی لە پاپاوە پێگەیشت، بۆ هاوکاری ئەویش هێزەکانی ئیسپانی لە میلانەوە و هی کاسۆلیک لە باڤاریا بەرەو بەرەکانی شەڕ چون ، هێزەکانی پرۆتستانتیان بە هێزێکی زەبەلاح گەمارۆدا،

کە ژمارەیان لە پەنجا هەزار جەنگاوەر کەمتر نەبوو، کاتێک هێزەکان لە داستانێک بەیەک دەگەن بە ناوی ( چیای سپی ) لە نزیک پراگ، هێزەکانی فردریک لە توانایاندا نەبوو بەرگری ئەو هێزە مەزنەی فەردیناند بکەن، لە ئەنجامدا فردریک رادەکا و هێزەکانی لە چارەنووسێکی نادیار جێدەهێلێ، ناو لە فردریک نرا پادشای زستان چونکە تەنها زستانەکەی خۆشیی بە تاجی پادشایەتی برد، فەردیناند بە دەستێکی پۆلایین لە سەرکردە پرۆتستانتەکانی داو زوڵمێکی زۆری لێ کردن هاوڵاتیانی بوهیمیاشی بە زۆر کردن بە کاسۆلیک، بەم هۆیەوە هەزاران خانەوادەی پرۆتستانت کۆچ دەکەن، لە دروست بونی ئەم بۆشاییە عیساخوازەکان روو لە بوهیمیا دەکەن لە رێگەی کردنەوەی خوێندنگاوە مەزهەبی کاسۆلیک بلاو بکەنەوە، بەم شێوە کاتێک هاوڵاتیانی پشتگیری سەرکەوتنی بۆهیمیەکان دەکەن بوهیمیا جارێکی دیکە دەژێیتەوە و هەناسەی پرۆتستانتەکانیش لە نەمسا کپ دەکرێ، ئەم کارەساتە بووە مایەی لەناوچوونی یەکێتی پرۆتستانتی لە ١٦٢١ و گواستنەوەی رابەرایەتی پرۆتستانت بۆ پادشای دانیمارک، ئیترخولی یەکەمی جەنگی سیساڵە کۆتایی دێت.

## ( خولی دووەم ) رۆلی دانمارک ( ١٦٢٥-١٦٢٩)

دانیمارک و ئینگلتەرا زۆر بە بایەخەوە بەدواداچونیان بۆ شەڕی بوهیمی دەکرد، پادشای دانمارک کرستیانی چوارەم لە هەمان کات والیی میرنشینی هۆلشتاین بوو کە ویلایەتێک بوو سەربە ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆزەوە، لەتەک دەمارگیری مەزهەبیی ئامانجی سیاسیشی هەبوو، چاوی لێبوو هەندێک ئەبرەشیی ئەلمانی کۆکاتەوە و کورەکەی خۆی بەسەریاندا بکاتە پادشا. وەزیری فەرەنسی ریشلیۆ بە پشت بەستن بە هاوپەیمانێتیی لەگەڵ ئینگلتەرا و میرەکانی باکووری ئەڵمانیا و پەیمانەکانی، خۆی لەو جەنگە خزاند.

و: خالید هەرکی

بەم شێوە خولی دووەمی جەنگی سیساڵە دەست پێدەکا. ئیمپراتۆر وایدەبینی کە پرۆتستانتەکان ئەم جارە بەهێزتر و بناغە مکومترن، مەزنترین و بەهێزترین فەرمانددەی ئەلمانیی بانگێشت کرد کە ( والنشتاین ) بوو شازادەی فریدلاند، ئەو پیاوە بەوە ناسرابوو



کرستیانی چواردم

کە لە توانایدایە زۆرترین کرێگرتەی بێگانە لە فرە رەگەزەکانی ئەورووپا کۆکاتەوە، ئەوان لەسەر تالآن و دزی دەژیان، والنشتاین مەرجی بۆ ئیمپراتۆر دانا، بەوەی فەرماندەی باڵای ئەو سوپایە تەنها بەدەست خۆی بێ، هەرچەندە ئیمپراتۆر فەرماندەی بەهێزی هەبوو ( قلی) بەڵام چونکە ئیمپراتۆر پێویستی بە والنشتاین بوو و لە دۆخێکی نالەباریشدا بوو ناچار مەرجەکەی قەبوڵ دەکا.

کاتێک والنشتاین و سەرکردەکانی ئیمپراتۆر کە لەگەڵیدابوون توانیان هێزەکانی پادشای دانمار ببەزێنن و لە خاکی ئەڵمانیایان وەدەر نێن بەدوایاندا دەچن بۆ بەرفراوان کردنی خاکی داگیرکراو تا سنوورەکانیان پێ بپارێزن، بەرەو کەنارەکانی سوێد هێرشیان بەدوادا دەکەن، دوای دەست بەسەرداگرتنیان بەسەر ئەوهەرێمانە باجی قورسیان بەسەردا دەسەپێنن داهاتی بەندەرەکانیان لوش دەدەن تا تێچوی بەکرێگیراوەکان بدەن.

بەندەری سترالسەند Staralsund ئامادە نابن گوێرایەڵی فەرمانەکانی هێزی داگیرکەر بن و باجیان پێبدەن بۆیە لە ١٦٢٨ بۆ ماوەی پێنج مانگ گەمارۆیان دەدەن،

بەرگریەکی قارەمانانەیان کرد، ئەوەی هاوکاریی دان لە دەرچوون لەم گەمارۆیە، ئەوە بوو گەمارۆکە تەنها رووی وشکانیی گرتبۆوە رووی دەریایی کراوە بوو، بۆیە کەشتیگەلی دانیمارکی و سوێدی لەوێوە هاوکاریەکانیان دەگەیاندن.

کاتێک والنشتاین بێ ئومێد دەبێ ناچار گەمارۆکە هەڵدەگرێ، لە ئەنجام هەریەک لە ئیمپراتۆرو کرستیانی پادشای دانمارک پێیان زانی کە هیچ چارەسەریەکی دیکە نیە جگە لەوەی رێککەون، بەتایبەت کە کرستیان هاوکارییەکانی ئینگلتەرا بێ ئومێد بوو کە پادشا چارلسی یەکەم پەیمانی دابوو، ئیمپراتۆر درکی بە مەترسییەکان کرد کە بەرلەوەی پادشای سوێد بێتە سەر هێل بۆ هاوکاری پرۆتستانتەکان باشتر وایە ئەم رێککەوتنە ئەنجام بدرێ.

بۆیە ئاشتەوایی لۆبیک Lubeck لە ساڵی ١٦٢٩ ئەنجام دەدرێ بەو مەرجەی کرستیان دەست لە ئسقوفیەکانی ئەڵمانیا هەلگرێ کە بەئەگەری گەڕاندنەوەی مولکەکانی بۆی میراتی هولشتاین و شلیزویچ و جەنلەندە داوای دەکا.

لەوساوە ئیمپراتۆر پێگەی بەهێز دەبێ و پرۆتستانتیش بێ ئومێد دەبن هەست دەکەن کە کەوتوونەتە ژێر میهرەبانی کاسۆلیک.

هانی ئیمپراتۆر فەردیناندیان دا فەرمانێک دەرکا بەناوی مەرسومنامەی گەڕاندنەوە، تیایدا کڵێسای رۆمانی دەستکراوەبکا بۆ گەڕاندنەوەی هەموو ئەو کڵێسانەی پرۆتستانتەکان لە هاوپەیمانی ئەگزبورگەوە لە ١٥٥٥ دەستیان بەسەردا گرتبوو، ئەم مەرسومنامە هەموو پرۆتستانتەکانی ترساند و تووڕە کرد، نەک هەر لە ئەڵمانیا بەڵکو لە هەموو ئەوروپا، بەتایبەتیش حاکمی ویلایەتەکان ترسی ئەوەیان هەبوو بەم مەرسومنامە خەونی لەمێژینەی ئیمپراتۆر بێنێتە دی کە حکومەتێکی پادشایەتیی خانەوادەی هابسبورگ دامەزرێنێ سەرتاسەری ئەوروپا بگرێتە خۆ.

لە نێو ئەوانەی لە نیازی ئەو فەرمانە گەیشتبن فەرەنسییەکان و سوێدیەکان بوون، ئەوەی ئەوکات لەسەر دەسەڵاتی فرەنسا زاڵ بوو ریشلیۆ بوو بەڵام ئەو توانایەی نەبوو بەرەنگاری ئیمپراتۆر بێتەوە، ئەو تا ئەوکات سەرقاڵی سەرکوتکردنی خانەوادەکانی فرەنسا و هیجونوت بوو، بۆیە ئەوەندەی پێکرا پشتگیری ئەو سەرەرۆییە بکا کە گوستاف ئەدۆلف پادشای سوێد پێی هەڵسا، هاوکاری کردنی بە دارایی و هاندانی هەندێک ویلایەتی کاسۆلیکی ئەڵمانی بۆ وروژاندنیان دژی ئیمپراتۆر و تێگەیاندنیان بەو مەترسیانەی کە ئەو

و: خالید هەرکی

بیری لێدەکاتەوە لەوەی ئیمپراتۆر مەبەستیەتی هەموو دەسەڵاتەکان بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە .

## (خولی سێیەم ) رۆلی سوێد ( ١٦٣٠-١٦٣٥ )

گوستاف ئەدولف Gustavus Adolphus پادشای سوێد لە مەزنترین و بەهێزترین سەرکردەی ئەوروپیی سەدەی حەڤدەهەم بوو.

حاکمێکی بەرێز بوو توانیی هەموو توێژەکانی گەلی سوێدی لە ژێر یەک ئاڵا کۆکاتەوە و سوپایەکی بەهێز و بە باشترین چەک پێکبێنی و لەسەر دەستی سەربازە هۆلەندیەکان مەشقیان پێبکا. خوێنگەرمی ئاینی و سۆزی تایەفگەری پرۆتستانتیی بۆ ئەو یاوەرانەی بە ئازاری کاردانەوەی کارەساتە مەزنەکەوە دەژیان لە دوای شکستی ئەڵمانیا، بوە هاندەری هەلسانیان بە کارێکی سەرکێشی، لەهەمان کات ئامانجە سیاسییەکانی بریتی بوون لە پاراستنی دەریای بەلتیک و زاڵ بوون بەسەریدا بۆ پاراستنی مومتەلەکاتی سوید لە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی. پێی وابوو ئەگەر ئیمپراتۆر لە ئەڵمانیا بەسەر پرۆتستانتەکاندا سەرکەوێ کارێکی سەرکێشی ئەنجام دەدا بە هێرش کردنە سەر دەوڵەتی پرۆتستانتی لە سوێد و باکووری ئەڵمانیا.



پێی وابوو ئەگەر ئیمپراتۆر لە ئەڵمانیا بەسەر پرۆتستانتەکاندا سەرکەوێ کارێکی سەرکێشی ئەنجام دەدا بە هێرش کردنە سەر دەولەتی پرۆتستانتی لە سوێد و باکووری ئەڵمانیا. لە هەمان کات خەونێکی دیکەی لە سەردا بوو بیری لای ئەوە بوو ئەگەر بەسەر ئیمپراتۆریەتدا زاڵ بێ ئەوکات سوێد دەستدەگرێ بەسەر تیلمە زەوییەکانی کەناری باکووری ئەڵمانیا لە دەریای بەلتیک، ئەوسا دەریای بەلتیک دەبێتە دەریایەکی سوێدی.

گوستاف هێزەکانی لە حوزەیرانی ١٦٣٠ لە ئەڵمانیا دابەزاند، هەموو پرۆتستانتەکان ئومێدیان بەو هێزە بوو، ئەویش پێی وابوو بەم چونە ناو خاکە سەرجەم میرەکانی ویلایەتە پرۆتستانتیەکانی ئەڵمانیا دێنە ریز هێزەکە و هاوکاریی دەکەن، بەڵام میری سکونیا و براندنبورگ رەتیان کردەوە هاوکاریی بکەن بۆیە ئومێد براو دەبێ.

گوستاف بە هاواری مگدبورنگدا Megdeburng دەڕوا کە فەرماندەیەکی ئیمپراتۆری بەناوی ( تلی ) گەمارۆی دابوو، تا بە پێی ( مەرسومنامەی گەڕاندنەوە ) لە چنگ ئیمپراتۆری رزگارکا، بەڵام میری سکونیا و براندنبورگ رێگەیان نەدا هێزەکانی گوستاف بەسەر خاکیاندا تێپەرن بۆ گەیشتن بە مەگدبورنگ. بەر لەوەی سوپای سوێدی پێیان بگا هێزی ئیمپراتۆر پێی دەگەن و سوپای سوێدی لەناو دەبەن، لەئەنجام مەزنترین کوشتاریان لەو شارە دەدەن کە بە بیست هەزار کەس مەزندە دەکرێ لە ژن و منداڵ و هاوڵاتی، زۆر دڕندانە دەکەونە گیان ئەو خەڵکە و دەیانکوژن، دواتر ئاگر لە شارەکە بەردەدەن و ئاهەنگی سەرکەوتن دەگێرن، بە بۆنەی ئەو سەرکەوتنەی فەرماندە ( تلی ) تیایدا هێزەکان بە ئاراستەی سکونیا دەڕوا بۆ داگیر کردنی. داوا لە میرەکەی دەکا سوپاکەی چەکدانێ ، ئەوسا میری سکونیا هەستی بە هەڵەی خۆیکرد کە هاوکاری پادشای سوێدی نەکردوە، بۆیە هیچی لە بەردەم نەمایەوە جگە لەوەی داوای هاوکاری لە پادشای سوێد بکا و پەیمانی پێبدا کە ئیتر دڵسۆزی بێ دوای ئەوە میری برانبورگ هەمان هەلوێستی دەبێ و بەشداری لە شەڕ دەکا.

گوستاف هاوکاری دوو هاپەیمانەکانی دەکا بۆ هێرش بردنە سەر لایبزگ liepzig کە هێزەکانی ( تلی ) داگیری کردبوو، هەردووک سوپا لە لێواری بریتنفێلد Breitenfeld کە دەکاتە نزیک لایبزگ رووبەڕووی یەکتری دەبنەوە، لێرە قارەمانی و توانایی گوستاف و هێزە مەشقپێکراوەکەی دەردەکەوێ کە سوپای ئیمپراتۆر راودەنێ و بە هەزاران کەسی لێ دەکوژێ. دواتر گوستاف بەرەو رۆژئاوای ئەڵمانیا پێشڕەوی دەکا و لەگەڵ سوپاکەی ( تلی ) لەسەر رووباری لخ Lech کە لقێکی روباری دانوبە

ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، لەم شەڕە (تلی)بریندار دەبێ بەڵام لەم برینداریە چاک نابێتەوە دوای دوو هەفتە بەوهۆیەوە گیان لەدەست دەدا، دوای کوژرانی فەرماندەکەیان سوپای ئیمپراتۆر پاشەکشە دەکا و مەیدانی شەڕ جێدەهێڵێ، سوپای گوستاف بەرەو پایتەختی باڤاریا ( میونخ ) بەڕێ دەکەوێ.

ئیمپراتۆر فردناند ترسی لێنیشت بەتایبەتی کە سوپاکەی گوستاف تادەهات خەڵکی ئەڵمانیا دەچوە ریزی و مەزنتر دەبوو، چارەی نەما داوای فەرماندە والنشتاین دەکاتەوە ( دیارە کە پێشتر ئیمپراتۆر بەهۆی زۆرداری سەربازە بەکرێگیراوەکان و هاندانی میرەکان لە ئیمپراتۆر والنشتاینی دور خستبۆوە )، بەڵام دیسان والنشتاین مەرجی هەبوو کە خۆی تاقە فەرماندە و بڕیاربەدەست بێ سەرفراز بێ لە تاڵان و پاتارکردنی ئەو شوێنەی دەیگرێ، لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی مەرسومنامەی( گەڕاندنەوە ) کە پێی وابوو دژی بنەماکانی سوپاکەیەتی و لەگەڵ لێبووردەیی ئاینی نایەتەوە، فەردیناند هیچ لاریەکی نەبوو لە مەرجەکانی هەرچەندە پێشێلی سەروەرییەکانی بوو.

ئەوەندەی نەبرد والنشتاین سوپایەکی شەست هەزاریی کۆکردەوە، بە سەکسۆنیادا بەرەو ڕووی هێزەکانی گوستاف ڕۆیشت، کە گوستاف مەدوایەکی زۆری لەناو خاکی ئەڵمانیا بڕیبوو لە نۆرنبیرگ بارەگای دانابوو بۆ سەرپەرشتیکردنی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکانی، کاتێک والنشتاین هێرشی دەکاتە سەر. گوستاف پاشەکشە دەکا و هەردووکیان لە ١٦٢٣ لە لوتزن Lutzen ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە، بەڵام سوپاکەی والنشتاین پەرتەوازە دەبێ و زۆر خەراپ تێکدەشکێ. سوپای سوێدی لەم شەڕە پادشاکەیان لەدەست دەدەن چونکە بریندار دەبێ برینداریێکی کوشندە بۆیە دوژمن بەسەریاندا دەدا.

هەرچی والنشتاینە گەڕایەوە بوهیمیا بۆ کۆکردنەوەی پاشماوەی سوپاکەی و خۆڕێکخستنەوە. چونکە خۆی خاوەنی دوا ووتە بوو لە ئەڵمانیا بیری کردەوە کە ئیمپراتۆر و پادشای سوێدی ناچاربکا ڕێککەوتنێکی ئاشتەوایی ئەنجام بدەن. ئەویش مەرجی خۆی بخاتە نێوی. هەڵسا بە نهێنی پەیوەندیی بە پێسپێردراوی جێماوی پادشاوە کرد بۆ ئەم مەبەستە، ئیمپراتۆر بەم کارەی دەزانێ و لێی تووڕە دەبێ و بە تۆمەتی ناپاکی لە پەیوەندیکردن بە دوژمنەوە تۆمەتباری دەکا و کوشتنی حەڵاڵ کرد. ئەم بڕیارە سەربازێکی ئیرلەندی بۆ چاوتێبڕینی پاداشتەکەی جێبەجێی دەکا و والنشتاین دەکوژێ.. لە دوای ئەو فەردیناندی کوری ئیمپراتۆر فەرماندەیی سوپاکە دەکا، ئەو پادشای مەجەر بوو بەرەو باڤاریا چوو (نۆردینگن Nordingin) ی گەمارۆدا. لەو هێرشە سوێدیەکان دەشکێن و

رادەکەن، بەهۆی شکستیانەوە سەکسۆنیا لە جەنگ دەردەچێ و لە ئایاری ١٦٣٥ ڕێککەوتنێکی ئاشتەوایی لەگەڵ ئیمپراتۆر واژۆ دەکا، ویلایەتەکانی دیکەی پرۆتستانتیی ئەلمانی ئەوانیش چاو لە سەکسۆنیا دەکەن و پشتگیری خۆیان بۆ سوێدیەکان دەکێشنەوە و داوای کشانەوەی سوێد دەکەن لە خاکی ئەڵمانیا، لە پای ئەمە ئیمپراتۆر زۆربەی خاڵەکانی ( مەرسومنامەی گەڕانەوە )ی هەڵوەشاندەوە، بۆ هێورکردنەوەی پرۆتستانت و مسۆگەر کردنی ژیانیان و ئابوری و بژێویان، بەم شێوە پرۆتستانتی ئەلمانی خۆیان دەکێشنەوە لەو لایەنەی بۆ هاوکاریکردنیان هاتبوون.

ئێستا دۆخەکان ئارام بوونەوە و زەمینەی لەیەک نزیک بوونەوەی ویلایەتەکانی ئەلمانی رەخساوە، تەنانەت شەڕی ئاینیش لە سەروبەندی نەماندا بوو، بەڵام جەنگی سیساڵە بەردەوامە چونکە فرەنسا لە سەروی هەموویانەوە ریشلیۆ دوای شکستی سوێد بڕیاری دابوو داواکاریەکانی جێگرەوەی پادشای سوێد جێبەجێ بکا کە بەشداری کردن بوو، رۆلی فرەنسا لە جەنگی سیساڵە پاش ئەوەی رۆلێکی نەرێنیی هەبوو ئێستا رۆلی ئەرێنی دەگێڕێ.

## رۆلی فەڕەنسیی سوێدی (١٦٣٥-١٦٤٨)

دوای ئەوەی رۆلی فرەنسا یارمەتیدانی دارایی سوێد دەبێ، ئێستا ریشلیۆ بڕیاری دا هێزەکانی فرەنسا هێرش بکاتە سەر سوپای ئیمپراتۆر لە بەرەی رۆژئاوا. لەهەمان کات بڕیاریدا لەگەڵ ئیسپانیا بکەوێتە شەڕ کە لقی دووەمی خانەوادەی هابسبورگ حوکمڕانیی دەکا.

ئێستا جەنگی سیساڵە چووە قۆناغی کۆتایی و یەکلایی بوونەوە، سوپای فرەنسی هاوشانی سوپای سوێدی لەسەر خاکی ئەڵمانیا شەڕدەکەن، بەڵام ناکۆکییەکانی ئاینی هۆکاری شەڕ نین. ئەمجارە هێرشبەرانی ئەڵمانیا لە هەردووک مەزهەبی کاسۆلیک و پرۆتستانت پێکهاتبوون، هەرچەندە ریشلیۆ کەسێکی کاردینالیی کاسۆلیکی سەربە کڵێسای رۆمانی بوو بەڵام نیازەکانی نەشاردنەوە کە هاوکاری سوپای پرۆتستانتی ئەلمانیی دەکرد، ئێستا شەڕەکە بۆتە شەڕێکی نێودەوڵەتی، ریشلیۆ لەهەولی کۆکردنەوەی هەموو نەیارەکانی خانەوادەی هابسبورگدا بو تا بەشداریان پێبکا لەم جەنگە. بەتایبەتی دژی لقی ئیسپانیی خانەوادەی هوبسبورگ کە دوژمنی سەرسەختی فرەنسا بوو. ئامانجی سەرەکیی لاوازکردنی ئیسپانیا بوو لە زەویەنزمەکان چونکە بونی هێزەکانی ئیسپانی لەم شوێنە هەڕەشە بۆسەر

پایەختی فرەنسا دروست دەکا. هەر لەوکاتەی بڕیاری بەشداریکردنی جەنگی دابوو لەگەڵ سوێدیەکان، لەگەڵ هۆلەندیە شۆرشگێرەکانی دانوستان و ڕێککەوتنێکی لەگەڵ واژۆکردن کە کۆتایی بە ئاگربەستی دوانزەساڵ ەیان هاتبوو لەگەڵ ئیسپانیا، ئەو ڕێککەوتنە کاتی خۆی لە ١٦٢١ ئاگربەستەیان واژۆ کردبوو. بەڵێ کۆتایی و یەکلابوونەوەی جەنگی سیساڵە دەبێتە رکابەری لە نێوان خانەوادەی هابسبورگ بە هەردوو لقەکانی ئیسپانی و ئەڵمانییەوە لەگەڵ خانەوادەی بوربونی فرەنسی لەسەر زاڵبون و دەسەلاّت بەسەرداچون بەسەر ئەوروپادا.

ریشلیۆ نەخشەی شەڕی بەم شێوە دارشت، سوپای فرەنسی لە رووباری راینەوە و سوپای سوێدی لە بنکەکەنایەوە بۆسەر بەلتیک تا ناو خاکی ئەڵمانیا هێرش بەرن تا ئەوکاتەی ئیمپراتۆر خۆی لە نێوان دوو سوپا گەماۆ دراو دەبینێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا وێڕای پشتگیری نەکردنی ئیمپراتۆر لەلایەن هاوڵاتیانی ئەلمانییەوە و لاوازیی، سور دەبێ لەسەر بەرگریکردن، هەرچەندە لە سەرەتا بەرگریی کرد و پێشی لە هێرشەکان گرت بەڵام بەهۆی بەردەوامی و دووبارە بوونەوەی هێرشەکانی یەک لەدوای یەکی هێزەکانی فرەنسی و سوێدی و لاوازبونی توانای سەربازی وبلاو بوونەوەی نەخۆشی لە ئەنجامی خاپور کردنی شارو دێهاتەکانی و لەبەین بردنی ژێرخانی ئابوری و بەرهەمی کشتوکالیەوە، شکست و کارەساتەکانیش یەک لەدوای یەک بوون، ئیمپراتۆر ناچار دەبێ سەربۆ ئاشتەوایی بنوێنێ.

سوپای فەرەنسی سوپایەکی دڕ بوو سەرکەوتنەکانیان بەردەوام بوون بەسەر سوپای ئیمپراتۆردا، ئەم سوپایە بە سەرکردایەتی فەرماندەی مەزنی کەنەدی ( تورین Turenne) دەبردران بەرێوە، لەولاشەوە سوپای سوێدی بە درێژایی هێلەکانی شەڕ سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو.

ئیمپراتۆر هەستی بە چارەنوسی رەشی ئەو جەنگە کرد، بەڵام لێی دیار نەبوو کەی، تا لە ساڵی ١٦٣٧ کۆچی دوایی دەکا. دوای ئەو فەردیناندی سێیەم لە (١٦٣٧-١٦٥٧) جێگەی دەگرێتەوە، لە سەردەمی ئەو ئەڵمانیا شکستی یەکجارەکی دەهێنێ و لەو جەنگە دەبەزێ، بەناچاری دانوستان لەگەڵ دوژمنەکانیدا دەکا و کۆتاییەکەی بە پەیمانی وستڤالیای ١٦٤٨ دێت.

## ئاشتەوایی و ستڤالیا ١٦٤٨:

وتووێژەکانی ئەم رێککەوتنە لە هەرێمی وستڤالیا دەستیان پێکرد، کە دەکەوێتە گۆمی راین، باشووری هەردوو شاری مونستەر Munster ئۆسنابروک Osnabruck فەرەنسا و سوێد داوایان لە ویلایەتەکانی ئەلمانی کرد هەریەکە و بەتەنیا بەشداری لە دانووستاندا بکەن، ئەمەش بۆ پەرتکردنی هێزەکانیان بوو. هەرچەندەی ئیمپراتۆر بەرەنگاری ئەم بیرۆکە بۆوە بەڵام سودی نەبوو. وستڤالیا پڕ بوو لە دبلۆماتکارانی ئەمریکی و ئەورووپی و نوێنەرانی ئیمپراتۆر و پاپا و دانوستانکارانی هەردووک وڵاتی فرەنسی و سوێدی، ئەم رووداوە بووە روداوێکی ئەورووپی کە نوێنەرایەتی هەموو لایەنەکانی تێدابوو. لەوکاتەی دانوستانەکان بەرێوەدەچون شەڕ لە بەرەکان بەردەوام بوو، بۆیە بەپێی روداوەکانی شەڕ و بەرەکانی جەنگ مەرجی لایەنەکان دەگۆڕدران، سەرەتا دانوستانەکە خەریک بوو بلاوەی پێبکرێ بەڵام دواجار کەوتەوە سەر هێڵ و گرنگترین مەرجەکانی کۆتایی هاتن بەو جەنگە بریتی بوون لە:

### یەکەم/

لایەنگرانی لۆسەر و کالڤن لە هەمووشوێنێکی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆر ئەوپەڕی ئازادی ئاینیان دەبێ، هەریەک لە کاسۆلیک و پرۆتستانت ئەو مومتەلەکانەیان لەدەست دەمێنێتەوە کە لە ١٦٢٤ لەدەستیاندا بوو، لەگەڵ ریزگرتنێکی تەواو لە مەرجەکانی ئاشتەوایی ئەگزبورگ لە ١٥٥٥ و، هیچ میرێک مافی ئەوەی نیە هاوڵاتیانی ناچارکا مەزهەبێکی دیارکراو پێڕەو کەن.

### دووەم/

پلاتینی باڵا Upper Platinate لەدەست باڤاریادا دەمێنێتەوە، بەم هۆیەوە رووبەری بەرفراوان دەبێ ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی سەرۆکایەتی هەموو ویلایەتەکانی باشووری ئەڵمانیا بکا، پلاتینی باشوور بۆ کوڕی فردریک پادشای بوهیمیای پێشوو دەگەڕێتەوە.

## سێیەم/

شارەکانی ( هتز و تۆل و ڤـردان ) لەدەسـت فرەنسـا دەمێنێـتەوە و زۆربەی خـاکی ئەلزاس جگە لە ستراسـبورگ دەخـاتە ژێـر دەسـەلاتەکانیەوە، بەم هـۆیە فرەنسـا دەسـەلاتی بەسەر بەرزاییەکانی ( دیین )دا دەشکێ.

## چوارەم/

سوێد دەستدەگرێ بەسەر نیـوەی رۆژئـاوای ( پومیرانیـا ) لەگەڵ هەردوو ئەسـقوفیەی بریمن Bremen و ڤردان Verdun بە خستنەسـەری ئەم خاکـانە بـۆ سـوێد دەتـوانێ دەسەلاتی بەسەر ئاورێژگەی رووبارەکانی ئیمپراتۆردا بشکێ کە ئێستا کەوتە ژێر میهرەبانی دەوڵەتێکی نا ئەلمانی.

بەم هۆیە سوێد بەسەر رووبارەکانی ئەودەر و ئەلب و ڤیزەردا زاڵ بوو.

## پێنجەم/

براندنبورگ کە دەکەوێتە ناوجەرگەی ئیمپراتۆریەت دەست بەسەر پومیرانای رۆژهەلاتدا بگرێ بە زۆربەی زەوییەکانی مەجدبورگ و چەند ئەسقوفیەتێکی دەوروبەرییەوە.

## شەشەم/

بە فەرمی دان بە سەربەخۆیی هۆڵەندا و سویسرادا بنرێ.

## ئاسەوارەکانی جەنگ لە ئەڵمانیا:

ئەم جەنگە ئاسەوارێکی زۆر خەراپی لە ئەڵمانیا جێهێشت، زۆربەی ویلایەتەکانی لەژێردەست دەرهێنا کە بەسەر سنوورییەوە بوون، ئێستا هۆڵەندا و سویسرا سەربە ئیمپراتۆریەتەوە نین، ئەڵمانیاش دابەشی سەر نزیکەی دووسەد ویلایەت دەبێ، هەر میرێک بانگخوازی سەربەخۆیی بۆخۆی دەکا و دەسەلاتی ئیمپراتۆر لەم ویلایەتانە لەبەین دەچێ، هەولی ئیمپراتۆرەکانی پێشو بە فیرۆ چوو کە بۆ یەکگرتنەوەی ویلایەتەکانی ئەڵمانی دەیاندا، ویستڤالیا دەریخست کە ئیمپراتۆر هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر هەرێمەکانیدا نییە، ئەو دەستەواژەش هیچ بەهایەکی نیە تەنها یەکێتیەکی لاوازە و بەس. هیچ دەسەڵاتێکی ناوەندی بوونی نەما کە بتوانێ باج بەسەپێنێ و سەربازی زۆرەملێ جێبەجێ بکا، ئیتر دەرفەت بۆ سەرکردەکان دەرەخسێ ناوە ناوە هەولی دەستگرتن بەسەر ئەڵمانیادا بدەن، ئەم هەولە لە خانەوادەی براندبورگ بەدی دەکرا کە دواتر دەبنە پادشاکانی پرووسیا .

دواجار ئاشتەوایی و ستڤالیا دەبێتە کۆتایی ئەو چەرخەی کە پێی وترا چەرخی چاکسازی ئاینی. ئومێدی چاکسازییەکانی ئاینیی لەناو چوون ئەوانەی نیازی لەناوبردنی کاسۆلیکی رۆمانیان هەبوو، بە هەمان شێوە ئومێدی بزووتنەوەی دژە چاکسازی ئاینیش بۆ گەڕاندنەوەی لایەنگرێتیی رەها بۆ پاپا و کڵێسای رۆمانیش لە ناوبردرا ، ئیتر دەبێ خۆش یا ناخۆش هەردووکیان یەکتری قەبولکەن و بەیەکەوە ئەو دوو مەزهەبەی کاسۆلیک و پرۆتستانت لە ئەوروپا بە هاوشانی یەکتری بژین، لەوکاتەوە بڕوای بەیەکەوە ژیان و گیانی لەیەک بووردنی ئاینی باڵی بەسەر ئەوروپادا کێشا بوو کە دەولەتە پێشکەوتووەکان بەسەر هاولاتیانیاندا سەپاندبوو.

# بەشی دەیەم

## ئینگلتەرا لە سەدەی شانزەهەم

## ( چەرخی خانەوادەی تیۆدۆر )

## (١٤٨٥ -١٦٠٣)

مێـژووی گەلـی ئینگلـتەرا وەکـو نەتەوەیەکـی نـوێ، لەو کـاتەوە دەسـت پێـدەکا کە (نورمەندیەکان) وڵاتی خۆیان لە ١٠٦٦ بە سـەرۆکایەتی شـازادە ولیـامی شـازادەی نورمەنـد رزگـــارکرد. نۆرمەنـــدیەکان لەو وڵاتە نیشـــەجێ دەبـــن و لەگەڵ ئینگلیزەکـــان تـــێکەڵاوی هاوسـەرگیریان دەبـێ. لە تـێکەڵاوی ئەو دوو رەگەزە گەلـی ئینگلیزیـی نـوێ بە فەرمانـدەیی پادشای بەهێز دروست دەبێ، کە حوکمڕانیان تەنها لە سنووری ئینگلـتەرا ناوەسـتێ چـونکە لەوکاتەی ولیام ئینگلـتەرا دەکـاتە شـوێن بارەگـای خـۆی نۆرمەنـدیش دەکەوێـتە ژێـر تـاجی ئینگلـتەراوە. دوای ئەوە خـاکی ئینگلـتەرا بەرفـراوان دەبـێ، لە فرەنسـا دەبێـتە مـایەی هەلگیرسانی ئەو شەڕەی بەناوی شەڕی سـەدرۆژە نـاونرا، ئەو شـەڕە رەنگدانەوەی لەسـەر دوارۆژی هەردووک دەولەت جێهێشـت، هۆکارەکەشـی بـۆ ئەوە دەگەڕێـتەوە کە پادشـاکانی ئینگلتەرا سوور دەبن لەسەر مانەوەیان لە فرەنسا لەسەر ئەو شوێنانەی داگیریان کـردووە و سـووربونی فرەنسـیەکانیش لەسـەر رزگـارکردنی خاکەکانیـان و وەدەرنـانی ئینگلیزەکـان لە خاکی فرەنسـا، بەڵام ئینگلیزەکـان نـاتوانن لەبەرانـبەر سـووربونی فەڕەنسـییەکان درێـژە بە دەگیرکاری فرەنسـادا بـدەن، فەڕەنسـییەکان بە نیشـتمانپەروەری ناسـراون و سـەرکردەیەکی پاڵەوانی کەم وێنە لە نێویاندا دەردەکەوێ و هەموو هێزەکانی ئینگلیز لە خاکی فرەنسا وەدر دەنێ، دواتر ئینگلیزەکان خۆیان لە ١٤٥٥-١٤٨٥) تووشی شەڕێکی ناوەخۆ دەبنەوە بەناوی ( جەنگی دوو گوڵ ) ئەمەش بـۆیە بەم نـاوە نـاونراوە وەکـو ئامـاژەیەک بەو دووگـولەی کە دروشمی هەردوو خانەوادەکە بووە، گوڵی سپی دروشمی (خانەوادەی یـورک) و گـوڵی سـور دروشـمی ( خـانەوادەی لانکسـترا ) بـوو. ئەم دوو خـانەوادە لەیەک رەچەلەک بـوون بەڵام لەسەر دەسەڵات ململانێیان بوو.

لە جەنگی ١٤٧١ خانەوادەی یورک بەسەر خانەوادەی لانکستەرادا سەردەکەوێ، بەڵام پادشاکەیان ( ریچاردی سێیەم ) لە حکومڕان سەرکەوتوو نابێ، بەهۆی کوشتنی دوو برازای خۆی کورانی ئەدوارد، خەڵک لێی تووڕە و نیگەران دەبێ، هنری تیۆدۆر لە خانەوادەی لانکسترا بە دەرفەتی دەزانێ سود لەم هەلە وەرگرێ و ڕەزامەندی گەل وەدەست بێنێ و حوکم لە خانەوادەی یورک بسێنێتەوە و خانەوادەی تیۆدۆر ی بەهێز پێکبێنێ، توانیی ماوەیەکی زۆر وڵات ببات بەڕێوە، وێڕای ئەو هەموو ئاژاوە و گێچەڵیانەی ئەو سەردەم و کێشە ئاینی و سیاسییەکان، هنری تیۆدۆر بەناوی هنریی حەوتەم لە حوکم هاتە ناسین.

## هنریی حەوتەم ١٤٨٥-١٥٠٩

بۆ کۆتایی سەدەی پانزەهەم سەرکەوتنی هنریی حەوتەم بۆ گرتنەدەست دەسەڵات بە گەورەترین ڕوداوی سەردەم دێتە ئەژمار، کۆتایی بە سەردەمێکی دورو درێژی شەڕی دەرەبەگایەتی هێنا کە قەوارەی نەتەوایەتیی وڵاتی لاوازکردبوو. سەردەمی ئەو سەردەمی پێشکەوتنێکی مەزنی ئابوری بوو بەبازوی چینی مامناوەندی، سەرکێشی مەزنیان لەودیو دەریا ئەنجام دابۆ، دۆزینەوەی سەرچاوەی ئابووریی نوێ کە بوە مایەی بەرز بوونەوەی ئاستی بژێوی هاوڵاتیان و بووژانەوەی ئابووری وڵات، ئەمەو بزووتنەوەی ڕێنسانس و بوژانەوەی زانست و چاکسازی ئاینی هەمویان ڕۆڵیان هەبوو لە ڕەوشەنفکر کردنی هاوڵاتیان. لە ئینگلتەرا خەڵک بەو هۆیەوە ڕوو لە گەڕان بەدوای زانست وکۆکردنەوەی سامانا دەگەڕێن، ناکۆکی سیاسی و ئاینی بایەخێکی ئەوتۆی نەمابوو، پادشا ببوە خاوەنی کردنەوەی گرێکوێرەکان و چڕ بوونەوە لەسەر پرسی کاروباری سیاسیی وڵات.

لەو سەردەم گیانی ستەمکاری لە ئەوروپا باو بوو، لە ئیسپانیا هەریەک لە چارلسی پێنجەم و فلیپی دووەم مافەکانی دەستوریان پێشێل کردن، لە فەرەنسا ئەنجومەنی نوێنەران وورده ورده لاواز و بێکاریگەر دەبێ تا لە ١٦١٤ بەیەکجاری پەک دەخرێ، ئینگلتەرا تا ئەوکاتەی هنریی حەوتەم دێت کە بە ستەمکار دەناسرێ ئەنجومەنی نوێنەرایەتی کارا دەبێ، مزایەدەی بە یاساکانی پەرلەمان و دەستوورەوە دەکرد بەڵام تەنها ڕوکەشی بوو . دوای ئەو هنریی هەشتەم کە کوڕیەتی لەسەر هەمان ڕێچکەی باوکی دەڕوا، هەردوکیان کاریان بە پەرلەمان نەدەکرد پەکیان خستبوو، بەڵام کاریان لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەندامانی پەرلەمان ئەڵقەبەدەستی خۆیان بن و ئەوەی بیانەوێ پێیان بکەن و بڕیارەکان هەمویان لە پادشاوە

دەرچن، بۆیە لەسەردەمی حوکمڕانی خانەوادەی تیۆدۆر حوکمی پەرلەمان لاواز دەبێ بەڵام یەک ناخرێ تا دەرفەتی بۆ دەرەخسێ جارێکی دیکە کارا دەبێتەوە.

پادشاکانی خانەوادەی تیۆدۆر هیچ کەس و لایەنێک دژایەتی و بەرەنگاریان نەبوون چونکە جەنگە درێژخایەنەکە هەموویانی لەناو بردبوون و سیستەمی دەرەبەگایەتی لەناو بردرابوو بەو هۆیەوە سەردەمی خانەوادەی تیۆدۆر ئینگلتەرا لە ئاستێکی بەرزی گونجان و تەبایی دابوو کە پێشتر ئەم تەباییەی بەخۆوە نەبینیوە.

هنریی حەوتەم توانی ئاشتی و ئارامی بۆ وڵات بگێڕێتەوە، لەبەرانبەردا توانیی پشتگیری مولکداری بکا بە دەرکردنی چەند یاسایەک، گرنگترینیان یاسای تایبەت بە دامەزراندنی ژووری ئەستێرە Star chamber لە ١٤٨٧، ئەم ژوورە وەکو دادگایەکی خاوەن دەسەڵاتە بۆ چاودێری کردنی رەفتارەکانی خانەدانان و دادگایی کردنیان بوو. یاسایەکی دیکە تایبەت بوو بە گەیاندنی نارازییەکان بە حکومەتی پادشا ، هەروەها ئەوانەی پشتگیری لە داواکارانی گرتنەدەستی دەسەڵات دەکەن بدرێنە دادگا، یاسای سێیەم رێگە بە خانەدانان نەدرێ لایەنگر بۆخۆیان پەیداکەن بە چاوی دەسەڵات گرتنەدەست. دواجار یاسایەک دەرکرا کە کاروباری پیشەسازی لەژێر دەستی پادشادا بێ، بەم شێوە هنریی حەوتەم توانی پادشایەتیەک دامەزرێنێ دەسەڵاتەکانی رەها و بێ رکابەر بن، بەڵام پادشایەتییەکی ستەمکار نەبوو هەروەکو ئەوکات لە ئەوروپا هەبوو.

هنری چاوی لە شەڕ نەبوو، سیاسەتی رووی لە نزیک بوونەوە بوو لەگەڵ ئیسپانیا لەرێگەی هاوسەرگیری لەگەڵ خانەوادەی پادشاوە، لە ١٥٠١ کچی پادشای ئیسپانیا (کاترین کچی فەردیناند پادشا)ی بۆ ئەرثەری کوڕی خواست. ئەم هاوسەرگیریە ئەوەندە درێژە ناکێشێ، دوای پێنج مانگ لەو پرۆسە ئارثەر دەمرێ، هنری سووردەبێ لەسەر ئەو خزمایەتیە، کاترین لە کوڕی دووەمی خۆی مارە دەکا هەرچەندە ئەمە لەگەڵ یاسا و عورفەکانی کڵێسای رۆمانیدا نایەتەوە. بەڵام پاپا ئەو رێگەی پێدان. هەروەها پەیوەندیەکانی نێوان تاجی پادشایەتی ئینگلیز و سکۆتلەندا خۆش دەکا لە رێگەی پێدانی مارگرێتی کچی بە جەمسی چوارەم پادشای سکۆتلەندا لە ١٥٠٣ ئەم هاوسەرگیرییە بنەمای بیرکردنەوەی یەککگرتنی هەردوو پادشا نشینەکە بوو.

## هنریی هەشتەم ( ١٥٠٩-١٥٤٧ )

هنریی هەشتەم دوای مردنی باوکی لە ١٥٠٩ تاجی پادشایەتی دەنێتەسەر. سەردەمی ئەو لەگەڵ سەردەمی باوکی جیاوازیەکی زۆری هەبوو، خەڵک لە رۆلی باوکی بێزار ببون کە لەسەردەمی ئەودا ئینگلتەرا لەروی پێگەی نیودەولەتیەوە چەقبەستوو ببو. بەڵام هنریی هەشتەم ئامادەیی تێدا بوو بۆ جولەکردن لە دەرەوەی ئینگلتەرا بۆئەوەی ناوی ئینگلتەرا و پێگەی بەرز راگرێ و ببێتە جێی سەرنجی وڵاتان، ئەم جولەش بە هەوڵلێهاتویی وەزیرە بەتواناکەیەوە بوو ( توماس ولزای) کە لە کڵێسا پەروەردەیەکی ئاینیی وەرگرتبوو، بە زیرەکی و لێهاتویی خۆی گەیشتبوە پلەی سەرۆکی ئەسقوفەکانی خانەوادەی یورک، دواتر بەرز دەبێتەوە بۆ راوێژکاری ئاینی و دواتریش دەبێتە کاردینال دەڕوا تا دەگاتە پلەی جێگری پاپا، بەم شێوە بەسەر کڵێسای ئینگلیزیدا زاڵ دەبێ، کاتێک دەبێتە وەزیری هنریی هەشتەم دەبێتە دەسترۆیشتوی سیاسەتی پادشا.

لە ١٥١٣ ئینگلتەرا چەند شەڕێکی دژ بە فەرەنسا ئەنجامدا، دواتر لە ١٥٢٢ و ١٥٢٥ دووبارە و سێبارە دەبێتەوە تا لەگەڵ هرنی ڕێکدەکەون ساڵانە سەرانەی پێبدا. هەر لەسەردەمی ئەو سکۆتلەندا هەولدەدا هێرش بکاتە سەر ئینگلتەرا و داگیریکا بەڵام هێرشەکەیان تێک دەشکێنێ و لە ١٥١٣ پادشاکەی دەکوژێ و بەو مەرجەی دانوستانی لەگەڵدا دەکا کە هاوکاری فەرەنسا نەکات.

بینیمان چەندین شەڕ روویاندا کە فەرەنسا هێرشی دەبردە سەر ئیتاڵیا و ژمارەیەک خولی شەڕ لە نێوان فەرەنسا و ئیسپانیا روویاندا تا بیرۆکەی بڕوابون بە دەستەواژەی هاوسەنگی نێودەولەتی لە ئەوروپا جێگیر دەبێ و دەبێتە بنەمای کارپێکردن و سەقامگیر کردنی دۆخەکان. ولزی ئینگلتەرای لە کێشەی ئیتاڵیا تێوەگلاند بەڵام بەبێ ئەنجام دەگەڕێتەوە وڵات، هنریی هەشتەم لە دژی فەرەنسا لە ١٥١١ هاوپەیمانیی پیرۆز لەگەڵ ئیسپانیا واژۆ دەکا، هێزەکانی ئینگلیز پەلاماری فەرەنسا دەدەن و هەندێک سەرکەوتنیان لە نێو خاکی فەرەنسا بەدەست هێنا.

کاتێک شەڕ لە نێوان فرانسوای یەکەم و چارلسی پێنجەم بەردەوام دەبێ هنریی هەشتەم بە کاریگەری سیاسەتی ویلز لایەنگیری ئیسپانیا دەکا، بەڵام لە رووداوی پاڤا لە ١٥٢٥ فرانسوای یەکەم شکست دێنێ، هنریی هەشتەم پشت لە دۆستەکەی دەکا و روو لە

فرەنسای دوژمن دەکا، لەگەڵی دەبێتە هاوپەیمان لەبەر مەترسیی پاراستنی هاوسەنگی نێودەوڵەتی. لگەڵ ئەوەشدا ئینگلتەرا ناتوانێ هیچ سوودێک لەو تێوەگلانەی شەڕ ببینێ.

## بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی لە ئینگلتەرا:

ڕوودانی چاکسازی ئاینی لە ئینگلتەرا بە گەورەترین ڕووداوی سەردەمی هنریی هەشتەم دادەنرێ، چونکە چاکسازی لای پادشا مەبەستێکی ئاینیی نەبوو، بزووتنەوەکە سەرەتا لە ئینگلتەرا سیاسی بوو دواتر گۆڕدرا بۆ ئاینی، خۆی لە ڕاستیدا هنریی هەشتەم دژی بزووتنەوەی لۆسەری بوو ئەوەتا لە ١٥٢١ نامەیەک دەنووسێ تیایدا ڕاو بۆچونی لەسەر ئەو بزووتنەوە دیار دەکا هەر بۆیە پاپا نازناوی پارێزەری بیروبڕوای پێبەخشی، ئەم نازناوە هەموو پادشاکانی ئینگلیز شانازیان پێیەوە دەکرد کە هەیانبێ.

لە ئینگلتەرا گروپێک دەرکەوتن لەسەرووی هەموویانەوە کۆلت Colet مۆر More وچاکسازی هۆلەندی ئەرزمس هەمویان لەسەر دەقی ئنجیلی یۆنایی ( العهد الجديد New testament) وورد بوونەوە و لە ڕووی زانستییەوە هەڵوەستەیان لەسەری کرد، کەموکوری و باشیەکانی کڵێسایان بۆ دەرکەوت، بەم چاکسازانەیان دەوت ( چاکسازەکانی ئۆکسفۆرد) The Oxsford Reformers لەگەڵ ئەوەشدا ئەمان نە لایەنگری لۆسەر بوون نە سۆزیان بۆی هەبوو، بەرهەڵستی کڵێسای کاسۆلیکیشیان نەدەکرد کە وەکو بیروبڕوای کڵێسا بێ، بەڵام ئەوان تەنها کەموکوڕیەکانیان دەردەخست و ئاشکەرا دەکردن و داوای چاککردنیان دەکرد.

هیچ مێژوو نوسێک پێشبینی ڕۆلی ئینگلتەرای نەدەکرد لە چاکسازی ئاینی ئەگەر ئەو دۆخەی بەسەر هنریی هەشتەمدا هات ڕوی نەدابا و هەموو قورساییەکی نەخستبایەتە سەر بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی. ئەگەر ئەو هۆکارە تایبەتیانە نەبونایە هەڵوێستی ئینگلتەرا بەرانبەر بە بزووتنەوەکە جیا دەبوو.

## جیابوونەوەی کاترینی ئەرجوانی:

هنریی هەشتەم کەسێکی سۆزداری و شەیدای رابواردن بوو، زۆر منداڵی لە کاترین لێ وەپاش کەوت بەڵام هیچیان نەژیان تەنها یەک شاژن نەبێ بەناوی ماری واتە هیچ کوڕی لێ وەپاش نەکەوت تا ببێتە جێگرەوەی لە پادشایەتی. بەتەمەن کاترین لە هنری بەتەمەنتر بوو بۆیە لە بۆنە و ئارەزووەکانی بەشدارىی نەدەکرد، لە هەمان کاتیشدا پابەندی خۆشەویستیی لەگەڵ ( ئان بولین )ی یەکێک لە خانمەکانی کۆشک و کارگوزارێکی شاژن بوو، بڕیاریدا لە شاژن جیابێتەوە و تا کارگوزارەکە مارە بکا. بەڵام بڕیارەکە قورس بوو چونکە هیچ بیانویەک نەبوو تا لەیەک جیاببنەوە پاپاش لە روی شەرعەوە رێگە بەم جیابونەوە نادا ، بەڵام نەریتی پاپاکان وابوو هەندێک جار داخوازی و ئارەزووەکانی پادشاکانیان جێبەجێ دەکردن ، بەڵام ئەوساڵ کە ١٥٢٧ بوو هێزەکانی ئیسپانیا رۆما داگیر دەکەن و پاپا ( کلمنتی حەوتەم ) بەدیل دەگرن و دەیبەنە لای ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم، بەو ئەگەرەوە پاپا ملکەچی فەرمانەکانی ئیمپراتۆر دەبێ ناتوانێ سەرپێچی فەرمانەکانی بکا.

کاردینال ویلزی هەوڵیدا لە رماوە بڕیارێک بێتە دان، بڕیارەکەی پاپای پێشووی (یولیوسی دووەم) هەڵبوەشێنێتەوە کە رێگەی بە هاوسەرگیری ئەوانی دابوو، بەڵام تێیدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە ویلزی خاوەنی بڕیاری هەڵوشاندنەوە بووە بۆیە پادشا رقی لێدەبێتەوە و لێی تورە دەبێ بە ناپاک تۆمەتباری دەکا و بڕیار دەدا دەست بەسەر مولکەکانیدا بگرن، بەڵام بەر لە دادگایی کردنی لە ١٥٣٠ کۆچی دوایی کرد.

## تۆماس کرمویل:



هەرکە ماوەی چاوەڕوانی هنریی هەشتەم بۆ پرسی جیابوونەوە درێژە دەکێشێ و پاپا خۆی دەگرمخێنێ لەو پرسە ناکۆکیەکانی نێوان کڵێسای پاپایی و هنریی هەشتەم زیاد دەبن ، پادشا کەسێک دەستنیشان دەکا کە لەژێر فەرمانی کاردیناڵ ویزلی کاری دەکرد، بەڵام لەو توندتر بوو

و: خالید هەرکی

بڕوای بە گوتەی میکیافیللی دەکرد کە دەڵێ ( ئامانج پاساوی رەفتارە) ئەویش تۆماس کرومویلە، ئەو پیاوە ئاماژەی بە پادشادا کە لە کڵێسای رۆمانی جیابێتەوە و کڵێسای ئینگلتەرا بخاتە ژێر دەسەڵاتی پادشاوە، ئەمەش وەکو لاسایی کردنەوەی میرەکانی ئەلمانی دەبێ کە کلێساکانیان خستنە ژێر فەرمانی خۆیان دەسەڵاتەکانی کلێسای رۆمانیان رەت کردنەوە.

هنری بەم پێشنیارە رازی دەبێ و خۆی وەکو یەکێک لە سەرکردەکانی چاکسازی ئاینی دەزانێ. بەڵام لە ناخا بۆ ئەوەی بوو دەسەڵاتەکانی وڵات هەموو بگرێتە دەست کە پێشتر بەسەر دوو دەسەڵاتدا دابەش ببون: یەکێکیان دەسەڵاتی کڵێسا بوو بەدەست پاپاوە بوو سەرۆکی بالای کڵێسای کاسۆلیکە، دەسەڵاتەکەی دیکە بەدەست پادشاوە بو، بە رزگاربوونی لە دەسەڵاتی پاپا سێ ئامانجی دێنە دی:

١/ جیابوونەوە لە کاترین و مارەکردنی ئان بولین.

٢/ دەستگرتن بەسەر ئەو سامانەی کە پێشتر بۆ کڵێسای رۆما دەنێردران.

٣/ توندکردنی دەسەڵاتەکانی بەسەر هەموو جومگەکانی وڵات بەتایبەتی پیاوە ئاینیەکان.

بەم شێوە چاکسازی ئاینی بە شێوازی چاکسازی سیاسی و ئاینی دەرکەوت، گەل هەلبژاردنی مەزهەبیان بۆ پادشا جێهێشت، ئەو چۆنی بە بەرژەوەند دەزانێ و بریاری لەسەر دەدا ئەوان جێبەجێی بکەن، تەنانەت بریارە ئاینیەکانیش هەر لەو دەردەچون، ئەوەی هاوکاری پادشا بوو لە جێبەجێ کردنی بریارەکانی پەرلەمان بوو، کە بەدەست خۆیەوە بوو بریارەکانی پەسند دەکردن ، بەم شێوە تا ماوەی شەش ساڵی یەک لەدوای یەک بەرێ کرا لە ( ١٥٢٩-١٥٣٥ )، پادشا تۆماس کرومویلی بە جێگری خۆی بۆ کاروباری ئاینی دامەزارند، ئەویش کاری لەسەر نەهێشتنی کڵێسا و دەستگرتن بەسەر زەویەکانی کڵێسادا کرد.

پادشا توانیی سەربەخۆیی کڵێسای ئینگلیزی بەدەست بێنێ و خۆی ببێتە سەرۆکی باڵا. هەروەها ئارەزەکەی جێبەجێ کرد کە جیابوونەوە لە کاترین و مارە کردنی ئان بولین بوو ، جگە لەم ئارەزوانەی گەنجینەکانی پرکرد لەو سامانەی بۆ کڵێسا دەهات و ئەو بۆخۆی دایدەکردن، دیسان خۆی بوە خاوەنی تاقە دەسەڵاتی باڵای ئاینی و سیاسیی وڵات.

گەلی ئینگلتەرا خەمیان لەو رۆژانە دەخوارد کە کڵێسا لەژێر دەسەڵاتی رۆما دابوو پاپا پیاوانی ئاینیی لێ دادەمەزارند هەستیان بەو نارێکیە دەکرد کە لەسەری رۆیشتون،

هەرچەندە رەفتاری چاکسازانی ئاینیی ئەلمانی هەمان رەفتاری پێشوی پیاوانی کڵێسا بوون، لەهەمان کاتدا رای گشتی پشتگیری پادشای دەکرد بۆ چاکسازیەکان، چونکە پشتگیری جەماوەر سەنەدی ئارامی و ئاسودەیی بوو بەتایبەت دوای شەڕی دوو گولەکە بوو کاولکاری و داتەپینی ژێرخانی وڵات ئاسەوارەکانی مابوونەوە، خەڵک ئارەزوی ئەوەیان بوو دەسەڵاتەکانی پاپا لەسەر وڵات نەمێنێ چونکە پاپا کەسێکی بێگانە بوو نەتەوی نەبوو، ئەوەی بووە پشتگیری چاکسازی ئەوەبوو کە هیچ کەسێک لەوانەی پشتگیری چاکسازیان دەکرد نیاز و مەبەستی هێرشکردنیان نەبوو بۆسەرمەزهەبی کاسۆلیک خۆی، پەرلەمان پشتگیریی لە مولکداری پادشا کرد چونکە ئەو دەستی بۆ مولکەکانی کڵێسا درێژ نەدەکرد، کارەکان بەم شێوە مانەوە تا زۆرینەی خەڵک بڕوا بە مەزهەبە نوێکە دێنن و جێگرەوانی هنریی هەشتەمیش بە هەمان رێچکەدا رۆیشتن تا هەموو هاوڵاتیانی ئینگلتەرا بەوە رازی دەبن مەزهەبی وڵات ببێتە مەزهەبی پرۆتستانت.

دوای مانگی نۆڤەمبەری ١٥٢٩ ئەو پەرلەمانە بەناوی پەرلەمانی چاکسازی هاتە ناسین یا پەرلەمانی ( حەوت ساڵە ) چونکە لە ماوەی حەوت ساڵ خەمی گەورەی کۆبوونەوەکانی چاکسازی ئاینی دەبێ، لەو ماوە ژمارەیەک یاسای دەرکرد تیایدا کەموکوڕیەکانی کڵێسای دیار دە کردو داوای دەکرد کڵێسا بخرێتە ژێر دەسەڵاتی پادشاوە، زۆر سوور بوو لەم پرسە تا دواجار بڕیارێک دەردەکا ناردنی داهاتی کڵێساکان بۆ رۆما قەدەغە دەکا، لە بڕیارێکی دیکەیدا رێگە بە کڵێسا نادا هیچ کارێک بەبێ فەرمانی پادشا بکا، لەگەڵ قەدەغە کردنی دامەزراندنی خزم و دۆستەکانیان لە کڵێساکان و لەو پۆستانەی نوێنەران بە پۆستی کڵێسای دەزانن.

لە ١٥٣٣ پادشا مەرسومنامەیەک دەردەکا بە دامەزراندنی تۆماس گرانمەر Gramner بە سەرۆکی ئەسقوفەکانی (کنتر بری) پاپا کلمنتی حەوتەم ئەم دامەزراندنەی رەت کردەوە، بەڵام هنریی هەشتەم گوێی بەو بڕیارەی پاپا نەدا، لە ئایاری ١٥٣٣ گرانمەر بڕیارێک بە هەلوەشاندنەوەی هاوسەرگیری کاترین دەردەکا و رەزامەندیش لەسەر هاوسەرگیریە نوێکەی پادشا لەگەڵ ئان بولین دەدا. دوای چەند حەفتەیەک پاپا بڕیاری بێبەش کردن دژی هنری دەردەکا کە هاوسەرگیریی لەگەڵ ئان بولین بە نهێنی ئەنجام دابوو بەر لەوەی ئەسقوفی کنتربری رەزامەندیی لەسەر بدا و منداڵێکیشی لێ ببو بەناوی ئلیزابێث کە کردیە جێگرەوەی خۆی و مافی جێگرەوەی لە ( ماری ) ی کچی سەندەوە کە لە کاترینی لێ وەپاش کەوتبوو گوایە لە دایکێکی ناشەرعی لەدایک بووە.

و: خالید هەرکی

لە نۆڤەمبەری ١٥٣٤ پەرلەمان یاسایەک دەردەکا بەناوی ( یاسای سەروەریی بالاّ ) بەپێێ ئەو یاسایە پاپا سەرۆکی بالاّی کلّێسای ئینگلیزی دەبێ هەموو دەسەلاّتێکی یاسایی و روحانیی دەبێ کە پاپا بەسەر کلّێساکاندا هەیەتی. بەسزادانی هەرکەسێک دەستدرێژی بکاتە سەر مافەکانی پادشا. دواتر یاسای هەلوەشاندنەوەی دێرە بچووکەکانیان دەرکرد، دواتر یاسای هەلوەشاندنەوەی دێرە مەزنەکان هات تا ژمارەی دێرە هەلوەشاوەکان دەگاتە شەش سەد دێر، داهاتەکانیشیان چوە گەنجینەی پادشاوە. جگە لەو داهاتانە ئەو کلّێسا و مومتەلەکانەی کە دەستیان بەسەردا گیرا هەموو خرایە گەنجینەی پادشا، واتا پادشا دەست بەسەر پێنجیەکی زەویەکانی ولاّتدا گرت، سەرباری سامانێکی زۆر، هنری هەلسا بە ئانجامدانی چەند پرۆژەیەک بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی ولاّت و بوژانەوەی، لە نێویاندا کەشتی گەلێکی بەهێزی دامەزارند، کەنارەکانی قایم و شورە بەندکردن ، توانیی لە ( ١٥٤٣-١٥٤٦) شەڕ لەگەلّ فرەنسا هەلّگیرسێنێ بەمەبەستی یەکخستنی ولاّتی ( گال ) بە ئینگلتەراوە و بە سیستەمی حکومرانی ودابەشیە ئیداریەکانیەوە. دەستی دایە ڕێکخستنی ئیرلەندا، باکوور و باشوو ری ئینگلتەرای یەکخست، بەر لەمردنیشی هەولیدا سکۆتلەندا بێنێتە ژێر تاجی پادشایەتی ئینگلتەرا بەلاّم تێیدا سەرنەکەوت.

ژیانی خانەوادەیی ناسەقامگیری بوە مایەی گۆڕانی شیرازەی حوکمڕانیی ویراسی بۆ خانەوادەی. لە هاوسەرەکەی ئان بولین رزگار دەبێ و لەیەک جیا دەبنەوە، دوای ئەویش چین سیمون و سێی تریش یەک لەدوای یەک هاوسەرگیریان لەگەلّدا دەکا و لێیان جیا دەبێتەوە، بەلاّم لە چین سیمون کورێکی لێ پاشکەوت، کە لە پەرلەمان یاسایەکی بۆ دەرکرد بەوەی ببێتە جێگرەوەی، چونکە ئەگەر بمرێ و کوڕی لەپاش جێ نەمێنێ ئەوسا تاجی پادشایەتی دەدرێتە ( ماری ) ی خوشکی کچی کاترین، ئەگەر ئەویش جێگرەوەی نەبێ و کەسی لەپاش جێنەمێنێ ئەوکات تاجەکە دەدرێ بە ئێلیزابێثی خوشکی.

بەم شێوە پادشایەتی بەر ئەدواردی شەشەمی کوڕی دەکەوێ، لەهەمان کاتدا یاسا ماریای کچی کاترینی بە کچی شەرعیی هنری ناساند. لە ١٥٤٧ هنریی هەشتەم دەمرێ و ئەدواردی شەشەمی کوڕی جێگەی دەگرێتەوە.

## پادشا ئەدواردی شەشەم و پرۆتستانتیزم (١٥٤٧-١٥٥٣)



ئەوکاتەی هنری دەمرێ ئەدواردی کوڕی نابالق و تەمەنی دەساڵان دەبێ. (ئیرل هرتفورد)ی خاڵی دەبێتە پێسپێردراوی. پادشا نازناوی شازادەی (سومەرست )ی پێ بەخشی شازادەی سومەرست بوو بە بەرپرسی پاراستنی پادشانشین. لەو سەردەم گۆڕانێکی ریشەیی لە بیروبڕواکانی ئینگلیز ڕوودەدا، سومەرست لەسەر مەزهەبی پرۆتستانت بوو بۆیە هەموو دەقەکانی دژ بە پرۆتستانت لە یاساکان دەرهێندران.

دواتر دەبێتە بەرهەلستکاری کاسۆلیک و هەموو کڵێساکانیان دادەخا، داهاتەکانی خستە ناو گەنجینەی پادشاوە، دروست بونی پادشا بە پرۆتستانتی دەبێ، لەسەردەمی ئەودا بزووتنەوەی چاکسازی ئاینی هەنگاوێکی باش دەنێ، لەو هەنگاوانە دەرکردنی کتابی سەلەواتی گشتی بە زمانی ئینگلیزی Book of Common ، ئەم کتابە بوو کە کڵێسای پرۆتستانتی بە نەفەسێکی نەتەوی نوسیبویەوە، ئازادی تاک و ئازادی بڕوابون کرابوە بنەمای پرۆتستانتی و بە ئینگلیزی نوسرابۆوە. پێگەی سومەرست بەهۆی سەرسەختی دوژمنکاریی لەگەڵ کاسۆلیک سست ببو، کێشەی زۆری ڕووبەڕوو ببۆوە لەو کێشانە دژمنداریێتی هەمیشەیی ئینگلیز و فرەنسا وێڕای ئاژاوەکانی ناوەخۆ کە لە ئەنجامی کێشەکانی ئاینی توشی ببوون و بزووتنەوەی (داخستنی کێڵگەکان Enclosures ) کە هۆکارەکەی داواکاری خاوەن زەویە چاکەکان بوو، داوایان دەکرد ڕەگەزی زەویەکانیان بگۆڕن لە کشتوکالیەوە بۆپاوانی ئاژەلەکانیان تا بتوانن خوری بنێرنە دەرەوە. شورەیان لە دەوری زەویەکانیان دروست کرد و سوودمەند و جووتیارە بچوکەکانیان لێ وەدەرنان، کێڵگە کشتوکالیە مەزنەکان بەهۆی پەرژینکردنیانەوە دەبنە پارچە زەویی داخراو بۆ پاوانی ئاژەلەکانیان، بەم هۆیەوە ئاستی کاری کشتوکالی و بەرهەمەکانی دادەبەزێ و پاشەکشە دەکەن، دەبێتە قاتوقڕی و بێکاری زیاد دەکا، خاوەنی ئەو زەویانە لە چینی خانەدانە کۆنەکان سورتر بوون بۆ پەیدا کردنی پارە و سامان لە

و: خالید هەرکی

پەنای زەویەکانیانەوە، لە چاوبرسێتیانەوە بە زیادەرۆیی دەستیان بەسەر زەوییەکانی دەورو بەردا دەگرتن کە پێشتر مولکی گشتی بوو هەژارەکان لەسەری دەژیان.

سومەرست بیری کردەوە کارێک بکا لە باری قورسی هەژارەکان کەم کاتەوە کە لەئەنجامی دەستگرتنی گەورە مولکدارەکان بەسەر زەویەکاندا توشی هاتوون، روو بەرووی نارەزایی هەردووک لایەن دەبێتەوە: مولکدارەکان پێیان وابوو ئەمە هۆکاری ئالۆزی وڵات بوو، بە دەستبڵاوی سامانی وڵاتیان تۆمەتبار کرد و کە سامان و سەروەتی کڵێسای لە گەنجینەی خۆی داکردووە، رای گشتیش بەهۆی ئەو پرۆپاگەندەی بەدوایدا کرا لێی تورە ببون، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی لە ١٥٤٩ دەستگیری بکەن ولە پۆستەکەی دورخەنەوە ، وداتر لە ١٥٢٢ لەسێدارەیاندا.

( ئیرل وارک Earl waurik) وەکو پێسپێردراوی پادشای بچووک جێگەی سومەرست دەگرێتەوە ، ناوبراو یەکێک بوو لە گەورە مولکدارەکان کە ئازایەتی دامرکاندنی شۆرشی جووتیاری بۆ دەگەرێتەوە. پادشا نازناوی شازادەی نورتمبرلەند Northumberland ی پێ بەخشی. کەسێکی سیاسەتمەداربوو ئارەزوی ئاینێکی تایبەتیی نەبوو، بەڵام وەکو کەسێکی پرۆتستانت خۆی دەرخست چونکە هەموو وەزیرەکانیش لە مەزهەبی پرۆتستانت بوون، لەسەردەمی ئەودا مەزهەبی پرۆتستانت لە لەندەن و شارە کەناریەکان بڵاو دەبێتەوە، لە ناوەوەی وڵاتیش بە هێواشی بڵاو دەبێتەوە.

کاتێک پادشا ئەدواردی شەشەم لە ١٥٥٢ نەخۆش دەکەوێ و بەرەو مردن نزیک دەبێتەوە، شازادەی نوثمبرلاند هەستی کرد دەسەڵاتەکانی بەرەو نەمان دەچن ئەگەر ماری ببێتە جێگرەوەی پادشا، چونکە ماری کەسێکی توندرەوی کاسۆلیک بوو، بۆیە هانی پادشایدا گۆرانکاریەک ئەنجامبدا لەدوای دوای خۆی تاجی پادشایەتی بدرێتە لیدی چین گرای کە نەوەی یەکێک لە خوشکەکانی هنریی هەشتەمە، بیانووی بۆ ئەم بیرۆکە ئەوەبوو ماری و ئێلیزابێث هەردووکیان کچی ناشەرعین، بەڵام ئەم پیلانەی سەرناگرێ چونکە لایەنگرانی ماری زۆربون ئەوان بەرگریان لەیاسا دەکرد بۆیە خاوەنی مافی شەرعی دەسەڵات دەگرێتە دەست کە ماریی کچی هنریی هەشتەم بوو لە هاوسەری یەکەمی کاترینی ئەرجەوانی.

## شاژن ماری (١٥٥٢-١٥٥٨)

ماری بڕوادار و کاسۆلیکێکی توند بوو. بۆیە یەکەم بڕیاری گەڕاندنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ کڵێسای ڕۆما بوو، دواتر هەموو یاساکانی ئاینی کە لە سەردەمی ئەدوار دەرکرابوون هەڵیوەشاندنەوە، پاشان شوی بە فیلیپی دووەم پادشای ئیسپانیا کرد کە توندڕەوێکی بەهێزی کاسۆلیک بوو، بەو هۆیەوە خەڵک لێی دەورووژێ بەتایبەت ئەوانەی دوژمنی سەرسەختی ئسپان بوون لە ئەنجامدا شۆڕش لە ئینگلتەرا بە فەرماندەیی تۆماس وێیت Thomas Wyatt هەڵدەگیرسێ. بەڵام شاژن دەتوانێ شۆڕشەکە لەناو بەرێ و فەرماندەکەی لەسێدارە بدا. هەر ئەوکاتە بڕیاری لەسێدارەدانی (جین جرای )دا لەکاتێکا ئەو دەستی لەو شۆڕشەدا نەبوو.

ئیتر سەردەمی چەوساندنەوەی پرۆتستانت دەستپێدەکا. لەم میانە کاری دڕندانەی زۆری لەگەڵیاندا بەکار هێنا لە کوشتن و سوتاندن تەنانەت هەندێک ناویاننابوو ماریی خوێنرێژ، سەردەمی ئەو سەردەمی چەوساندنەوەی ئاینی بوو بەشێوەیەک کە ئینگلتەرا ئەم دۆخەی هەرگیز بەخۆوە نەدیبوو.

هاوسەرگیریی بە فلیپ شەرمەزاری بوو بۆ وڵاتەکەی، کەس بەمە ڕازی نەبوو کە ئینگلتەرا سەربە ئیسپانیاوە بێ، کاتێک فلیپ دێتە ئینگلتەرا تا لەوێ بژی، جێگەی پێ تەنگ دەکەن و ڕوێکی خۆشی نادەنێ بۆیە ئەوێ جێدەهێلێ و ڕوو لە زەویە نزمەکان دەکا. لەو کاتەوە ناگەڕێتەوە ئینگلتەرا تا ئەوکاتەی دێت بۆئەوەی هانی ماری بدا بۆ هاوکاریکردنی لە دژی فەرەنسا، ماری داواکەی قەبول دەکا بەڵام ئەنجامەکەی بۆ ئینگلتەرا دەبێتە کارەسات چونکە ئینگلتەرا بەندەری کالێ Calais قایم نەکردبوو ، کاتێکیش لە ١٥٥٨ شەڕ دەست پێدەکا فەرەنسیەکان کالێ Calais یان لێ سەندەوە . ئینگلتەرا لەم سەرکێشیەی ماری هیچ سوودێکی نەبینی جگە لە لەدەستدانی بەندەری کالێ نەبێ کە لە چەرخی ناوەڕاستەوە لەکاتی داگیرکاریەکانی ئەوروپا بەدەستیەوە بوو.

هاوڵاتیان لەم دۆخە بێزار دەبن بەو هۆیەوە ڕوو لە پرۆتستانت دەکەن و ژمارەیان زۆر دەبێ، ترسی هاوڵاتیان لەوەوە بوو ئەگەر لە فلیپەوە منداڵێک لە ماری وەپاش کەوێ و دواتر ببێتە جێگرەوەی دایکی ئەوسا ئینگلتەرا دەبێتە خاوەنی پادشایەک لە خوێنی بێگانە. بەڵام بەر لەوەی ئەو کارەساتە ڕووبدا خۆی دەمرێ، دوای ئەو ئێلیزابێثی خوشکی دێتە سەر تەختی پادشایەتی.

و: خالید هەرکی

## شاژن ئلیزابێث (١٥٥٨-١٦٠٣)



ئلیزابێث کە دێتە سەر حوکم تەمەنی بیست و پێنج ساڵ دەبێ، لە دەسەڵات دەمێنێتەوە تا تەمەنی حەفتا ساڵی.

سەردەمی حوکمرانی ئلیزابێث خۆشگوزەرترین سەردەمی ئینگلتەرا دەبێ تەنانەت هەندێک لە مێژوونووسان ناویان لە نیوەی دووەمی سەدەی شانزەهەم ناوە سەردەمی ئلیزابێث لەو سەردەم ئینگلتەرا دەبوژێتەوە و ناسنامەی نەتەویی سەرهەڵدەداتەوە، ئینگلتەرا دەبێتە خاوەنی سەروەری دەریایی ئەمەش هاوکار دەبێ بۆ بەهێز بوونی پێگەی، لەو سەردەم بە تەواوەتی سیستەمی کڵێسای ئەنجلیکانی دەچەسپێ. چالاکییەکانی پەرلەمانی گەشە دەکەن وژیانی ئەدەبی دەبووژێتەوە.

ئلیزابیث بە کارایی دەسەڵاتی گرتبووە دەست هەرچەندە کەسانی بەهێزی خستبوە سەرکار بەڵام خۆیشی بەهێزو بە ئیرادە بوو ، پێی وابوو لەو کاتە ئینگلتەرا لە دۆخێکی ناسک دایە دەبێ بە هێزەوە کارا بکرێ ئەمەش بە حاکمێکی بەهێز دەکرێ.

توانیی روخسارێکی پرۆتستانتی بە ئینگلتەرا بدا هەرچەندە خۆی لە پرسی ئاینی و هیچ لە مەزهەبەکان قوڵ نەبیۆوە و لە ناخەوە سۆز و لایەنگریی بۆ هیچ کام لەو دوو مەزهەبە نەبوو، هەر بۆیە پەلەی نەبوو لە پچراندنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کڵێسای رۆما.

ئەو لە بڕیارەکانیدا لایەنی مامناوەندیی دەگرت بە پشت بەستن بە بڕیارەکانی پەرلەمان، ئەم سیاسەتەی بە پشگیری کردن و چەسپاندنی کڵێسای ئەنجلیکانی کۆتایی دێ. یا وەکو هەندێک لە مێژونووسان بە سیستەمی کڵێسای ئلیزابێثی ناویان دەبرد. ئەم سیستەمە لەسەر بنەمای دوو یاسا کۆلەکەی گرتبوو:

١/ یاسای سەروەری باڵا The act of Supermenrcy

٢/ یاسای تاک مەزهەبی The act of Unifermity .

یاسای یەکەم دەسەڵاتی بە پادشا داوە خاوەنی سەروەری باڵا بێ لەسەر هەموو کاروبارە ئاینی و ناوەخۆییەکان، پیاوە ئاینیەکانیشی پابەند کردن لەبەردەم پادشا سوێند بخۆن بە دلسۆزیان بۆ پادشا و دان بە دەسەڵاتەکانیدا بنێن بەسەر هەموو کاروباری کڵێسا و گوێڕایەلی هیچ بڕیارو فەرمانێکی بێگانە نەبن بۆ کاری کڵێسا و ئاینی و دادوەری. بەم سوێندە ڕێگەی لە ئەسقوفەکانی کاسۆلیک گرت کە لەسەردەمی ماری ستونی کاسۆلیکەکان بوون و ئازاد بن لەوەی بە دەست لە کاری ئەسقوفەکانیان وەردەن.

هەر لەو بڕیارەی سەروەری سزای بۆ ئەوکەسانە بڕیەوە کە دژی ئەم بڕیارە کار دەکەن و ڕێگە بە بێگانە دەدەن دەست بخاتە ناو کاروباری کڵێساکانیان.

یاسای دووەم کە یاسای تاک مەزهەبیە، تیایدا شێوازی ئاینپەرستیی دیار کردووە کە لە کتابی نوێژی دووەم دا هاتووە لە ١٥٥٢ دەرکراوە، بە دەستکارییەکی کەمەوە کە میانڕەوانی کاسۆیک و پرۆتستانت قەبوڵی کەن و پێیان هەرس بکرێ.

یاساکە باسی لە هەندێک ڕێورەسمی ئاینی کردبوو کە لەگەڵ کاسۆلیک و پرۆتستانتەکان ناکۆک نین، بۆچونی لەسەر پرسی قوربانی بە کۆمەڵ دەرکردبوو لە نێوان قوربانی بە ئاهەنگی بیرهاتنەوە و قوربانیی ڕاستەقینە . هاوسەرگیری قەشەی بە شەرعی زانی بەڵام هانی ئەم کارە نادات. داواشی لە قەشەکان کرد جل و بەرگیان نەختێک خاکی و ئاسایی بێت تا ئەوەندە گرانبەها نەبن، بەم شێوە سیستەمی کڵێسای ئەنگلیکانی ڕوخسارێکی کاسۆلیکی و بیروبڕوایەکی پرۆتستانتیی دەبێ. بۆیە لە دەسپێکیدا دژایەتیی لەلایەن توندڕەوانی پرۆتستانتەوە لێکرا.

هەرچی میانڕەوەکان بوون ڕازی بوون بەو سیستەمە، بەو ئومێدەی خۆیان ڕادێنن لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانە، ئەمانیش بە پاککراوەکان Puritanns هاتنە ناسین . پرۆتستانتە توندڕەوەکانیش کەبە جوداخوازەکان Separatits هاتنە ناسین درانە دادگا و یاسای تاک مەزهەبیان بەسەردا جێبەجێ کردن.

بەهەمان شێوە دەمارگیرە کاسۆلیکەکانی سیستەمی کڵێسای ئەنگلیکانی نارازی بوون. ئەوان لە هەردوو بەشەکەی دیکە پاکخوازان و جوداخوازان مەترسیدارتر بوون بۆ پادشا، تەنانەت هەندێکیان پیلانی لەناوبردنی پادشایان داڕشتبوو تا لە سیستەمی ئەنگلیکانی ڕزگاریان بێ، بۆیە چاویان لە فلیپ پادشای ئیسپانیا و پاپای ڕۆما بوو بەڵکو دژی تاجی پادشایەتی هانیان دەدەن.

هیچ دەرباز بوونێک نەبوو بۆ روونەدانی بەگژ یەکداچونی کاسۆلیک و پرۆتستانت لەسەر ئاستی دونیا. ناچار ئلیزابێث لایەنگری پرۆتستانت دەکا و زەویە نزمەکانیش پشتگیریی دەکەن لە فرەنساش هیجونوت، لە بەرانبەردا فیلیپ دەستی لە کاروباری ئیرلەندا وەردا بۆ ورووژاندنیان لەدژی پادشای ئینگلتەرا.

ئەم رووداوانە بوونە مایەی سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوان ئلیزابێثی پادشای ئینگلتەراو ماری ستیوارتی پادشای سکۆتلەندا کە دەکاتە خێزانی پادشای فرەنسا فرانسای دووەم ، ماری ستیوارت دایکی هەموو ئەو پیلانانە بوو کە کاسۆلیک دژی ئلیزابێثی دەهونیەوە، مەبەستیش لەو پیلانانە ئەوەبوو ماری ستیوارت ببێتە پادشای ئینگلتەرا.

بەڵام ئەو دەرفەتانە بۆ ئلیزابێث دەرەخسێن تا بتوانێ لە ماری ستیوارت رزگاری بێ کاتێک مێردەکەی ماری فرانسوای دووەم دەمرێ ئەو خۆی حوکمرانی سکۆتلەندا دەکا، ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ئەو و پیاوانی ئاینی و خانەدانەکان، بەوە تۆمەتباری دەکەن کە خۆی مێردەکەی کوشتوە بەو هۆیەوە رادەکات و پەنا بۆ ناحەزەکەی دەبات ( ئلیزابێث) لە ئینگلتەرا ئەویش باوەشی بۆ دەکاتەوە بەڵام دواتر لە ١٥٨٧ بە بیانوویەک لە سێدارەی دەدا چونکە پێی وابوە کە مەترسیی لەسەر دروست دەکا و دەستی هەبووە لەو هەموو پیلانانەی لە ساڵ انی رابردوو دژی ئەو ئەنجام دراون.

## ململانێ نێوان ئینگلتەرا و ئیسپانیا و هەڵمەتی ئەرمادا:

ئلیزابێث سوربوو لەسەر سەربەخۆیی و ئاشتیی وڵات، بەڵام ئەو ململانێیەی لە دوا ساڵەکانی حوکمڕانییدا کەوتە نێوان ئیسپانیا و ئینگلتەرا هیچ بوارێکی بۆ پرۆسەی ئاشتی نەهێشتەوە، لەلایەک ململانێ لەسەر پرسی ئاینی و کێشەی توندیش لەسەر دەست بەسەرداگرتنی کۆلۆنیالەکانی ئەمریکا. ناکۆکیەکە ئەوکاتە سەر هەڵدەدا کە فلیپی دووەم دان بە مافی ماری ئستیوارتی پادشای سکۆتلەندا دەنێ کە لە جیات ئلیزابێت تاجی پادشایەتی ئینگلتەرا بنێتە سەر. راپەراندنی پیلانێکیش بۆ ئەوەی ماری شوێن ئلیزابێث بگرێتەوە، لەهەمان کاتدا ئلیزابێث یارمەتی هۆلەندیەکانی دەدا کە دژی داگیر کەری ئیسپانی شۆرشێکی نەتەویان هەڵگیرساندبوو، بە چەک و تەقەمەنی و پێداویستیە سەربازیەکان هاوکاریی دەکردن دواتر بە سوپاش بەشداریی لە هاوکاریەکاندا کرد، ئەوکات ئیتر دوژمنداریتیەکە توند دەبێ و شەڕ دەست پێدەکا. هۆکارە سەرەکیەکە لەسەر بازرگانی و

دەریاوانیی دەریاکان بوو کە کەشتیەکانی ئینگلیز لەو شوێنانە گەشتی بازرگانیان دەکرد کە ئیسپانیەکان پێیان وابوو ئەمە بۆ خۆیان قۆرخکراوە.

کۆلنیالێکی بچوکی ئینگلیزی لە فەرجینیای ئەمریکای باکوور لەسەر دەستی وۆلتەر ڕالی دروست دەکرێ، فرەنسیس دریک کە بە دەوری زەویدا دەگەڕێ بە کەشتیەکەیەوە دەگاتەوە ئینگلتەرا لەم میانە بارێک زێرو زیو و خشلی گرانبەهای تالانیی شارە ئیسپانیەکان لەگەڵ خۆیدا دێنێ . کەشتیوانە ئینگلیزەکان بە ئەنقەست شارە ئیسپانیەکانیان لە ئەمریکا تێکدەدا و تالانیان دەکردن. لە ساڵی ١٥٨٧ (دریک) بەشەش کەشتیی شەڕکەرەوە بەسەر بەندەری ( قادس )ی ئیسپانی دادەدا هەندێک کەشتیی لەنگەرگرتووی تێکشکاندن ئەوانی دیکەی بەرەو کەنارەکانی ئینگلتەرای گواستنەوە، لە کاتێکا ئەم کارە ڕوودەدرێ کە فلیپ بڕیار دەدا هێرشی سەر ئینگلتەرا بکا.

فلیپ لەسەر بڕیارەکەی سوور بوو کەشتیگەلێکی مەزن کە ناوینا (ئەرمادا) بۆ هێرش کردنە سەر ئینگلتەرا ئامادە دەکا، دەبوایە ئینگلتەرا ئامادەسازییەکی باش بکا بۆ بەرگری کردن و تێکشکاندنی ئەو هێزە. کەشتیگەلی ئینگلیزی لە چەند کەشتیەکی بچوک پێکهاتبوو بەڵام بە فەرماندەیی دەریاوانی بەتوانا بوو. ئینگلیز ناچار دەبن بە کەشتی و بەلەمە بچوکەکانیان هێرشی توند دەکەنە سەر کەشتیگەلی ئەرمادا لە نزیک کالیێ، سەرەڕای مەزنی هێزی کەشتی گەلی ئیسپانی ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن و بەرووی ئەو هێرشانە بوەستنەوە. کاتێک هێزەکانی ئیسپانی لە بەرەو لێژدادەبن کەشتیە بچوکەکانی ئینگلیزی بۆیان دەچنە ناو ئاوو هێرشی بەردەوام دەکەنە سەریان ناچاریان دەکەن بشکێن، ئەو کەشتیگەلە خۆی لە بەرانبەر هێرشەکانی ئینگلیز ڕاناگرێ و پەرش و بڵاو دەبێ، ئەوەی دەکوژرێ دەکوژرێ ئەوەی نەجاتی دەبێ و ڕادەکا بەر شەپۆل و گەردەلولی دەریا دەکوێ کە لە دەریای باکوورو زەریای ئەتلەسیەوە هەلیکردبوو.

لە کەشتیگەلەی ئیسپانی تەنها ٤٥ بەلەمی لێ گەیشتەوە کەنارەکانی ئیسپانی .

ئەوەی بەسەر ئەرمادای ئیسپانیدا هات لە شان و باڵی ئیمپراتۆریەتی ئیسپانی نەدەوەشایەوە بۆیە تارمایی ترس و تۆقاندن باڵی بەسەر ئیسپانیەکادا کێشا، ئیمپراتۆر دەرفەتی شەڕکردنی پرۆتستانتەکانی ئینگلتەرای لەدەستدا، شکستی ئەرمادا پرۆسەی و ئینگلتەرا بە دەوڵەتێکی پرۆتستانتیی تەواو کرد.

# بەشی یانزەھەم

## چەرخی زاڵبوونی فرەنسا

## ( لویسی چواردەھەم )

### مەزارن:

ریشلیۆ Richelieu لەو بەرنامەیەدا سەرکەوت کە بۆ زال بونی سیاسیی فرەنسا لە ئەوروپا دایرشتبوو. ئاستی تاجی فرەنسیشی لە ناوەوە و دەرەوە بەرزتر کرد. هەر ئەو بەرنامە و پلانە بوو جلەوی ململانێی چەندین ساڵەی لەگەڵ ئیسپانیا ونەمسا لە دەرەوەو لە ناوەوەش لەگەڵ خانەدانەکان لەدەست دەرهێنا و دایە دەست پادشا. بەم شێوە پادشا لەو کۆتوبەندانە رزگاری دەبێ کە چەندین ساڵ بوو بۆیان کێشا بوو و دەسەڵاتەکانیان لێ سنووردار کردبوو، هەروەها فرەنسای لە شەڕی سیساڵ ە تێوەگلاند و بەرهەم و دەستکەوتەکانیشی لە ئاشتەوایی وستفالیای ١٦٤٨ هاتنە بەرهەم.

ریشلیۆ Richelieu دەمرێ و دوای ئەویش بە چەند مانگێک لە ١٦٤٣ پادشاکەی لویسی سیانزەهەم دەمرێ. بەمردنی تاجی پادشایەتی بۆ کوڕە بچوکەکەی دەمێنێتەوە کە لویسی چواردەهەم بوو، ئەوکات منداڵێکی چوارساڵ انە دەبێ دایکی ( شاژن یان ) ی نەمسایی دەبێتە پێسپێردراوی، لەوکاتدا سەرۆکایەتی وەزیران کاردینال مەزارن Mazarin بوو کە لەسەردەستی ریشلیۆ لەسەر کاروباری حوکمڕانی مەشق درابوو، هەمان سیاسەتی ئەوی پیادە دەکرد کە بریتی بوو لە یەکەمین جار رازی کردن و پشتگیری کردنی پادشا دواتر وەدەست هێنانی زاڵبونی نێودەولەتی لە دەرەوە.

مەزارن بە رەچەڵەک فرەنسی نەبوو، ئەو لە ئیتاڵیا لەدایک ببو، ئەوەندەی لە داب و نەریتی فرەنسیەکان نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ریشلیۆ نەبوو لە چارەسەر کردنی کارە

ناوەخۆییەکـان بەڵام لە کاروبـاری دەرەوە کەسـێکی بەتوانـا و سـەرکەوتو بـوو، بـۆیە بـۆ سەرخستنی سیاسەتی دەرەوەی فرەنسا سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بەدەست هێنا.

لویسی چواردەهەم تەمەنی لە پێنج ساڵ کەمتر بوو، بۆیە ماوەی پێسپێردنی ئانی دایکی درێـژە دەکێشـێ، ئـان هەمـوو قورسـاییەکی دەخـاتە سەرشـانی مەزارن بەتـایبەت لە بـواری سیاسەتی دەرەوە، تەنـانەت هەنـدێک لە سیاسـەتمەداران گومـانی ئەوەیـان لێـێ کـرد کە بە نهێنی هاوسەرگیریی لەگەڵ مەزارن ئەنجام دابێ، بۆیە لێێ پەست ببـوون، تۆمەتباریـان کـرد کە پیاوێکی ( بێگانە و ماستاوچی و فێلبازە)، رقیان لەوەبوو کەسێک بەم جۆرە باڵ بەسـەر دەولەتدا بکێشێ، هەرچەندە لەسەر سیاسەتی ریشلیۆ دەرۆیشت بەڵام شێوازی دیکەی بەکار دەهێنا. پیاوانی کۆشک و خانەدان و پەرلەمانتاران و خەلک بە گشتی خۆشیان نەدەویست. ئەو ناتۆرەیـان پ بۆهەڵبەسـتبوو دەیـانووت ( دوای دیارنەمـانی شـێر رێـوی دەردەکەوێ) چونکە هەموویـان ئەو جیـاوازیەی نێـوان ریشـلیۆ و مەزارنیـان دەبینـی یەکەمیـان پشـتی بە خۆڕاگری دەبەست ئەویتریان بە فرتوفێل.

بەهۆی بەرز بوونەوەی باجەکان لەسەر خەڵک بە بیـانوی شـەڕەکانی ئەو مـاوە کە پـانزە ساڵی خایانـدبوو لە دوای ئاشـتەوایی وسـتڤالیا کە فرەنسـا لەگەڵ ئیسـپانیا وئەڵمانیـا تێـی کەوتبوو، بێزاری لە دەسەڵاتی مەزارن لەزیاد بووندا دەبێ .

لە راستیدا ئاشتەوایی وستڤالیا گەورەترین سەرکەوتن بوو بۆ مەزارن، بەڵام رای گشتی فرەنسی پشتگیریان لێی نەدەکرد. هەرکە شـەڕی سیسـاڵ ە تەواو دەبـێ کە فرەنسـا تێیـدا بەشـدار بـوو، نارازیەکـان و ئۆپۆزسـیۆن ئەوانەی لە شـێوازی حـوکمڕانیی بێـزار ببـوون هێرشەکانیان بۆسەر سیاسەتی مەزارن دەست پێـدەکەن. هەمـوو هەولەکـانی خسـتنەگەڕ بـۆ بەرگـری کـردن لە رژێمـی حـوکم، دوای ئەوە هەنـدێک ئـالۆزیی نـاوەخۆ سـەرهەڵدەدەن کە بەنـاوی ( جەنگـی ئەلفرونـد ) هـاتە ناسـین. ( ئەلفرونـد ووشـەیەکی فەڕەنسـییە بەمانـای بەردەقانی یا قۆچەقانی . و .).

و: خالید هەرکی

# جەنگی ئەلفروند ( ١٦٤٨-١٦٥١ )

ئەم ئالۆزیانە بەهۆی سێ هۆکارەوە سەریان هەڵدا:

١/ رق لێبوونەوەی خەڵک لە مەزارن

٢/ خانەدانەکان چاویان لەوە بوو دەسەڵاتیان بۆ بگەڕێتەوە.

٣/ بێزاری هەندێک لە چینەکان لەو سیستەمەی ستەمکاری کە لەسەرەتاوە ریشلیۆ دایینابوو.

فرەنسا ئەوکات بەهۆی شەڕەکانی ناوەخۆ و دەرەوەی کەوتبووە ژێر بارێکی قورسی ئابووریەوە، دەبوایە باجی زۆر بخاتە سەر خەڵک کە لەسەردەمی ریشلیۆو مەزارن سەپێندرابوو .خانەدانەکانیش بە دەرفەتیان زانی پێیان وابوو کاتەکەی گونجاوە تا مەزارن لە پۆستەکەی وەلانێن دوای ئەوەی لەدەست ریشلیۆ لە مردن رزگاریان بووە. بۆیە توندترین شەڕی ناوەخۆ هەڵدەگیرسێ، شەڕەکان توند و سەخت بوون چونکە ئامانجەکانیان یەکگرتو نەبوون فرە مەبەست و فرە هۆکار بوون بۆیە شکست دێنێ.

ئەو شەڕانە راستەوخۆ دوای ئاشتەوایی وستڤالیا روو دەدەن، پادشا تا ئەوکات منداڵ بوو کارەکانیش هەمووی بەدەست مەزارنەوە بوو، یەکەم بڵێسەی شەڕ ئەوکاتە دەست پێدەکا کە پەرلەمانی پاریس ئامادە نابێ باج بخاتە سەر هەموو هاوردەکانی پاریس، پەرلەمان لە دادگای باڵا دەچوو، هەر مەرسومنامەیەک کە پادشا دەریدەکرد کاری پێنەدەکرا تا لە پەرلەمان تۆمار نەکرابا، بەڵام پەرلەمانی فرەنسا مافی یاسا دانانی نەبوو، ئەگەر پەرلەمان بڕیارەکانی پادشایان رەت بکردبانەوە، بەپێی مافی ( تەختەخەوی یاسا) پادشا لە پەرلەمان ئامادە دەبوو فەرمانی پێدەکردن مەرسومنامەکە تۆمارکەن.

شۆڕشی فروندیەکان شۆڕشێکی نەزۆک و پێنەگەییو بوو، سەرکردەکانیان هەندێکیان لە ئەندامانی پەرلەمان و هەندێکیان پیاوانی خانەدان و کەسانی نەشارەزاو بێتوانا بوون بۆ ئەم ئەرکە. هەلسان بە پێکهێنانی لیژنەیەکی مافپەروەری یاسایی دەستوری، مافی چاودێری ئەوەی هەبێ باج بەسەر هاوڵاتیاندا بسەپێنێ، هەروەها بۆ پاراستنی ئازادی هاوڵاتیان ئەگەر حکومەت کەسێکی دەستگیر کرد دەبێ لە ماوە ٢٤ کاتژمێر بدرێتە دادگا.

حکومەت هەستی بە مەترسی دۆخەکان کرد بۆیە بریار دەدا بە توندی لەو بزووتنەوە بدا، فەرماندەی سوپا کە فەرمانی گەمارۆدانی پاریسی دا ئەم ئەرکەی بە فەرماندەی ناودار ( کوندیە ) سپارد.

شەڕ لە نێوان حکومەت و پەرلەمان دروست دەبێ، خانەدانەکان هەوڵیاندا شۆڕش بگەیەننە هەموو هەرێمەکان خۆیان و چەند چەکدارێک بەو هەرێمانەدا دەسوڕانەوە ، بێکارەکان و ئەوانەی لە دوای ئاشتەوایی وستڤالیا لە سەربازی دەرچووبوون دەچونە ریزیانەوە، لە بێ ئومێدیا هانایان بۆ ئیسپانیا برد هاوکاریان بکا بەڵام فەرەنسا خۆی لە حالەتی شەڕدا بوو لەگەڵ ئیسپانیا، چینی مامناوەندی ( بۆرژوا ) هەستی بە مەترسی چینی خانەدان کرد، نوێنەرانیان لە پەرلەمان پشتگیری خۆیان بۆ خانەدانە شۆڕشگێڕەکان کێشایەوە، ئەوکات دەرکەوت کە چینی بۆرژواو چینی ئۆرستوکرات ناتوانن بەیەکەوە کار بکەن، بۆ میللەتیش دەرکەوت کە خانەدانەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان ئەم کارە دەکەن بۆ فەرەنسایان نییە، ئەگەر بۆ فەرەنسا بێت چۆن پەنا بۆ دوژمن دەبەن تا لە دژی حکومەتەکەیان بێتە شەڕ، پێیان وابوو فرۆندیەکان بەرنامەیەکی باش و پلانێکی دیاریان نییە، تەنها مەبەستیان بەرژەوەندیەکانی خۆیان و لەسەر کارلادانی مەزارنە ، دیارە پەردە لەسەر هەلمالینی ئەم هۆکارانە بوە مایەی ئەوەی چینی بۆرژوا و جووتیارەکان پشتگیری پادشا بکەن و بەهێزی کەن.

بەم شێوە جەنگی فرۆندیەکان کە ماوەی پێنج ساڵ دەخایەنێ لە ( ١٦٤٨-١٦٥٣ ) بە سەرکەوتنی مەزارن و بەهێز بونی پادشا و لەناوچوونی فرۆندیەکان کۆتایی دێت. شەڕی فرۆندی دوا هەولی خانەدانان بوو بۆ گەیشتن بە تاجی پادشایەتی. دواجار سەریان بۆ دیفاکتۆ دانەواند کە نەمانی تایبەتمەندێتی چینایەتیان بوو، وەکو هاوڵاتیانی بێ تایبەتمەندی بمێننەوە، ئەو ئایابیانەی پێشتر هەیانبوو وەکو بوردن لە باج و وەرگرتنی پۆستی تایبەتی هیچیان نەمان. لەوکاتیشەوە کۆشکی پادشایەتی ئەو کەسانەی تیا نامێنێ کە پێشتر رۆڵی دیاریان هەبوو لە سیاسەتی دەوڵەت.

و: خالید هەرکی

## جەنگی نێوان فرەنسا و ئیسپانیا:

لە میانی ئەو شەڕە ناوەخۆییانە، فرەنسا لەگەڵ ئیسپانیا لە حالەتی شەڕدا بوو، فرەنسا ناچار دەبێ لەبەر باری قورسی ئەو جەنگە ناوەخۆیی و دەرەکیە هەڵوێستی بەرگریکردن بگرێتە بەر، بەڵام ئیسپانیا لەو ماوە دەتوانێ هەندێک شوێن کە پێشتر لەدەستی دابونن بیان گێرێتەوە. کاتێکیش شەڕی فروندیەکان تەواو دەبێ مەزارن هێزی فرەنسی کۆدەکاتەوە و هێرش دەباتە سەر ئیسپانییەکان لە زەویە نزمەکان و راویان دەنێ تا ناچار دەبێ داوای ئاشتەوایی بکا. لە ساڵی ١٦٥٩ دانوستان لە نێوانیان دەست پێدەکا و هەردووکیان پەیمانی پیرەنس Pyrenees واژۆ دەکەن ، کە ئامارژەیەک بوو بە کۆتایی هاتنی زاڵ بوونی ئیسپانیا، لە گرنگترین مەرجەکانی ئەو رێککەوتنە:

١/ فرەنسا دەست بگرێت بەسەر ئارتۆ Artois کە دەکەوێتە نزیک زەویە نزمەکانی ئیسپانی. لەگەڵ رۆسیلۆن Roussillon کە لەنزیک لێژاییەکانی چیای برانسە.

٢/ لویسی چواردەهەم دەبێ هاوسەرگیری لەگەڵ ماری ترێزای کچی پادشای ئیسپانیا فیلیپی چوارەمدا بکا. لەم بابەتە لویسی دانی بەوە دانا کە ئەم هاوسەرگیرییە مافی جێگرەوەی حوکمی ئیسپانیا ناگرێتەوە.

پەیماننامەی برانس کۆتایی دەستکەوتەکانی مەزارن بوو کە ئەوەندەی نەبرد دوای ئەو رووداوە لە ١٦٦١ کۆچی دوایی دەکا، ئەوکاتیش لویس تەمەنی بیست و سێ ساڵ دەبێ.

## سەردەمی لویسی چواردەهەم:



لویسی چواردەهەم راستەوخۆ کاروبارەکانی فەرنسای گرتە دەست . سور بوو لەسەر ئەوەی خۆی سەرپەرشتی هەموو کارەکانی وڵات دەکا و رێگە بە هیچ وەزیر یا راوێژکارێک نادا لە جیات ئەو کارەکان ببا بەرێوە، دەستەواژەی ( دەولەت منم) ی ئەوکاتە پیادە کرد کە هەمیشە دەیوتەوە.

لویسی چواردەهەم خاوەنی توانایەکی دەگمەن نەبوو لە شەڕ و سیاسەت. بەڵام کەسێکی چالاک و بە

جولە و پێداگر بوو، سور بوو لەسەر شکۆی پادشایەتی و سەپاندنی سامی پادشایەتیی. ماوەی پەنجاو چوار ساڵ حوکمی پادشایەتی فرەنسای کرد بە شێوەیەک توند و خەمخۆر دەبێ کە ئەم خەسلەتانەی لەودا بوون لە هیچ پادشایەکدا نەبینراون.

دارایی وڵاتی خستبوە دەست ( کیلبەر ) بیگێڕێ کە مەزنترین ئابوریناسی سەردەم بوو، لەگەڵ (تورین) فەرماندەی بەتوانا و ( کوندیە ) باشترین سوارچاک، لەگەڵ ژمارەیەکی دیکە لە کەسانی دڵسۆز و بەتوانا بۆ خزمەتی وڵاتی فرەنسا. بۆیە بە شێوەیەک سەرەکوتنی بەدەست هێنا لە ڕووی ناوەوە و دەرەوە کە نە لە سەردەمی ریشلیۆ نە مەزارن بەم شێوە بووە. بۆیە ناونرابو بە (پادشای هەرە مەزن)، شەیدای خۆدەرخستن و کەشخەیی و ڕوخساری شکۆداری بوو، لە دەوروبەری ڤیرسای کۆن کە دە میل لە پاریسەوە دوورە شارێکی نوێی بۆخۆی بنیادنا، کۆشکی ڤێرسای لێ دروست کرد کە لە جوانترین کۆشکەکانی پادشاکانی ئەوروپا بوو، نمونەی هونەرو جوانکاری بوو بە نەقش و نیگاری ڕازاندەوە، لەسەر دەست مەزنترین هونەرمەند و بەتوانای وڵات نەخشێندرا، هەمووی بە ئاوێنە و چرای ڕووناککەرەوە دەوری درا، لە ناوەوەش بە تازەترین جۆری ناوماڵ ڕایەخرا، ئەو کۆشکە ببوە پەرستگای ڕەوشەنبیر و زانا و سیاسەتمەدار و ئەدیبەکان لە نمونەی ( کورونی، راسین، مولییر، دیکارت، بسکال ) و هیتریش. لویس بانگی چینی خانەدانانی کرد لە دەوروبەری ڤیرسای نیشتەجێ بن تا لە ژیانی گشتیی شار دوور کەونەوە.

## Colbert کۆلبیرت

قۆناغی یەکەمی حوکمڕانیی قۆناغی چاکسازی بوو لەسەر دەستی پیاوەکانی لە سەرووی هەموویانەوە وەزیری دارایی ( کۆلبیرت )، کە لەسەر دەستی مەزارن پێگەیشتبو و دوای ئەوە لە ١٦٦١ بە وەزیری دارایی دامەزرا. ئەو یەکەم کەس بوو بیری لەوە کردەوە سەرەتا دەبێ وڵات لەم پاشاگەردانیەی ئابووری ڕزگار بێ و بخرێتەوە سەر ڕێڕەوی دروستی خۆی و باری ئابوری سەقامگیر و باش کەن، دروشمی باڵای بریتی بوو لە ( مەزنی فرەنسا لەسەر سامانی وەستاوە، سامانیش لەسەر کار وەستاوە، هێزی میلەت بە جلی جوان و بریقەدار دروست نابێ، بەڵکو بە پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵ و خزمەتگوزاری دروست دەبێ کە هەموو چینەکانی کۆمەلگا پێی هەڵدەستن ). بۆیە پلانێکی چاسکازیی بۆ دارایی وڵات دانا، بەهۆیەوە بەرهەمی نەتەوی لە ڕێگەی ڕێکخستنەوەی باج و بووژانەوەی کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی زیاد ببێ،

سیستەمی باج وەرگرتن لە فرەنسا بێ ویژدانانە دارێژرابوو ، حکومەت ئەوەندە سودی لێ وەرنەدەگرت ئەوەندەی بە رێگەی دزییەوە دەچوە گیرفانی هەندێک لە فەرمانبەرە مەزنەکان . باجە ناراستەوخۆکان کەسانی سڤیل کۆیان دەکردەوە سودێکی بەزیادەوەیان وەردەگرت، تەنها پارەیەکی کەم دەگەیشتە دەست حکومەتەوە، بەڵام ئەو سیستەمەی کۆلبیرت داینابوو پارەیەکی زۆر لە باج دەگەڕایەوە گەنجینەی حکومەت و دزو گەندەلکارەکان بێبەش کران، وێڕای ئەوەی باجی جووتیار نیوە بەنیوە کەم کرایەوە، بەم شێوە پارەیەکی زۆر کەوتە دەست حکومەت، دواتر رووی لە بەرهەمەکانی ناوەخۆ کرد هانیدان بۆ بەرهەمهێنان و باجی زۆری خستە سەر بەرهەمی هاوردە لە کالا و شتومەکی دیکە، بۆ هاندانی هاوڵاتیان تا بایەخ بە بەرهەمهێنانی ناوەخۆ بدەن، بەم شێوە بازارەکان پڕ بوون لە بەرهەمی ناوەخۆ لە شووشە و کەلوپەلی ناوماڵ و خوری و باقی بەرهەمەکان، لە روێکی دیکەشەوە بۆ هاوکاری بەرهەمهێنان قەرزی بە پیشەوەر و کارگەی دروستکردنی دا، بۆ ئاسانکاری گواستنەوەی بەرهەمەکان رێگاوبانەکانی چاککرد و ئاسانکاری کەوتە هاتوو چۆ و گواستنەوە، دوای ئەوە بایەخی بە داگیرکاری دا، بە دەست گرتن بە سەر ولاتانی ئەودیو دەریا بۆ مەبەستی بازرگانی و هێنانی کالا و کانزاکان، کۆمپانیای هندیی رۆژهەڵاتی فرەنسیی دامەزارند، خەونی داگیرکاریی مەزنی هەبوون هەولی ئەوەی دەدا میسر بکەوێتە ژێر دەستی تا کەنالی سوێس دروستکا بەوهۆیەوە دەست بگرێ بەسەر بنکەیەکی دەریایی کە دەکەوێتە سەر رێگای هیندیی رۆژهەلاتی دوور.

وێڕای ئەو هەموو چاکسازییە داراییانەی کۆلبیرت لە سیستەمی حوکم ئەنجامیدا بەڵام شەڕەکانی لویسی چواردەهەم ئەوەندە زۆر بوون بەو تێچوانەی شەڕ رانەدەگەیشت ، دواتر گەندەلیەکانی دارایی سەرچاوەیان ئەوەندە قووڵ بوو لە توانای کۆلبێرتدا نەبوو هەمویان بنبڕکا، سیستەمی لێبوردنی خانەدانەکان لە باج وەک خۆی مایەوە، سیستەمی وەرگرتنی باج کە هەندێک کەس قۆرخیان کردبوو وەکو خۆی مایەوە، دواتر شەڕەکانی پادشا و خەرجیەکانی هەموو داهاتەکانی کۆلبەرتیان لوشدا. پادشا چاوی لە زۆر بوو مەرامەکانی فرە حەزی بوون، حەزی لێبوو مومتەلەکاتی لە ئەورووپا بەرفراوانکا بەتایبەتی لەسەر حسابی ئیسپانیا.

## جەنگەکانی لویسی چواردەهەم:

١/ شەڕی جێماوە لە زەوییە نزمەکان (١٦٦٧-١٦٦٨).

کێشەی نێوان خانەوادەی پادشایەتی لە فرەنسا و خانەوادەی هابسبورگی پادشایەتی ئیسپانی ماوەی سەدەیەکی خایاند. لە ئاشتەوایی و ستڤالیا فرەنسا توانیی بەسەر خانەوادەی هابسبورگی نەمساییدا زاڵبێ. بەڵام لەگەڵ لقەکەی دیکەی خانەوادەی هابسبورگ لە ئیسپانیا بەردەوام دەبێ تا ئاشتەوایی پرانس لە ١٦٥٩، لە ڕاستیشدا ئەوکات ئیسپانیا بەرەو نەمان و توانەوە بەڕێوە بوو.

لە ١٦٦٧ دۆخەکان بەدیدی لویسی چواردەهەم دەرفەتێکی باش بوو بۆ بەرفراوان بوون لەلای باکوور و زەویە نزمەکانی ئیسپانیەوە، ئەمە ئەوکاتە دەبێ کە پادشای ئیسپانیا فلیپی چوارەم دەمرێ، دیارە کچەکەی ئەو هاوسەری لویسی چواردەمە بەڵام ئەوکات بەمەرجی لێخۆشبون لە مافەکانی ویراسی هاوسەرگیری لەگەڵ کردبوو، کەچی ئێستا داوای ئەو مافانە دەکاتەوە کە زەویەنزەکانی ئیسپانین لە پشکی هاوسەرەکی. لەسەر ئەو بنەمایە هێرش بردە سەر ئەو ناوچانە، لەو هێرشە هەندێک شاری داگیرکرد بێ ئەوەی هیچ بەرگریەک لە هێزەکانی ئیسپانیاوە هەبێ، دیارە سوپای ئیسپانی بەهۆی شۆڕشی پۆرتوگالی کە داوای سەربەخۆییان دەکرد، ماندوو شەکەت ببو، بۆیە نەیتوانی بەرپەرچی هێرشەکەی دوژمنکاری فرەنسا بداتەوە. دیارە ئیسپانیا هێزێکی ئەوتۆی لە زەویە نزمەکان نەبووە لە توانایدا بێ ڕێگری لە سوپای هێرشبەری فرەنسی بکات کە بە فەرماندەیی ( تورین ) بوو، لەو هێرشە فرەنسا توانی دەست بگرێ بەسەر چەندین قەلا و سەنگەرو شاردا. ئەم سەرکەوتنانە بوونە مایەی بێزاری هەریەک لە ئینگلتەرا و هۆڵەندا و سوێد، بەو هۆیەوە هاوپەیمانێتیەک بەناوی ( هاوپەیمانی سێقۆلی) لە نێوان ئەو دەولەتانە دەبەسترێ بۆ وەستاندنی هێرشەکانی لویسی چواردەهەم، دوای ئەوەی پەیوەندی لە نێوان ئەو هاوپەیمانانە دروست دەبێ لویس ڕایدەگەیەنێ کە ئامادەیە دانوستانی ئاشتەوایی ئەنجام بدا.

ئاشتەوایی (ئێکس لا چاپیلە Aix-la-Chapelle) لە ١٦٦٨ ئەنجام درا مەرج و خاڵەکانی ئەو ڕێککەوتنە بریتین لە:

و: خالید هەرکی

ئەو شوێنانەی فرەنسا داگیری کردوون ( شەڕەلوا، لیل، ترنای، هەشت شاری دیکەی سەر سنووری زەوییە نزمەکان) بەدەست فرەنسا دەمێننەوە.

٢/ شەڕەکانی لەگەڵ کۆماری هۆڵەندا ( ١٦٧٢-١٦٧٩ )

لە رێککەوتنی ئاشتەوایی ئێکس لاچاپیلیە لویسی چواردەهەم هەندێک لەو شوێنانەی چاوی تێبڕیبون وەدەستی هێناو داگیری کردن. لە کاتی جەنگ پێی زانی کە هۆڵەندا گەورەترین تەگەرەیە لەبەردەم ئەرکەکەیدا، ئەو هانی دەوڵەتانیداوە بۆ بەستنی هاوپەیمانی سێقۆلی لە دژی فرەنسا، بۆیە بڕیاردەدا تۆڵەی لێ بکاتەوە، بەڵام بیری لەوە کردەوە بەر لەوەی بەم کارە هەڵسێ دەبێ لە هاوپەیمانانی جیاکاتەوە، هەرکە هاوپەیمانێتیەکە هەلدەوەشێتەوە لویسی چواردەهەم روو لە ئینگلتەرا دەکا و لە دۆڤەر هاوپەیمانێتیەکی نهێنی لەگەڵ پاداشای ئینگلتەرا چارلسی دووەم لە ١٦٧٠ واژۆ دەکا ، دواتر روو لە سوێد دەکا و دەتوانێ بیکاتە لایەنگری خۆی، ئێستا هۆڵەندا بە تەنیایی مایەوە دەرفەتەکە رەخساوە بۆ تۆلە سەندنەوە و لابردنی کۆسپ لەسەر رێگای چاوتێبڕینەکانی.

لە بەهاری ١٦٧٢ هەموو کەرەستە و کارەکانی شەڕ ئامادە کرابوون. دوای ئەوەی لویسی چواردەهەم لەگەڵ شارڵی دووەم بەنهێنی لەسەر هەموو کارەکانی هێرش بردن رێکدەکەون و کەشتیگەلی ئینگلیزی و فرەنسا ئامادە دەبن بۆ هێرشێکی دەریایی، چارلس بۆیە رێککەوتنی لەگەڵ فرەنسا پێباشتر بوو لەوەی لەگەڵ هۆڵەندا رێک بکەوێ، تا لە ململانێی هۆڵەندا رزگاریی بێ کە لە دەریا لەسەر بازرگانی لەگەڵیدەکا، پێی وابوو هەردوو کەشتیگەلی ئینگلیزی و فەرەنسی لەتوانایاندا دەبێ بەسەر کۆمارە بچووکەکەی هۆڵەندا دا زاڵ بن و لەناوی بەرن.

هێرشەکەی ئینگلتەرا و فرەنسا بە فەرماندەیی دوو بەناوبانگترین فەرماندی سەربازی فرەنسی ئەنجام درا، هەریەک لە (تورین، وکوندیە )، لە دەریا رووبەڕووی هێزەکانی دەریایی هۆڵەندا دەبنەوە بەڵام هێزەکانی دەریایی هۆڵەندا لە حوزەیرانی ١٦٧٢دەتوانێ شکست بە گەمیەکانی ئینگلیزی و فرەنسی بێنێ.

هەرچەندە هێزەکانی فرەنسی توانیان هەندێک شاری هۆلەندی داگیرکەن کە هاولاتیانی داوای ئاشتەواییان دەکرد، بەڵام بەهۆی مەرجە قورسەکانی بەسەریاندا سەپاندن رووبەڕووی راپەڕین و شۆڕش بونەوە، گەلی هۆلەندی مەرجەکانیان قەبول نەکردن و دژی سەرۆک ( دی

وت De Witt ) راپەڕین، بە تۆمەتی هەبوونی مەیلی ئاشتەوایی بە دەستی شۆڕشگێڕەکان دەکوژرێ. داوای گەڕانەوەی خانەوادەی ئۆرەنجیان کرد کە ماوەی بیست ساڵێک دەبوو لە حوکم نەمابوون، ولیام ئۆرەنجی نەوەی پالەوان ولیام ئۆرەنجی یەکەم بە سەرۆک کۆمار دادەنرێ، ناوبراو کەسێکی بەسۆز و خوێن گەرم و دلسۆزی وڵاتەکەی بوو.

بەر لەوەی فرەنسیەکان پێگەیان لەسەر خاکی هۆڵەندا قایم کەن هاوڵاتیانی هۆلەندی هەرچی پرد و بەنداو هەیە روخاندیان تا وڵات لە ئاو نقوم کەن و رێگا لە داگیرکەر بگرن، بەو هۆیەوە فرەنسیەکان ناگەنە ئەمستردام.

ئەوروپا هەستی بە چاوبرسێتی و مەتسرییەکانی چاوتێبڕینی فرەنسایان کرد بۆیە ئیمپراتۆر و هەندێک میری ویلایەتەکانی ئەلمانی و دواتریش دانمارک و ئیسپانیاش هاتنە ریز و بڕیاری شەڕیان لە دژی فرەنسا دا.

لە ساڵی ١٦٧٩ رای گشتی بەریتانی دژی لویسی چواردەهەم بوو بۆیە پەرلەمان چارلسی دووەم ناچار دەکا پەیوەندییەکانی لەگەڵ فرەنسا بپچڕێنێ و لەگەڵ هۆڵەندا ئاشت بێتەوە، بەم هۆیەوە تەنها سوێد نەبێ کەس لەگەڵ فرەنسا نەمایەوە.

لەوکات لویسی چواردەم خۆی بە تەنیایی بینیەوە هەموو وڵاتانی ئەوروپی لە دژی ئەو هاوپەیمان بوون هەستی بەو مەترسیانەکرد و لەوە دڵنیا بوو کە ناتوانێ ئەو شوێنانەی دەستی بەسەردا گرتوون بە نهێنی و شاراوەیی بیانهێڵێتەوە بۆیە بڕیار دەدا کۆتایی بە جەنگ بێنێ.

ناچار دەبێ لەگەڵ دوژمنەکانی هەریەکەی بە جیا دانوستان دەکا و ئاشت دەبێتەوە ئەو رێککەوتن و ئاشتبوونەوانە هەموویان بە ناوی هاوپەیمانی نایمێخنی Nijmegen ١٦٧٨ دێنە ناسین، بەپێی ئەو رێککەوتنە فرەنسا رازی دەبێ لە خاکی هۆڵەندا بچێتەدەر بێ ئەوەی هۆڵەندا یەک بست لە خاکی لەدەست بدا.

لە بەرانبەردا ئیسپانیا دەست لە ( فرانس کوستیە ) و چەند شارێکی دیکەی سەرسنووری فرەنسا لە باکووری رۆژهەلاتەوە بۆ فرەنسا جێدێڵێ. بەم شێوە لویسی چواردەهەم لە هۆلەندیەکان هیچی قازانج نەکرد بەڵام لە سنوورەکانی دیکەی هەندێک بەرفراوانیی دەستکەوت. باجەکەی بوە خاپور بونی هەندێک شاری سەرسنوور و لەدەست دانی خەرجیەکی زۆر کە کاریگەریی لەسەر ئابوری وڵات هەبوو.

و: خالید هەرکی

لەگەڵ ئەوەشدا لویسی چواردەهەم پەندی لەم کارە وەرنەگرت و شانازیی بە سوپا مەزنەکەی دەکرد کە بریتی بوو لە دوو سەد پارچەی دەریایی، بۆیە لە چاوتێبڕین بەردەوام دەبێ و هێرش دەباتەوە سەر دراوسێکانی، پاساوی بۆ ئەو هێرشانە، گوایە پەیمانی نایمێخن دەڵێ فرەنسا مافی خۆیەتی هێرش بکاتە سەر ئەو شوێنانەی لەدەستی بوون، بۆ ئەم مەبەستە دادگای خۆجێیی دامەزارند ناوینان ( ئەنجومەنی گەڕاندنەوەی مولکەکانی فرەنسی)، بۆ دەستنیشان کردنی ئەو مولکانە بە هەوەستی پادشا دەبوو، بۆیە بڕیار لەسەر گەڕاندنەوەی چەند شارێک دەدات کە بەهێچ شێوەیەک مافی بەسەردا نەبوو کە دەکەوتنە سنوورەکانی فرەنسا تا روباری راین، هەر لەم میانە سەربەخۆیی بە هەرێمی ئەلزاس دەدا، لەبەرامبەر هێرشەکانی ئیسپانیا شکست دێنێ و ناچار دەبێ لوکسەمبورگی بۆ جێبێلێ و دانوستانی لەگەڵدا بکا.

ئیمپراتۆریەت لە ئەڵمانیا لەو فراوانخوازیەی فرەنسا بێزار بوو کە لەسەر حسابی مومتەلەکاتەکانیدا دەیکا. بۆیە ئیمپراتۆر لە ١٦٨٤ ناچار دەبێ داوای کۆبونەوەی دایت دەکات تا باس لە پرسی مەترسیەکانی فرەنسا و فراوانخوازیەکانی دوای سەرکەوتنی لویسی چواردەهەم لە ( راتزیون ) بەدەستی هێناوە بکات ، کاتێکیش لویسی چواردەهەم بەم هەواڵە کۆبونەوەی دایت دەزانێ ، داوایان لێدەکات مافی هێشتنەوەی ئەو شووێنانەی پێبدەن کە ئەنجومەنی گێڕانەوەی مولکەکان رەزامەندیان لەسەر داوە بۆماوەی بیست ساڵی دیکە ، دیت لەژێر هەڕەشەکانی لویسی چواردەهەم ناچاردەبێ رەزامەندی دەدا، ئەم سەرکەوتنە نمونەی لوتکەی سەرکەوتنەکانی لویسی چواردەهەم بوو.

## سیاسەتی ئاینی و هەڵوەشاندنەوەی مەرسومنامەی نانت:

دوای ئەوەی لویسی چواردەهەم لە دەرەوە بە لووتکەی ئەمجای سیاسیی دەگا، هەولەکانی لە ناوەوە چڕ دەکاتەوە بۆ لێسەندنەوەی دەسەڵاتەکانی ئاینی لە پاپا. بە جۆرێک خۆی ببێتە خاوەن دەسەڵاتی رەها و بێ رکابەر لە کاروبارەکانی سڤیلی و ئاینیی وڵات. بۆ ئەم مەبەستە لە ١٦٨٢ داوای کۆبوونەوەی کۆمەڵگای ئاینی دەکا بۆ زیندوو کردنەوەی دەسەڵاتەکانی پادشای کۆنی فرەنسی کە دەسەڵاتەکانی سەربەخۆیی لە پاپا وەردەگرێ، کۆمەلگای ئاینی بڕیاریدا دا کە بڕیارەکانی پاپا، کڵێسای فەرەنسی ناگرنەوە.

کۆلبێرت وەزیری دارایی فرەنسا لە سەردەمی لویسی چواردەهەم لە ١٦٦١ کە فرەنسا ئەوکات لە ئاشتەوایی وسفالیا لە ١٤٦٨ لە شەڕی سیسسالەی ئاینی تەواو دەبێ دواترپێنج سالیش توشی شەڕی ناوەخۆ دەبێ ، بۆ دەرباز کردنی فرەنسا لەو دۆخە داتەپیوەی ئابوری و ئالۆزییە ناوەخۆییەکانی، کۆلبێرت لەسەر ئەم دروشمە کاردەکات و دەڵێ: ( مەزنی فرەنسا لەسەر سامانی وەستاوە، سامانیش لەسەر کار وەستاوە، هێزی میلەت بە جلی جوان و بریقەدار دروست نابێ، بەڵکو بە پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵ و خزمەتگوزاری دروست دەبێ کە هەموو چینەکانی کۆمەلگا پێی هەڵدەستن ) .

دوای ئەوە بایەخێکی زۆربە لەناوبردنی هاولاتیانی هیجونوت دەدا کە بەپێی رێککەوتنی نانت تایبەتمەندیان پێدرابوو، ئەم توێژە پێشتر لەلایەن ریشلیۆوە سیاسەتێکی سەرکوتکارانە و ستەمکارانەیان لەگەڵ بەکار هێنابوون، لویس پادشا لە مافی ئاینیی بێبەش کردبوون، چونکە ئەو مافە ئاینیەکانی بە نیمچە سەربەخۆییەک دەزانی ئەمەشی پێ پارچەکردنی خاکی فرەنسا و سەربەخۆیی ئەوان دەزانی، بۆیە مامەلەیەکی توندی لەگەڵدا دەکردن لەرێگەی هاندنانی کاسۆلیک و عیساخوازەکانی دەرورو بەریەوە. ئەم نەهامەتیەی هیجونوت لە ساڵی ١٦٦١ ەوە دەست پێدەکات کە لە هەموو مافەکانی پۆستی حکومیان بێبەش دەکەن و خوێندن لە قوتابخانەکانیان دەکەنە خوێندنی ئاینی کاسۆلیکی، کارەکان بەو ئاستە گەیشتن کە داوایان لێبکەن منداڵەکانیان رادەستی حکومەت بکەن تا پیاوە ئاینیەکان وانەی پێڕەوی کاسۆلیکیان پێبدەن، لەژێر هۆکاری ئەو چەوساندنەوەو رەفتارە مەزهەبپەرستیەدا هیجونوت هەولی کۆچکردن دەدەن بۆ ولاتانی دەرەوە.

خۆی گورزە مەزنەکە کاتێک بەریان دەکەوێ کە مەرسومنامەی نانت لە ١٦٨٥ هەلدەوەشێتەوە، هەرچەندە رێگری کۆچکردنیان لێکرا بەلام هەرچۆنێکی بێ ژمارەی ٣٠٠٠٠٠ کەسێکیان دەتوانن بۆ ئەو ولاتانە کۆچکەن کە رێگەپێدراو بوە پێرەوی ئاینی پرۆتستانتی، وەکو ولاتی هۆڵەندا و ئینگلتەراو ئەڵمانیا، هەندێکیشیان بۆ کۆلۆنیالەکانی ئینگلیزی لە ئەمریکای باکوور کۆچیان کرد.

زۆربەیان بڕوایان وابوو ئەوەی هاتە رێگەیان بۆ ئەو ژنە دەگەڕێتەوە کە لەسەرەتای ژیانیەوە دەبێتە پێرەوانی پرۆتستانتی (هیجونوت) دواتر لێی هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە کاسۆلیکێکی توند، ئەویش مەدام دی مەینتینۆن Madame de Mainttenon بوو، ئەو سەرەتا ژنە هەژارێک دەبێ، دواتر دەبێتە بەخێوکەری منداڵانی پادشا، پادشا بە رەفتار و هزرەکانی سەرسام دەبێ، ئەویش دەبێتە لایەنگری پادشا، کاتێک ماریاترێزای

هاوسەری پادشا و کچی پادشای ئیسپانیا کۆچی دوایی دەکا، پادشا لە ١٦٨٣ هاوسەرگیری لەگەڵ مەدام مینتینوندا دەکا، لە راستیدا ئەو توانیی کاریگەری خۆی لەسەر پادشا دروستکا بۆ ئاینپەرستی و پێڕەویکردنی مەزهەبی کاسۆلیک، بەڵام هۆکاری چەوساندنەوەی هیجونوت نەبوو چونکە ئەم رەفتارە بەر لە چونی مەدام بۆ کۆشکی پادشایەتی بونی هەبووە، لە دوای خۆی مەدام مینتینون نامەی جێهێشت بوو کە ئەم راستیە دەسەلمێنێ، هەموو ئەوەی ئەو مەبەستی بووە خەڵک پێڕەوی مەزهەبی کاسۆلیک بکات بەڵام بەبێ چەوساندنەوەی هیچ لایەنێک.

چونکە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی مەرسومنامەی نات بۆ لویسی چواردەهەم و دەوروبەرانی لە پێڕەوانی کاسۆلیک و توندڕەوانی دەگەڕێتەوە. کۆچکردنی هیجونوت بۆ دەرەوەی وڵات زیانی بۆ فرەنسا لە سوودەکانی زیاتر بوون، چونکە بە کۆچکردنی ئەوان سەدان پیشەوەر و بەهرەدار وڵاتیان جێهێشت کە دەکرا لە بواری بازرگانی و پیشەسازی جێدەستیان دیاربا ئەگەر لە وڵات بمابانەوە.

## ٣/ جەنگی پلاتین ( ١٦٨٨-١٦٩٧ )

لەوکاتەی لویسی چواردەهەم لە پیادەکردنی سیاسەتی ناوەخۆی بەردەوام دەبێ کە راوەدوونانی هیجونوت و بێبەش کردنی وڵات لە سودی رۆڵەکانیان، لە هەمان کاتدا لە سیاسەتی دەستبڵاوی و بەهەدەردان و خەرجکردنی داهاتی وڵات لە کۆشک و جوانکاریەکانی بەردەوام دەبێ، دوژمنانی لە دەرەوە چاویان بریوەتە جوڵە و چاوتێبڕینەکانی لە خۆ بەرفراوان کردنی کە کۆتاییان نایە. بەتایبەت کە دەولەتە ئەوروپیەکان لە ئەنجامی سیاسەتی دوژمنکاریی لەگەڵ پاپاو هاوپەیمانێتیی لەگەڵ تورکە عوسمانیەکان لێی تووڕە ببون. لە هەموویان تورەتر ولیام ئۆرەنج بوو کە سور بوو لەسەر ئەوەی لە دژی لویسی چواردەهەم هاوپەیمانێتیەک دروستکا. لە ١٦٨٦ توانیی لەگەڵ هەریەک لە ئیسپانیا و ئیمپراتۆر و ژمارەیەک لە ویلایەتەکانی ئەڵمانیا لە دژی لویسی چواردەهەم هاوپەیمانێتیەک دروستکا بەناوی هاوپەیمانی ئەجزبورگ.

ئێستا شەڕ لە نێوان لویسی چواردەهەم و ئەو هاوپەیمانیە مسۆگەرە. بەڵام لویس خۆی لەم هاوپەیمانێتیە گێل کرد، لە کارەکانی بەردەوام دەبێ داوا لە ئیمپراتۆر دەکا رێککەوتنی ( راتزبون )ی بۆ بکەن بە هاوپەیمانی، واتە ماوەی بیست ساڵەکەی بۆ بکەن بە

هەمیشەیی تا بتوانێ مومتەلەکانی گێردراوە بۆ هەتاهەتایە لە دەست خۆی بمێنێتەوە. ئیمپراتۆر ئەم داوایە رەت دەکاتەوە، لویس مردنی چارلس میری پلاتین بە دەرفەت دەزانێ تا داوای مافی تاجی ویلایەت بکا. لە ١٦٨٨ بەو هۆیەوە شەڕ لە دژی ئیمپراتۆر رادەگەیەنێ. لایەنگرانی هاوپەیمانی ئیمپراتۆر دەچنە هانای، ئینگلتەرا دەچێتە ریزیان و هەموویان لە دژی لویسی چواردەهەم یەک دەست دەبن، هەر ئەوساڵ بوو لە ئینگلتەرا لە ١٦٨٨ شۆرش دژی جەمسی دووەم پارێزەری کاسۆلیکەکانی ئینگلتەرا بەرپا دەبێ. بەهۆی فشارەکان جەمسی دووەم رادەکاتە دەرەوە بەریتانیەکان بانگی ماریی کچی جەمس دەکەن لەگەڵ هاوسەری ولیام ئۆرەنج بێن پادشایەتی وڵات بکەن، هەروایلێهات ولیام کرایە پادشای بەریتانیا و تاجی پادشایەتیان لەسەرینا بەناوی ولیامی سێیەم. ئەمەش هۆشداریەک بوو کە ئینگلتەرا دەچێتە ناو هاوپەیمانێتیەکەی دژی لویسی چواردەهەم کە لە ئەوروپا هیچ هاوپەیمانێکی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا لە غروری خۆی نەهاتە خوارو بەر لەوەی هێرشی هاوپەیمانان دەست پێبکا ئەو هەلمەتی کردە سەر پلاتین و گوندو کێڵگە کشتوکالیەکانی خاپور کردن، لە ١٦٨٩ شەڕ بەتەواوەتی باڵی بەسەر دۆخەکەدا کێشا، بەڵام لە سەرەتا لە دەریا و لە وشکانی لە بەرژەوەندی لویسدا دەسوورا، لە ١٦٩٢ بەرژەوەندیەکان سەراوژێر دەبنەوە و دەکەونە دەست ئینگلتەرا بەتایبەتی لە دەریا کە ئینگلتەرا زاڵە.

شەڕ لە ئەوروپا پەرە دەستێنێ، فرەنسیەکان لە ئیتاڵیا سەرکەوتن بەدەست دێنن، فەرماندە نەمساییەکە لە پیرمونت وەدەر دەنێن و دەست بەسەر زەویە نزمەکاندا دەگرن، لە (منس و نامور لە ساڵەکانی ١٦٩١-١٦٩٢) لە دەریا سەرەتا وا دەبینرا کە فرەنسا خاوەنی سەروەری دەریایە، لە سەری بیچی ( Beachy Head ) لە ١٦٩٠ گەمیەکانی فرەنسی بەسەر گەمیەکانی ئیگلیزی و هۆڵەندیدا سەرکەوتن، بەڵام ساڵی دواتر ئینگلیزەکان بە فەرماندەیی (رەسل) لە شەڕی لا هوگ هێزەکانی فرەنسی تێک دەشکێنن. لەوکاتەی فرەنسا ئەم شکستە دێنێ دلنیا دەبێ کە ئیتر سەروەری دەریا دەکەوێتە دەست ئینگلتەرا بۆیە هزر و بیرەکانی بۆلایەکی دیکە دەبا کە هێرش بردنە بۆسەر ئینگلتەرا، ئەم بیرۆکە هەموو هۆشی لێ داگیر کردبوو، مەبەستی لەو هێرش و داگیرکردنە گێرانەوەی جەمسی دووەم بوو بۆ سەر دەسەڵات کە رایکردبوە دەرەوە و لە ئیرلەدا گیرسابۆوە.

دوای بەردەوامی نۆساڵ لەو شەڕە هەردوو لایەن هەمان توانای جارانیان نامێنێ بەتایبەت لایەنی فرەنسی کە دەبوایە شەڕێکی فرە لق و پۆ بکا بەو هۆیەوە تێچوی زۆری لەسەر بوو بۆ دابین کردنی چەک و تەقەمەنی و پێداویستیەکانی جەنگ، وێرای تێچوی

چاككردنەوەی كەشتیگەلی جەنگیی، بۆیە كەش و هەوای دانوستان دەرەخسێ. هەردووك لایەن پەیمانی رایزڤایك Rijswijk ( شارێكە یا گەڕەكێكە لە قەراخ لاهای واتە دەنهاخی هۆڵەندا ..و ) لە ١٦٩٨ واژۆ دەكەن.

بەپێی ئەو رێككەوتنە فرەنسا دەبێ دەستبەرداری هەموو ئەو شوێنانەبێ كە دوای رێككەوتنی نایمێخن دەستی بەسەردا گرتووە، جگە لە ستراسبورگ و ئەلزاس. لویسی چواردەم دان بە مافی تاجی پادشایەتی ولیامی سێیەم دەنێ وەكو پادشای ئینگلتەرا. ئەم دانپێدانانە سەركەوتنێكی مەزن بوو بۆ ولیامی سێیەم چونكە بەپێی ئەو رێككەوتنە دەبێ لویس بە هیچ شێوەیەك هاوكاری خانەوادەی ستیوارت نەكا بۆ گەڕانەوەیان بۆ سەر كورسیی پادشایەتی ئینگلتەرا، پەیمانی رایزڤایك بۆ فرەنسا زۆر قورس و مایەی شەرمەزرای بوو، زۆری لەسەر كەوت بەڵام لویسی چواردەهەم ناچار بوو واژۆی بكا چونكە كێشەیەكی دیكەی بۆ دروست بوو ئەویش پرسی ویراسەتی ئیسپانی بوو.

## ٤/ جەنگی ویراسەتی ئیسپانی ( ١٧٠٢-١٧١٣ ) :

كاتێك پادشای ئیسپانیا چارلسی دووەم لە ١٦٦٥ تاجی پادشایەتی دەنێتە سەر كێشەیەكی مەترسیدار بۆ ئەورووپا دەخولقێ، چارلسی دووەم لە رووی ئەقل و جەستەوە پادشایەكی پەككەوتە بوو. لە هەمان كاتدا هیچ كوڕێكی لەپاش نەمایەوە بۆ جێگرەوە بۆیە ئەورووپا دەست لەسەر دڵ بەترسەوە لەو رۆژەیان دەڕوانی كە ئەو پادشایە دەمرێ. وەریسە نزیكەكانی دوو خوشكەكانی بوون، ماریا تریزا هاوسەرگیریی لەگەڵ لویسی چواردەهەم كردبوو، مارگرێت تریزاش هاوسەرگیریی لەگەڵ ئیمپراتور لیوبولدی یەكەم كردبوو، مارگرێت كچێكی لێ وەپاش كەوت شووی بە میری باڤاریا كردبوو.

بۆیە جێگرتنەوەی پادشایەتی ئیسپانیا ئالۆز دەبێ و بەسەر سێ تەوەردا دابەش دەبێ:

ا) میری باڤاریا داوای پادشایەتی ئیسپانیای دەكرد، چونكە برازای پادشا بوو. بەهۆی ئەوەی لە روی پێگە و لایەنگرییەوە لاوازترین داواكراو بوو، بۆیە كێشەیەكی بۆ هاوسەنگی هێز دروست نەدەكرد، بەو هۆیەوە دەولەتان مەیلی ئەویان زیاتری هەبوو بۆ وەرگرتنی تاجی پادشایەتی.

ب) ئیمپراتۆر لیوبولدی یەکەم داوای دەکرد، چونکە نەوەی فیلیپی سێیەم و هاوسەری کچی فلیپی چوارەمە ، ماریا ئەنتونیای کچی بەر لەوەی شوبە میری باڤاریا بکا لە مافەکانی خۆی خۆش ببو بۆ ئەو.

ج) لویسی چواردەهەم داوای تاجی پادشایەتی و ویراسەی بۆ شازادەی کوری ماریاتریزای هاوسەری دەکرد، بەڵام لویس لەکاتی هاوسەرگرییی دەستی لە مافەکانی ویراسیی ماریا تریزا هەڵگرتبوو، بەڵام کە ئەم پرسە دێتە پێش بە چەند بیانوویەکی بێبنەما پەشیمان دەبێتەوە و وتەکانی دەگۆڕێ.

بەم شێوە پرسی جێگرەوەی پادشای ئیسپانیا لە دوای مردنی چارلسی کێشەی تێدەکەوێ دواتر مولکەکانی چارلسی دووەم جگە لە ئیسپانیا دوورگەکانی بلیارد و زەویە نزمەکان و میلان وناپولی و سقلیە هەبوون، هەندێک کەلێنیش لە کەنارەکانی دورگەی تسکانیا و کۆلۆنیالەکانی لە ئەفریکا و ئەمریکای ناوەڕاست و ئەمریکای باشوور لەگەڵ چەند دورگەیەک لە کەناری مەکسیک و دەریای کاریبی و زەریای ئارام.

مردنی چارلسی دووەمی نەخۆش یەکێک بوو لە ئەگەرەکان، هەرساتێک روو بدا، هەروەها کێشەی دوای مردنیشی بەهەمان شێوە لە ئارادا بوو بۆ پاراستنی هاوسەنگی نێودەولەتی، بۆیە بەر لە مردنی چەند هەولێک بۆ ئەم مەبستە دەدرێن بەڵام هەمویان بەهۆی کێشە و ململانێ و رکابەری نێوان فرەنسا و ئیمپراتۆرەوە شکست دێنن، کۆشکی پادشایەتیی چارلسی دووەم لەسەر ئەم پرسە بەسەر دوو حزبدا دابەش دەبن یەکێکیان لایەنگری ئیمپراتۆر دەکەن ئەویتریان لەیەنگری چاوتێبڕینەکانی لویسی چواردەهەم دەکەن، دواجار لایەنگرانی فرەنسا ( لویسی چواردەهەم ) سەردەکەون بە رازی کردنی پادشای ئامادەکراو، گوایە لە ئۆکتۆبەری ١٧٠٠ وەسیەتی کردوە کە هەموو مولکەکانی بدرێتە فیلیپی شازادەی ئەنجو کە دەکاتە نەوەی لویسی چواردەهەم ودووەم کوری شازادەی فرەنسا، دوای ئەم وەسیەتە بە یەک مانگ چارلسی دووەم دەمرێ.

دوای ئەمە لویسی چواردەهەم پەیماننامەی دابەشکردن لەگەڵ ئینگلتەرا پشتگوێ دەخا کە بۆ زەویە نزمەکان لە ١٦٩٩ لەسەری ڕێککەوتبوون، بڕیاریدا وەسیەت نامەی پادشای کۆچکردوو قەبولکا کە بۆ شازادەی ئەنجو دابووی و بە پێدانی تاجی پادشایەتی فرەنسا بە فیلیپی پێنجەم رازی بوو، نامەیەکیش بۆ پادشای ئینگلتەرا ولیامی سێیەم دەنوسێ تیایدا هۆکارەکانی پەشیمان بوونەوە لە ڕێککەوتنەکە و قەبوڵکردنی وەسیەتنامەکە روون

و: خالید هەرکی

دەکاتەوە. دوای وتووێژێکی دوورو درێژ بۆ ئینگلتەرا و هۆڵەندا روون بۆوە ئەو مەترسیەی دروست بووە لەسەر تێکچوونی هاوسەنگی هێز لە ئەوروپا.

ولیامی سێیەم رابەرایەتی بێزاری هاوڵاتیانی ئەوروپای کرد لە دژی لویس، لە ١٧٠١ توانیی هاوپەیمانێتیەک بە ناوی ( یەکێتیی هەرەمەزن) پێک بێنێ. بریتی بوو لە ئینگلتەرا و هۆڵەندا و ئیمپراتۆرو هەریەک لە میرنشینی براندنبورگ (پرووسیا) و دواتر پۆرتوگال و میرنشینی ساڤوایی ئیتالیش پشتگیریان لێی کرد. بەڵام بەر لەوەی جەنگ دەست پێبکا دەمرێ. چونکە هێزەکان بەرانبەرو بەتوانا بوون، جەنگ درێژە دەکێشێ لە ١٧٠٢ تا ١٧١٣ هیچ لایەکیان سەرکەوتنیان بەسەر لایەکەی دیکە نەهێنا، هاوپەیمانی فەرماندەی ئەو شەڕەیان بە میری مارلبۆرگ سپارد کە مەزنترین فەرماندەکانی ئینگلیز بوو، هاوپەیمانی لە شەڕەکاندا سەردەکەوت لە بەناوبانگترین ئەو شەڕانەی لە بلنهایم Blenheim بوو لە باڤاریا لە ساڵی ١٧٠٤ و لە راملیزلە Rammlies لە ساڵی ١٧٠٨ ولە ئۆودنارد Audnarde لە١٧٠٨ و لە مالپاکیەت Malpaquet و زەویە نزمەکانیش لە ساڵی ١٧٠٩.

ئەو جەنگە فەرەنسای زۆر ماندوو کرد، هێزەکانی لە گەلێک شەڕدا لەناو چوون، پیاوەکانی بە هەزارانیان لێ کوژرا، لویسی چواردەهەم هیچ دەرچوونێکی بۆ ئەم دۆخە نەبوو هیچ دەرفەتێکی ئاشتەواییشی بۆ نەرەخسا، هەرچەندە گەلی ئینگلتەرا بێزار ببون لەم دۆخە و ئارەزوی ئاشتیان هەبوو، دواتر رووداوێک روودەدا دەبێتە مایەی رزگار بوونی فرەنسا لەم تەنگژە، ئەویش مردنی ئیمپراتۆر جۆزیف بوو لە ساڵی ١٧١١، دوای ئەو براکەی شازادە چارلس دەبێتە ئیمپراتۆر، کە بۆ پادشایەتی ئیسپانیا کاندید بوو، ئێستا هەرگیز ئەوە قەبوڵ ناکرێ پادشایەتی ئیسپانیا و ئەڵمانیا لە یەک پادشادا رێکبخرێ، هەر لەو کاتانەدا کابینەی وزاریی ئینگلتەرا دەگۆرێ و کابینەی وزاری دەکەوێتە دەست پارتی توری Tory کە لایەنگری کۆتایی هێنانی شەڕ بوو، وەزارەت بانگی فەرماندە ( ملبرا )ی خاوەن سەرکەوتنەکانی کرد، رازی بوو بە ئەنجام دانی دانوستان لەگەڵ لویسی چواردەهەم، وەکو زەمینە خۆشکردنێک ۆ بپرۆسەی ئاشتەوایی. لە ١٧١٢ ئینگلتەرا لە شەڕ دەردەچێ، دوای ئەویش هۆڵەندا دەرچوو.

لە نیسانی ١٧١٣ پەیمانی ئوتریخت Utrecht بەم مەرجانە هاتە واژۆکردن:

١/ جێگیر کردنی فیلیپ نەوەی لویسی چواردەهەم بە پادشای ئیسپانیا و خاوەنداریێتی مولکەکانی ئەمریکی بە رەچاو کردنی ئەوەی لە یەککاتدا نەبێتە خاوەنی تاجی پادشایەتی فرەنسا وئیسپانیا .

٢/ ئیمپراتۆر دەست بگرێ بەسەر سەردینیا و ناپۆلی و میلان و زەویە نزمەکانی ئیسپانی کە بە بەلژیک ناودەبردرێ و دواتر دەبێتە زەویە نزمەکانی نەمسایی.

لەم زە ویە نزمانە پانتاییەک یا ناوچەیەکی لێبەدەر کرا کە پێی دەوترێ ( خلدەرلاند Gelderland ) ئەمەش درا بە میری براندنبورگ فریدریکی یەکەم، لە قەرەبوی ئەو زیانانەی لە قوربانیدان لەو جەنگە لێی کەوتون، لەگەڵ دانپێدانانی وەکو پادشای پرووسیا.

٣/ ئینگلتەرا دەست بەسەر دوورگەی منورقە و چیای تاریقدا دەگرێ کە لەدەست ئیسپانیایە و لێی وردەگرێتەوە، نیو فۆندلاند و نوفاسکوشیا و کەنداوی هدسن لە فرەنسا وەردەگرێتەوە، هەندێک دەستەکەوتی بازرگانیشی لە ئیسپانیا وەرگرت.

پەیمانی ئوتریخت دەستپێکی سەردەمێکی نوێ بوو. کۆتایی بەو زنجیرە شەڕانە دران کە خانەوادەی بۆربۆن لە هەولی دەستگرتن بەسەر ئەوروپا دەیدا و مەترسیەکان رەوێندرانەوە. لەم بەزمە فرەنسا تەنها ئەوەندەی لێچنی کە فلیپی پێنجەم نەوەی لویس کرایە پادشای ئیسپانیا و فرەنسیەکانیش دەستیان لە بیرۆکەی داگیرکردنی بەلژیک هەلگرت، بەریتانیاش دوای دەستگرتنی بەسەر بنکەی چیای تاریق کە مەزنترین هێزی دەریای سپیی ناوەڕاستە، وەکو دەوڵەتێکی مەزن لەو شەڕە دەرچوو.

# بەشی دوانزەهەم

## بەریتانیا لە سەدەی حەڤدەهەم

## خانەوادەی ستیوارت و شۆڕشی پیوریتان

### جەمسی یەکەم James ١ (١٦٠٣-١٦٢٥)




کە ئلیزابیث لە ١٦٠٣ دەمرێ، کوڕی ماری ستیوارت (جەمسی شەشەم ) کە پادشای سکوتلەندا بوو تاجی پادشایەتی ئینگلتەرا وەردەگردێ، کە دەبێتە پادشای ئینگلتەرا نازناوی جەمسی یەکەمی پێدەدەن.

سەردەمی ئەو بە سەردەمێکی نوێی یەکێتی ئینگلتەراو سکۆتلەندا دەناسرێ، کە خەونی هەموو پادشاکان بوو هەر لە هنریی چوارەمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی یەکێتی لای هەندێک لایەنی ئۆپۆزسیۆن مایەی نارەزایی بوو، چونکە ناکۆکی و جیاوازیی نێوان ئەو دوو گەلە قول و رەگداکوتاو بوون هەر بۆیەش سکۆتلەندا پەرلەمانی خۆی هەڵنەوەشاندەوە و یاسا و فەرمانبەرەکانی دەستکاری نەکردن، یەکێتیەکە تەنها بریتی بوو لە بوونی یەک پادشا لەسەر ئەو دوو دەوڵەتە و پەیوەندیەکانیشیان هەر وەکو خۆیان مانەوە تا ماوەیەکی دوور.

لە بێبەختــی ئەو دوو وڵاتە یەکێتــیەکە لە ســەردەمی جەمــس روو دەدا، کە پیــاوێکی رەفتــار خەراپ و دڵ و دەروون پــیس بــوو، بـایەخی بە خــۆ رەوشــەنبیر کــردن دەدا بەڵام لە بەڕێوەبردنی دەولەت ئەقلیەتێکی خەراپی هەبوو ئەو رەوشەنبیریەی هەیبوو بۆ بەڕێوە بردنی دەولەت هیچ سودێکی نەبوو، لەو ماوە نەیتـوانی سـۆزی هاوڵاتیـان بۆخـۆی بکێشــێ چـونکە هەمیشە باسی لە مافەکانی پادشا دەکرد و هەر ئەو باسانەی لەسەر زار بوو. پێی وابـوو کە مافی خۆیەتی هەر یاسایەک لێێ رازی بێ دەریکا بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ پەرلەمان، بـڕوای وابـوو کە مـیللەت سـەرچاوەی هێـز و پەنـای ئەو نـیە چـونکە ئەو لەلایەن خـواوەدنەوە بـۆ پادشایەتی راسپێردراوە بۆیە هیچ بایەخێکی بە راو بۆچونی میلەت نەدەدا. پێێ وابوو تەنهـا خۆی دەتوانێ دادپەروەری پیادە بکـا و یاسـا جێبەجـێ بکـا، چـونکە لەلایەن خـوا هەر ئەو بەرپرسیارە و هەر ئەویش دەتوانێ حسابی لەگەڵدا بکا نەک میللەت.

ئەوەنـدە بەختــی بـاش بـوو لە ســەردەمێکدا دەســەڵاتی گرتەدەســت پــێگەی ئینگلـتەرا بەهێز بوو ئیسپانیا لەلاوازبوندا بوو، کەشتیگەلی بەریتانی توانیبووی کەشـتیگەلی ئەرمـادای ئیسپانی تێک بشکێنێ. لاواز بوونی ئیسـپانیا لە دەریـا و وشـکانی ئینگلـتەرای لە مەزنتـرین مەترسی رزگارکرد، پێی باش بوو لەم کاتە پەیوەندیی لەگەڵدا باش بکا بـۆیە رێککەوتنێکـی ئاشتەوایی لە ١٦٠٤ لەگەڵـدا واژۆکـرد، بەڵام بەهـۆی سیاسـەتی ئاشـتەوایی لەگەڵ ئیسـپانیا شــەپۆلی نـاڕەزایی لە وڵات هەڵـدەکا، پەرلەمــانیش لەوە تــورە بــوو کە بەبــێ گەڕانەوە بــۆ پەرلەمــان یاســای بــاج دەردەکــا و دەســتکاری پســپۆریی دارایــی دەکــا بێــئەوەی هــیچ شارەزاییەکی لێ هەبـێ، بە پاسـاوی ئەوە مـافی تێـدا هەیە دەتـوانێ دەسـتی بخـاتە نـاوی، لەگەڵ لۆرد و ئەندامانی ئەنجومەنی گشتی کەوتە دەمەتەقێ ، پێی ووتن ئەو مافـانەی ئێـوە بە هی خۆتان دەزانن ئەوە پادشا پێی داون مافی تایبەتی خۆتان نیە، ووتی کار و پسپۆری ئێوە لەسەر داهاتی دەولەت و سیاسەتی ئاسایشی نەتەوایەتی و رێکخسـتنی کـاری کڵێسـای دەوڵەتە، بەڵام سیاسەتی باڵا لەدەسەڵاتی پادشا بە تەنهایە.

ئەم بیرۆکانە پەرلەمانتارەکانی بێزار کرد ناڕەزاییەکیان بەم شێوە پێشکەش بە پادشا کرد:

و: خالید هەرکی

( ئـازادی و تایبەتمەنـدی و پسـپۆری ئەنـدامانی پەرلەمـان مـافێکی دێـرین و رەسـەنی خۆمانە لە گەلی ئینگلیزی بۆمان ماوەتەوە، پرسـە مەترسـیدار و بەپەلەکـان کە پەیوەنـدیان بە دەولەت و پادشـاوە هەیە لەگەڵ پرسـەکانی بەرگـری لە دەولەت و کلێسـای ئینگلیـزی و لێپێچانەوەی ستەمی زۆرلێکراوان هەموویـان کـاری پەرلەمـانن، ئەنـدامانی گوتـوبێژی لەسـەر دەکەن)

پادشا لەم یاداشتە هـار دەبێ کە ئەنـدامانی ئەنجـومەنی گشـتی بەو بـوێرییە بەرزیـان کردۆتەوە، بڕیاریدا ئەم لاپەرە لە کۆنوسی دانیشتنەکانی ئەنجومەن وەلابنـرێ و فەرمـانی دا پەرلەمان هەڵبوەشێندرێتەوە و هەنـدێک لە ئەندامانیشـی بە تـۆمەتی ناپـاکی مەزن تاوانبـار کردن، ناکۆکیەکانی نێوان پادشا و پەرلەمان دەتەقنەوە، ئەم ناکۆکیانە بەردەوام دەبن تا لە ساڵی ١٦٢٥ جەمسی یەکەم کۆچی دوایی دەکا و چارلسی یەکەمی کوڕی جێی دەگرێتەوە.

## چارلسی یەکەم Charles١ ( ١٦٢٥-١٦٤٩ )



چارلسی یەکەم کۆمەڵێک کێشەی نێوان پادشا و پەرلەمان بە میرات بۆ مایەوە. لە روی ستەمکاریی لە باوکی دەچو. نەیتوانی خۆشەویستی میللەت وەدەست بێنێ، هەموو ژیانی لە ململانێدا بوو لەگەڵ پەرلەمان، متمـانەی بە شـازادەی بکنگـام کـرد کە هەر لە سەردەمی جەمسەوە جێگەی نـارەزایی خەڵـک بـوو. چـارلس هەولیـدا بە سـەرکەوتنەکانی دەرەکیـی گەل توشـی شـۆک و سەرسـوڕمانکا تـا بەلای خۆیانـدا بکێشـێ، شـەڕی لەگەڵ ئیسـپانیا راگەیانـد بەڵام شکستی هێنا، هەوڵیدا هاوکاری ( هیجونوت )ی فەرەنسا بکا لە دژی ریشلیۆ، لە (لاروشیڵ ) هاوکاری بۆ ناردن بەڵم بووە مایەی بەهێز بوونی ریشلیۆ و وون بوونی شکۆی پادشـایەتی ئینگلیز و ناوبانگی لە فەرەنسا.

بۆ قەرەبووی زیانەکان و پڕکردنەوەی ئەو زیانەی لە گەنجینەی ئینگلتەرا کەوتوە هەولیدا بەڕێگەی ناشەرعی پارە کۆکاتەوە ، بەڵام هەرجارەی ئەم هەولەی دەدا لە ڕێگەی پەرلەمانەوە ، گەل زیاتر لێی دوور دەکەوتەوە . قەرزی بەزۆر بەسەر بازارگان و چینی مامناوەندی و خاوەن کەشتیەکاندا دەسەپاندن، ئەگەر یەکێک ڕەتی بکردبایەوە قەرز بە پادشا بدا زیندانیی دەکرد، ئەم کارانە زیاتر دۆخی شۆڕشیان سازاند، گەل ڕاپەڕی و داوای دیاری کردنی سنووری مولکداریی کرد بێ ئەوەی کەس بێ دادگا زیندانی بکرێ، ئەم داواکاریە دەنگۆیەکی مەزنی لە پەرلەمان هەبوو بۆیە ئەندامانی لە ١٦٢٨ کۆدەبنەوە و بڕیار دەدەن بەلگەنامەیەک ئامادە بکەن بەناوی ( یاداشتی مافەکان) ئەمە بە گرنگترین بەلگەنامە دێتە ئەژمار لە مێژوی ئینگلتەرا تیایدا داوایان کرد:

ا) بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان هیچ باج و قەرزێک بەسەر کەسدا نەسەپێندرێ.

ب) نابێ کەس ئەشکەنجە بدری، بەبێ یاساش هیچ کەسێک زیندانی نەکرێ.

ج) نابێ بەهیچ شێوەیەک گەل ناچار بکرێ بەزۆر سەرباز و دەریاوان لە ماڵی هاوڵاتیان بحەوێندرێنەوە یا میوانداری بکرێن.

پادشا خال و داواکارییەکانی ئەم یاداشتەی پێ کەم کردنەوەی دەسەڵاتەکانی پادشا بوون، سەرەتا ڕەتی کردنەوە، بەڵام دوای دوودڵیەکی درێژ قەبولی کردن. چونکە زۆر پێویستیی بە ڕەزامەندی پەرلەمان بوو بۆ سەرف کردنی ئەو پارەی داوای کردبوو، پەرلەمان ڕەزامەندیی لەسەر خەرجیەکاندا بەڵام داوای کرد میری بکنگهام لە کارەکەی دوور خاتەوە، هەرچەندە بە نیانی پێیان ووت بەڵام پادشا ئەم داوایەی پێ زیادەڕۆیی و دەستێوەردان بوو لە کارەکانی و مافی خواوەندێتیی.

لە ١٦٢٩ پەیوەندیەکانی نێوان پەرلەمان و چارلس تێکدەچن، پادشا چارلس بڕیار دەدا بەبێ پەرلەمان کار بکا، پەرلەمانیش هیچ مافێکی یاسایی نەبوو بەبێ فەرمانی پادشا هیچ کۆبونەوەیەک بکا، ئەوەی دۆخەکەی زیاتر ئالۆز کرد ناکۆکیی ئاینی بوو کە پەرلەمان دژی وەستایەوە گەلی ئینگلتەراش لە پشتی پەرلەمان و لە دژی پاد شا بوو، دەنگۆیەکە وا بڵاو بۆوە کە گوایە پادشا دەیەوێ بگەڕێتەوە سەر پێڕەوی مەزهەبی کاسۆلیک بە تایبەت

کە هاوسەری پادشا لە پێرەوییەکانی کاسۆلیک بوو. لە چەند دانیشتنێکی بە مشتومڕ ناکۆکیەکانی نێوان پادشا و ئەنجومەنی گشتی زیاد دەبن، نارەزایی گەل توندتر دەبێ، ئەنجومەن رەتی کردەوە بە فەرمانی پادشا بڵاوە بکەن، سەرۆکی پەرلەمان لە شوێن خۆی مایەوە و درێژەی بە کارەکانی دا، لەو دانیشتنەیدا ئەنجومەن ئەم بڕیارە دەدا:

( هەرشتێکی بە چەواشەکاری بخرێتە ناو ئاینەوە کاری کاسۆلیکە، هەرکەسێکیش بەبێ رەزامەندی پەرلەمان باج کۆکاتەوە ئەو باجە دەدا، ئەوە دوژمنی دادگا و بەرژەوەندیی گشتییە). دوای ئەوە پادشا مەرسومێک بە هەلوەشاندنەوەی پەرلەمان دەردەکا، لەوکاتەوە تا یانزە ساڵ واتە لە ١٦٢٩ تا ١٦٤٠ پەرلەمان کۆنەبوەوە، لەو ماوە پادشا حوکمێکی ستەمکاری تاکرەوانە دەبرد بەرێوە، ئەنجامەکەی بوە جۆش بون و خرۆشانی میلەت کە بە دەرهاوێشتەی هەڵگیرسانی شۆرش تەواو دەبێ.

لە ماوەی حکومی بێ دەستورییدا چارلسی یەکەم و وەزیرەکانی هەلوەشانەوەی ئەنجومەن بە دەرفەت دەزانن تا بە بیانوی جیاجیا باج بەسەر خەلکدا بسەپێنن و لێیان وەرگرن ، یەکێک لە ستەمکارترین باجەکان پێی دەوترا ( باجی کەشتیەکان) ئەم باجە لەی کەشتیەکان وەردەگیرا بۆ تەواو کردنی کەشتیگەلی بەریتانی کە زۆر پێویستیان پێبوو، وەکو نەریتی جاران نەبوو کە هەر بەندەرە و ناچار بکرێ چەند کەشتیەک بۆ دەولەت ئامادە بکا، باجێکیان لە سەر هاولاتیان دانا بۆ ئامادە کردنی ئەو کەشتیگەلە، کۆکردنەوەی باج و سەرانە لە هاولاتیان بێزاری کردبوون، رازی نەبوون ئەم هەموو باجانەیان لێ بسەندرێ بە بیانووی جیاجیاوە، رووداوێک لەم میانە روویدا بوە مایەی تێکچونی دۆخەکان، ئەویش یەکێک لە ناودارانی چینی مامناوەندی بەناوی ( جۆن هەمدن) لە گوند ئامادە نابی باج بدا ، ئامادە بونی لە دادگا و زیندانی کردنی پێ باشتر بوو، کاتێک دادگا بە زۆرینەیەکی کەم بڕیاری زیندانی کردنی دەدا ئەم دەنگۆیەی بۆ دەبێتە پالەوانێتی و مایەی دەربرینی نارەزایی لە حوکمی ستەمکاری پادشا، بەو هۆیەوە متمانە لە نێوان گەل و پادشا لەق دەبێ، متمانەی ماوەیەکی دوور و درێژ بوو لە نێوان گەلی ئینگلیز و پادشاکەیان پتەو و چەسپاو بوو.

## ولیام لاود William Laud

پادشا , ولیام لاودی وەکو راوێژکاری خۆی بۆ کاروباری ئاینی دەست نیشان کردبوو، زۆر لێ رازی بوو سەرسامی بیرو بۆچونەکانی بوو بۆیە لە ١٦٣٣ بە سەرۆکی ئەسقوفەکانی ( کنتەربری ) دامەزارند کە بالآترین پۆستی ئاینی بوو لە دەولّەت .ئیتر لاود هەلّسا بە پیادە کردنی بیردۆزەکانی، هەولّیدا هەموو پیاوانی ئاینی کتابی سەلەوات بەکار بێنن , هانی گەلی ئیگلیزییدا ئاین پەرستیان پێ قەبول بێ وەکو ئەوەی بەرەو کلّێسای رۆما بچن وابوو، سزای توندیشی بەسەر ئەو کەسانەدا سەپاند کە دژی بۆچونەکانی ئەون و رازی نین بە پیادەکردنی بیروبرواکانی، ئیتر هەر قەشەیەک ئامادە نەبێ ئەم رێنمایانە جێبەجێ بکا دەبێ لەبەردەم دادگای بالّا دادگایی بکرێ. هەندێک لە نارازیەکان بە جەلدە لێدان سزا دەدران هەندێکیش بە نانبرین، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە (بیورینانەکان) ناچاری کۆچکردن دەبن بۆ هۆلّەندا و هەندێکیش بۆ ئەمریکا، لە ئۆردوگای تایبەتی نیشتەجێ کران کە پێیان وترا ( نیو ئینگلاند ) لەوێ رێنما و یاساکانی ئینگلتەرایان جێبەجێ دەکردن بۆیە گەلێک خەسلەت و تایبەتمەندی ئینگلتەرایان پاراستن کە هەر لە ئینگلتەرا دەچو ، ئەوانیش سۆزو خۆشەویستیان بۆ ئینگلتەرا لە کەسانی دیکە زۆرتر بوو کە لە ئەمریکا جێنیش کرابوون.

## کێشەی چارلس لەگەڵ سکۆتلەندیەکان:

بەهۆی ئەوەی گەلی سکۆتلەندی رازی نەبوون ئەو کتابەی نوێژکردنی ئەنگلیکانی کە چارلسی یەکەم راوێژکاری ئاینیی سەرۆکی ئەسقوفی کنتەربری بەسەریاندا سەپاندبوو قەبولی کەن، ناکۆکی دەکەوێتە نێوان گەلی سکۆتلەندا و پادشاوە، لەهەمان کاتدا مافی خواوەندیی پادشایان رەت دەکردەوە، رقیان لە پیاوانی ئاینی دەبۆوە لە هەلّس وکەتەکانیان کە وەکو سێبەری پادشا دەجولانەوە، سکۆتلەندیەکان لە پیاوانی خانەدانی پرۆتستانت بوون بڕیاریاندا رێگە بە پادشا نەدەن دەست لە کلّێسایان وەرد،ا بۆ ئەم مەبەستە لە ١٦٣٨میساقێکیان لە نێوان خۆیاندا واژۆکرد بەناوی هاوپەیمانی نەتەوی، سەرجەم سکۆتلەندیەکان بە راکردن بەرەو واژۆکردنی ئەو هاوپەیمانێتیە دەچون. ئەوەی ئەم

هاوپەیمـانێتیەی واژۆ دەکـرد بڕیـاری دەدا ئەوەی لە دەسـتیدایە و هەیەتـی لە پێنـاو ئەم هاوپەیمانێتیە ببەخشێ کە رێگە نەدەن پادشا هیچ ئاین یا مەزهەبێکیان بەسەردا بسەپێنێ جگە لە مەزهەبەکەی خۆیان نەبێ، سەرەتا پادشا چارلسـی یەکەم بەنیـاز بـوو دانوسـتانیان لەگەڵـدا بکـا بەڵام دواتـر بـۆی دەرکەوت کە لەبەردەم دوو رێـگەدایە؛ یـا ئەوەتـا دەبـێ لەبەرانبەر ئەو شەپۆلەی ناڕەزاییە دەست بەرداری داواکەی بێ یا دەبێ دەرگای شەڕیان لـێ بکاتەوە.

دیـارە دارایـی مەزنتـرین گرفـت بـوو لەبەردەمـی چـارلس بـۆ هێرشـبردنە سـەر سکۆتلەندیەکان. هەڵمەتی یەکەم جاری شکسـت دێنـێ، ناچـار دەبـێ لە ١٦٣٩ رێککەوتنـی ئاشتەواییان لەگەڵ واژۆ بکا، بەڵام ئەم پێیوابـوو کە ئەم ئاشـتەواییە کـاتییە، تـا ئەوکـاتەی پارەی تەواوی دەست دەکەوێ ئەوسا درێژە بە هەڵمەتەکەی دەدا، دیارە ئەو خـۆی نـاتوانێ ئەو تێچووە دابین بکا تا پەرلەمان بڕیار نەدا بودجەی تایبەتی بۆ شەڕی سکۆتلەندا تەرخان بکا. ئیتر لە ١٦٤٠ناچار دەبێ داوای کۆبوونەوەی پەرلەمان دەکا کە ماوەی یانزە ساڵ بـوو وەستاندبووی، هەرچەندە پەرلەمـان ئامـادە بـوو بڕیـاری تەرخـان کردنـی بـودجە بـۆ شـەڕی سکۆتلەندا رەزامەندی لەسەر بدا بەڵام بە هەلیان زانی لەم دەرفەتە داوا لە پادشا بکەن ئەو ستەمەی لەو مـاوە خـراوەتە سـەریان هەڵیگـرێ، گفتوگۆیـان لەسـەر ئەو سـتەمانە کـرد کە لەسەر میللەت هەیە. لەوکاتە پادشا توڕە دەبێ و دووبارە ئەنجومەن هەڵدەوەشـێنێتەوە کە تەنهـا سـێ هەفـتە درێـژەی هەبـو لە ( ١٣ی نیسـانەوە تـا ٥ی ئایـاری ١٦٤٠ بـۆیە ئەم ئەنجومەنە بە پەرلەمانی کورت هاتە ناسین ).

لە هەمان ساڵ لە ١٦٤٠ چارلس دووبارە دەگەڕێتەوە سەر هەمان پرۆسەی لەنـاو بردنـی بـزووتنەوەی سـکۆتلەندی. بەڵام شکسـتی ئـابڕووبەرانەی ئەمجـارەی لە هـی جـاری یەکەمـی مەزنتر بوو بۆیە ناچار دووبارە دەگەڕێتەوە لای پەرلەمان و داوای کۆبوونەوەیـان لێدەکا بـۆ ئەوەی بە ناچاری داواکانی گەل جێبەجێ بکا چـونکە ئەو تێچـوە تەنهـا پەرلەمـان دەتـوانێ بـۆی دەسـتەبەرکا. دۆخ و هەلوێسـتەکان هەسـتیار و ناسـک بـوون هێزەکـانی سـکۆتلەندی هێرشـیان هێنـابوو لە رووبـاری تویـد Tweed پەڕیبـوونەوە، شـارەکانی درهـام و نورتمرلندیان داگیر کردبوو لە پای کشانەوە داوای پارەیان دەکرد.

## پەرلەمانی درێژ:

دوای هەڵبژاردنێکی نوێ پەرلەمانێکی نوێ دادەمەزرێ، بەڵام بە هەمان ئەندامە کۆنەکان. لە مێژوو بەم پەرلەمانە گوتراوە پەرلەمانی درێژ، چونکە لە ماوەی ۲۱ساڵدا هیچ پادشایەک ئەم پەرلەمانە هەڵناوەشێنێتەوە.

هەرکە پەرلەمان دەست بەکاردەبێ بە سەربەخۆیی کاردەکا و پادشا دەکەوێتە بەر میهرەبانی پەرلەمان، یەکەم کاری ئەنجومەن تۆڵە سەندنەوە دەبێ لە ( ئیرل سترافۆرد ) سەرۆکی وەزیران و کلودی سەرۆکی ئەسقوفەکان، بڕیاری زیندانی کردنیاندا، ئەنجومەن تۆمەتی ناپاکی مەزنی خستە پاڵ یەکەمیان ولە ١٦٤١ لەسێدارە درا، دوای دوودڵیەکی زۆر بۆ ڕزگارکردنی بێ سود دەبێ پادشا خۆی بڕیارەکە واژۆ دەکا و بەسەریدا جێبەجێ دەکرێ. هەرچەندە لود بۆ ماوەیەک لە سێدارەدان ڕزگاری دەبێ بەڵام دوای چوارساڵ لە ١٦٤٥ حوکمەکەی بەسەردا جێبەجێ دەکەن و لەسێدارە دەدرێ.

ئەندامانی ئەنجومەن کاریان لەسەر نەهێشتنی کارە نەرێنیەکانی سەردەمی پێشوو کرد. چەند بڕیارێکیان دەرکرد:

١/ لانیکەم هەر سێ ساڵ جارێک ئەنجومەن کۆببێتەوە ئەگەر پادشاش داوای کۆبوونەوە نەکات.

٢/ ئەنجومەنی تەنها بە بڕیاری ئەندامانی هەلبوەشێندرێتەوە.

٣/ بڕیاری هەلوەشاندنەوەی دادگای تایبەتی دادگای ئەستێرە دەرکرد کە هنریی حەوتەم دایمەزراندبوو، بۆ ناچار کردنی خانەدانەکان بۆ لێسەندنی پارە بە ڕێگایەکی نایاسایی. دواتر ئەم دادگایە چارلسی یەکەم وەکو ئامرازێک بەکاری دەهێنا بۆ سزادانی خاوەن بیرورا ئازادەکان.

٤/ بڕیاری هەلوەشاننەوەی دادگای باڵای دا، کە تایبەت بوو بە دادگایی کردنی ناحەزان و ڕکابەرانی پادشا و گەورە ئەسقوفەکان.

٥/ بڕیاری نەهێشتنی باجی کەشتیەکانی دەرکرد چەنکە بە باجێکی نایاسابیان دەزانی.

٦/ بە شێوەیەکی گشتی هەموو ئەو بڕیارانەیان نەهێشتن کە پادشا بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکاری دەهێنا، پادشا ناچار بوو لەگەڵ بڕیارەکانی پەرلەماندا هەناگوی دەنا، بەڵام تۆلە سەندنەوەی بۆ ڕۆژی تایبەتی هەڵگرتبوو ئەوکاتەی هەل دەرەخسێ.

کاتێک ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ئەندامانی ئەنجومەن لەسەر پرسی ئاین، ئاسۆی دەرفەت دەردەکەوێ، بە ئاستی دژایەتیان بۆ پادشا و یەک بونیان لە بڕیارەکانی دژی پادشا لە پرسی ئاینیدا هەمان یەکگرتنیان نەبوو، کەمینەیەک دژی پیادە کردنی ڕێنماکانی کڵێسای ئینگلیزی نەتەوی هەبوون، ئەو کەمینە هەولیان دەدا ئەوەی پێی دەوترا حکومەتی ئەسقوفیەکان بروخێنن و کەمینەیەکی کۆنەپارێزیش لە پشتیوانی پادشادا بوون بەرگریان لە کڵێسا دەکرد.

لەم ململانێیە تروسکاییەکی ئومێد بۆ پادشا بەدیکرا کە جارێکی دیکە هەمان ڕۆلی خۆی بگێڕێ و لە پیلان و نانەوەی ناکۆکی بەردەوام بێ، بەڵام کاتێک ئەندامانی پەرلەمان هەست بەو کارە دزێوەی پادشا دەکەن زۆرینە لە دژی دەوەستنەوە و هەڵوێستەکانی ڕسوا دەکەن ، لە سەپتەمبەری ١٦٤١ جولانەوەیەکی نارەزایی ڕێکدەخەن بەناوی (نارەزاییەکانی مەزن) ، تیایدا هەموو کارە دزێوی و نابەجێکانی پادشایان ئاشکەرا کرد، لەوانە لەدەست دانی متمانەی نوێنەرانی گەل. داواش لە وەزیرەکان کرا لەبەرانبەر ئەم بەرپرسیارێتیە دابن لە بەرانبەر ئەنجومەن، ئەنجومەن بڕیاریدا ئەم نارەزاتیە چاپ بکرێ و بەسەر خەڵکدا دابەش بکرێ.

پادشا لەم کارەی ئەنجومەن زۆر نیگەران دەبێ و بڕیار دەدا لە ڕێگەی بەکار هێنانی هێزەوە بەسەر ئەنجومەندا زاڵ بێ، لە ٤ی جەنیوەریی ١٦٤٢ بە فەرماندەی سەرۆکی پاسەوانەکانی هێرشی بردە سەر پەرلەمان، بە نیازی دەستگیر کردنی پێنج سەرکردە نارازیەکە و دادگایی کردنیان بە تۆمەتی ناپاکی ئەمانیش بریتی بوون لە، ( پیم، هیمبدن، هازلیرخ، هۆلز، سترود ). خۆی چوە ناو پەرلەمان بۆ دەستگیر کردنیان بەڵام هیچیان لەوێ نەبوون، دیارە بەمەیان زانیوە و خۆیان حەشاردابوو دواتر بۆ شوێنێکی نادیار ڕادەکەن، هاوڵاتیانی لەندەنی بەم کارە دەزانن و لەدژی ڕادەپەڕن، پادشا هەستی بە مەترسی

هەلوێستەکان کرد کە کۆی جەماوەر دژی راپەریوە بۆیە بەباشی زانی لە ترسی جەماوەری راپەریوی لەندەن کە زۆرینەیان لە (پیورتان) بوون. خۆی و خانەوادەی روو لە گوندێک بکەن.

## شەڕی ناوەخۆ لە ١٦٤٢ دەست پێدەکا ( دەرکەوتنی کرمول ):




هیچ گومانێک لە رووبەڕوو بونەوەی پادشا و پەرلەماندا نەما، هەردوکیان خۆیان بۆ ئەم شەڕە ئامادە دەکرد، ئەوەندەی نەبرد لە سەرتاسەری وڵات شەڕی ناوەخۆ هەڵدەگیرسێ. لایەنگرانی چارلس ناویان لە خۆیاننا ( سوارچاکەکان ) Cavaliers زۆربەیان لە ئەندامانی خانەدان و کاسۆلیک و ژمارەیەکی کەمیش لە ئەندامانی ئەنجومەن کە لایەنگری سیستەمی کڵێسای ئینگلیزی بوون. پارتی پادشاخوازان بەسەر زۆربەی هەرێمەکانی باکوور و رۆژئاوادا زاڵ بوو، لایەنگرانی پەرلەمان بە ( سەرخرەکان ) Rond heads ناسرابوون

و: خالید هەرکی

چونکە لە رقی خانەدانەکان کە تا سەرشان قڕیان جێدەهێشت، سەرخرەکان لە رقی ئەواندا قژیـان دەتاشـی. لە رۆژهەلات و باشـووری ئینگلـتەرا بـالا دەسـت بـوون، سـەرخرەکان فەرماندەیەکی زیرەک و لێهاتویان هەبوو بەناوی کرومول Oliver Cromwell توانیی بارگە بە پادشا بپێچێتەوە و لە تەختی پادشایەتیی بێنێتە خوار و کۆتایی بە شەڕی ناوەخۆ بێنێ.

ئۆلیڤەر کرومول کەسێکی پیوریتانی بـوو، سـوپایەکی نـوێی دامەزرانـد سـەربازەکانی بە پارێزبەندی ئاینی تایبەتمەند بوون، دلسۆزی بڕواکانی پرۆتستانتی بوون، ئەم سـوپایە تونـد وتۆڵ و بەهێز بوو، شایستەی ئەو نازناوە بوو کە لێی نرابوو( پۆلایین ).

ئەو شـەڕە کە چەنـد سـاڵێک دەخـایەنێ لەسـەرەتا لە ١٦٤٣ لایەنگرانـی پادشـا یـا سـوارچاکەکان توانیـان بەهـۆی باشـی کـوالێتی چەک و پرچەکـی سـوپاکەیان و توانـای داراییـانەوە بەسـەر سـوپای پەرلەمـان یـا سـەرخرەکاندا زال بـن، بەلام دوای ئەو سـالە سەرکەوتن بـۆ پەرلەمـان و حـزبەکەی بـوو، توانیـان لە شـەڕی ( نـازبی ) Nazeby لە ١٦٤٥ پادشا ببەزێنن و بەسەریدا سەردەکەون .

پادشا لە سەرکەوتن بێ ئومێد دەبێ بەناچاری خۆی رادەستی سوپای سکۆتلەندی دەکا کە لە بـاکوور سـەربازگەی دانـابوو لەتەک حزبـی پەرلەمـان دەجەنگـی، سـکۆتلەندیەکان لە ١٤٦٥ پادشـا رادەسـت دوژمنەکـانی ( حزبـی پەرلەمـان ) دەکەنەوە، چـارلس بە دیلـی لە دورگەی وایت بۆ ماوەی دوو ساڵ دەمێنێتەوە.

لە پەرلەمان هەندێک ئەندام لایەنگری هێـورکردنەوەی دۆخەکـان بـوون داوایـان دەکـرد پادشا بگەڕێتەوە بەو مەرجەی ئەو بڕیارانەی لە بەرژەوەندی گەلدان جێبەجێیـان بکـا، بەلام کرومول سور بوو لەسەر نەگەڕانەوەی ، ناوی لێنابوو ( پیاوی خوێن ) و داوای دەکرد دوای دادگاییکردنی لە سێدارە بدرێ.

لە ٦ی سەپتەمبەر هێزێـک بە فەرمانـدەیی کۆلۆنیـل پرایـد بەسـەر پەرلەمانـدا دەدا و هەرچی لایەنگرانی پادشان وەدەریان دەنێ کە ١٤٣ ئەنـدام دەبـن، تەنهـا شەسـت ئەنـدام لە نێو پەرلەمان دەمێنـنەوە کە لە سەرسـەختترین دوژمنـانی چـارلس دەبـن. ( ئەم پاکسـازیە

بەناوی پاکسازی پراید ناونرا ). بەڵام لە روی یاساییەوە نوێنەرایەتی گەل ناکەن ئەم ژمارە، بەڵام هەرچۆنێکی هەبێ کاری خۆیان دەکرد. یەکەم بڕیاریان دادگایی کردنی چارلس بوو، رایانگەیاند کە ئەنجومەنی گشتی کە نوێنەرایەتی گەل دەکا و سەرچاوەی حوکمەکانە و بە ئیرادەی ئەوان دەسەڵاتی باڵایە لە وڵات ، پێویست بە پادشا یا ئەنجومەنی لۆردات ناکا تا خەسلەتی شەرعیەت بە بڕیارەکانمان بدا، هەر ئەوکات بڕیاریان دا دادگایەکی تایبەتی دامەزرێنن، ئەندامەکانی پێکهاتبوون لەو کەسانەی زۆر رقیان لە پادشا بوو، دادگاکە بە بڕیاری لەسێدارەدان دەردەچێ، لە ٣٠ی یەنیوەری حوکمی لەسێدارەدانی لە گۆڕەپانی هویت هۆل لەبەر دەمی کۆشکی پادشا لە لەندەن بەسەردا جێبەجێ دەکرێ و ملی دەپەڕێندرێ.

## کروموڵ و حکومەتی کۆماری:

لە دورگەکانی بەریتانی حکومەتێکی کۆماری هاتە راگەیاندن ناوینرا یەکێتی گەلانی بەریتانی Commonwealth ئەنجومەنی حکومەت راگەیەندرا کە ئینگلتەرا دەولەتێکی کۆماریی بێ پادشا و ئەنجومەنی لۆردەکانە، کروموڵ هەولیدا حکومەتێکی چاک پێکبێنێ و دەستورێکی گونجاو بۆ وڵات دانێ، لەگەڵ یاوەرانی ئەم حکومەتە ببەن بەرێوە کە ناویان نابوو (ئیدارەی حوکم) بەپێی دەستورەکەیان بەریتانیا ببوە دەوڵەتێکی کۆماری، بەڵام کروموڵ کە نازناوی پاسەوانی دەولەتی لەخۆ نابوو حوکمی پادشایەکی بێ تاجی دەکرد، هەندێک جار دەسەڵاتەکانی لەدەسەڵاتی چارلسی یەکەم زیاتر بوون.

سیستەمی پەرلەمانیی کۆن دووبارە گەرایەوە کە هەندێک جار دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو، پەیوەندیەکانی نێوان کروموڵ و پەرلەمان خۆش نەبوو، چونکە ئەندامانی بەرتیلیان وەردەگرت و پۆست و کارەکانیان بە خزم و دۆستانی خۆیان دەسپارد. کرۆموڵ لێیان پەست دەبێ و لە ١٦٥٣ بڕیاری هەلوەشاندنەوەی ئەنجومەن و هەڵبژاردنێکی نوێ دەدا، کاتێک ئەنجومەنە نوێکە کۆدەبێتەوە دیسان شکستەکانی وەدەر دەکەون، دووبارە ئەویشیان هەڵدەوەشێنێتەوە، لەوساوە دەسەڵاتەکان هەموو دەکەونە دەست کروموڵ ئەویش پشت ئەستور بە هێزی بەردەستی و توانای سیاسیی ماوەی پێنج ساڵ وەکو (پاسەوانی دەولەت) حوکمڕانی وڵات دەکات.

و: خالید هەرکی

هەرچەندە لە ناوەوە توشی هەندێک تەنگ و چەڵەمەو گرفت بۆوە بەڵام بۆ سیاسەتی دەرەوەی سەرکەوتوو دەبێ، هاوپەیمانی لەگەڵ فرەنسا بەست و هاوکاریی کردن لە شەرەکانی دژی ئیسپانیا، لە پای ئەو هاوکاریانە ئینگلتەرا بەندەری دنکر و دوورگەی جامایکا وەدەست دێنێ، کرومولیش لە ١٦٥٨ کۆچی دوایی دەکا.

## گەڕانەوەی پادشا:

دیاردەکانی لاوازی سیستەمی حکومرانیی دوای مردنی کرومول بەدەرکەوتن. وڵات لەو پەڕی پێویستیدا بوو بۆ کەسێکی بەتوانا و بەهێزی خاوەن پێگەیەکی مکوم تا بە زانایی وڵات ببات بەڕێوە و شان بداتە بەرباری قورسی. بەڵام ریچاردی کوڕی کە دوای خۆی پۆستی سەرۆککۆماری بۆ دەمێنێتەوە هەرچەندە کەسێکی نیان وحەزی لە چاکە بوو بەڵام لاواز بوو، نەیدەتوانی وەکو باوکی رووبەڕووی ئاستەنگەکان بێتەوە، تووشی چەندین کێشە و گرفتێ هات:

**یەکەمیان/** چاوتێبڕینی هەندێک لە فەرماندەکانی سوپا بۆ دەسەلات گرتنە دەست.

**دووەمیان /** کۆماریخوازەکان کە لە پۆستەکانیان بەردەوام دەبن چاویان لێبو لە رێگەی کودەتاوە دەسەلات بگرنە دەست.

**سێیەمیان/** پادشخوازەکان هەوڵی گەڕانەوەی خانەوادەی ستیواردیان دەدا بۆ وەرگرتنی دەسەڵات.

**چوارەمیان/** پارتە ئاینیەکان لە هەولی سەپاندنی پێڕەوی مەزهەبیاندا بوون .

ریچارد بە باشی زانی کە باشترین بژاردە بۆ دەرچون لەم گرفت و کێشانە دەست هەڵگرتنە لە پۆستەکەی و بۆئەوەی سوپا خۆی رەفتار بکا، بەهێز ترین فەرماندەی سوپای ئەوکات جەنەرال (مۆنک) Monk بوو، ئەو فەرماندە لەو کۆنەپارێزانە بوو کە مەیلی گەڕانەوەی پادشای هەبوو، نامەیەک بۆ چارلسی دووەم کوڕی چارلسی یەکەم دەنوسێ کە لە هۆڵەندا لە دورخراوەیی دەژیا تا بگەرێتەوە وڵات و تاجی پادشایەتی بنێتە سەر، ئەویش داواکەی قەبول دەکا، بەم شێوە کۆتایی بە سیستەمی کۆماری دێت و تاجی پادشایەتی دەدرێتەوە دەست خانەوادەی ستیوارت.

## چارلسی دووەم Charles II (١٦٦٠-١٦٨٥)

پادشا نوێکە وەکو باوکی ئارەزووی حوکمی رەها و پێداگری لە بۆچوونەکانی هەبوو. وێرای چارەنووسی باوکی کە بەهۆی ستەمکارییەوە بەم ئەنجامەی گەیشت کەچی خانەوادەی ستیوارت بەردەوام دەبن لە رەفتاری توندو ستەمکاری لە بەرێوە بردنی حوکمرانی، لەم میانە ئەوان هەولی ئەوەیان دەدا حوکمەکە بکەن بە ئوتوکراسیی کۆن.




بەڵام چارلی دووەم لە پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ پەرلەمان هەستیار بوو تا ئەنجامەکەی بە ئەنجامی باوکی نەگا، رەچاوی ئەوەی دەکرد توورەیان نەکا. نوێنەرای چینەکانی پەرلەمان لە دۆخی بیست ساڵ ەی رابردویان بێزار ببوون، بۆیە ئەو ئەنجومەنەی هەلبژێردرابون لە دوای هاتنەوەی چارلسی دووەم نیان و ئاشتی خواز بوون، خۆیان لە رووبەڕوو بوونەوە دەپاراست، بەو هۆیەوە ماوەی هەژدە ساڵ پرسی پەیوەندیەکان و حوکمڕانی، بە ئارامی بەڕێوە چوو، لەو ماوە پێویست نەکراوە پەرلەمان هەڵبوەشێندرێتەوە، لە هەمان کاتدا ئەندامانی پەرلەمانی ئەوکات ئامادە بوون هاوکاری کڵێسای فەرمیی وڵات بکەن، رەزامەندیان لەسەر چەندین یاسای دژ بە ( پوریتان ) دا ، گرنگترینیان یاسای یەکخستنی مەزهەبەکان بوو کە لە ساڵی ١٦٦٢ دەریانکرد تیایدا بڕیار درا قەشە دەبێ بڕوای بە هەموو ئەو دەقانە بێت کە لە کتابی سەڵەواتدا هاتوە ، بەپێچەوانە پۆستەکەی لە دەست دەدا.

پادشا چارلسی دووەم خۆی بەلای کڵێسای رۆمای کاسۆلیک دەشکایەوە. لەگەڵ کاسۆلیکەکان سیاسەتی لێبوردەی هەبوو. بۆیە خەڵک ترسیان لەوە هەبوو پادشا مەزهەبی کاسۆلیک بۆ وڵات بگێرێتەوە، بەو هۆیەوە پەرلەمان کە لەسەرەتای کارەکانیاندا هاوکاریان دەکرد ئێستا ترسیان لە سیاسەتی ئاینیی لێ پەیدا بوو. بەو هۆیەوە لە ساڵی ١٦٧٣ (

یاسای تاقیکردنەوە ( Test Act یان دەرکرد، تیایدا هەموو سەرۆک فەرمانگە و فەرمانبەرەکانی پابەند کرد کە لە بۆنە ئاینیەکان پێڕەوی مەزهەبی کڵێسای ئینگلیزی بکەن، قەدەغەکرا پۆست و کاری فەرمانبەری حکومی سڤیلی و سەربازی بە هیچ کەسێک بدرێ جگە لەوانەی پێڕەوی مەزهەبی کڵێسای ئینگلیزی دەکەن.

سیاسەتی چارلسی دووەم ئەوکاتە زیاتر بۆ رای گشتی روون دەبێتەوە کە لە ١٦٧٠ پەیماننامە لەگەڵ لویسی چواردەهەم واژۆ دەکا، بە پێێ ئەو پەیماننامە چارلس پشتگیری لە کڵێسای کاسۆلیک دەکا، لە بەرانبەردا لویسی چواردەهەم هاوکاری چارلس بکا لە شەڕە پێشبینی کراوەکانی لەگەڵ هۆڵەندا ،هاوکاری سەربازی و دارایی بکا لە هەر کێشە و شەڕێکی ناوەخۆ کە لە دژی هەڵدەگیرسێ، ئەگەر دەرفەتیش رەخسا ئەوا بچێتە ریز کڵێسای کاسۆلیکی رۆمانیەوە.

ئەوکات میللەت هەستی بەوە کرد کە پادشاکەیان سەروەری وڵات پێشێل دەکا. هەلسوکەوتەکان لاسایی حوکمی فەرەنسای کۆنی دەکردەوە کە دەسەڵاتێکی رەهای هەبێ و حوکمی کاسۆلیکی رۆمانی بە هاوکاری دەستی دەرەکی لە وڵات جێگیرکا.

## شۆڕشی ساڵی ١٦٨٨ :

چونکە چارلسی دووەم وارسی نەبوو دوای خۆی براکەی جەمسی دووەم دەبێتە پادشا لە (١٦٨٥-١٦٨٩) ، دیاربوو جەمس بۆ گەڕاندنەوەی مەزهەبی کاسۆلیک سور بوو، پێی وابوو هەرچیەکی تێبچێ دەبێ ئەم کارە ئەنجام بدا. جێگرتنەوەی جەمس مایەی مشتومڕ بوو، لە پەرلەمان هەندێکیان دژی پێدانی رەزامەندی بوون بە جەمس بۆیە داوایان کرد لە پەرلەمان لیستێکی قەدەغە لە ئەنجومەن دەربکرێ تا جەمس جێگرەوەی تاجی پادشایەتی وەدەست نەهێنێ. لە کاتی گفتوگۆکردنی ئەم پرسە ئەندامانی ئەنجومەن بەسەر دوو باڵدا دابەش دەبن، باڵێکیان رازین باڵێکیان دژ. ئەم جیاوازییە لە بۆچون بووە بنەمای دابەش بوونی سیاسیی پەرلەمان لەسەر بنەمای حزبایەتی، پارت (هویگ ) Whigs واتە (پارتی ئازادی) دادەمەزرێ ئەندامانی زۆربەیان پوریتانیست ( پاکسازی ) بوون، هەر ئەوانیش بوون کاتی خۆی پشتگیری شۆڕشی دژی چارلسی یەکەمیان کرد. پارتەکەی دیکە ( پارتی توری

Tories) بوو،ئەندامانی کۆنەپارێز بوون لایەنگری پادشایان دەکرد، زۆربەیان پیاوانی ئایینی و خانەدانان بوون، هەموویان بیرکردنەوەیەکی کۆنەپەرستانەیان سەبارەت بە دەسەڵاتەکانی پادشا و پرسەکانی دیکە هەبوو ، گوتەیەکیان هەبوو دەیان ووت: ( حوکمرانی پادشایەکی کاسۆلیکیی ستەمکار، باشترە لە گەڕانەوە بۆ دۆخی نائارامی و ئاژاوەیی ئەگەر پەرلەمان لە مافی ویراسی بێبەشکا )، بەڵام پارتی توری لە پەرلەمان ئەوەندە بەهێز نەبوو تا بتوانێ ڕێگری لەو یاسایە بکات، ئەنجومەنی لۆردەکان زۆرینەیان لەو پارتە بوون ئەوان توانیان ڕێگری لەو یاسایە بکەن و پادشا ڕزگارکەن.

هەرکە جەمسی دووەم لە ١٦٨٥ دەردەچێ، سەلمێندرا کە گەل متمانەی پێنەداوە، هەروەها متمانەی ئەو پارتەشی لەدەستدا کە لە ئەنجومەنی لۆردان پشتگیریی کرد و لەو هەلوێستە ناسکەی ڕزگار کرد. پادشا ڕکەی لەبن پەرلەماننا و لە دژی ئەوان بەرنامەی ( لێبوردەیی ئاینی) ی دەرکرد، کە ئەو یاسایانەی هەلوەشاندنەوە کە پێشتر لە دژی کاسۆلیک و دوژمنەکانی دیکەی پرۆتستانت دەرکراون، ژمارەیەک لە کەسانی کاسۆلیکی لە پۆستی سوپا دامەزارند، بەم کارەی هەردووک پارتەکە، توری و هویگ ی تورە کرد، پارتی توری لەوە دەترسا ئەگەر فەرماندەیی سوپا بکەوێتە دەست کەسانی کاسۆلیک ئەوکات سوپا دەکاتە چەکێک لە دژی کڵێسای ئینگلیزی ( ئینگلیکانی ) بەکار دێنێ. وەکو کرومول خۆی بەسەر پرسە داراییەکاندا دەسەپێنێ، پارتی ( هویگ ) لە پادشا پەست ببون لەوەی ڕیز لە دەسەڵاتی پەرلەمان ناگرێ و بێ سنوور هاوکاری کاسۆلیک دەکا.

تاقە ئومێدی خەڵک ئەوەبوو، جەمس بەتەمەن بوو، کچێکی پرۆتستانتیی هەبوو لە ژنەکەی یەکەمی بەڵکو ئەو دەبێتە جێگرەوەی، بە پێی یاسای ویراسەتی حوکم مافی یەکەم بۆ کوڕە ببێتە جێگرەوەی باوک بەڵام جەمس لە ژنە کاسۆلیکەکەی هیچ کوڕی نەبوو.

لەبەر دەم پەرلەمان هیچ چارەسەریەکی دیکە نەما جگەلەوەی بڕیاربدا پادشا خۆی و شازادەی لە دەسەڵات دوور خەنەوە و مافی پادشایەتی بە ( ماری )ی کچی بدەن، دیارە ئەندامانی هەردوو پارت لەسەر ئەم بیرۆکە ڕێک دەکەون، بەهۆی ئەوەی (ماری) هاوسەری ولیام ئورنجی حاکمی هۆڵەندا بوو، شاندێکی پرۆتستانت دەچێتە هۆڵەندا و داوا لە ولیام دەکا بێتە ئینگلتەرا بۆ وەرگرتنی تاجی پادشایەتی ینگلتەرا، ولیام و ماری داواکەیان

قەبول كرد چونكە پێیان وابوو ئەمە ئارەزوی گەلی بەریتانییە. لە ١٦٨٨ ولیام لە سەر خاكی ئینگلتەرا دادەبەزێ و خۆی و سوپاكەی بەرەو لەندەن هەلمەت دەبەن. گەلی پرۆتستانت هاوكاری و پشتگیریان لێی كرد ، سوپای جەمس هیچ بەرگرییەكی نەكرد و بە ناچاری رایكردە فرەنسا، ولیام توانیی بەسەر بەرهەڵستكارانی كاسۆلیك و سكۆتلەندی و ئیرلەندیەكاندا سەركەوێ.




ئینگلیزەكان ناویان لە شۆرشی ١٦٨٨ ی دژی خانەوادەی ستیوارت نا (شۆرشی نەمر) پێیان وابوو كە سەركەوتنێكی مەزنی دەستوری و سیاسی بوو بەم شۆرشە دەسەڵات

گەرایەوە دەست گەل، چونكە بە نوێنەرایەتی گەل پەرلەمان داوای ولیام و ماریان كرد تاجی بەریتانیا بنێنە سەر، بەراستی ئەو شۆرشە وای كرد ناوی گەل و دەسەڵاتەكانی بەرز بێتەوە و رۆلی پادشاكان كەم بكرێتەوە، دوای ئەو رووداوە هیچ كام لە پادشاكانی ئینگلتەرا زاتی ئەوەیان نەبوو بریارەكانی ئەنجومەنی نوێنەران بشكێنن.

## مانەفێستی مافەكا :

پەرلەمان لە ١٦٨٩ سەركەوتنەكانی خۆی بە راگەیاندنی ( مانەفێستی مافەكان ) Declaration of Rights رازاندەوە. تیایدا پێشێلیەكانی جەمسی دووەمی لەسەر مافەكانی گەل ئاماژە پێدا. مەرجی بۆ پادشای داهاتو دانا كە دەبێ رەچاوی ئەوە بكا بریارەكانیپەرلەمان رەت نەكاتەوە و لە خۆیەوە باج زیاد نەكا یا باجی نوێ بخاتە سەر كالا و هاولاتیان، یا بەبێ بریاری پەرلەمان سوپای تایبەتی دامەزرێنێ، زیندانی كردنی هاولاتیانیش بەبێ دادگایی كردنێكی یاسایی قەدەغەكرد. ماری و ولیام رەزامەندیان لەسەر

هەموو مەرجەکاندا کەلە مەنەفێستی مافەکاندا هاتبوون، ولیام بەناوی ولیامی سێیەم تاجی پادشایەتیی نایە سەر، لەراستیدا یاسای مافەکان لە روی پراکتیکیەوە خۆی دەستورێک بوو دەسەڵاتەکانی پادشایان سنووردار دەکرد و دەسەڵاتەکانی پەرلەمانیشیان دەپاراست.

دوای ئەوە چەند یاسایەکی دیکە دەرچون بۆ پاڵپشتی سیاسەتی نوێ. لەوانە یاسای لێبوردەیی ئاینی لە ١٦٨٩ بە پێێ ئەو یاسایە رێگە بە پرۆتستانتەکان دەدرێ ئەوانەی لە دەرەوەی سیستەمی کڵێسای ئینگلیکانین پێرەوی رێورەسمەکانی ئاینپەروەری خۆیان بە ئازادی بکەن، بەڵام رێگەیان پێنەدرا پیادەی ژیانی سیاسی و خزمەتی گشتی بکەن. هەروەها (یاسای یەکلاییکردنەوە)یان Act of Settlement لە ١٧٠١ دەرکرد. کە ناوەرۆکەکەی دەڵی نابێ کاسۆلیک تاجی پادشایەتی لە ئینگلتەرا بنێتە سەر بەم بڕیارەش رەچەلەکی جەمسی دووەم لە پادشایەتی ئینگلتەرا دوور دەکەونەوە، واتە دوای ولیام مافی تاج بۆ (ئان) ی خوشکی هاوسەری و کچی جەمسی دووەم دەبێ. چونکە ماری و ولیام هیچ منداڵیان لێ پاش نەکەوت.

دواجار (یاسای یەکێتی) یان دەرکرد بەپێی ئەو یاسایە سکۆتلەندا وئینگلتەرا دەبنە یەک دەولەت، ئینگلیزەکان سکۆتلەندیان بەوە تامەزرۆ کرد تا سیستەمی یەکێتی قەبول کەن گوایە لە پاشەڕۆژ سکۆتلەندا سود لەو خێرو داهاتەی ئینگلتەرا دەبینێ کە لە کۆلۆنیالەکانی بەدەست دێنێ، لەگەل سودی یاسای دەریاوانی و ئابوریی دیکەش. ئیتر لە ١٧٠٧ ەوە شانشینی یەککگرتوی بەریتانیای مەزن دادەمەزرێ و لەوکاتیشەوە دەستەواژەی (بەریتانی) لەسەر ئینگلیزی وسکۆتلەندی بەکار دێ.

## خەسلەتەکانی شۆڕشی ئینگلیزی:

ئاسەوارەکانی شۆڕشی ئینگلیزی کاریگەریەکی دوریان هەبوو، بە دیدی دونیا ئینگلیزەکان یەککگرو پێشکەوتووترین گەلانی دونیان لە حکومی دەستوریشدا دیرینترین گەل دەرچون. گەلێک لە نەتەوە و گەلانی دونیا پەندییان لە دەستوری ئەوان وەرگرت کە لە سەدەی حەڤدەهەم دەریان کردبوو.

و: خالید هەرکی

دەکرێ ئەنجامەکانی هەردووک شۆڕشی ئینگلیزی بەم شێوە کورت کەینەوە:

## ١/ ئەنجومەنە نوێنەراتیەکان:

بیرۆکەی دامەزارندنی ئەنجومەنی نوێنەران بۆ دەرکردنی یاسا و سەپاندنی باج و بڕیاردان لەسەر سیاسەتی دەوڵەت هی ئەوان بوو، کە پێشتر لەدەست پادشا و ئەنجومەنی وەزیران بوو.

## ٢/ چڕکردنەوەی ژیانی پەرلەمانتاری لە دوو ئەنجومەندا:

ژیانی پەرلەمانتاری لە ئینگلتەرا لە دوو ئەنجومەن کۆکرابونەوە:

ا) ئەنجومەنی لۆردەکان. کە نوێنەرایەتی ئۆرستوکراتەکانی ئینگلیزیان دەکرد.

ب) ئەنجومەنی گشتی، نوێنەرایەتی دیموکراسییەتی دەکرد بە جوانترین شێوازەکەی، ئینگلتەرا لە ڕوی دەستورەوە لە پێش هەموو دەولەتانەوە بوو، دەولەتان سودیان لە ئەزمونی ئەوان وەردەگرت وەکو فرەنسا، پرووسیا، ژاپۆن ، ئیتاڵیا، ئیسپانیا، میسر و هیتریش.

## ٣/ نوێنەراتیکردن لەسەر بنەمای بازنەی هەلبژاردن:

زۆربەی دەولەتانی دونیا لە ڕوی دابەش کردنی ئەندامانی پەرلەمان بەسەر بازنەی جوگرافی چاویان لە بەریتانیا کردووە، کاندید نوێنەرایەتی چینێک یا توێژێکی یا پارتێکی تایبەتی ناکات بەڵکو نوێنەرایەتی سەرجەم دانیشتوانی ئەو بازنە دەکات، کاتی خۆی ئەندامانی پەرلەمانی ئینگلتەرا نوێنەرایەتی چوار چینیان دەکرد:

١/ چینی ئۆرستوکراتیەتی دەرەبەگایەتی.

٢/ چینی پیاوانی ئاینی.

٣/ چینی مامناوەندی جووتیار.

٤/ چینی مامناوەندیی شارەکان ( بۆرژوا ) .

ئەنجومەنی لۆردەکان نوێنەری دوو چینەکەی یەکەم و دوەمیان تێدابوو. وردە بیرۆکەی نونەرایەتی چینەکان کاڵ دەبێتەوە، نوێنەری چینی مامناوەندی ( بۆرژوا ) لەو بازنەی خۆیان تیادا کاندید کردبوو نوێنەرایەتی هاوڵاتیانی خۆیان دەکرد چی لە شار یا لە گوند.

## ٤/ هۆشیاری سیاسیی مافەکانی تاک:

شۆرشەکانی ئینگلیزی بەتایبەت شۆرشی پیوریتانەکان کاریگەری زۆری لەسەر تاک هەبوو بۆ ناسینی مافەکانی سیاسیی خۆی، لە چەرخی ناوەڕاست ئەنجومەنی نوێنەران کە نوێنەرایەتی چینەکانی دەکرد بەرگریی لە چینەکەی خۆی دەکرد بۆ پاراست و وەدەست هێنانی مافەکانیان. بەڵام لە سەدەی حەڤدەهەم گیانی تاکگەرایی دەبووژێتەوە و دژی مافی نایابی چینەکان دەوەستێتەوە، لە هۆکارەکانی ئەو بوژانەوە ئەوەدەبێ کە شۆرشگێرانی چینی مامناوەندی کە بە ( سەرخڕەکان ) ناسرابون رقیان لە مافی بێبنەما و مافی تایبەتی دەبۆوە، ئەو مافەی چینی ئرستوکراتەکانی لەوان جیا دەکردەوە، بۆیە ئەم هەستە دەبێتە هاندەرێک بۆ نەهێشتنی جیاوازیەکان و داوای یەکسانی لە مافەکانی خۆیاندا دەکەن پێیان وابو هەموو تاکێک مافی خۆیەتی نوێنەری لەو ئەنجومەنەدا هەبێ کە یاسا دادەنێن بەتایبەت ئەم یاسایانە بەسەر خۆیاندا دەسەپێندرێن و دەبێ جێبەجێیان بکەن.

## ٥/ سیستەمی دوو حزبی: Two Party System

ئەم سیستەمە لە ئینگلتەرا ئەوکاتە دروست دەبێ کە لەسەردەمی چارلسی دووەم ئەندامانی پەرلەمان بەهۆی ( یاسای بێبەشکردن ) ەوە بەسەر دوو بۆچوندا دابەش دەبن، هەندێکیان لەگەڵ وهەندێکیان دژ ئەو یاسایە دەبن، لەوکاتەوە ئەم دوو بۆچوونە بوون بە دوو پارتی ( توری و هویگ ) یەکەمیان بە پارتی پارێزگار هاتە ناسین کە پشتگیریی لە

پادشا دەکرد و ئەویتریان بە پارتی ئازادیخوازهاتە ناسین. لە ئینگلتەرا ئەوانەی بە ژیانی پەرلەمانتاری سەرسامن دەڵێن نهێنی سەرکەوتنی ژیانی پەرلەمانتاریی ئینگلتەرا لە سیستەمی دوو پارتیدایە.

## ٦/سیستەمی ئەنجومەنی وەزیران: Cabonet system

سیستەمی بەڕێوەبردنی ئەنجومەنی وەزیران وەکو ئەنجامێکی ناراستەوخۆی شۆڕشەکانی بەریتانیە لە سەدەی حەڤدەهەم، پادشاکان کردبویانە نەریت هەندێک لە گەورە پیاوانی سیاسی بەتایبەت لە خانەدانەکانیان دەستبژێر دەکردن وەکو راوێژکاری خۆیان یارمەتیان دابان لە بەڕێوە بردنی کاروباری حکومەت، وەکو سەرپەرشتیکردنی دارایی و کاروباری جەنگ، بۆ راوێژ لەگەڵ پادشا کۆدەبوونەوە، بەر لە شۆڕشی ١٦٨٨ ئەندامانی ئەنجومەن لە کەسانی نزیک لە خۆیان پێک دەهێنا، راهاتبوون لەسەر ئەوەی سەرۆک پارتەکان کە لە نێو پەرلەمان زۆرینەیان هەیە بەلای خۆیاندا کێشکەن. لە ١٧١٤ جۆرجی یەکەم بە رەگەز ئەڵمانی و هاوسەری ( ئان )ی ئینگلیزی دەبێتە پادشای وڵات، پادشا زمانی ئینگلیزیی نەدەزانی ، بایەخێکی ئەوتۆی بە کاروباری وڵات نەدەدا بۆیە ئەنجومەنی وەزیرانی سەرفراز کردبوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات.

بەم شێوە سیستەمی حوکمڕانی دوو هەنگاو دەنێ:

**یەکەمیان/** پسپۆری لە ئیدارەی کاروباری گشتی.

**دووەمیان/** پشتبەستن لەسەر زۆرینە لە ئەنجومەنی گشتی.

دوای ئەوە لە چواریەکی دووەمی سەدەی هەژدەهەم هەنگاوێکی دیکەش دەنێ، ئەویش ( هەلبژاردنی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ) بوو.

## ٧/ پەرەسەندنی بیردۆزە سیاسییەکان:

بیردۆزەکانی جۆن لۆک John lock: دواجار شۆڕشەکانی ئینگلیزی کار دەکەنە سەر گەشە کردنی بیردۆزەکانی مافی سروشتی و سەروەری گەل، هەندێک لە نوسەرە بەناوبانگەکان لە لایەنگرانی شۆڕش بۆ لێکۆلینەوە لە سەر ڕەچەڵەک و ئەنجامەکانی کتابیان لەسەر ئەم بابەتە دانا ، لە بەناوبانگترینیان جۆن لۆک بوو. کە ڕاستەوخۆ دوای شۆڕش بابەتەکانی بڵاو دەکردنەوە، جۆن لۆک بەرهەڵستکاری حوکمی ئۆتۆکراسی بوو، باوکی لە سەرکردەکانی ( پوریتان ) ( پاکسازخوازەکان ) بوو کە لە دژی چارلسی یەکەم ڕاپەڕی. لە سەردەمی چارلسی دووەم و جەمسی دووەم جۆن لۆک ناچار دەبێ ڕابکاتە دەرەوە و ئاوارەی هۆڵەندا بێ، لە ١٦٨٨ لە سەردەمی ولیامی سێیەم کاتێک شۆڕش بەرپا دەبێ، دەتوانێ بگەڕێت ەوە ئینگلتەراو لە پۆستێکی حکومی دامەزرێ، توێژینەوەکانی چارەسەری بیردۆزە سیاسیەکانی کردن، کە شۆڕش لەسەر بنەمای ئەو بیردۆزانە هەڵگیرسابوو. لۆک شەیدای ماتماتیک بوو، دەیوت: هەموو کەسێک مافی سروشتی ژیان و ئازادی و خاوەندارێتیی هەیە. خەڵک حکومەتیان دامەزارندوە بۆ ئەوەی ئەم مافانە بپارێزن، ئەگەر حکومەت لە پاراستنیان شکستی هێنا، گەل مافی خۆیەتی دژی ئەو حکومەتە شۆڕش هەڵگیرسێنێ و حکومەت وەدەرنێ، کەواتە گەل خۆی گەورە و سەرۆکی ڕاستەقینەی هێزەیە کە پشتیوانی لە دەسەلات دەکا.

ئەمە بیردۆزی سەروەری مللییە، کاتێک ( گەل ) بریتی دەبێ لە کۆمەڵێک کەسی یەکسان لە مافەکانیان، کەوایە دەبێ زۆرینەی ئەم کەسانە حوکم لەسەر بڕیاردانی کارەکانیاندا بکەن. لەسەر ئەم بنەمایە دەڵێ چونکە ئامانجی حکومەتەکانی پاراستنی ئازادیی تاکە، مافی ئەوەی نیە دەست بخاتە نێو ئازادی ئاینیی هاوڵاتیانەوە ، لەم ئازادیە ئازادی بژاردەی کاسۆلیک و بێدینی بەدەرە . ڕێبازی لۆک لە ئەمریکا و فەرەنسا و شوێنی دیکە بڵاو دەبێتەوە، کرانە پاساوی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەمریکی تا ئەوکاتەی دەچەسپێ ئەوسا سەربەخۆیی ڕادەگەیەندرێ، لە شۆڕشی فەرەنسیش لە ١٧٨٩ پیاوانی شۆڕشگێڕ ئەم گوتەیان لە گوتارەکانیان دەوتەوە کاتێک بەسەر حوکمی ئوتوکراسییەوە دەیانخوێند، بە کۆی گشتی بیردۆزەکانی جۆن لۆک ببووە بنەمای زۆربەی دەستورەکانی دونیا.

و: خالید هەرکی

## دیموکراسییەت ئەنجامێکی راستەوخۆی شۆڕشەکانی ئینگلیزی نییە:

ئەمە مانای ئەوە نییە ئەو دیموکراسیەی ئێستا زۆربەی گەلانی دونیا پێڕەوی دەکەن لە ئەنجامی راستەوخۆی شۆڕشەکانی ئینگلتەرابێت. ئەم راستیە ئەوکاتە بۆمان دەرکەوت کە دیراسەی جۆری حکومەتەکانی ئینگلیزیی سەردەمی کۆتایی سەدەی حەڤدە و هەژدەهەممان کرد. واتە دوای کۆتایی هاتنی شۆڕشەکانی ئینگلتەرا.

پەرلەمانی ئینگلتەرا لە سەدەی هەژدەهەم پەرلەمانێکی دیموکراسی نەبو:

ئەنجومەنی لۆردەکان لە خانەدان و سەرۆکی یەکە ئاینیەکان پێکهاتبوو، حکومەت خۆی دایدەمەزاردن. ئەنجومەنی نوێنەرانی لەو نوێنەرانە پێکدەهات کە گەل هەلیدەبژاردن. بەڵام هەموو کەسێک مافی هەڵبژاردنی نەبوو، چینی هەژار بۆی نەبوو بەشداری لە هەلبژاردنەکاندا بکا، لە راستیدا خانەدانە دەوڵەمەندەکانی شار دەستیان بەسەر هەڵبژاردنی نوێنەرەکاندا گرتبوو، بەم هۆیەوە ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان لە مافی هەڵبژاردن بێبەش ببون، جگە لەوەش ژمارەیەکی زۆر لە شارە مەزنەکان نوێنەریان لە پەرلەمان نەبوو، بە کۆی گشتی پەرلەمان نوێنەرایەتی چینی باڵای دەکرد وەکو خانەدانەکان و گەورە مولکدارو بازرگانە دەولەمەندەکان.

## حکومەتی ئینگلیزی ئەرستوکراس بوو:

لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم حکومەتێکی (ئۆلیگارچی) (حکومەتی کەمینە) لە خانەدان و گەورە دەوڵەمەندەکانی حزبی (هویگ) پێکهات، بەرتیل دان و وەرگرتن و گەندەلی لە نێو سەرکردەکان تەشەنەی کردبوو، ئەوانەی بە دەمامکی نیشتمانپەروەری دەستیان بە دەسەڵات دەگەیشت یاساکانیان لە بەرژەوەندی توێژەکەی خۆیان دادەڕشت. بە نموونە گەورە مولکدار و دەرەبەگەکان یاسایەکیان بۆ دانرابو رێگەیان پێدەدرا بە

هەوەستی خۆیان گەنم و دانەوێڵە هەناردەی دەرەوە بکەن بەو هۆیەوە گرانی و قات و قڕی دەکەوێتە نێو میللەتەوە.

لەولاشەوە یاسایەکی دیکە لە بەرژەوەندی گەورە بازرگانەکان و خاوەن کارگەکان دانرا کە باجی هاوردەی کاڵا و کەرەستەی خاوی دروستکردن کەم کرابۆوە، بەم شێوە باجە قورسەکە چینی هەژار و زۆرینەی گەل دەیدا.

پوختەکەی ئەوەیە شۆرشی ئینگلیزی لەدژی حوکمی ئۆتوکراسی نابێتە مایەی دامەزراندنی سیستەمی دیموکراسی، بەڵکوو بوە مایەی بەرهەم هێنانی حکومەتێکی ئولیگارچی (کەمینە) لە خالک ناکا، بەڵام دەرهاوێشتەکانی بریتی بوون لە ژمارەیەک دەستور و بیردۆز کە بوونە بنەمای ئەو دیموکراسیەی لە سەدەکانی داهاتوو پیادە دەکرا. بەرهەمەکانی ئەو دیموکراسیەش بریتی بوون لە:

ا) سیستەمی نوێنەرایەتی گەل.

ب) بەرپرسیارێتی وزاری.

ج) سیستەمی دوو حزبی.

د) حوکمی زۆرینە.

ه) سیستەمی دابەشی بازنەیی لە هەڵبژاردنەکان.

و) بیردۆزی سەروەری میللی.

# بەشی سیانزەهەم

## دەرکەوتنی رووسیا

ئەورووپای کاسۆلیکی لە کەنارەکانی رۆژئاواوە درێژ دەبۆوە تا پۆلۆنیا. لەلای رۆژهەڵاتیشەوە میرنشینێکی مۆسکۆی تازە دامەزراو هەبوو، لەسەر مەزهەبی ئەرسەدۆکسی کە مەزهەبی باوی ئەوێ بوو، بە زمانێکی سلاڤیەوە. مێژووی ئەو میرنشینە بە روونی لە سەردەمی (ئیڤا)ی تۆقێنەر ( ١٤٦٢-١٥٠٥ ) بۆمان دەردەخا کە توانیبووی سەربەخۆیی خۆی لە ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلی رابگەیەنێ. ئیتر ئەوە سەرەتای سەرهەڵدان و دروستبوونی دەوڵەتێکی نوێ بووە.

ئەم میرنشینە کەوتبووە ناوەڕاستی بیابانێکی پان و بەرین هەم لەلای باکوور هەم باشوور هەم رۆژهەڵات و رۆژئاواشەوە پان و بەرین دەچوو. بە ئاسانی سنوورەکانت بۆ دیاری نەدەکرا بۆیە ئاسایی بوو لەگەڵ رەگەزی مەنگۆلی تێکەلاوی سروشتیان هەبێ.

کاتێک ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلی لە بێهێزیدا دەبێ سوێد دەبێتە دەوڵەتێکی بەهێز دەسەڵاتەکانی گەیشتبونە کەنارەکانی دەریای بەلتیق، لەولاشەوە پۆلۆنیا ببوە بەربەست لە بەردەم میرنشینی مۆسکۆ بۆ بەرفراوان بوون بەلای رۆژئاواوە. تورکە عوسمانییەکانیش ئەوکات لەوپەری بەهێزیدا بوون دەستیان بەسەر خانەکانی قەرەم و رێگەی دەریای رەش گرتبوو دۆخەکانیان لە روسەکان تێکدابوو، رووسەکان ناچار دەبن بەرەو رۆژهەلات هەڵکشێن.

روسەکان لە کارە داگیرکاریەکانیاندا لە رۆژهەلات تەنها سەرقالی داگیرکردنی خاک نەبوون بەڵکو کاری شارستانێتی فرە لایەنیان ئەنجام دەدا، کاتێک لە چیای ئۆرال پەرینەوە، چونە ناو سێبیریا، شاریان دروست دەکرد ئاوەدانیان بنیاد دەنا لەتەک ئەمانە کاری بازرگانیی سەرکەوتووشیان دەبرد بەرێوە.

ئەمانە بوونە مایەی بوژانەوەی وڵات لە رووی ماددییەوە، چونکە باکووری رووسیا بە بەرهەمی خوری و پێستی باش دەوڵەمەند بوو، سەرکێشە ئەورووپیەکان چاویان تێبڕیبوو

بۆیە بەجارێ روویان تێکرد، یەکەم کەس لەو سەرکێشانە کەسێکی ئینگلیز بوو بەناوی ریچارد چانسلەر Richard Chanceller کە لە رێگە بەندەری ئەرکانجلیی باکوورەوە هاتبوو. لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ کە رێگا کورتەکانی نێوان ئەوروپا و رووسیا بەکار نەدەهاتن.

پادشایەتی سوێدی هەستی بەو گەشە بەرفراوانییەی رووسیا دەکرد کە پانتاییەکەی وردە وردە مەزن دەبێ و نابێ ئەو دەرفەتەی پێبدرێ ئەوەندە فراوانبێ بگاتە شارستانیەتی ئەوروپا بۆئەوەی پێش نەکەوێ، لەهەمان کاتیشدا لەپێناو ئەوەی سوێد بتوانێ ئەو کەنارە درێژەی باشووری بەلتیق لەدەست خۆیدا بمێنی و بیپارێزێ.

هەرچی پۆلەندای کاسۆلیک بوو دژی رووسیای ئەرسەدۆکسی سلاڤی بوو،چاوی لە خاکی رووسیا بوو داگیریکا، ئەگەر بەراوردیەکی ئەوکاتی پۆلۆنیەکان بە روسەکان بکەین، دەبینین کە پۆلۆنیەکان لە روسەکان پێشکەوتوتر بوون بۆیە ببونە کۆسپ لەبەردەم گەیشتنی روسەکان بۆ ناوجەرگەی ئەوروپا، دەولەتی عوسمانیش لای ئەوان دوژمنێکی کۆنی ناشیرن بوو، نەک بەهۆی ناکۆکی ئاینییەوە بەڵکو چونکە عوسمانیەکان قوستەنتینیەی بارەگای بەتریرکی ئەرسەددۆکسیان داگیر کردبوو. ئەمە هۆکاری ئەوەبون بەردەوام هانی روسەکان بدا دژی تورکە عوسمانیەکان بن، دواتر ئەوە بە دوور دەزاندرا رێگایەک لە نێوان روسەکان و دەریای ناوەڕاست بکرێتەوە، بۆیە بەندەری ئەرکانجلی بۆ رووسەکان گرنگ بوو، تاقە دەرگای گەیشتنیان بوو بۆ ئەوروپا. بەڵام ئەم دەرگایە بەهۆی بەستەڵەکیەوە لە زستانان دادەخرا دەبوایە بەدوای ئاوێکی شیرتێندا بگەرێن بەڵام ئەمەش ئاسان نەبوو زوو نەدەهاتە دەست.

لەدوای (ئیڤا)ی تۆقێنەر وڵات دوچاری شەپۆلێکی ئاژاوەگێری و نائارامی هات، دۆخەکانیان پێ ئارام نەدەبۆوە تا کاتێک لە ١٦١٣ میرەکان ( میشێل رومانۆف ) بە پادشای وڵات هەڵدەبژێرن، میشێل ئەوکات منداڵێکی ( قەیسەریی ) دەبێ، بەڵام ئەو دەبێتە دامەزرێنەری خانەوادەی رۆمانۆف کە تا شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ حوکمی رووسیا دەکەن.

رۆژەکانی حوکمی رۆمانۆف سەخت بوون، دۆخی رووسیا لە دۆخی ئەوروپای کاتی هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی چارلسمان دەچو، خانەدانەکان خاوەن هێز بوون لە توانایاندا بوو خۆیان بەسەر قەیسەردا زال کەن، قەیسەر پێی وابوو دوارۆژی وڵات پێویستی بە حوکمێکی ناوەندیی بەهێز هەیە، چونکە ئەزمونی دەوڵەتی خاوەن پادشای لاوازو بێ دەسەڵاتیان لەبەر چاو بوو، پۆلەندا لە ژێر دەست و فەرمانی خانەدانەکاندا بوو، بەهۆی

و: خالید هەرکی

ململانێ و ناکۆکییەکانی نێوانیان وڵاتەکەیان لە بەینچوو، خانەوادەی رۆمانۆف بەباشیان زانی بۆ ئەوەی لەم جۆرە دۆخانە دووربن دەبێ دەسەڵاتەکان لەدەست قەیسەردا بن، بۆیە لە رووسیا پادشایەتییێکی رەها و ستەمکار دەبێ، لە شێوەی ئەو حوکمڕانییەی کە ئەورووپای نەتەوی لە ماوەی گواستنەوەی لە چەرخی ناوەڕاستەوە بۆ چەرخی رێنسانس پیشانی داین.

کڵێسای ئەرسەدۆکسی روسی زۆر لە دوای کڵێسای کاسۆلیکیدا بوو، دەسەڵاتداران لە ١٥٨٩ دوای ئەوەی کە بینیان پەتریرکی قوستەنتینیە لە رەفتارو کاروباری کڵێسایدا ئازاد نییە، بەهۆی ئەوەی کەوتۆتە ناوجەرگەی پایتەختی عوسمانیەکانەوە، پەتریرکێکی سەربەخۆیان لە رووسیا دامەزارند، ئەمە مانای ئەوە نیە کڵێسا خۆی لە پشت دیواری مەزهەبی حەشار داوە بەلکو بۆ پێداچونەوە بوو بە کارەکانیدا تا توانای گەیاندنی پەیامەکانی هەر بمێنێ. بواری چاکسازی کڵێسایی ئەوکات لە رووسیا فرە رەخسا بوو، ئەمە پاش ئەوەی پیاوانی ئاینی دەکەونە دوای ئارەزوە تایبەتیەکانی خۆیان کە بە دیدی هەندێک لە پیاوانی ئاینی دەرچونبوە لە ئاینی مەسیحی.

ئەو دانە ئنجیلەی بەردەستیان کە دەستکاری کرابوو دەستیان پێیەوە گرت و پاراستیان، بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم پیاوانی ئاینی لە کڵێسای ئەرسەدۆکس پێیان وابوو کاتەکەی هاتووە ئیتر چاوێک بەو هەلانەدا بخشێندرێنەوە.

چاکسازانی ئاینی دەستیان کرد بە راست کردنەوەی ئەو هەلانەی کە پێیان وابوە دورن لە راستی ئنجیل و مەسیح، بەڵام ئەم چاکسازیەش وەکو هەموو چاکسازیەکانی دیکە توشی ناڕەزایی و دژایەتی دەبێتەوە لەلایەن ئەو کەسانەی قالببەستوی نەریتی کۆنن کە هەمیشە دژی هەر گۆڕانکاری و نوێکاریەکن، بۆیە دەستیان بە نەریتە کۆنەکەدا گرتوە و هەر گۆڕانکاری و راستکردنەوەیەک رەت دەکەنەوە.ژمارەیەکی زۆری ووردە پیاوانی ئاینی دژی ئەم چاکسازیە بون پێیان وابو ئەمە دژی ئاینی مەسیحە. دیارە ئاسایی بو پیاوە ئاینیەکان سەر بۆ داخوازیەکانی جووتیار دا بنوێنن و بە هەوەستی ئەوان دژایەتی ئەو چاکسازیە بکەن و خەڵکیان لێ بوروژێنن، چکسازخوازەکان ناچار دەبن روو لە حکومەت و بەکارهێنانی هێز دەکەن، بەلام ئەم چاکسازیانە و شێوازی جێبەجێ کردنیان دەرهاوێشتەی مەترسیداریان دەبێ چونکە ئەم رەفتارانە شۆڕشیان بە بیر جووتیاردا هێنایەوە.

جووتیاران پاساوی زۆریان بەدەستەوە بوو بۆئەوەی دژی حکومەت و گەورە دەرەبەگ و خانەدانەکان راپەڕن. گەورە مولکدار و خانەدانانەکان پشتیان بە داهاتەکانیانەوە ئەستور بوو هەرچەندی داهاتیان زیادی دەکرد جووتیارەکان زیاتر بێدەرامەت و بێتوانا دەبوون و

ئاستی بژێویان دادەبەزی، هەرکاتەی دەرفەت بۆ جووتیارەکان برەخسابا دژی حکومەت و گەورە دەرەبەگەکان رادەپەرین، بەلاّم حکومەت و خانەدان و گەورە مولکدارەکان بە توندی گورزیان لێدەوەشاندن بە زەویەکانیانەوە پابەند دەکردن و دەیان بەستنەوە تا وەکو کۆیلە لەسەر زەویەکان بمێننەوە بێ دەسەلاّت و جولە و ببنە کالاّ بەدەست مولکدارەکانەوە.

لەو ماوەی ولاّت توشی ئاژاوە و پشێوی ببو جووتیارەکان ئەو دەرفەتەیان بۆ دەرەخسا لەدەستیان رابکەن و بۆخۆیان ئازاد بن ،بەو هۆیەوە بەرهەمەکانیان تووشی دابەزین و دارمان دەبوو، بەپێی ئەو هزرو بیرکردنەوانەی ئەوکات چارەسەری هەر ئەوە بوو جووتیارەکان بە زۆر ناچارکەن بێنەوە سەر زەویەکان و بە کۆت و بەندی توندتر بیانبەستنەوە.

بۆیە یاسایەک دەرکرا ماف بە گەورە دەرەبەگ و خانەدانەکان درا هەر جووتیارێک لەدەستیان رابکات ئەگەر ماوەی پانزە ساڵیشی بەسەردا تێبپەرێ دەتوانن بەزۆر بیانگێرنەوە سەر زەویەکان و وەکو کۆیلەی جاران مامەلەیان لەگەڵدا بکەن، بەم شێوە راکردنی جووتیار لەدەست ئاغاکەی بوو بە راپەرین و شۆرش لە دژی ئەو سیستەمە کە دەبوایە تا مردن بە کۆیلایەتی لای بمێنێتەوە، ئیتر هیچ دەرچونێک بۆ جووتیارە کۆیلەکان نەمایەوە جگە لە شۆرش و راپەرین نەبێ.

لەم جۆرە دۆخە و لە ولاّتێکی فرە جەمسەر دەکرا گروپێکی مەزن لە جووتیاران پێکبهێندرێ و چەکداریان کەن و لەژێر فەرماندەیەکدا بەرگری لە بەرەژوەندیەکانیان بکرێ، (ستیڤان رازین) Stephan Razin لە بەناوبانگترین سەرکردەی جووتیارەکان بوو کە شۆرشێکی سەرتاسەریی مەزنی راگەیاند.

شۆرشی جووتیاران بە فەرماندەیی ستیڤان رازین بە دیدی هەندێک لە مێژوو نوسان شۆرشێکی چینایەتی بوو، ئامانجی کۆکردنەوەی تواناکانی جووتیار بوو دژی مولکدارو خانەدانەکان. هەر بە راستیش شۆرشێک بوو بۆ رزگار کردنی جووتیارەکان لە ستەم و کۆیلایەتی. بەلاّم زیاتر ئامانجی دەسەلاّت بوو لەوەی هەولی رێکخستنەوەی کۆمەلگا بێ هەروەکو ئەوەی لە دوای شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ رووی دا.

هەرچۆنێکی بێ شۆرشێکی سەرتاسەری بوو، توانیی زەویی زۆر لە دەرەبەگ و خانەدانەکان ببەزێنێ، دەستی بەسەر گەلێک شاردا گرت بەلاّم شۆرشێک نەبوو بتوانێ سیستەمێکی نوێ بخولقێنێ تا بتوانێ بەرهەڵستی دژە شۆرشەکان بکا، چونکە هێزە کانی

و: خالید هەرکی

دژە جووتیار ڕێکخراوتر بوون لە سەروی هەموویانەوە سوپای دەوڵەت، کە ئەوەندە نابا شۆڕش لاواز دەکا و سەرکردەکەی دەکەوێتە دەست دوژمنانی و لە ١٦٧١ لە سێدارە دەدرێ.

ئەم ڕووداوانە بەر لە هاتنی بەتروس ( پیتەر ) لە ١٦٨٢ بۆ سەر حوکمی رووسیا بە چەند ساڵێک روو دەدەن، ئەمە یەکێک دەبێ لەو هۆکارانەی لە سەردەمی ئەو ئارام و بێ ئاژاوە دەبێ، ئەمەش بۆ ئەو دەبێتە دەرفەتێک تا چاوێک بە سیستەمی دەوڵەتدا بخشێنێ و بۆ ئاستی سەردەم بەرزیکاتەوە.




بەتروس یا پیتەری مەزن Peter the Great سەرەتا بەتەنیایی حوکمی نەدەکرد، چونکە منداڵێک بوو بە هاوشانی براکەی حوکمڕانیان دەکرد بە پێسپێردراوی سوفیای خوشکی، بەڵام ئەو منداڵە چاوتێبڕ بوو، براکەی هزر لاواز و کەم ئەقڵ بوو، هەرکە تەمەنی دەبێتە حەڤدە ساڵ خوشکی وەلا دەنێ و بەتەنیایی حوکم دەگێڕی و خوشکی دەنێرێتە کڵێسایەک.

پەتروس کە بە هەرەمەزن ناونرا یەکێک دەبێ لە دامەزرێنەرانی دەولەت، بەڵام وەکو هەموو دامەزرێنەرانی دیکە زۆر دەستی بە سەر هەموو دەسەڵاتەکاندا گرتبوو. دیارە ئەمە سروشتی گۆڕانکاریی ئەو سەردەم بووە، دامەزرێنەرانی دەوڵەت پێویستیان بە دەسەڵاتی ئاورتە هەیە تا بتوانن بەسەر قۆناغی گواستنەوەدا زاڵبن، هزر و بیرەکان نوێن، نارازیەکان زۆرن، گرفتەکان هەندێکیان مەزندەکراون هەندێکیشیان مەزندەکراو نین کتوپڕ و لەناکاون، بۆ پاراستنی دەسکەوتەکان پێویست دەکا بە دەستێکی توند ڕووبەڕووی هەموو دۆخەکان ببیتەوە، بەڵام پەتروسی هەرەمەزن لە پادشا ئەوروپیەکانی ئەوکات زیاتر پیادەی حوکمی رەهای دەکرد.

هیچ دەزگایەکی ئەوتۆی بەهێز نەبوو لە حوکمڕانی بەشداریی لەگەڵدا بکا یا بڕیارەکانی بەسەردا بسەپێنێ، ئەنجومەنی دوما ( پەرلەمان ) یەکی لاواز هەبوو وەکو ئەنجومەنی نیشتمانی وابوو.

یەکەمیان تەنها ئەنجومەنێک بوو لە گەورە راوێژکارەکانی قەیسەر پێکهاتبوو، دووەمیشیان لە ئەنجومەنێکی خانەدان و گەورە مولکدارەکانی هەموو ولایەتەکان دەچو، بەهێز بوونەوەی تزاری ( قەیسەری ) واتە لاواز بوونی ئەم ئەنجومەنانە.

دواتر پەتروس لە زاڵ بوو بەسەر ( ئەنجومەنی دوما )و ( ئەنجومەنی نیشتمانی ) دا سەرکەوتو بوو. ئەوەی لەم میانە مایەوە کرا بە ئەنجوەنی پیران بەڵام ئەم ئەنجومەنەش بە فەرمانی پەتروس دەجولایەوە، ئەرکی ئەو ئەنجومەنە جێبەجی کردنی فەرمانەکانی قەیسەر بوو، روونتر بلێێن دەزگاکانی ناوەخۆ لەژێر دەستیدا بوو.

بەهەمان شێوە پەتروس (پیتەر) Peter کاری لەسەر زال بون بەسەر کڵێسادا کرد، بەتایبەت لەروی تێخستنی شارستانیەتی رۆژئاوا هەولی دەدا، پێی وابوو ئەم بەرهەلستیەی کڵێسا نیشانەی دواکەوتوییە، بۆیە بڕیاریدا دەست بەسەر ئاڕاستەکانی کڵێسادا بگرێ و بیکاتە ئامێرێک بەهەوەستی خۆی جولەی پێبکا، هەلی مردنی بەتریرکی قۆستەوە دوای ئەو هیچ بەتریرکێکی دانەمەزارند، دواتر کڵێسای خستە ژێر سەرپەرشتی لیژنەیەک لە ئەسقوفەکان، چاودرێژێکیشی لەلایەن حکومەتەوە لەسەر دانا بۆ چاودێری کارەکانی کڵێسا. ئەوەندە نابا تزاری ( قەیسەر ) خۆی لە لووتکەی کڵێسا دەبینێتەوە.

تساری ( قەیسەر ) بەوەی دەزانی کە رووسیا لە هەموو روێکەوە لە دەولەتانی ئەروپی پاشکەتووترە، ئاستی بیرکرندەوە و هزری ئەوروپیی دەبینی کە چەند لە بیرکردنەوە و هزری روسی پێشکەتووترە، ئاستی پیشەسازی و دورستکاری سوپایی وکەشتی و بازرگانی و هەموو بوارەکانی دیکەی ئەوروپای لەبەر چاو بوو کە پێی وابو لە هەموو ورێکەوە ئەوروپا لە پێش رووسیادایە، دڵنیا بوو لەوەی ئەو پێشکەوتنەی ئەوروپا بەتایبەت لە روی چەک و ئامێری سەربازیەوە رووسیا پێویستیی زۆری پێیە بۆ خۆپاراستن لەو دەولەتە بەهێزانەی دەوریان داوە، بەتایبەت ئەو دەشتاییانەی دەکەونە نێوان سنوورەکانی ئەو لە رۆژهەڵاتی دوورو ئەوروپا، ئێستا، نە لە توانایدایە لەگەڵ ئەوروپا بەشداری لە پێشکەوتنەکاندا بکا نەدەتوانێ بگاتە سەر دەریای بەلتیق و دەریای رەش.

و: خالید هەرکی

رووسیا بۆ نوێبوونەوەی ناوەخۆی پێویستی بە پرۆسەیەکی نوێبوونەوەی بەردەوامی هەبوو تا بتوانێ سیاسەتەکانی دەرەوەی لەسەر ئەو بنەمایە ببا بەرێوە، پەتروسی هەرەمەزن کەوتە ژێر هەژموونی بەرز کردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنان دەبوایە لە پێناو زیندووبوونەوەی ئاستی سوپا هەولی جدی بدا، مەرج نیە بەرزکردنەوەی ئاستی سوپا لە رێگەی بەرزکردنەوەی کوالێتی چەکەوە بکرێ بەڵکو دەکرێ لە رێگەی بەرز کردنەوەی ئاستی هزری و بیرکردنەوەی ئەفسەرو سەربازەکان ومۆرالیانەوە بکرێ.

پەتروسی هەرەمەزن سور بوو لەسەر ئەوەی شارستانیەتی ئەوروپا بگوازێتەوە رووسیا، دیارە ئەو خۆی لە نێو گۆمی کەشتییەکانی ئەمستردام و کۆشکی پادشاکانی ئەوروپا ژیاوە، ئیتر لە ئەوروپاوە بە هەزاران دەسترەنگین دەهێنیتە رووسیا لە هەموو بوارەکانی شارستانێتی ئەوروپی کاریان پێدەکا. زۆر بایەخی بە دروست کردنی سوپایەکی بەهێز دا تا ئەو گەمارۆیە بشکێنێ کە سوێد وپۆلۆنیا و تورکە عوسمانیەکان خستویانەتە سەریان.

ئەم جۆرە گۆڕانکارییە مەزنانە لە بوارەکانی جیای دەولەت پێویستی بە سەرمایەیەکی باش هەبوو، پێێ وابو گەل دەبێ ئەو سەرمایە پەیدا بکا کە پەیوەستە بە بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانیان، بۆیە باجی خستنبوە سەر هەموو شتێک تەنانەت سەر هەندێک شتی سەیر، بارە قورسەکەی ئەو باجانەش کەوتبوە سەرشانی جووتیارەکان چونکە ئەوان باری ژیانیان سەقامگیرتر و بەر دەستتر بوو لە توێژەکانی دیکە و لەلایەکی دیکەش لەبەر دەستی حکومەتدا بوون، ئیتر کۆت و بەندی سەر جووتیار و کۆیلەکان زۆر دەبن.

لە بواری بازرگانیشەوە هەموو دەرگاکانی کردنەوە ، بە پیادە کردنی ئەو بیردۆزەی پێی دەگوترێ ( مەرکانتیلیسم Mercantilism) ئەم بیردۆزە لەسەر بنەمای ئەوە دانراوە کە بازرگانی لە خزمەتی دەولەتدا بێ، بە شێوەیەک هەناردە زیاد بکرێ تا دوا ئاستی توانست و لە داهات گەلێک زیاتر بێ. بۆیە پەتروس بایەخی بە بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنانی پیشەسازی دەدا، سەرمایەدارانی خۆجێیی توانیان هاوکاری حکومەت بکەن لە دامەزراندنی کۆمپانایی زەبەلاحی بەرهەمهێنان، تا وایلێهات بەهۆی کەشتیە بازرگانیەکانی روسی ئاستی هەناردە گەلێک بەرز دەبێتەوە.

تەنانەت لە میانی داهێنانی پیشەسازیی نوێ دەرفەتێک بۆ جووتیارەکان رەخسا خۆیان لە کۆیلایەتی رزگار کەن و بچنە کارگەکان، بەڵام ئەم دەرفەتە بوارێکی وای نەخولقاند چونکە کۆیلەکان لە کارگە و کانزاکان دەبنە کرێکاری کۆیلە. ئەمە خەراپترین شێواز یا پرۆسەی گۆڕانکاری و نوێبونەوە بوو لە رووسیا لە سەردەمی پەتروسدا.

لە بـواری سیاسـەتی دەرەوەیـدا یەکەم هەنگـاو و بایەخیـان بە ئاراسـتەی تـورکە عوسمانیەکاندا بوو کە بەسەر کەنارەکانی دەریای ڕەشدا زاڵ بـوون. دوای لەسـەرنانی تـاجی پادشایەتی دەرفەتێکی باشی بـۆ دەرەخسـێ کە ئمپراتـۆریەتی ڕۆمـانی لەگەڵ عوسـمانیەکان دەیانبێتە شەڕ، جەنگ لەسەر عوسمانیەکان رادەگەیەندرێ و لەم میانە ( ئـازوف Azou ) ی دەست دەکەوێ.

بە شێوەیەکی گشتی ئەو بەرانەی جەنگ کە پەتروسی هەرەمەزن لێـی دەجەنگا بریتـی بوون لە:

١/ بەرەی جەنگی سویدی، لە مەترسیدارترین بەرەکانی جەنگ بوو بۆ چارەنووسی پەتروس.

٢/ بەرەی جەنگی پۆلۆنی، بەرەیەکی لاواز بوو بەڵام دەرفەتی بۆ وڵاتانی دیـکە دەرەخسـاند تا لەسەر حسابی پۆلۆنیا بەرفراوانبن و دواتریش بۆ رووسیا دەبنە مەترسی.

٣/ بەرەی جەنگـی تـورکە عوسـمانیەکان، ئەم بەرە تەنهـا سـنووری هاوبەشـەکانی روسـی و دەوڵەتـی عوسـمانیی نەدەگـرتەوە بەڵکـو لە هەمـوو ئەو شـوێنانە بـوو کە ململانێـی بەرفراوانـی نێـوان قەیسـەرو سـولتانی عوسـمانیدا هەبـوون بـۆ داگیرکردنـی زەویـی ئیمپراتۆریەتی خانەوادەی سەفەویی فارسیی لەناوچوو.

کێشـەی سـوێد لەگەڵ کێشـەی پۆلۆنیـا تێکهەڵکێشـیان هەبـوو، پۆڵەنـدا کاسـۆلیک مەزهەبێکـی لاواز بـوو، دراوسـێکانی چاویـان تێـی بڕیبـو، ئەوەی حـوکمی پۆلەنـدای دەکـرد پادشایەکی بەرەگەز سوێدی بوو بەناوی ( ڤاسکا Vasca ) . بەڵام ئەو پادشـایە پێـڕەوی کاسۆلیکیی دەکرد و تـا ئەوکـاتیش داوای مـافی پادشـایەتی سـوێدی دەکـرد کە خـانەوادەی ڤاسـکا بـوو، بە بـڕوای خـۆی مەبەسـتی بـوو ( بیروبـڕوای خواوەنـدی بـۆ سـوێد بگێـڕێتەوە) پادشاکانی سـوێدیش هەر لە (گوسـتاڤ ئەدولـف)ەوە دژایەتـی ئەم خـانەوادە کاسـۆلیکەیان دەکرد و داوای پۆلەندایان دەکرد.

بەڵکـو پادشـاکانی سـوێد بیانتوانیـایە ئامانجەکانیـان بێنـنەدی ئەگەر ئیمپراتـۆریەتی ڕۆمانیی پیرۆز (ئیمپراتۆریەتی نەمسایی) دەسـتی نەخسـتبایەتە نیویـان بـۆ ڕزگـاری کردنـی پۆلەنـدای کاسـۆلیک لە چنـگ پرۆسـتاتانتەکانی بـاکوور. ئیتـر ڕق و کینەکـان بە شـاراوەیی دەمێننەوە لە چاوەڕوانی خولقـانی دەرفەتێکـدا دەبـن ، تـا لە ١٧٠٠ کاتێـک چارلسـی دووەم دەچێتە سەر تەختی پادشایەتی سوێد زۆر بە هێزەوە ئومێدەکان دەژیێنێتەوە.

و: خالید هەرکی

چارلسی دوانزەهەم گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو تا ئاستی شێتی بەخۆیەوە دەنازی، چونکە لە ئەڵمانیا چەند سەرکەوتنێکی بەسەر دوژمنەکانیدا وەدەست هێنابوو ئیتر بڕوای بە توانای خۆی هەبو کە دوژمن دەبەزێنێ و زەلیلی دەکا. پێی وابو ئەو سوپایەی لەبەر دەستیدایە کە ناوە ناوە پێی لە ئەڵمانیا و پۆلەندا دەدا سوپای رووس دەبەزێنێ، ئەو سوپایەی پەترۆسی مەزن بە ژمارەیەکی زۆر پێکی هێناوە تا لە دژی سوپای سوێد کە بۆتە سوپایەکی پێهەلگوتە ، شەڕی پێبکا.

ئەو هێزانەی لەبەردەم سوپای سوێد شکستیان هێنابوو بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕان تا لە دژی سوێد هاوپەیمانێتیەک ببەستن، کاتێک لە ١٦٩٧ پادشای سوێد دەمرێ، پەتروس لەگەڵ هەریەک لە دانیمارک و پۆلەندا لە دژی سوێد هاوپەیمانی دەبەستێ، بەڵام خۆیان لەبەردەم پادشایەکی بەهێز بینیەوە کە توانیی مەیدانی شەڕ بگواستەوە ناوجەرگەی وڵاتەکانیان. بەسەر دانیمارک و میرەکەی ساکسونیدا زاڵ دەبێ، کە دواتر بە سوپای پەترۆسی مەزن دەگات.

سوپای پەترۆسی مەزن سوپایەکی زەبەلاح بوو چوارجار بەقەدەر سوپای سوێد دەبوو. بەڵام سوپای سوێد لە سەرکەوتن دڵنیا بوون، چونکە خاوەنی فەرماندەیەکی بە توانا و بەجەرگ بوو، ئەم ئەزمونە بۆ پەترۆسی مەزن سەخت بوو، دواجار سوپای چارلسی دوانزەهەم لە مەیدانی جەنگ لە ( ناڤارا Navara ) لە نۆڤەمبەری ١٧٠٠ بەسەر سوپای روسیدا زاڵ دەبێ.

لە راستیدا پەترۆسی هەرەمەزن بەر لە شەڕی ناڤارا هەندێک دەستکاری و چاکسازیی لە سوپاکەیدا کردبوو بەڵام دوای ئەو شەڕە دەستیدایە دامەزراندنی سوپایەکی سەردەمیانە، بەڵام پێویستی بە کات هەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو نوێکارییە و دامەزراندنی سوپایەکی نوێی هاوچەرخ. چارلسی دوانزەهەم ئەو دەرفەتەی پێدا تا خۆی نوێکاتەوە.

گومانەکان بۆ ئەوە دەچون کە چارلسی دوانزەهەم بە بەڕێوەبردنی حوکم لە پۆلۆنیا ماندوو بوە بەڵکو پرسی روسەکان پشتگوێ ب خا، ئەو سوکایەتیی بە روس و قەیسەرەکەی دەکرد و حسابێکی کەمی بۆ دەکردن، ئەمە مەزنترین هەلەی چارلسی دوانزەهەم بوو تێیکەوت.

پەترۆسی هەرەمەزن ئەم هەلە دەقۆستەوە لەسەر بنەمایەک مکوم بینای سوپاکەی دەکاتەوە، فەرماندایەتیی بە کەسێکی بەتوانا دەسپێرێ ئەویش فەرماندەی زانا ( شرمتیف

Sheremetief) بوو، ئەم فەرماندە ئەرکی گرتنەوەی بەلتیقی گرتە ئەستۆ کە لەدەست پادشـای سـوێددا بـوو، دوای ئەوەی چـارلس کێشـەکانی لەگەڵ پۆلۆنیـا و ساکسـۆنیا و ئیمپراتـۆریەتی نەمسـایی یەکلایـی کـردەوە بەرنـامەیەکی لە دژی رووسیا داڕشـت و خسـتیە بەردەست بۆ جێبەجێکردن.

چارلسـی دوانـزەهەم هێرشـی کردەسـەر رووسـیا و چـوە نـاو خـاکەکەیەوە. ئەمە لە بەرژەوەندی پەتروسدا بوو بەڵکو هەر خۆی سوپای سوێدی کێش کردوەتە ناو رووسـیا، هەر لە دوری رێگاوە تا هاتنی سەرما و سۆل کە سەرمایەکی بێ وێنە بوو لەگەڵ چەند دۆخێکی دیکە هەموویان لە بەرژەوەندی پتروسی هەرە مەزندا بوون.

لە پۆلتاڤا Poltava ) شەڕ لەگەڵ سوپای سوێدی بەرپا بـوو، سـوپای سـوێدی بە شێوەیەک دەبەزێ و پەرش و بلاو دەبێتەوە کە تەنها چەنـد سـەد کەسـێک لەگەڵ چارلسـی دوانزەهەم دەمێننەوە بەو چەند کەسەوە رادەکاتە  ناو خاکی تورکە عوسمانیەکان.

ئەم سەرکەوتنە مەزنە دەراگاکانی بەرووی پەتروسی مەزندا کردنەوە، لەدوای ئەو شەڕە روسەکان متمانەیان بەخۆوە بوو کە رووبەڕووی مەزنترین سوپای دونیا ببنەوە، لەدوای ئەوە سوپای روسی بەرە و  بومیرانیای ئەڵمانیـا هەلـمەت دەبـات تـا لەوێشـەوە بەرەو سـتۆکهۆلم هێرش ببـا. پەتـروس لەگەڵ پرووسـیا هاوپەیمـانی دەبەسـتێ، ئەویـش ئەو دەرفەتە بە هەل دەزانێ تا لەسەر حسـابی سـوێد خـاکی زیـاتر داگیرکـا. هەروەهـا پەتروسـیش لە ئاراسـتەی (لیڤونیـا)وە لە بەشـێکی رۆژهەلاتـیەوە لە فینلەنـدای ئێسـتا فراوانـی بەدەسـت دێنـێ، بەم فراوان بوونە دەگاتە لێوار کەنارەکانی دەریای بەلتیق.

ئەم سـەرکەوتنانە کاتێـک بەدەسـت دێـن کە دروسـتکردنی پـایتەختە نـوێکە ( سـان پێـتروس بـورگ ) بەرێـوە دەچـوو ئەو پـایتەختەش دەبێـتە پەنـجەرەیەی رووسـی بە رووی رۆژئاواوە و یەکێک لە شارە هەرە مەزنەکانی دونیا.

سەبارەت بە خاکی فارسەکان ئومێدی مەزنی پەتروس بـوو لەسـەر مـافی ئەوان لەروی قەواقازی فارسەکان و جۆرجیاوە دەستی بەو ناوچەیە بگا و دەریای قەزوین بکـاتە مەیـدانی دەریـاوانیی روسـی. وا رێکـکەوت فارسـەکان بەدەسـت هێرشـی ئەفغانیەکـان و ململانێـی هێزەکانیـان لەسـەر دەسـەڵات گرتنەدەسـت گیریـان خواردبـوو، میـر مەحمـودی ئەفغـانی لە ١٧٢٢دەسەڵاتی لە شا حسێنی سەفەوی ( شای شـەرعیی)ی وڵات زەوت کردبـوو. پەتـروس

خۆی لە داننان بە میر مەحمودی ئەفغانی دوور دەخستەوە، بالوێزی خۆی بۆلای شا حسێن نارد.

رووسەکان وایان بلاوکردەوە کە ناردنی بالوێز بۆلای شا حسین بەمەبەستی قەرەبوی زیانلێکەوتوانی کاروانیانی روسی بووە کە لەسەر دەستی خان ( خیوە ) ی سەربە ئێرانیەکان لێیان کەوتوە. بەڵام مەبەستە راستە قینەکە بۆ لەمەرام گەیشتنی فارسەکان بوو وەکو دەستپێکی کارێکی سەربازیی دژ بە ئەوان.

هەر لە رێگەی ئەو بالوێزخانەیەوە روسەکان لە ئاستی هۆشیاری میر مەحمود گەیشتن کە کەسێکی بێئاگا و نەزانە لە روی ستراتیژیەتی سیاسیەوە، ئەمەش ئەوکاتە بۆیان دەردەکەوێ کە دبلۆماتکارە روسەکان لەسەر دۆخی باکووری فارس سکالای لەلا دەکەن، لە جیات ئەوەی سوربونی خۆیان بۆ دەربخا کە چارەسەری دۆخەکەیان بۆ دەکا، پێی ووتبون کە ئەو توانایەی نیە خێلەکانی ئەو ناوچەیە کۆنترۆلکا، هەرکە پەتروس بەمە دەزانێ سوپایەکی مەزن پێکهاتوو لە ٢٢ هەزار سەرباز بە فەرماندەیی ڤۆلگا دەنێرێتە سەریان، پێی ووتبون من چاوم لە داگیر کردنی خاکی فارس نیە بەڵام لەدەست زولمی ئەفغانیەکەتان رزگار دەکەم. هێزەکانی فارسی (دەربەند) یان داگیرکرد بەڵام هێزەکەی پەتروس لە بلاو بوونەوە و داگیرکاری بەردەوام دەبێ تا نێردەی عوسمانیەکانی پێدەگا، پێی رادەگەیەنێ هێرش و هەلمەتەکانی روسی لەسەر حسابی دەولەتی ئێرانی مانای شەڕ دەگەیەنێ لەگەڵ دەولەتی عوسمانی. دیارە پەتروس نیازی نەبوە لەگەڵ دەولەتی عوسمانی بکەوێتە شەڕ بۆیە بە دانوستان رازی دەبێ، ئامانجی هەردوکیان لەسەر حسابی ئێران تەواو دەبێ .

رێککەوتنەکە لە ١٧٢٤ ئەنجام درا لەسەر دابەش کردنی میراتەکانی فارس بەم شێوەی خوارەوە:

کەنارەکانی دەریای قەزوین و هەندێک ویلایەتی باکووری فارس تا رووباری ئاراس بەر رووسیا دەکەوێ.، بەڵام ئەوەندە نابا لە ١٧٢٥ پەتروس دەمرێ و لە ئێرانیش شایەکی بەهێز دێتە مەیدان بەناوی شا نادر رێگە نادات کەس دەست بخاتە سەر خاکی ئێرانی و ئەو خاکانەی ئێرانیش کە پێشتر داگیر کراون هەولی سەندنەوەیان دەدا، خۆی دوای مردنی پەتروس رووسیا دوچاری چەندین کێشە و گرفت بۆوە بەڵام بە هاتنی کاترینی دووەم بۆ لوتکەی دەسەڵات، رووسیا دەگەڕێتەوە سەر رۆلی سەربازیی جارانی لە دژی پۆلەندا و دەولەتی عوسمانی و فارس.

سەبارەت بە دەولەتی عوسمانی، رووسیا لە شەڕی درێژخایەنیدا ( ١٧٦٨-١٧٧٢ ) توانیی بەسەر سوڵتانە عوسمانیەکاندا زال بێ و ناچاریان کا پەیمانی کوچک قینارچی لە ١٧٧٤ ببەستن ، کە بریتیە لە کۆتایی هاتنی هێزی دەوڵەتی عوسمانی. کاترینی دووەم سەرکەوتوو دەبێ، سوپاکەی دەست بەسەر خانەکانی قەرمدا دەگرن، بە هاوشانی ئەمە سوپاکەی کە بەرەو باکووری بەلقان و ناوچەرگەی ئەستانە هەنگاویان دەنا مەرجی قورسیان بەسەر سوڵتاندا سەپاندبو، بەڵام مەرجەکانی پەیمانی کوچک قینارچی وێرای توندیان تارادەیەک سوک بوون، دیارە ئەمەش بۆ هۆکاری رەچاوکردنی بیردۆزی هاوسەنگی نێودەولەتی دەگەرێتەوە.

ئیمپراتۆریەتی نەمسا و حوکمەتی پروسی لەم بەرفراوان بونەی رووسیا لە هەرێمی بەلکان نارەحەت بوون چونکە ئەو هەرێمانەی بەلکان هەرێمی ئیمپراتۆریەتی نەمسایی بون تورکە عوسمانیەکان داگیریان کردبوو، ئەم بەرفراوان بوونەی رووسیا لە ناوچەرگەی بەلکان بوە مایەی تێکچونی هاوسەنگی نێو دەوڵەتی، دەبێ ئیمپراتۆریەتی نەمسایی بە زوترین کات دەست لەم کارە وەردا تا رێگری لە بەهێز بونی رووسیا و دەسەڵاتەکانی لە بەلکان بکا ، ئیتر کارەکان ئەوەندە تەشەنەیان کرد لە تەقینەوە نێوان سان پترۆسبورگ و ڤیەننا نزیک کەوتبوونەوە.

پرووسیا ئارەزووی نەبوو ئەم شەڕە روبدا چونکە ئەوەندە نابا خۆی لە نێو ئەو شەڕە دەبینێتەوە کەئەمەشی پێ باش نەبوو، دۆخی دارایی فردریکی پادشای پرووسیا ئەوەندە باش نەبوو لەم کاتە دوچاری شەڕ بێتەوە وەکو ئەو شەڕەی لە ساڵ انی ( ١٧٥٧-١٧٦٣) تێی کەوتبوو، لە بەرەژوەندی پرووسیادا بوو رێگە چارەیەک بدۆزێتەوە ئەم شەڕە لە نێوان ئەم دوو دەولەتە زەبەلاحە روو نەدا، پاراستنی هاوسەنگی نێودەولەتی لە بەرژەوەندی هەموو لایەکدایە، بۆیە ئاراستەکان لەسەر ئەم شێوە چڕ کرانەوە:

١/ رووسیا لە بەلکان بوەستێ و پەیمانێک لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ببەسترێت بەهۆیەوە ئەو شوێنانەی لێی داگیرکراون و لەبەردەستی دەرهێندراون بۆی بگێردرێنەوە.

٢/ پۆلەندا لە نێوان نەمسا و پرووسیا و رووسیادا دابەش بکرێ.

ئەمەش مانای ئەوەیە هاوسەنگی نێودەوڵەتی دەبێتە مایەی لەناو بردنی دەولەتان. نەک ئامرازی رێگەنەدان بە دەولەتە مەزنەکان تا لەسەر حسابی دەولەتە بچووکەکان بەرفراوان بن، پۆلەندا بووە قوربانیی بیردۆزە نوێکەی ( هاوسەنگی نێودەوڵەتی ).

و: خالید هەرکی

دابەش کردنی پۆلەندا لە ١٧٧٢ بوە مایەی ئەوەی سێ دەوڵەتەکە ئەم پرۆسەی دابەشکردنە دووبارە بکەنەوە، بەتایبەتی کە ئەم دابەشکردنە بەبێ شەڕ ئەنجام درا و دەولەتە میانڕەوەکان بەشی خۆیان بە زۆرەوە دەست دەکەوێ.

لە ١٧٩٣ پرووسیا و رووسیا لەسەر ئەوە رێکدەکەون بەشێک لە پۆلەندا جیاکەنەوە و بەسەر خۆیاندا دابەش کەن و ئەلزاس و لۆرینییش دوای دەستگرتن بەسەر فرەنسای شۆڕشدا بدرێتە نەمسا. بەڵام ئەوەی رویدا رووسیا و پرووسیا پشکی خۆیان لە پۆلەندا بەدەستهێنا بەڵام نەمسا نەیتوانی ئەلزاس و لۆرین وەدەست بێنێ، ئیتر نەمسا بە دۆڕاوی لێی هاتەدەر، لەلایەکی دیکە ئەو دەستکەوت و بەرفراوانیەی رووسیا و پرووسیا بەدەستیان هێنا نەمسا پێی وابوو ئەمە هاوسەنگی نێودەوڵەتی تێکدەدا، بۆیە دەبێ نەمساش لەم دەستکەوتە هەندێکی بەر کەوێ یا هێزەکانی کە لە دژی فرەنسای شۆڕشدا دەجەنگا دەگوازرێتەوە بۆ بەرەی دژ بە پرووسیا و رووسیا تا لە پۆلەندا هەندێکی بەرکەوێ، ئەم هەولە بووە مایەی دابڕاندنی سێیەمی پۆڵەندا کە بەو هۆیەوە لە نەخشە دەسرێتەوە.

پرۆسەی دابەشکردنی پۆلەندا لەلایەن گەلی پۆڵەنداوە بەرهەستیی لێدەکرا، ئەمەش جۆرێک بوو لە بەرگری نیشتمانیی نەتەویی پێشوەخت، بەڵام ئەم بەرگرییە نەیتوانی هیچ لەو کارەساتە کەم کاتەوە.

ئەوەی بوە هۆکاری گلۆربونەوەی پۆڵەندا بۆ ئەم چارەنووسە ناخۆشە:

١/ پۆلەندای لاواز کەوتبوە نێوان چەند دەولەتێکی بەهێز کە هەندێکیان تازە پێگەیشتبون وەکو پرووسیا و رووسیا هەندێکیشیان هەر خۆیان بەهێز بوون وەکو دەولەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی نەمسا.

٢/ پۆلەندا بەهۆی ناحەزی و دوژمانیەتیی لەگەڵ دەولەتی عوسمانی سۆزو پشتگیری ئەوروپای وەدەست هێنابوو، بەڵام دواتر هێزەکانی خانەدانان بینیان کە پۆلەندا لە مەترسیەکانی دەولەتی عوسمانیەوە دوورە بۆیە کەوتنە ململانێ و رکابەری لەگەڵ یەکتریدا لەسەر دەستگرتن بەسەر زەوی و دەسەڵاتدا، بەم کارەیان وڵاتیان ماندوو کرد.

٣/ یەکێک لە هۆکارەکانی شەڕی ناوەخۆیان ئەوەبوو تاجی پادشایەتیان کردە سیستەمی هەلبژاردن، بەو هۆیەوە چاوتێبڕانی دەسەڵات لە پێناو وەدەست هێنانیدا یەکتری دەکوژن و وڵات بەرەو کاولکاری دەبەن، بەتایبەت خانەدانانی پۆڵەندا خۆشیان لە نێو خۆیندا رێک نەدەکەوتن، ئامادە بوون بەردەوام پەنا بۆ هێزی دەرەکی ببەن..

٤/ بەشێکی زۆر لە توێژەرانی گەلی پۆلەندی چارەنوسی وڵاتیان لا گرنگ نەبوو. چونکە گەل لەلایەن خانەدانانی پۆڵەندیەوە دەچەوسێندرانەوە و بە کۆیلە کرابون ئیتر چ باکیان بە دابەشکردنی وڵات دەبێ، جولەکەکان کە کەمینەیەکی مەزنی گەلی پۆڵەندی بوون لایان گرنگ نەبوو لەژێر دەسەڵاتی نەمساییدا بن یا رووسی یا پروسی، ئەوان تەنها بایەخیان بە قازانجەکانی خۆیان دەدا.

لەوکاتەی پۆڵەندا بەرەو نەمان دەچوو، لەولاوە دەولەتێکی مەزن لەسەر سیستەی ئەورووپی لە دونیای نوێ دروست دەبێ.

# بەشی چواردەهەم

## دەرکەوتنی پرووسیا و
## کاریگەریی لەسەر هاوسەنگی هێز لە سەدەی هەژدەهەم

پرووسیا بە گرنگترین دەوڵەتی ئەورووپی دادەنرێ کە لە چەرخی نوێ سەرهەڵدەدا. لەوکاتەی دەبێتە خاوەن هێز و پێگەی تایبەتی خۆی لە ئەورووپا ، واتە هەر لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمەوە، زۆربەی سیاسەتەکانی ئەورووپا بە سیاسەت و هەڵوێستەکانی پادشاکەی دەبەسترێنەوە .

سەنتەری دروستبوونی پرووسیا شاری براندنبورگ بوو کە دەکەوێتە نێوان رووباری میز و ئەلبەوە، ئەمەش یەکێکە لەو هەرێمانەی لە چەرخی ناوەڕاست دروست بووە، براندنبورگ وەکو ناوەندێکی پێشەوەی دژی هێرشەکانی سلافی بوو لە نێوان رووباری ئەلب و پۆڵەندا.

ئەم ناوەندە بە رێگەی ئیمپراتۆریەتی دەولەتی رۆمانیی پیرۆزەوە بە فەرمانبەرێکی مەزن دەسپێردرا پێی دەوترا ( مارکراف ) . ئەم هەرێمە ئازارو نەهامەتی زۆری بەخۆیەوە بینی تا ئەوکاتەی ئیمپراتۆر بە ( سیگمۆند Sigmond ) ی دەسپێرێ، تا ئەوکاتەی فردریک هوهنزلرن Hohenzolleren ) حوکم دەکا، ئەم خانەوادە بەردەوام دەبێ لە حوکمڕانی واتە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ١٩١٨، دەکاتە نزیکەی پێنج سەدە لە حوکمڕانی. لەوە نەدەچو ئەم خانەوادە ئەوەندە حوکم دەکا تا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆیەم دەبێتە دەولەتێکی ئەورووپیی مەزن، بەڵام گومان لەوەدا نیە کە خانەوادەی هوهنزلرن رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لەم بەرەو پێشچونەی ئەورووپا، ئەو پێشکەوتنە بوو کە هەمیشە پشتی بە بەهێزکردنی سوپای سەربازی بەستووە، ئەم خانەوادە لەوکاتەی حوکمڕانی براندنبورگ یان پێدەسپێردرێ، هەوڵیان داوە خاوەنی چەکی ئاگرینی بەهێز بن، ئەو چەکانەی بۆ ئەو کات توانیویانە رۆڵی کاریگەر لە تێکشکاندنی هێزەکانی دوژمن لە بەرەکانی جەنگ بگێڕن.

دەسەڵاتدارانی هەرێمی براندنبورگ لە خانەوادەی هوهنزلرن لە ماوەی شەڕی ئاینی کە لە سەدەی شانزەهەم ئەڵمانیای گرتبۆوە لەو پەڕی ئالۆزیدا بوو. لە نێو ئەو قەیران و ئالۆزیانەدا نوێنەرانی براندنبورگ پێیان باش بوو لەتەک میرە لۆسەریەکانی ئەڵمانیا بوەستن لە دژی ئیمپراتۆریەتی چارلس کنتی پێنجەم، تەنانەت نوێنەر خۆی دەبێتە لۆسەری، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتدارانی هۆهنزولرنیی براندنبورگ لە پەراوێزی ڕووداوەکان دەمێننەوە تا ئەوکاتەی دەسەڵاتیان دەگاتە پرووسیا و ڕۆڵی نێودەولەتی مەزنیان دەبێ، ئێستا درێژ بوونەوەی دەسەڵاتیان بۆ پومیرانیا بە گەورەترین گۆڕانکاریی ئەوروپا لە هەردووک سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم دێتە ئەژمار، چونکە دۆخی ئەو هەرێمە بەر لەوەی خانەوادەی هوهنزلرن دەسەڵات لەوێ بگرنە دەست لەگەڵ ئێستایاندا دەرکەوت چ گۆڕانکاریەکیان بەسەردا هاتوە.

پرووسیا لە سەدەی پانزەهەم لە دەست ئەوانەدا بوو کە پێیان دەوتن ( سوارچاکی تیوتۆن Teuton ) لەڕوی بلاو کردنەوەی پەیامی کڵێسا زۆر بەهێز و ڕشت بوون، هەر ڕووداوێک لەو دەورو بەرە ڕوویبدابا، ئاسایی بوو تیتون لەگەڵ پۆلەندا بەگژ یەکدا دەچون لەکاتێکا پۆڵۆنیا خۆی بە خاوەنی خاکی تیتۆن دەزانی، دوای هەولێکی زۆر پۆلۆنیا دەبێتە خاوەنی بەشێکی پرووسیا ( پرووسیای ڕۆژئاوای پۆڵۆنی )، تیتۆنەکانیش بەتەنیا مانەوە کەبە ( پرووسیای ڕۆژهەڵات ) دەهاتنە ناسین.

سیستەمی حوکمڕانیی تیوتون بۆ ئەو سەردەم گونجاو بوو ئەوەتا بەردەوام دەبێ لە حوکمڕانی تا ئەوکاتەی پرووسیای ڕۆژهەڵات دەبێتە میرنشینێکی سەربە حوکمڕان، وەکو لقێک لە حوکمڕانی خانەوادەی هوهنزلرنی دەسەڵاتدار لە بروندنبورگ. دیارە ئاساییە ئەم دوو لقە لەیەک نزیک بکەونەوە تا دوای مردنی حاکمی پروسیی ڕۆژهەلات دەرفەت دەرەخسێ هەردوکیان لە ژێر حوکمڕانی سیگموندی هەلبژێردراوی براندنبورگ لە ١٦١٨ یەک دەگرن، لەو کاتەوە سیگموند دەبێتە حاکمی براندنبورگ و پرووسیای ڕۆژهەڵات، ئەو میرە پێگە و سیاسەتی مامناوەندیی ئەوروپیی پیادە دەکا.

پرووسیا ئەوکات مەرجی دەوڵەتیی تێدا نەبوو، پرووسیای ڕۆژهەڵات بەهۆی خەراپی خاک و نەبونی سەرچاوەی کانزا ژماری دانیشتووانی کەم بوون، هەروەها بە ئاراستەی ئەوروپای ڕۆژهەڵات توندڕەویان هەبوو چونکە ئەو هەرێمەش لە ڕوی شارستانیەوە بە بەراورد لەگەل پارچەکانی دیکەی ئەوروپا نەختێک لە پاش بوون، بەڵام سەرجەم مێژوو نووسەکان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە گەلی پروسی وێڕای دواکەوتوییان لە ڕوی

و: خالید هەرکی

شارستانیەوە وزە و توانایەکی بەهێزیان بە خانەوادەی هوهنزلرن داوە، گوێڕایەڵیەکی کوێرانەی دەسەڵاتدارانیان دەکردن، ئەمەش کێماسی زۆری مەرجەکانی دەوڵەتی بۆ قەرەبوو کردونەتەوە. لە روی هەلکەوتی جوگرافیشەوە پرووسیای رۆژهەلات لەتەک پۆلەندا هەلکەوتبو، شانشینێکی خاوەن پێگە بوو، بەڵام گرفتە مەزنەکەی پرووسیا بۆ بەرگری کردن لە پرووسیای رۆژهەلات ئەوەبوو کە درێژبوونەوەی دەشتاییەکانی پۆلۆنیا بوو، پرووسیا خاوەنی سنوورێکی جوگرافی نەبوو تا لە روی سەربازی و سیاسییەوە پشتی پێببەستێ. بۆیە بەرپرەسیارێتیە مەزنەکەی خانەوادەی هۆهنزلرن لە بەرلین بوو و ویراسەتی پرووسیا بۆ خانەوادەی هوهنزلرن ئەو کاتەی بەدەستی پۆلەندا و پرووسیا بوو ئەوانیش پەیوەندیەکانی دەرەبەگاتیان نەپچراندبوون .

لەو دەوروبەرانەی کە دەسەڵاتی پرووسیا بەدەستی خانەوادەی هوهنزلرن براندنبورگ بوو، لە ١٦١٤ دەسەڵاتیان بۆ کلیڤس Cleves درێژ کردبۆوە و گەیشتبوونە هەندێک ناوچەی ئەلمانیش لە دەوروبەری روباری راین، لە رووداني شەڕی سیسالە (١٦١٨-١٦٤٨): سێ کۆمەڵە هەرێم کەوتونەتە ژێر حوکمی ئەوانەوە

١/ پرووسیای رۆژهەلات کە زەویەکانی پرووسیای رۆژئاوای پۆلۆنی و بومیرانی لە براندنبورگ ی جیا دەکردەوە.

٢/ براندنبورگ.

٣/ مومتەلەکاتی هوهنزلرن کە دەکەونە سەر روباری راین ئەوانیش میرنشینە بچوکەکانی ( کلیڤس، مارک، راڤینس بێرگ Cleves, Mark, Ravensber) .

بەم شێوە هوهنزلرن بەرپرسیار بوو لە بەرگری کردن لە مومتەلەکاتە پەرش و بلاوەکانیان لە بەرانبەر هێزە زەبەلاحەکانی کە لە نزیکیانەوە بوون، لە رۆژهەلاتیەوە ( پۆلۆنیا ) لە باشووریەوە ( ئیمپراتۆریەتی نەمسا ) لە باکووریشەوە ( سوێد ) لە رۆژئاوایەوە ( فەرەنسا ) ، ئەم دۆخەی بەسەر هۆهنزلرندا سەپێندراوە لەسەریانە سیاسەتێکی تایبەتی پیادە بکەن هەم لەگەڵ دەولەتە مەزنەکانی دراوسێ هەم لەگەڵ هەرێمەکانی لەژێر دەسەڵاتیدا. یەکێک لە ئامانجەکانی هەولی بۆ دەدا یەکخستنی ئەو هەرێمانە بوو کە لە ژێر دەسەڵاتیدان.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجەی دەبوایە ئەو هەرێمانە داگیرکا کە دەکەونە نێوان هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی، ئەمەش واتە رووداني شەڕ یا لەگەل ئەو دەوڵەتە بەهێزانی ئەو هەرێمانەیان لە ژێردەستە یا لەگەڵ هەرێمەکان خۆیان.

بۆ بەدبەختی هوهنزلۆرن هەر لەو ساڵەی پرووسیای رۆژهەلات دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە ١٦١٨ جەنگی سیساڵە روودەدا. ئیتر لەوکاتەوە ئەو دەرفەتە بۆ هوهنزۆلرن نارەخسێ تا تواناکانی پرووسیای رۆژهەلات بخەنە گەڕ بۆ بەهێز کردنی لایەنێکی براندنبورگ بەرەوی هێزە بەگژیەکداچووەکانی ئەو شەڕە درێژخایەنە. هەر لە بەدبەختی ئەوان ئەڵمانیا دەبێتە مەیدانی سەرەکیی ئەو شەڕە، ئیتر وڵات لە سەردەمی حوکمی هوهنزلرن توشێ خەراپکاری و وێرانیەکی زۆر دەبێ، دوو گوتە هەیە بە نموونە لەسەر ئەو وێرانکاریە دەیهێننەوە، بەرلین، پایتەختی هوهنزۆلرن بوو ژمارەی دانیشتوانی لە ١٤ هەزارەوە دادەبەزێتە شەش هەزار، نموونەی دوەم لەسەر فرانکفۆرت هاتووە، دانیشتوانەکەی لە دانزە هەزار تەنها دوو هەزار کەسی مابۆوە، ئەمە سەبارەت بە شارەکان بۆ گوندەکان کارەساتتر بوو، بە سەدان گوند لەناو چوون، پانتاییەکی زۆر بووبە چۆڵەوانی.

زەبەلاحی و مەزنی سوپاکانی لە جەنگی سیساڵە بەشدار بوو ، لەگەڵ ئەو کاولکاریەی بەسەر وڵاتدا هات، جۆرج هوهنزلرنی لە ساڵ ی ( ١٦١٩-١٦٤٠ ) کردە کەسێکی کورتەباڵا لەتەک زەبەلاحەکان .

هەرچەندە سەردەمی حوکمڕانی هوهنزلرن پڕ بوو لەو وانانەی کە لێی فێری زانستی سیاسەت و جەنگ بوو، ئەمەش سودی زۆری بە فریدریک ولیام ( ١٦٤٠-١٦٨٨) گەیاند کە لە دوای جۆرج ولیام دێتە سەر حوکم، یەکێکی تر لە سوودەکانی ئەوەبوو یەکگرتنی پرووسیا و براندنبورگ کە لەسەردەمی هوهنزلرن رویدابوو ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێدەپەڕێ کاتی چنینی بەرهەمەکانی هاتبوو. بێگومان کەسایەتیی بەهێزی فریدریک ولیام لەگەڵ کەسایەتی جورج ولیامی لاواز جیاوازیەکی زۆریان هەبوو. بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەبەرچاو بێ کە ئەو دۆخەی فریدریک ولیان حوکمڕانیی تێدا دەکرد جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ دۆخی حوکمڕانیی جۆرج ولیام.

جۆرج ولیام لەسەرەتای جەنگی سیساڵە دەسەلاتی گرتەدەست، ئەوکات دەولەتە مەزنەکان لەوپەڕی بەهێزی دابوون، ئارەزووەکانی لە هێرشبردن و شەڕکردن کۆببونەوە، دانوستان لە نێوان لایەنە ناکۆکەکان لە سەرەتای ساڵی ١٦٤٣ دەست پێدەکا. ئیتر ئەرکی فردریک ولیام دابەش کردنی دەستکەوتەکان دەبێ و دەیانخاتە سەر مێزی دانوستانی

و: خالید هەرکی

ئاشتەوایی. دەبێ لەو ساتە خۆی بەسەر دۆخەکاندا بسەپێنێ و وەکو کەسێکی کاریگەر بێنێتە بەرچاو.

دوای ئەوەی فردریک ولیام دەسەلآت دەگرێتە دەست چاک دەزانێ توانا سەربازیەکانی سنووردارن، ئەگەر مەبەستی بێت بەشداری لە دانوستانەکاندا بکا دەبێ سوپایەکی بەهێز پێکبێنێ تا ئامانجەکانی بپێکێ. دیارە زۆرینەی سوپاکەی لە کرێگرتە کان پێک هاتبوو کە نەدەکرا پشتیان پێ ببەستێ. سوپای کرێگرتەی ناردەوە مالەوە، هەلسا بە پێکهێنانی سوپایەکی یەکگرتوو کە بە خۆیەوە بەسترابێتەوە.

ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ فردریک ولیام سوپایەکی بەهێزی پێکهێنابێ، چونکە سوپا نوێکەی ژمارەیان لە هەشت هەزار سەرباز رەت ناکا. بەلآم ئەم ژمارە بۆ ئەنجام دانی مەبەستەکانی فردریک ولیام بەس بوو. لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی سوپاکان ژمارەیان زۆر نەبوون. چەکی ئاگرینیش ئەوکات سنووردار بوو، بۆ سوپایەکی وەکو سوپای فردریک دەکرا هەندک چەکی ئاگری وەدەست بێنێ، بتوانن بەهۆیەوە بەرسنگی سوپای دەولەتێکی مەزنی وەکو ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆز بگرێ. لە راستیدا سوپایەکی بچوکی هوهنزلرن ئەستەم بوو بتوانێ بەسەر سوپای دەولەتێکی مەزن و دێرینی ئەورووپی زاڵ بێ بەلآم هوهنزلرن بە سووربون لەسەر ئامانجەکانی و هەلگیرساندنی شەرێکی سەخت دەیتوانی ئامانجەکانی بپێکێ.

کاروباری ئەورووپی و ئاراستەکانی سیاسیی ، جلەویان تەنها بەدەست سوپاوە نەبوو، بەڵکو بیردۆزی هاوسەنگی هێزیش کاریگەری خۆی هەبوو، بۆیە دەکرا دەولەتێکی مەزن پێویستیی بە سوپای هۆهنزولرنی بچوک هەبێ بۆ بەگژداچونی دەولەتێکی دیکەی مەزن کە پارسەنگی هێز تێکدەدا. دواتر مومتەلەکاتی هوهنزلرن کەوتبونە ناوجەرگەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆزەوە، بۆیە سوپای ئەو خانەوادە دەسەلآتدارە دەبێ حساباتی زۆری بۆ بکرێ، چونکە فریدریک ولیام سوپایەکی پرچەک و بەهێزی دروست کردبوو. سەیر نەبوو بزانێ چۆن رێگە لە سوێد دەگرێ لە شەڕی سیسالّ ە یا لە ئاشتەوایی ویسڤالیا لە ١٦٤٨ چۆن هەموو بومیرانیا لوش دەدا کە بەشێکی لە بومیرانیا داگیرکرد و خستیە سەر خاکی خۆی.

دەستگرتنی فردریک ولیام بەسەر ئەو بەشەی بومیرانیا بوە مایەی سوربونی هوهنزلرن تا پارچەکانی دیکەی مومتەلەکاتی یەکخا. ئەم یەکخستنە پێویستی بە هەنگاوی دبلۆماسی و سەربازی هەبوو، فردریک خۆی پێویستی بە دانپێدانانی هەندێک لەو دەولەتە ئەورووپیانە هەبوو کە چاویان لە داگیرکردنی پرووسیای رۆژهەلاتدا هەیە وەکو دەولەتی سوێد.

پێویستیشی بەوەبوو کە هەموو پەیوەندیەکانی دەرەبەگایەتی لەگەڵ پادشای پۆلەندا بپچڕێنێ. بۆیە لە دژی پۆلۆنیا لەگەڵ سوێد هاوپەیمانیی بەست تا دان بەمیراتی ئەو دابنێ لەسەر پرووسیای ڕۆژهەلات. ئەوەندە نابا لە جەنگی فاهربلین Fehrbellinلە ١٦٧٥ بەسەر سوێددا زال دەبێ کە دەبێتە ( دەنگۆی مەزناتی داهاتوی).

(فردریک )ی کوڕی لە ١٦٨٨-١٧١٣ جێگەی دەگرێتەوە ، ئەو درێژە بە سیاسەتەکانی باوکی دەدا، بۆئەوەی شوێنی شایستەی خۆی لە ئەوروپا بگرێتەوە کە لە ئاست مومتەلەکاتی خانەوادەی هوهنزلرن دایە. بۆ ئەم مەبەستە هانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی پیرۆزیدا تا وەکو پادشای پرووسیا بیناسێنێ، بەڵام ئیمپراتۆر ڕازی نەبوو، بەڵام لە کۆتایی ڕەزامەندی دەدا.

ئیمپراتۆر پێویستی بە فردریکی میری براندنبورگ و دۆقیەی پرووسیا هەبوو لە جەنگی ویراسیی ئیسپانیا. فردریک لە پای داننانی بە پادشای پرووسیا بە داواکەی ئیمپراتۆر ڕازی دەبێ کە هاوکاریی بکا. ئەمە بۆ ئیمپراتۆر کارێکی سەخت بوو چونکە بەم ڕەزامەندیە شانشینێکی بەهێز لە تەک خۆی دادەمەزرێنێ، بەڵام ناچار بوو بۆیە نازناوی پادشای پێدا، ئیتر فردریک لە ١٧٠١ تاجی پادشایەتی لە کاتدرائیی کونیگسبێرگ Konigsberg دەنێتە سەر و دەبێتە پادشای پرووسیا .

فردریک یەکەم میر یا شازادە نیە نازناوی پادشایەتی وەدەست دێنی. ئەوەتا خانەوادەی هانۆڤەریش لە ئەڵمانیا تاجی پادشایەتی بەریتانیا دەنێنە سەر، بژاردەی ساکسۆنیش دەبنە پادشای پۆلۆنیا، بەڵام جیاوازیەکی مەزن لە نێوان ئەو دوو پادشایانە و پادشای پرووسیادا هەیە، پادشایەتی ئینگلتەرا و پۆلۆنیا ڕاستەوخۆ بە هانۆڤەر و ساکسۆنیا بەسترابوونەوە، هەرچی پرووسیا بوو مومتەلەکە پەرش و بلاوەکانی خۆی لە ژێر یەک تاج یەکخستنەوە. لەم میانە دەولەتێکی نوێی بەهێز لەتەک ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی پیرۆز دادەمەزرێ.

هەر لەسەر دەستی فردریکی یەکەم پادشای پرووسیا لە ١٧٠١ ەوە هەولی زۆر دەدرێ بۆ دامەزراندنی سوپایەکی بەهێز بۆ پرووسیا، هەموو تواناکانی دەولەت دەخاتە خزمەت ئەو سوپایەوە.

پێشتر ئاماژەم بەوەدا کە بوژانەوەی ئەو سوپا بچوکەی پرووسیا لەسەر دەستی فردریک ولیام (١٦٤٠-١٦٨٨) بەهێز دەبێ و ئامانجەکانی دێنێتە دی. بەڵام لەکاتی دروست

و: خالید هەرکی

کردنی ئەو سوپایە بەهایەکی دیکەشی بۆ زیاد دەبێ، ئەو کات شانشینی پرووسیا بریتی نەبوو لە خاکێکی یەکپارچە بەڵکوو پارچە پارچە بوو کەچی کەساتیەکان خۆیان لە نێو ئەو سوپایەدا تواندەوە، وەکو سوپای دەولەتێکی یەکپارچەیی دروست بوو کە بەیەک دەست بەرگریان لە پادشا دەکرد بەم شێوە سوپای پروسی بەر لەوەی دەولەتێک یەکپارچە دروست بێ سوپایەکی یەکپارچەیان دروست کرد.

هەلبژێردراوی مەزن فردریک ولیام و دواتریش کورەکەی فردریکی یەکەم (١٦٨٨-١٧١٣) هەموو تواناکانی ولاتیان خستە ژێر فەرمانی ئەو سوپایە، داهاتی پادشایەتی پروسی لەم دوو سەرچاوەوە دەهات:

١/ داهاتی مومتەلەکاتی پادشایەتی.

٢/ باجەکان.

بە پێچەوانەی دەولەتانی ئەورووپی داهاتەکانی پادشایەتی دەتوانرا لە بوارەکانی دیکەی خزمەتگوزاری دەولەت یا سوپا خەرج بکرێ، هەرچەندی ئەو داهاتانە زیادیان دەکرد ئەوەندە زیاتر حکومەت پرۆژەی ئابوریی پێدەکردەوە و داهاتی دیکەی بۆ دەولەت پێ زیاد دەکرد کە خەرجیەکان بەتایبەتی بە ناوی سوپا دەبوون، بەم شێوە بوژانەوەی ئابوری بە پێویستیەکانی سوپاوە بەسترابونەوە.

لە بەرلین کارگەی دروستکردنی چەک و تەقەمەنی و چەندی جۆرە کارگەی تر کە پێویستی سوپا بون دامەزران.

هەلبژێردراوی مەزن چینی یونکزی ئرستوکراسیی پروسیی کردبوو بە سەرچاوەیەکی باش بۆ ئەفسەرانی سوپا. ئەو ئەفسەرانە لە خزمەتی فەرمانەکانی پادشادا بون ، دیارە بلاو بوونەوەی مەزهەبی لۆسەری کاریگەری زۆری هەبوە لەسەر ئەوەی ئەم توێژە زیاتر هاوبەستەگی پادشا و خانەوادەکەی بن، ئاشکەرایە کە رێبازی لۆسەری ئەوە بەسەر هەوادارانی خۆیدا دەسەپێنێ کە پابەندی حاکمی ولات و دەسەلاتەکەی بن، لەسەر ئەم بنەمایە خەسلەتەکانی رەوشتی (یونکز) پابەندی بوو بە خانەوادەی پادشایەتی و رەونەقێکی دابوە خۆشەویستیان بۆ سوپا و خاکی ولات و پادشا، فردریکی یەکەم خوێندنگای بۆ نەوەکانی یونکز دامەزارند کە دواتر بوونە مایەی شانازی پرووسیا.

لەپێناو بەردەوامی ئەو گەشە پیشەسازیە و بەهۆی پێویستی دەستی بە وزەی کرێکار هەلبـژاردەی مەزن دەرگای وەرگرتنی کۆچبەرانی کردەوە، لە سویسرا و هۆلەندا و

هوجونوتەکانی فرەنسا و جولەکەکانی کۆچبەری پۆلۆنی. مەزهەبی ئەو کۆچبەرانە پرۆتستانتی بوون بە هەموو جۆرەکانیەوە رویان تێیکرد.

بەڵام پادشاکانی هوهنزلرن هیچ دەرگایەکی بەرەو پێشچونیان بۆ جووتیارەکان نەکردەوە بەڵکو دەرگاکانیان بە رویاندا داخستن، هەڵبژاردەی مەزن لە پێناو کێش کردنی چینی ئرستوکراسیی پروسی قوربانیی بە جووتیارەکاندا. ئەمەش لە پێناو ئەوەی داواکاریەکانیان بۆ وەرگرتنی دەسەڵات سنووردار بکرێ بتوانن بیان چەوسێننەوە، ئەمەیە هۆکاری دواکەوتنی چینی گەلەری ئەلمانی، ئەگەر بە چینی بەریتانی یا هەر دەولەتێکی دیکەی ئەورووپی بەراورد پێبکەیت.

ئەم سیاسەتە توندەی ناوەخۆ بوە مایەی لاوازبوونی چینی مامناوەندی پروسی، روخساری ئەو چینە جیاوازیی هەبوو لەگەڵ روخساری هەمان چینی وڵاتیکی دیکەی ئەورووپوی رۆژئاوا، چینی مامناوەندی پروسی زۆربەیان فەرمانبەر بوون، ئەمانیش لە خزمەتی دەولەت و سوپادا بوون، ئەو توانایەیان نیە ببنە هێزێک خۆیان بەسەر حکومەت یا سوپادا بسەپێنن.

بەهەر حال پادشایەتی هوهنزلرن توانیی ئەو سوپایە بۆ وەدەست هێنانی پانتاییەکی زۆری زەوی بەکار بێنێ. دوای ئەوەی چەندین شەڕی سەخت و دژواری لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم لە ناوجەرگەی ئەورووپای پێکرد ، کە هاوکێشەکانی نێودەولەتیی پێ گۆڕین. ئەمەش بە شەڕی ویراسیی پۆلۆنیا و شەڕی ویراسیی نەمسا لە ( ١٧٤٠-١٧٤٨) و شەڕەکانی حەوتساڵ ەی (١٧٥٦-١٧٦٣) دەسەلمێندرێ، ئەم شەڕانە بەهای پرووسیایان دیاری کرد لە ئاراستە کردنی سیاسەتی ئەورووپا، ئیمپراتۆریەتی نەمسای زیاتر لە جارێک خستە تەنگژەیەکی مەترسیدارەوە، فرەنساشی گەیاندە لێواری شۆڕشی ناوەخۆ و ئینگلتەرای خاوەنی ئیمپراتۆریەتی جیهانیی گەیاندە هەردوو دونیاکەی کۆن و نوێ.

# بەشی پانزەهەم

## جەنگەکانی سەدەی هەژدەهەم ١٧٤٠-١٧٦٣

دەرکەوتنی پرووسیا و رووسیا لە هەردوو لایەکەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی (ئیمپراتۆریەتی نەمسایی) دەبێتە هۆکارێک بۆ ئالۆزبونی پەیوەندیەکانی دەولەتانی ئەورووپی لە نێو خۆیاندا، پرووسیا پادشاگەراییەکی پرۆتستانتی بوو، رووسیا ئەرسەدۆکس بوو، ئیمپراتۆریەتی نەمساش شوێنی دالدە و پەناگەی کاسۆلیکەکان بوو، بە ئومێدەی جارێکیتر زاڵ بنەوە بەسەر پرۆتستانتەکان لە ناوەوە و دەرەوەی ئەورووپا. بەڵام ئیمپراتۆریەت لە ناوەوە چەندین کێشە و گرفتی هەبوو کە بەرەو هەڵوەشاندنەوەیان دەبر، کێشەی نەتەوە جیاوازەکان، جگەلەمەش چەندین کۆمەلگای لەیەک نەچوی لەخۆ گرتبوو هەمویان بە فاکتەری سەربازی یا مەزهەبگەرایی توند ( وەکو عیساخوازەکان) بەیەک بەسترابوونەوە.

خاکی ئیمپراتۆریەت لە ناوجەرگەی ئەورووپاوە دەستی پێدەکرد بەرەو رۆژهەلات تا ئەو ناوچە کێشە لەسەرانەی نێوان خاچپەرست و دەولەتی عوسمانی لە باکووری بەلکان. ئەم ئیمپراتۆریەتەی نەمسایی بەپێی پەیماننامەی ئوتریختی ساڵی ١٧١٣ وڵاتانی زەویە نزمەکان (بەلژیک) ی لە ئیسپانیا وەرگرتبو، بەڵام ئەمە بارێکی قورس بوو بۆ ئیمپراتۆریەت چونکە بەرگری کردن لە هێرشەکانی فرەنسا بۆ سەر ئەو هەرێمە پێویستی بە توانا و پێداویستی زیاتر دەبوو.

دۆخی نەمسای ساڵ انی سیەکان و چلەکانی سەدەی هەژدەهەم وای کردبوو دەولەتانی دەوروبەر چاویان تێبرپبێ کە سود لە لاوازیی بکەن و دەستی بۆ بەرن جا چلە رێگەی هاوپەیمانیەوە بێ یا دژایەتی، بە مردنی چارلسی شەشەم لە ئۆکتۆبەری ١٧٤٠ ئەم مەرامە زیاتر ئاشکەرا دەبێ. چارلسی شەشەم لە پێناو وەرگرتنی رەزامەندی چەند دەولەتێکی ئەورووپی بۆ ئەوەی لە دوای خۆی ماریا ترێزای Maria Teresa کچی حوکم بگرێتە دەست ( ماریا ئەوکات گەنجێک بوو شوی بە فرانسیسی میری لۆرین کردبوو) ، قوربانیی بە پانتاییەکی زۆری خاک و بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆریەت دا.

ئەم ژنە لە جۆری تایبەتیی ژنانی سەدەی هەژدەهەم بوو، ژنێکی چاوتێبڕ بوو هەرچەندە هیچ تایبەتمەندی و تواناسازیەکی وای نەبوو لەگەڵ زانا و هەلکەوتوانی ئەو سەردەم بێتەوە کە چەندین زانا و سیاسەتمەداری بەناوبانگ لە سەدەی هەژدەهەم لە ئەوروپا هەلکەوتبون لە هەموو بوارەکانی سیاسی و سەربازی و زانستی، بەڵام لە نەمسا هیچ کەسێکی وا هەلنەکەوت، تەنانەت سوپای نەمساش ئەوکات لاواز بوو لەگەڵ پانتایی سنوورەکانی ئیمپراتۆریەت نەدەهاتەوە، ئیتر سپاردنی تاجی پادشایەتی بە کەسێکی بەرەگەز ژن بۆ ئەو سەردەم و دۆخی لاوازی نەمسا بەس بوو تا لە ناوەوە دوبەرەکی و بکێش بکێشی لە نێوان تەماعکاراندا سەرهەڵدا، لەهەمان کاتیشدا دەولەتانی دیکەش کە چاویان لە خاکی ئیمپراتۆر بوو لە هەولی لەناو بردنی ئیمپراتۆریەتدا بوون، ئەوانەی چاویان لە تاجی پادشایەتیی نەمسا بوو، بە پاساوی ئەوەی گوایە نەمسا بە دوژمنی بەهێز دەوری دراوە بۆیە پێویستی بە پادشایەکی بەهێزە، فەرەنسا لایەنگری یەکێک لەو داواکارانەی تاجی پادشایەتیی کرد ئەویش (چارلس ئەلبیرت Charles Alber) بوو، بژاردەی باڤاریا، هەرچەندە پادشای فەرەنسا پێشتر گفتی بە ماریا تریزا دابوو دوای مردنی باوکی دانی پێدا بنێ.

هەروەها هەندێک لە دەولەتان بەشێکیان لە خاکی ئیمپراتۆر پارچەکرد:

ا/ ئیسپانیا چاوی لەو مولکانەی نەمسا بوو کە لە ئیتاڵیا هەیەتی

ب/ پادشای سەردینیا چارلس ئەمانویل چاوی لێبوو دەست بەسەر میلانۆدا بگرێ.

ج/ فەرەنسا چاوی لە زەویە نزمەکانی نەمسایی و لوکسەمبورگ بوو.

د/ ئوگستسی بژاردەی ساکسونیا بە بیانوی ئەوەی هاوسەرەکەی نەمسایە چاوی لە هەندێک مولکەکانی نەمسا بوو.

ماریا ترێزا بۆئەوەی ڕێگە لەو چاوبرسیانە بگرێ و ئەو بوارەیان پێنەدا دەست بگرن بەسەر مولکەکانیدا هەرزوو (فرانسیس) ی هاوسەری کرد بە ئیمپراتۆر. بەڵام مەترسیدارترین چاوتێبڕ بە مولکەکانی ئیمپراتۆر پادشای نەمسا بوو( فردریکی دووەم (١٧٤٠-١٧٨٦) پیاوێکی زانای بێ رکابەر بوو. ئەو یەک راستیی دەزانی کە سەری هەموویان بوو، ئەویش ئەوەبوو کە وڵاتەکەی لاواز و بچوکە داهاتەکانی سنووردارن، پادشاکانی ئەوروپاش لە هەموو هاوپەیمانێتی و دوژمنایەتیە کانیاندا ئەمەیان لەبەر چاوە بۆ هاوسەنگی هێز، ئەگەر هەر

جەنگێکیش روویدا ئەوا وڵاتەکەی دەبێتە گۆڕەپانی جەنگ،دواتر دەستگرتن بە چاکەکانی سیاسی کە هەموو پادشاکانی ئەوروپا لێی بێبەشە،

پێی وابوو ئەمە دیدێکی جێماوەی فەلسەفییە هیچ سودێکی نابێ، بۆیە ئەو دەبێ بە



ماریا تریزا

شمشێر و قەڵەم و هەموو شێوازەکانی دیکە رووبەڕووی ئەوانە بێتەوە کە خۆیان لە مەڵاس ناوە بۆ خاکی نەمسا.

لەسەر ئەم بنەمایە فردریکی دووەم هێرش دەکاتە سەر سیلیزیا و داگیری دەکا ئەمەش دەبێتە دەستپێکی شەڕی ویراسیی نەمسایی.

ئەم داگیرکردنە ستەمە کە بەنرخترین پارچە خاکی ئیمپراتۆریەتی نەمسایی داگیر دەکرێ ، بەس بوو تا ئیمپراتۆریەت مەنەفێسی شەڕ رابگەیەنێ، بەڵام هۆکارێکی دیکە هەبوو تا نەمساییەکان بە جۆشتر دژی فردریکی دووەم بجەنگن، بە دیدی نەمسا پرووسیا تا ماوەیەکی زوو سەر بەخۆیەوە بووە، بۆیە ئەو گورزێک لەو مەدامە دەوەشێنێ. دواتر داگیرکردنی سیلیزیا لەلایەن فردریکی دووەمەوە گورزێکی کوشندە بوو بەر ماریا تریزا کەوت، لەو گورزەش توندتر ئەو سەرکەوتنە بو کە لەشەڕی ملویتز فردریکی دووەم بەسەر سوپای نەمسادا سەرکەوت، لەو شەڕدا لاوازی سوپای ئیمپراتۆری نەمسایی بۆ پادشا و سەرکردەکانی ئەوروپا دەردەکەوێ.

ئەوکات چارلس ئەلبێرت بژاردەی باڤاریا داوای تاجی ئیمپراتۆریەت دەکا، لەدوای ئەو فرەنساش جولە دەکا. ئنگلیز لەوە دڵنیا بوو کە هێزەکانی ناحەزان دەتوانن نەمسا پارچەکەن، ئینگلیز هانی ماریا تریزایدا بەپیر داخوازیەکانی فردریکی دووەمدا بچێ و دان بە مافی فردریکدا بنێ لە سیلیزیا و دەستی لەسەر هەلگرێ تا ئەو تەوژمە لە ئیمپراتۆریەتی نەمسایی دورکەوێتەوە. بواری رێککەوتنی تریزا و فردریکی دووەم رەخسابوو، چونکە فردریک لەبەر ترسی دەستێوەردانی فرەنسا ئۆقرەی لێ برابوو، بەڵام ماریا تریزا بە هەموو شێوەیەک رەتیکردەوە دەست لە سیلیزیا هەلگرێ ، بەم پێداگریەی تریزا پاساو بۆ فردریکی دووەم پەیدادەبێ تا لە ١٧٤١ لەگەل چارلس ئەلبیرتی پادشای فرەنسا رێککەوێ.

بۆ ئیمپراتۆریەتی نەمسایی ساڵی ١٧٤١ ناخۆشترین ساڵ ی دەبێ، هەر لەو ساڵە باڤاریەکان دەستیان بەسەر میونشندا گرت و فشاریان خستە سەر ڤیەننای پایتەخت و فرەنسیەکانیش فشاریان خستە سەر پراگ، لەولاشەوە سوپای پروسی هێرشیان کردە سەر ڤیەننا . ئیتر دیار بوو کە ئەو ساڵ ئیمپراتۆریەتی نەمسایی دەروخێ چونکە لە هەموو لایەکەوە فشار و هێرشەکان بەردەوام بوون تا ماریا تریزا ناچار دەبێ رادەکاتە هەنگاریا و ئیتر چارلس ئەلبیرت لە فرانکفۆرتەوە خۆی بەناوی چارلسی حەوتەم وەکو ئیمپراتۆر دەناسێنێ. بەڵام ئەوەندە نابا ئاراستەی رووداوەکان لە بەرژەوەندی ماریادا وەردەچەرخێن، بەهۆی چەند جولەیەکی سەربازی و سیاسیی ماریا تریزاوە کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

١/ ماریا تریزاکاتێک رایکردە هەنگاریا دوورەچاو بوو، بانگەوازی ئرستوکراتە هەنگاریەکانی کرد بێنە هانای بۆ رزگار کردنی ئیمپراتۆریەتی نەمسایی کە لە مەترسیی لەدەستدانیدایە، ئەوەندە نابا تریزا هێزێکی شەرکەری مەزن لەو بەهانا چوانە پێکدێنێ.

٢/ تریزا لە هەلوێستی بەرانبەر بە دەست هەلگرتن لە سلیزیا پەشیمان دەبێتەوە و بەگوێی ئینگلیزەکان دەکا و دان بە فریدریکی دووەمدا دەنێ لە خاوەنداریێتی سیلیزیا، ئیتر هێزەکانی پروسی لە خاکی نەمسا دەردەچن، ئەوکات هێزەکانی ئیمپراتور هێرشێکی مەزن دەکەنە سەر بنکەکانی فرەنسی و باڤاریەکان.

٣/ لە ئینگلتەرا ئاراستەکان زۆر بە توندی بەرەو هاوکاری نەمسا چون لە بەشداری کردنیان لەو شەرەیاندا، چونکە پێیان وابوو ئەو بەهێز بوونەی فرەنسا لە نێو جەرگەی ئەوروپا هەژانێک لەسەر ئاستی هاوسەنگی نێودەولەتی دەخولقێنێ، ئەمەش بە مسۆگەری لە بەرژەوەندی ئینگلتەرادا نابێ، هەر لەبەر ئەم سیاسەتمەداری بەتوانای ئیگلیز والپول Walpole واز لە سیاسەت دێنی چونکە یەکێک دەبێ لە بانگخوازانی

و: خالید هەرکی

ئاشـــتی، دوای ئەو کارتریـــت Carteret کـــابینەی وزاری دەگـــرێتە دەســـت کە سیاسـەتەکەی لەسـەر بنەمـای دژایەتـی فرەنسـا بنیـاد دەنـێ و ئاراسـتەی شـەڕ لە دژی فرەنسا دەگرێتە بەر، تەنانەت ئەوکات شـەڕ لە نێـوان ئەو دوو دەولەتە رانەگەیێنـدرابوو. سوپایەک دەنێرێتە (هانۆڤەر)ی ئینگلیزی تا بەرگری لە زەویە نزمەکـانی نەمسـایی بکـا، ئەم سوپایە لە دژی فرەنسا دەستیان بە ئۆپەراسیۆنی سەربازی کرد.

ئاسـایی بـوو ئینگلیزەکـان لە دژی فرەنسـا هاوپەیمـانێتیەک بهـوننەوە، لەم روەوە هەولەکانی ئینگلیز بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانیتیەکی مەزن هەریەک لە ئیمپراتۆریەتی نەمسایی و چـارلس ئەمانویـل (پادشـای سـردینیا) دەگـرێتەوە، هەردووکیـان لەگەڵ ئینگلیزەکـان لە ١٧٤٣ هاوپەیمانێتیەک بەناوی هاوپەیمانی وۆرمز Worms پێکدێنن.

پشکی چارلس ئەمانویل Charles Emmanuelلەم هاوپەیمانیە زۆر چەور بوو، رۆلی ئەویش زۆر مەزن بوو، بەشدار بونی لەو هاوپەیمانیە واتە فرەنسـا لە سـێ لاوە بەڵکـو زیاتریش گەمارۆ دراوە، سوپای ئینگلیزی لە بنکەی خۆیانەوە لە هانۆڤەر و سوپای نەمسایی فشار دەخاتە سەر ئەلزاس و لورین، چارلس ئیمانۆئیلیش لە بنکەکانی خۆیەوە لە (ساڤۆی) دەتوانێ لە رۆژهەلاتیەوە فشار بخاتە سەر فرەنسا.

فرەنسـا جـولەی دبلۆماسـیی دەسـتپێکرد بەڵـکـو لە روی هاوسـەنگی هێـزی ئەوروپـاوە بتوانێ بەرەکەی بەهێزکا، هەر ئەو ساڵەی هاوپەیمانی وۆرمزی لێ ئەنجامدرا فرەنسا توانیی لە ١٧٤٣ لەگەڵ ئیسـپانیا رێککەوتنێـک ئەنجـام بـدا بەنـاوی (هاوپەیمـانی فونتنبلـو Fontenbleau . یەکێک لە هۆکارەکانی ئەنجام دانی ئەو رێککەوتنە ئەوەبوو لقێـک لە خانەوادەی بوربون لە ئیسپانیا حوکمڕان بون چاوی لە ویراسەی نەمسا و ئیتاڵیـا بـوو، بەم هۆکارە فرەنسا و ئیسپانیا لەسەر ئەوە رێکدەکەون بەردەوامی شانشینی هەردوو سقلیەکە لە ژێـر فەرمـانرەوایی (دون کـارلوس) بمێنێـتەوە و بیپـارێزن و رێـگە لە دوژمنـانی فرەنسـا و ئیسپانیا بگرن کە چاویان بریوەتە ئەم ئامانجە.

جەنگ لە نێوان هەردوو هاوپەیمانی (وۆرمز و فونتنبلو) رویـدا، بەڵام لە دەرەوەی ئەم دوو هاوپەیمانیە پیاوێکی بەهێز مابۆوە چـاودێری ئەو رووداوانەی دەکـرد، ئەویش فردریکـی دووەم بوو، پادشای پرووسیا، دیارە گۆڕانکاریەکـان لە دژی فرەنسـا زۆر بەخێـرا دەرۆیشـتن تەنانەت بەر لە ئەنجامدانی هاوپەیمانی وۆرمز.

سەرەتا سوپای ئیمپراتۆر هەندێک سەرکەوتنی بەدەستهێنا کە هێزەکانی باڤاریی لە میونخ کردەدەر فرەنسیەکانیش لە پراگ، کاتێک لە ١٧٤٢ چارلس ئەلبیرت ناچار دەبێ بۆ ماریا تریزا دەست لە تاجی پادشایەتی هەلدەگرێ دواتر سوپای ئیمپراتۆریەتی نەمسا هێرش دەباتە سەر ئەلزاس و لۆرین. فرەنسا دەکەوێتە هەلوێستی بەگری لەخۆکردن، دۆخەکە بۆ فرەنسا زۆر ناسک بو چونکە لە باکوورەوە ئینگلتەرا بۆ فرەنسا لە ژواندا بوو، هەر جولەیەکی ئینگلتەرا وەکو هاونێک دەبوو ئاراستەی دلّی فرەنسا دەکرا. چونکە چارلس ئەمانویلی پادشای سەردینیا لە رۆژهەلاتیەوە ببوە خەنجەرێک بۆبەرپشتی فرەنسا ، بە مانایەکی دیکە بلێین دۆخی فرەنسای ١٧٤٢-١٧٤٣ لە دۆخی ئیمپراتۆریەتی نەمسای سالّی ١٧٤١ دەچو کە دوژمنانی بۆ دابەشکردنی چاویان تێبرییبوو.

بەلّام فردریکی دووەمی پادشای پرووسیا، هەستی بە مەترسیەکانی دەرهاوێشتەی زال بونی نەمسای دەکرد بەسەر فرەنسادا، چونکە ئەگەر فرەنسا کەوتە سەرچۆک ئەوسا نۆرەی پرووسیا دێت، بۆیە زۆر بەخێرا فردریک دەکەوێتە خۆ.

ئەوەندە نابا سوپای پروسی بەهێز دەبێ، لە ١٦ی سەپتەمبەری ١٧٤٤ دەست بەسەر پراگدا دەگرێ، شکستیان بە نەمساییەکان هێنا لە هوهنفریدبێرگ Hohenfriedbyrg و سۆهر Sohr و نەمسای ناچارکرد پەیمانی ئاشتەوایی دریسدن Dresden مۆرکا کە سیلیزیا و گلاتزی Glatz بۆ فریدریک هێشتەوە. دوای ئەوە گۆرانکاریەکانی جەنگ لە بەرژەوەندی فرەنسادا دەبن. لەوکاتەی سوپای نەمسا بە رووبەڕوو بونەوە لەگەلّ سوپای پروسیەوە سەرقال دەبێ ، فرەنسا لە زەویە نزمەکان و فونتنۆی Fontenoy لە ١١ی ئایاری ١٧٤٥ هێرشەکانی بۆ سەر هێزەکانی ئینگلیز و هاوپەیمانانی چر دەکاتەوە و وداتریش لە لاوفیلد Lauffeld لە ٢ی حوزەیرانی ١٧٤٦ بەسەریاندا زالّ دەبێ.

بەلّام ئومێدەکانی لویسی پانزەهەم نایەتە دی کە لە جێدانانی چارلس ئەدوارد بوو لەشوێن جۆرجی دووەمی هانۆڤەری لە حوکمڕانی ئینگلتەرا، ئەم داخوازیە بۆ گەڕاندنەوەی خانەوادە ستیوارت بوو بۆ سەر حوکم، بەلّام بەهۆی دەستپێوەگرتن و پشتگیری کردنی گەلی ئینگلیزیۆە خانەوادەی هانۆڤەری پرۆتستانتی کارەکە سەرناگرێ. ئینگلیزەکان هێزێکی سوپای رووسیان بۆ هاوکاری هێنا و پێداویستەکانیان بۆ دابین کردن، بەم هۆیەوە ئومێدەکانی فرەنسی بۆ مانەوەی لە زەویە نزمەکان لەبەین دەچن.

و: خالید هەرکی

لەم چەند ساڵە وا پێدەچوو کە هیچ هێزێک ناتوانێ لەم ململانێیانە پارسەنگی هێز بگۆڕێ، یەکێکیان یەکێک ببەزێنێ و دۆخەکە لە بەرژەوەندی خۆی بگۆڕێ، بۆیە ئاراستەکان بەرەو ڕێگەچارەی ئاشتیانە دەچون تا لە ڕێککەوتنێکی ئاشتەوایی بەناوی (ئێکس لاچاپیل Aix – La_ Chapelle ) لە ئۆکتۆبەری ١٧٤٨ ڕێکدەکەون، ئەم ئاشتەواییە هیچ لەو کێشانەیان چارەسەر نەکردن کە ئەم جەنگەی لەسەر ڕوودابوو، جگە لە پرسی ویراسیی نەمسا نەبێ کە بەو شێوە چارەسەر کرا کە ماریا ترێزا مەبەستی بوو، لەسەر ئەم بنەمایە پادشای فەرەنسا وپادشای ئیسپانیا دانیان بە فەرەنسیس نا وەکو ئیمپراتۆر و بارما یان لە ئیتاڵیا دابە دون فیلیپی ئیسپانی.




سەبارەت بە پەیوەندیەکانی نێوان فەرەنسا و ئینگلیز لەم ئاشتەواییە:

ا/ لویسی پانزەهەم دانی بە خاوەندارێتی ئینگلیز نا بۆ هانۆڤەر.

ب/ فەرەنسا هێزەکانی خۆی لە زەویەنزمەکان گواستەوە چونکە ئەم شوێنە بۆ ئینگلتەرا هێلی بەرگریە لە هانۆڤەر و تەنانەت لە ئینگلتەراش.

ج/ ئینگلتەرا قەلای لویزبورگی Lousburg لە کەنەدا بۆ فەرەنسا گێڕایەوە، هەرچی فەرەنسایە چەند مدراس Madras لە هیند بۆ ئینگلتەرا گێڕایەوە بۆ ( کۆمپانیای هندیی ڕۆژهەلاتیی بەریتانی).

بەم شێوە دەولەتە لەملیەکدا چوەکانی ئەورووپا ئاشت بوونەوە بێ ئەوەی چارەسەریەک بۆ ئەو کێشانە دابنێن کە ببنە رێگر جارێکی دیکە شەڕ لە نێوانیان روو نەدا ، ماریا تریزا ژانی دەکەوتە دڵ کاتێک فردریک ی دەبینی لە سیلیزیا ترەنتێیانێ دەکا لەوێشەوە درێژ دەبێتەوە ناو نەمسا. فرەنسا و ئینگلتەرا لەسەر داگیرکاری ململانێ و کێشەی بەردەوامیان لە هەردوو دوونیای کۆن و نوێ هەبوو، ئاخۆ کێ دەتوانێ زیاتر وڵاتانی ئەودیو دەریا داگیرکا، مێژو نوسی ئینگلیزی فیشەڕ Fisher ئەم ململانێیەی بەم شێوە باس لێوە کردوە ووتی:

( ئەم ململانێیە لە نێوان دوو حکومەت یا دوو کۆشکی پادشایەتیدا نیە، بەڵکو لەنێوان کەسەکاندایە، لەنێوان کەشتیوان و بازرگان و قاچاخبەر و سەرکێشەکان لەلایەک، لەگەڵ داربڕ و داگیرکەر و بازرگان و ئازادیخواز و کۆمپانیا بیانیەکان لەلایەک دایە، ئەوان یا لەدەریای ئیسپانی بازرگانی دەکەن و بە کێشە دێن یا لە دەریای نیوفونلاند یانیش لە درێژایی کەناری روباری ئالاهیو و سانت لورانس. یانیش لەژێر ئاسمانی گرگرتوی هیندا لە نێو کێلگەکانی برنجدا، یانیش لە کێلگەکانی چەوەندەر لە بەنگال، دیارە ئەو ململانێ و کێبەرکێیەی لە نێوان ئەو بازرگانانە روودەدا هەر دەبێتە شەڕ و جەنگ لە نێوان ئەنگلۆساکسۆنیەکان و رکابەرە لاتینیەکانیان. ئەم بەگژیەکدا چونە نافەرمیانە پەرە دەسەنن تا دەبنە جەنگی فەرمی).

لەم میانە هەردەبێ کارەکان بەو ئەنجامە بگەن کە ببێتە شەڕ لە نێوان دەولەتانی ئەورووپی، هەریەکەیان بەدوای دۆستێکدا دەگەڕێ تا ببێتە پێگە و بنکەی بەرژەوەندیەکانی لەو شوێنانە. لە کاتی ئاگربەستی سالآنی ( ١٧٤٨-١٧٥٦) هەندێک راستی دەرکەوتن کە هەرگیز نابێ پادشاکانی ئەورووپی لەکاتی بەستنی هاوپەیمانی یا دژە هاوپەیمانی خۆیان لێ بێئاگاکەن:

١/ ماریاتریزا بۆی دەرکەوت کە دوژمنە راستەقینەکەی پرووسیایە، مەترسیەکی مەزنە بۆ نەمسا ئەگەر پرووسیا و فرەنسا کە دوو دوژمنی سەرسەختی نەمسان هاوپەیمانی ببەستن.

٢/ دەکرێ رووسیا ببێتە پشتوپەنا بۆ نەمسا و بە ئومێدی بەرفراوان بون لەسەر حسابی پرووسیا تامەزرۆ بکرێ.

و: خالید هەرکی

٣/ سوێد بەهەمان شێوە بەچاوێکی رق و ترسەوە سەیری گەشەبون و بەهێز بونی پادشای پرووسیا فریدریکی دووەم دەکا.

٤/ ئەمە سەبارەت بە نەمسا و پرووسیای دوژمنە سەرسەختەکەی، سەبارەت بە فەرەنسا ئەویش بەهەمان شێوە ترسی لە پادشای پرووسیا هەبوو لەوەش دڵنیا بوو ئەگەر دەسەڵاتی بگاتە ئەودی و روباری راین سل لەوە ناکا کودەتای بەسەردا بکا. ئومێدەکانی لە سەر زەویەنزمەکان تەنها بە رازیکردنی نەمسا و بە شێوەیەکی ئاشتیانە دێتە دی کە نەمسا و فەرەنسا هاوکاری یەکتری بکەن بۆ دووبارە نەخشەکێشانی سنوورەکانیان.

٥/ فەرەنسا هەستی بەوەکرد کە شەڕی ئەودیو دەریا زیانبەخشە. بەڵام هەریەک لە فەرەنسا و ئینگلتەرا سیاسەتێکی جیاوازیان گرتە بەر بۆ جەنگی داگیرکاریی داهاتوو. فەرەنسا پشتی بە سوپای وشکانی وڵاتەکەی بەست تا ئینگلتەرا ناچارکا بێتە بنباری ئاشتیەک بەشێوەیەک فەرەنسا کۆلۆنیەکانی لەدەست نەدا. بەڵام ئینگلتەرا بایەخی بە هێزی دەریاوانی و کەشتیگەل دا، بەو نیازەی بتوانێ لە رێگای گەمارۆدانی بنکە و کۆلۆنیەکانی فەرەنسا، یەک لەدوای یەک دەستیان بەسەردا بگرێ. بەتایبەتی چونکە رێژەی فەرەنسیەکان لە هەموو کۆلۆنیەکانی ١% بوو، بەڵام لە روی پانتاییەوە کۆلۆنیەکانی ژێر دەستی ئینگلیز پانتاییان گەلێک لە هی فەرەنسیەکان زۆرتر بوون کە گرەویان لەسەر بردنەوەی پێدەکرد، دواتر گەل و حکومەتی ئینگلیزی زیاتر بایەخیان بە پرسی ئیمپراتۆر لەودیو دەریا دەدا.

ئەم دۆخانە لەبەر چاوی سیاسەتمەدارە پیرەکەی نەمسا راوێژکاری ئیمپراتۆری نەمسا بوو( کونت ونگل ڤۆن کاونتز ریتبرگ – Count Wengel von Kaunitz Rietberg ) هەر لە ١٧٥٣ وە هەموو هەولەکانی خستنە گەر بۆ لەناوبردنی هاوپەیمانی فەرەنسا- پرووسیا .

کاونتز لە ١٧٥٠-١٧٥٣ سەرپەرشتی شاندێکی دبلۆماسیی کرد بۆ فەرەنسا، بەڵام نەیتوانی کۆشکی پادشایەتی فەرەنسا بە ئامانجەکانی سیاسیی نەمسا رازیکا. ئەوکاتەی بەیەکدادان لە نێوان هێزەکانی فەرەنسی و ئنگلیزی لە هاوینی ١٧٥٥ لەسەر کۆلۆنیەکان روودەدا هەلوێستەکان بەلای بەرژەوەندی کاونتزدا دەشکێنەوە.

نەمساییەکان ئەم هەلەیان قۆستەوە تا دووبارە داواکانیان نمایشی کۆشکی پادشایەتی فەرەنسا بکەنەوە، ئەوەی بوە مایەی پێداچونەوەی فەرەنسا بە هەلوێستەکانی ئەوەبوو بالوێزی

پێشینی فرەنسا لە نەمسا (دی برنیس) بڕوای بە پێشنیارەکانی نەمسا هەبوو بۆیە لویسی پانزەهەم رایدەسپێرێ ئەو پێشنیارانەی بالوێزی نەمسا ( ستار مۆبورگ) بگرێتە ئەستۆ.

ئاسایی بو فردریکی دووەم لەم نزیک بوونەوەی نەمسا و فرەنسا زویر و تەنگەتاو بێ، هەولێدا کاردانەوەی هەبێ چونکە هەستی بەوەش کردبوو کە هێزەکانی رۆژهەلاتی ئەوروپا هەلوێستێکی دژ بە ئەویان گرتۆتە بەر، ئێستا سیاسەتی دەرەوەی روسی کەوتۆتە دەست کۆنت بستوزیف رومینەوە کە بە دوژمنی پرووسیا دەناسرا و ئامادە بوو لەدژی ئەو دەست بخاتە نێو دەستی ماریاتریزا.

فردریک دەبوایە ژمارەی دوژمنەکانی کەمکاتەوە، ئەو لە رێگەی رێککەوتنی لەگەڵ ئینگلتەراوە دەیتوانی فرەنسا لە ئەڵمانیا دورخاتەوە ، ئینگلتەرا پێێ ووت ئەگەری رووداني جەنگ لە نێوان فرەنسا و ئینگلتەرا لەسەر کۆلۆنیەکان ئەگەرێکی نزیکە، داوایکرد دلنیایی بدات لە بێلایەن بونی ئەڵمانیا لەو شەڕە، بۆیە رێککەوتنێک لە ١٧٥٦ لە نێوانیان ئەنجام درا بەناوی رێککەوتنی وێستمینستەر Westminster .

ئەم رێککەوتنەی پرووسیا و ئینگلیز کاردانەوەی زۆری لە ڤیەننا و پاریس لێکەوتەوە. سیاسەتمەدارانی کۆشکی ڤێرسای بەم رێککەوتنەی نێوان فردریک و ئینگلتەرا ی دوژمنی فرەنسا ئاگریان تێبەربوو. بەڵام هەندێک مێژوو نوسی فرەنسی رەخنەیان لەو بێزاریەی فرەنسا دەگرت پێیان وابو بەم رێککەوتنەی ئینگلتەرا و پرووسیا دەرفەتێک بۆ فرەنسا دەرەخسێ خۆی بەهێزکا و رێکبخاتەوە، بەڵکو بتوانێ زەویەکانی ئەودیو دەریا لە رووسیا بسێنێتەوە چونکە ئەو رێککەوتنەی نێوان پرووسیا و ئینگلتەرا نەلە دوور نەلە نزیک هیچ ئاماژەیەک بە زەویە نزمەکانی نەمسا نادا کە ئەوکات لە ژێر دەستی سوپای فرەنسیدا بوون.

بە دیدی ئێمەش ئەو رەخنە و خۆ زویرکردنەی فرەنسا لە جێی خۆیدا نەبوو چونکە راوێژکارەکانی لویسی پانزەهەم سیاسەتی فرەنسایان لەسەر ئەو بنەمایە دارشتبوو کە لە سەر وشکانی لە ئەوروپا سەرکەوتن بەدەست بینن، ئەمە کارێکی مەحال بوو سوپای فرەنسا هێز بنێرێتە کەنەدا یا هیند و داگیریان کا، بەڵام سەبارەت بە زەویە نزمەکان هەم ئینگلتەرا هەم پرووسیا داگیرکردنی فرەنسا بۆ زەویە نزمەکانیان بە هەرەشەیەکی راستەوخۆ دەزانی..

ئەم رێککەوتنەی پرووسیا و ئینگلتەرا لویسی پانزەهەمی بە کاریگەری دۆستە نا سیاسیەکەی ( مەدام پمپادور Pampadour) هاندا ، کە تۆلە لە فریدریکی دووەم بسێنێتەوە، لە یەکی ئایاری ١٧٥٦ رێککەوتنیکی بەرگری واژۆ دەکا بەناوی رێککەوتنی

و: خالید هەرکی

ڤیرسـاییی یەکەم، ڕووبەڕوو بــوونەوەی هەر لایەنێــک لەم دوو لایەنە هەریەکەو ٢٤ هەزار سەرباز دابەزێنێت بۆ هێرش بردنە سەر لایەنی سێیەم.

بەڵام ئەم پەیمانە نابێتە سەرکەوتنێکی سیاسی یا سەربازی بۆ (کاونتز یا ماریا تریزا) چونکە ئەم پەیماننامە مەبەستە سەرەکیەکەی ماریا تریزا ناپێکێ کە ڕسواکردنی فردریکی دووەم بوو، کە بەهۆی دەست بەسەرداگرتنی سیلیزیاوە ڕقی لێ هەڵگرتبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕێککەوتنە بوە دەروازەیەکی دبلۆماسیی مەزن بە ( شۆڕشی دبلۆماسی) هاتە ناسین. دەرهاوێشتەیەکی دیکەی ڕێککەوتنی نێوان پرووسیا و ینگلتەرا، ڕێککەوتنی ( وێستمنستەر) بوو ئەویش ئەوەبوو کە کۆشکی تزاری (قەیسەر) ئێلیزابێتی ڕقئەستور لە فریدریکی دووەم بەهۆی ئەوەی نوکتەی لەسەر دەهێنا، دلنیابوو لەوەی کە ئینگلتەرا کۆسپە لەبەردەم بەرفراوان بونی رووسیا لەسەر حسابی پرووسیا، ئەمەش ئەوەی لێکەوتەوە کە نزیک بوونەوەی رووسیا و نەمسا و فەرەنسای لێ دروست بێ لە دژی پرووسیا، ئەم نزیک بوونەوەش لە کۆتایی ساڵی ١٧٥٦ بوو بە ڕێککەوتن.

فردریک بە ووردی چاودێری ئەو گۆڕانکاریە دبلۆماسیە سەربازیانەی دەکرد، دەیزانی ناتوانێ تا ئەوکاتە چاوەروانبێ کە زلهێزەکان لەسەر پشتی ئەو ڕێکدەکەون، بۆیە بەباشی زانی تا زووە دەستی خۆی بوەشێنێ و گورزێک لە نەمسا بدا بەر لەوەی ئامادەکاری سەربازیان تەواو ببێ، ئەوسا دەتوانێ لە هەموو سوپاکانی دوژمنی بدا.

لە ئابی ١٧٥٦ شەڕی حەوتساڵ ە بەو هێرشە دەست پێدەکا کە فردریکی دووەم دەیکاتە سەر ساکسۆنیا وسوپای سەکسۆنیا ناچار دەکا لە پرنا Pirna لە ئۆکتۆبەری ١٧٥٦ خۆی بدا بەدەستەوە، بەڵام ئەوەندە نابا سوپای پروسی لە حوزەیرانی ١٧٥٧ شکستێکی مەزن دێنی.

لەوەش توندتر لەسەر پرووسیا فرەنسا و نەمسا لە یەکی ئایاری ١٧٥٧ ڕێککەوتنی ڤیرسای دووەمیان واژۆکرد، لەو ڕێککەوتنە فرەنسا پەیمان دەدا ١٠٥ هەزار سەرباز و ١٠ هەزار لەشکری کرێگرتەی ئەلمانی لە ئەڵمانیا جێبێلێ، لە بەرانبەردا دەبێ نەمسا هاوکاریەکی زۆر بدا، فرەنساش تەنها چوار شاری لە زەویە نزمەکانی نەمسا داوا کرد، ئەوەی مایەوە دون فیلیپ ی هاوسەری کچی لویسی پانزەهەم حوکمڕانیی لێبکا، ئەم مەرجانە هەموی لە بەرانبەر گەڕاندنەوەی سیلیزیا بوو بۆ ماریا تریزا.

بەم شێوە فرەنسا چوە ناو شەڕێکەوە کە نازانێ دەستکەوتەکانی چین تەنها ئەگەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا ئەوسا.

دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم رووسیا و نەمسا هاوپەیمانێتیەکی بەرگری و هێرشبەریان لە ئایاری ١٧٥٧ واژۆکرد، دواتر سوێدی دەچێتە نێو ئەو هاوپەیمانێتیە مەزنەی دژ بە پرووسیا، دۆخەکان بەگشتی لەسەر فردریکی دووەم گۆڕدران تەنانەت لە هانۆڤەریش کە پشتی پێدەبەست، سوپای فرەنسی هێرش دەکاتە سەری و لە سەپتەمبەری ١٧٥٧ دون کمبرلاند Don Cumberland ناچار دەکا ئاگربەست ئەنجام بدا کە لە خۆوەدەستدان نزیکتر بوو لەوەی ئاگربەست بێ، لە ئابی ١٧٥٧ سوپای روسی و پرووسیای رۆژهەلاتی هێرشیان برد و هێزەکانی نەمساش بەرلینیان لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا داگیرکرد.

فردریکی دووەم تەنگەتا و دەبێ، هەوڵی دا خۆی و وڵاتەکەی لەم مەترسیە رزگارکا، رووی لە فرەنسا کرد ویستی هاوپەیمانێتیەکەی نێوان ئەوو لویسی پانزەهەم نوێکاتەوە، بەڵام سودی نەبوو، هیچ رێگایەک لەبەردەم فریدریکی دووەمدا نامێنێ جگە لە شەڕکردن و پشت بەستن بە سوپا پۆلاینیەکەی.

لە نۆڤەمبەری ١٧٥٧ لە روسباخ Rossback فردریک سەرکەوتنێکی مەزن بەسەر سوپای فرەنسیدا بەدەست دێنێ، هەردوای چەند هەفتەیەک سەرکەوتنێکی دیکە لەسەر سوپای نەمسا لە لیوثن Leuthen تۆمار دەکا. ئیتر فردریک دەتوانێ بەرووی ئەم سوپا زەبەلاحانەدا بوەستێتەوە و هەر لە درێژەی ئەم شەرانە لە زۆرندۆرف کەبە دژوارترین جەنگی سەدەی هەژدەهەم دێتە ئەژمار روسەکان دەبەزێنێ و زیانێکی خوێناویی مەزنیان لێدەدا.

لە گۆرەپانی شەڕەکانی ئینگلیزی هەلوێستەکان باش دەبن، سوپای ئینگلیز لەگەل ئەو لەشکرەی ئەلمانیی کە لەگەڵیدا بوو لای رۆژئاوای سنوورەکانی پرووسیای پاراست لە ئەگەری هەر هێرشێکی فرەنسی بکرێتە سەری.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە فردریکی دووەم لە بەرگریەوە دەچێتە قۆناغی هێرش و دەتوانێ خاکی دراوسێکانی داگیرکا و پەرە بە سنوورەکانی بدا، نەخێر هێشتا مەترسیی مەزن لەسەر پرووسیا هەبوون، هەر لەو ساڵەی کە سوپای فردریکی دووەم لە شەڕی زورندورفدا Zorndorf سەرکەوتن بەدەست دێنێ ، سوێد هێرش دەکاتە سەر بومیرانیا و

و: خالید هەرکی

داگیری دەکا، نەمساییەکان لە شەڕی هۆچکیرچ Hochkirch لە ساکسۆنیا بەسەر پروسیەکاندا زاڵ دەبن.

هەرچۆنێکی بێ پرووسیا لەبەردەستی سوپای دوژمنانیدا بوو، لایەنی دوژمنانی ژمارەی سەربازانی لە نەوەد ملیۆن سەرباز دەبون کە بەرانبەر بە پێنج ملیۆنی پروسی دەجەنگان، دواتر لە توانای دوژمنانی پرووسیادا بوو سوپاکانیان بەهێز کەنەوە و خۆیان دووبارە رێکخەنەوە بۆ مەیدانی جەنگ.

بەڵام سەبارەت بە پرووسیا توانا و وزەی مرۆیی سنووردار بوو، هەرچەندە ئەگەر فردریکی دووەم لە توانایدا بوایە دووبارە سوپایەکی توکمە لە جیات سوپا لەدەستدراوەکەی ساڵ انی ١٧٥٧/١٧٥٦ بنیاد بنێتەوە کە قەرەبوی زیانەکانی ئەوان ساڵ ان بکاتەوە ، بەڵام هەر وەکو خاوەن سوپایەکی بەهێز و سامدار مایەوە، لەراستیدا سوپا نوێکەی نەیتوانی مەرامەکانی فردریکی دووەم بێننەدی وەکو ئەو سوپایەی بەرێ.

لە میانی ساڵ ەکانی ١٧٦٠/١٧٥٩ دەرکەوت سوپاکەی فردریکی دووەم کە ژمارەیان بۆ سێیەکی سوپاکەی جاران دابەزیوە ناتوانێ بەهەمان روحیەت درێژە بە شەڕەکانی بدا و شکست بە هێزە زەبەلاحەکەی دوژمن بێنێ، لە راستیدا ئینگلیز هاوکاری باشیان دەکرد بەڵام ئەوە نەبوو بتوانێ بەو هاوکاریانە بەرگەی هێرشەکانی دوژمنانی بگرێ و لەبەرانبەریاندا بوەستێتەوە.

ئەوکاتەی لە ئابی ١٧٥٩ سوپای روسی لە شەڕی (کوندرسدۆرف Kundersdorf) بەسەر سوپای پروسی سەردەکەوێ مەترسیەکانی فردریکی دووەم دەگەنە لوتکە، تەنانەت لە نامەیەکدا بۆ وەزیرێکی بەناوی ( فونکنشتین) Funckenstien دەنوسێ:

(... من وای دەبینم هەموو شتێکم لەدەست داوە، لەسەر ژیان نامێنمەوە تا کاولکاری وڵاتەکەم ببینم).

بەڵام لە راستیدا هێشتا دەرفەت لەبەردەم فردریکی دووەمدا مابوون تا پێگەی خۆی بگرێتەوە، نەمساییەکان و روسەکان گومانیان لە یەکتری هەبوو، ئەم گومانەش لای فەرماندەی روسی ساڵ تیکۆف زیاد دەکەن، بۆیە بەدوای سەرکەوتنەکانیدا ناچی کە لە (کوندرسدۆرف) بەدەستی هێنابوون، دەرفەت دەداتە فردریکی دووەم ئەویش دەتوانێ دەست بەسەر ساکسونیادا بگرێ.

فرەنسا هەستی بە نابەرانبەری کرد بەبەراورد لەگەڵ نەمسا، کە لەم شەڕە دەستکەوتی کەمی بووە ، لە دانوستانێکی تردا لەگەل نەمسا پەیمانێکی نوێ بەناوی ڤیرسای سێیەم لە ئاداری ١٧٥٩ دەبەستێ، لەم هاوپەیمانێتیە پابەندیەکانی فەرنسای بەرانبەر بە نەمسا لە بواری سەربازی و دارایی بۆ نیوە کەم کردنەوە .

قەدەر رۆڵی خۆی دەبینێ لە رزگارکردنی فردریکی دووەم لە جنگ دراوسێ زەبەلاحەکانی. ئەوەتا تزاریی رووسیا (قەیسەر) ئێلیزابێت لە ٥ی ئایاری١٧٦٢ دەمرێ، شازادە پەتروس بەناوی پەتروسی سێیەم شوێنی دەگرێتەوە کە یەکسەر داوای ئاگربەست لەگەڵ فردریکی دووەمدا دەکا. لەگەڵی رێک دەکەوێ و سوپای لە بومیرانیا و باقی زەویەکانی پرووسیا دەکێشێتەوە، ئەوەندە نابا لە ئایاری ١٧٦٢سوێدی رێککەوتنی ئاشتەوایی لەگەڵ پرووسیا ئەنجام دەدا.

لە راستیدا فردریکی دووەم هەناسەیەکی تەواو ناداتەوە کە پەتروسی سێیەم دەمرێ و کاترینی دووەمی چاوبرسی شوێنی دەگرێتەوە. بەڵام ئەم گۆڕانکاریانە کاتێک روودەدەن کە ئیمپراتۆریەتی نەمسایی هێزەکانی لەدەست داوە وماریا تریزا ئەو توانایەی نامێنی درێژە بەشەڕەکان بدا، بۆیە ئەگەرێکی دوور بوو بتوانێ سیلیزیا لە پرووسیا وەرگرێتەوە.

ئەمە بوە مایەی ئەوە دەولەتانی ناوەڕاستی ئەوروپا پەیمانی ئاشتەوایی ببەستن، ئەو رێککەوتنە لە ١٥ی نۆڤەمبەری ١٧٦٣ بە ناوی رێککەوتنی هوبەرتوسبورگ Hubertusburg ئەنجام درا، بە پێی ئەو رێککەوتنە دۆخەکان گەڕانەوە بۆ بەر لە رودانی شەڕەکان ، ساکسۆنیا کە فردریک چاوی تێبڕیبوو گەرایەوە بۆ حوکمڕانی یەکەمی، بەڵام بێ ئەوەی قەرەبوی ئەو خەراپکاری و کاولکاریەی بکرێتەوە کە لەسەر خاکی ئەو شەڕەکان روودران سوپای دوژمن و لایەنگران تیایدا شکستیان دەهێنا ، سیلیزیا لە نێو سنوورەکانی دەسەلاتی دشانشینی.پرووسیا مایەوە، پرووسیا وەکو دەولەتێکی مەزنی ئەوروپا لە ژێر فەرمانڕەوایی فردریکی دوەم دەمێنێتەوە تا مردنی لە ١٧٨٦ .

لە ١٧٦٢ هاوپەیمانی پروسی و ئینگلیز تەواودەبێ، ئیرال بیوتی خاوەن پێگە و دەسەلات لای پادشای ئینگلتەرای گەنج (جۆرجی سێیەم) پێداگر بوو لەسەر دەرچوونی ئینگلتەرا لە شەڕی ئەڵمانیا، بەتایبەتی دوای راگەیاندنی ئینگلتەرا دەستپێکردنی شەڕ دژی ئیسپانیا لە کانونی دووەمی ١٧٦٢. ئیرل بیوت بەمەبەستی نوێ کردنەوەی هاوپەیمانە کۆنەکەی نێوان نەمسا و ئینگلتەرا پەیوەندی بە تریزاوە دەکا، ئەم پەیوەندیە فردریکی دووەمی تورەکرد، کاتێک هەست دکا ئەمە فشارە دەیخاتە سەری چونکە پێی وایە لە

و: خالید هەرکی

پرۆسەی ئاشتەوایی فردریک سازشی لەگەڵ دوژمنەکانیدا کردوە. لەولاشەوە دژایەتیەکی زۆر هەبوو لەلایەن ئۆپۆزسیۆنی ئینگلتەرا لەو سەرکەوتنانەی ئینگلیز لە کۆلۆنیەکانی فەرنسی بەدەستی هێنابوو لە کەنەدا و لەو شوێنانەی کە هەیبونی، دواتر ئەو نارەزاییانە لەبەر ئەو هاوکاریە زۆرەی ئینگلتەرابون بۆ فردریکی دووەم بێ ئەوەی لەپای ئەو هاوکاریانە دەستکەوتێکی ئەوتۆی هەبێ یا قەرەبوی ئەو تێچوانەی شەڕی ئینگلتەرا و رووسیای بۆ بکاتەوە. دواتر فردریک ئەو پادشایە نەبوو کە ئینگلتەرا بەبێ بەرانبەر قوربانیی بۆبدا، چونکە رۆژێک لە رۆژان فردریک ئامادەبوە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیزی هاوپەیمانی بکاتە قوربانیی بەرژەوەندیەکانی خۆی، ئەوەتا لە پشتی ئینگلیزو هاوپەیمانیەوە پێشنیاری رێککەوتنی ئاشتەوایی لەگەڵ دوژمنەکانیدا دەکا، ئەمەش لە ١٧٥٩ زۆر بە روونی دیار بوو.

دواتر ئەو پەیوەندیە توند و تۆلەی فردریکی دوەم لەگەڵ پەتروسی ی سێیەمدا هەیبوو کە بۆ مەبەستی دەستگرتن بەسەر دوو هەرێمەکەی دانیمار بوو ( شلزویج و هولشتین) بوو سیاسەتمەدارەکانی بەریتانیایان وروژاندن، چونکە ئەم جۆرە شێوازە پەیوەندیانە لە خەسلەتی ئینگلتەرادا نەبو، ئینگلتەرا ترسی لەوە هەبوو ئەو یارمەتیانەی لە گەنجینەی ئینگلتەراوە بە فردریکی دوەم دەدرا لە تێچوی داگیرکردنی دانیمارکی خەرجکا. یا لە شەڕی نەمسادا خەرجکا کە درێژەی پێداوە، بەم شێوە هاوپەیمانێتی ئینگلتەرا و پرووسیا تێکدەچێ.

دروست بونی ئەم دۆخە بوە مایەی وەستانی شەڕ لە هەموو بەرەکان، هەروەها لە نێوان فەرەنسا و ئینگلتەرا، کۆتاییەکەی لە ١٧٦٣بە ئاشتەوایی پاریس هات ، کە ئەم دوو دەولەتە و ئیسپانیاش لەگەڵیاندا بەشداریی کرد، خالەکانی ئەم ئاشتەواییە بریتی دەبن لە :

١/ سەبارەت بە ئینگلتەرا، هەموو کەنەدا و نوفاسکوشیا و سەری بریتۆن ی بەردەکەوێ. لە ئەفریکاش سەنیگال وگرینادا و سان فنسین و دومنیک و توباجو، لە دورگەی هیندی رۆژئاوا و مینورکە لە گۆمی رۆژئاوای دەریای ناوەڕاست و فلوریدای ئیسپانیش. بەم شێوە ئینگلتەرا بەبراوەیی لە شەڕ دەردەچێ ژمارەیەکی زۆر لە پێگە و خاکی وڵاتانی بەردەکەوێ ئیتر دەبێتە ئیمپراتۆریەتێکی خاوەن خاکێکی فراوان.

٢/ هەرچی فرەنسایە زۆربەی کۆلۆنیەکانی لەدەستدان، بەڵام لویزیای لەدەست مایەوە لەگەڵ هەندێک پێگەی بچوک لە دەوروبەری ئینگلیز لە هیند، لەگەڵ مافی راوکردن لە فوندلاند.

٣/ ئیسپانیا فلوریدای لەدەست چوو، بەڵام هاڤانا و مانیلای بۆ گەڕایەوە، شەڕی حەوتساڵ ە گەبجینەی فرەنسیی مایەپوچ کرد، گورزێکی کوشندەی لە پادشاگەری گەندەلکار و چینی خانەدان دا و ژمارەیەک کۆلۆنیی لەدەستدان، لەگەڵ زەمینە خۆشکردن بۆ شۆڕشی فرەنسی. شەڕی حەوتساڵ ە جگە لەو دەرهاویشتانە دۆخێکی لەباری بۆ دانیشتوانی کۆلۆنیەکانی ئینگلیزی ڕەخساند لە ئەمریکای باکوور بۆ هەلگیرساندنی شۆرشی رزگاری، ئەم شۆڕشانە بوونە مایەی شەڕی رزگاری ئەمریکی.

# بەشی شانزەهەم

## جەنگی سەربەخۆیی ئەمریکا

جەنگی سەربەخۆیی ئەمریکا یەکێکە لە دیارترین رووداوەکانی مێژووی سەدەی هەژدەهەم. هۆکارەکانی پەرەسەندنی ئەم جەنگە بەو رووداوانەوە نەبەستراونەتەوە کە لە کۆلۆنیەکانی ئینگلیزی لە ئەوروپا و ئەمریکای باکوور لە ماوەی جەنگی حەوتساڵ ە روویاندا، بەڵکو بە ئۆپەراسیۆنەکانی داگیرکاری ئینگلیزی لە ئەمریکای باکوورەوە بەستراونەتەوە.




لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم ئینگلیزەکان لە بزووتنەوەی دۆزینەوەکاندا کاتێک بەشداریان کرد کە جون کابوت دەگاتە نیوفوندلاند و بە تیلمە کەناری دەریادا دەڕوا و مافی خاوەندارێتی بە پادشای ئینگلتەرا دەدا کە دواتر ئەو تیلمە کەنارە پێی دەوترێ (ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکی).

ئینگلیزەکان لە ١٦٠٧ یەکەم کۆلۆنییان لەوێ بەناوی (جیمستون) دامەزارند ، سیاسەتی پێڕەوکراوی حکومەت لەسەر ئەو کۆمپانیایانەی زەویەکان دەدۆزنەوە لە بەرژەوەندی نیشتمانی دایک دابوو، ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکانی قایم بونی پێگەی داگیرکاری ئینگلیزی لە ئەمریکا. بەڵام دواتر کۆچی هاوڵاتیانی ئینگلیز بۆ وڵاتە دۆزراوەکە دەبێتە مایەی سەرکەوتن و زیاد بونی ژمارەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە داگیرکراوە.

یەکێک لە هۆکارەکانی دیکەی زیاد بونی ژمارەی دانیشتوانەکان چەوسانەوەی ئاینی بوو لە ئینگلتەرا کە بوە مایەی کۆچکردنی بیوریتان و لە فەرەنساش کۆچی هوجونوتەکان.

بە فراوان بونی کۆلۆنییەکانی ئینگلزی لەو کشوەرە ژمارەی ویلایەتەکانیان بوون بە ١٣ ویلایەت هەریەکەی ئۆتۆنۆمی خۆی هەبوو، بەڵام هەموویان لەژێر دەسەڵاتی پادشای ئینگلیز و پەرلەمانەکەیدا بوون.

راستیەکەی حکومەتی ئینگلیزی هانی هاوڵاتیانی دەدا بۆ داگیرکاری و دۆزینەوەی وڵاتان، لەسەرەتا مافی نایابی باشی پێدەدان و چاوی لەوە نەبوو سودێکی زۆر لە ئەمریکای لێ وەدەست کەوێ. ترسی ئەوەهەبوو پایتەختی ئینگلتەرا لەژێر کاریگەری بوژانەوەی ئابوری کۆلۆنیەکانیدا هەرەس بێنێ، چونکە سەرەتا ئەم کۆلۆنیانە تەنها بازرگانیان لەگەڵ ئینگلتەرا نەدەکرد، بەڵام دواجار ئینگلتەرا بەوەی زانی کە بەستنەوەی بازرگانێتی بە لەندەنی پایتەختەوە سودێکی باشی بۆ ئینگلتەرا دەبێ بۆیە لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەمەوە یاسایەکی دەرکرد تیایدا کۆمپانیاکانی بازرگانیی پابەندکردن کە بازرگانی بە لەندەنەوە ببەستنەوە، ئەم یاسایانە ئەوەندە توند بوون ماسوشتس دووجار لەو یاسایە یاخی دەبێ لە ساڵی (١٦٨٤/١٦٨٩)، بۆئەوەی کۆلۆنیەکانی ئەمریکی لەبەردەم بەرهەمەکانی ئینگلیزی بە کراوەیی بمێننەوە . لەرێگەی پەرلەمانی بەریتانیەوە لە ١٧٥٠ پیشەسازی ئاسنیان لێ قەدەغەکردن.

بە تێپەربونی ساڵ ەکان دەرکەوت کۆلۆنیەکانی ئینگلیزی بەهێزتر بوون، ئەگەر بە کۆلۆنیەکانی ئیسپانی و پۆرتوگالی و فەرەنسی بەراورد بکرێن پڕبەرهەمتر بوون، هۆکارەکانی دەگەڕێنەوە بۆ:

١/ بە پێچەوانەی پۆرتوگالی و ئیسپانی، ئینگلیزەکان سەرەتای داگیرکاریان بە هەرێمی بچوک دەستپێکرد دواتر خزانە نێو هەرێمە مەزنەکانەوە.

٢/ ئینگلیزەکان بە هەمان شێوەی پرتوگالی و ئیسپانی و فەرەنسیەکان ، لە گەشتەکانی دۆزینەوەیاندا بەدوای زێڕ و بەهاراتدا دەگەڕان، بەڵام کاتێک جێگیر دەبون لەو دونیا نوێیە بەتایبەتی کەنارەکانی باکووری ئەمریکا ئیتر وازیان لە گەڕان بەدوای زێر و بەهارات دەهێنا، بایەخیان بە زەویەکان دەدا و دەیانچاندن تا بەرهەمی لە زێڕ بەسودتر وەبەربێنن، پۆرتوگالی و ئیسپانی و فەرەنسیەکان پێویستیان بە دانیشتوانە رەسەنەکان هەبوو بۆ پەیدا کردنی زێڕ، دوای ئەوە بۆ پەیدا کردنی کرێکار بە نرخێکی هەرزان بە رێگایەکی یاسایی یا نایاسایی. بەڵام ئینگلیزەکان کاتێک شوێنێکیان داگیر دەکرد دانیشتوانەکەیان لەناو دەبردن یا دوریان دەخستنەوە ئینجا کۆمەڵگایان لێ دروست دەکرد.

و: خالید هەرکی

کۆلۆنیەکانی ئینگلیزی لە سنووری کەنەدای فرەنسیەوە تا ئەوپەڕی باشوور هیچیان لەیەک نەدەچوون، جیاوازیی زۆر لە نێوان کۆلۆنیەکانی باکوورو باشووردا هەبوون:

ا/ لە باشوور سیستەمی ئرستوکراتی پیادە دەکرا ، لەسەر بنەمای پانتایی زەوی کاریان بەو کۆچبەرانە دەکرد کە لە ئەفریکا هێنابویان، ژمارەیان لە سپی پێستەکان زیاتر بوو.

ب/ لە باشوور شارەکان کەمتر بوون لەوەی باکوور.

ج/ لە باکوور ستستەمی دیموکراسی کاری پێدەکرا زەویەکان لەلایەن سپیپێستەکان خۆیانەوە بەکار دەهێندران، شاری مەزنیان هەبوو مولکدارو بازرگانی تیا دەژیا خاوەن مولک و دەولەمەندەکان زیاتریان لە باکوور دەژیان. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی چینی باڵای کۆمەلگەکان لە چینی مامناوەندیی بازرگان و خاوەن کێلگە کشتوکاڵیەکان پێکدەهاتن. لە تەنیشتیانەوە ژمارەیەکی کەمی دەولەمەند هەبوون، ئەوانیش نمونەی بازرگان و مولکدارەکانی ئینگلیز بون کە دانیشتوانی ئەو شوێنانەیان لەناوبرد بوو یا کۆچیان پێکردبون، وەکو هندیە سورەکان و هەندێکی تریان لە ئەفریکاوە هێنابون بۆ خزمەتکردنی خۆیان و کۆیلایەتی.

حوکمداری لەو کۆلۆنیانە لەسەر سێ بنکە بەسترابۆوە :

١/ حاکم .

٢/ ئەنجومەنی راوێژکاری.

٣/ ئەنجومەنی نوێنەران .

پادشا حاکمی دایدەمەزارند، ئەو فەرماندەی پارێزگاکە و بەرپرسی پاراستنی ئاسایش و چاودێری بەرژەوەندیەکانی کۆلۆنی بوو، بەو مەرجەی زیان بە بەرژەوەندیەکانی کۆشک نەگەیەنێ. مافی رەتکردنەوەی بڕیارەکانی هەردوو ئەنجومەنی هەبوو، هەرچەندە ئەنجومەنی راوێژکاری دەسەڵاتێکی بەهێزی نەبوو، ئەنجومەنی نوێنەران لە شێوەی ئەنجومەنی گشتیی بوو، لەلایەن گەل دەهاتە هەلبژاردن. دەسەڵاتی سەپاندنی باج و دەستکاری کردنی موچەی فەرمانبەرانی هەبوو تەنانەت هی حاکمیش، دواجار ئەم ئەنجومەنە توانیی خۆی بەسەر حاکمدا زالکا و خەسلەتی حوکمی ئۆتۆنۆمی لە چوارچیوەی سەروەری پادشایەتی بەریتانی بە دەسەڵات بدا.

داگیرکاری بەریتانی ئەنجامەکەی یا بە ئۆتۆنۆمی یا بە جیابوونەوە لە نیشتمانی دایک کۆتایی دەهات، چونکە بنیادنانی ئەو کۆلۆنیە نوێیانە لەسەر بنەمایەکی ئەوروپی و ئینگلیزیی نوێ دادەمەزارن بۆیە دامەزراوەی کۆمەلایەتیان جیا دەبوو لەگەڵ دامەزراوەی کۆمەلایەتی کۆمەلگای کۆن، بە شێوەیەکی دی بلێیم شێوازو بنەمای حوکمڕانی لەسەر سیستەمی حوکمی گەل و پەرلەمان و دامەزراوەی نوێ دروست دەبوو.

ئەو ئەگەرە دوور بوو دانیشتوانی وڵاتانی داگیرکراو ببنە هاوڵاتیی ئینگلیزی، دواتر داگیرکەر خۆی پێویستی بە دروستکردنی کەساتیەکی نوێ هەبوو ئەوە نەبێ بگاتە ئاست خۆی لە روی بیرکردنەوە. ئەگەر خۆیان بۆ ئاستی ئەوان دابەزێنن ئەوا دەبێتە شەڕمەزاری و ماکێکی رەش، بۆیان ، ئەگەر ئەم دەستەواژە و پێوەرە بۆ نەوەی یەکەمی داگیرکراو لە سەدەی حەڤدەهەم گونجاو بێ ئەوا بۆ نەوەی داهاتو ئەمەی قەبول وگونجاو نیە، چونکە ئەوان بەوە رازی نەدەبوون ئاستی بیرکردنەوە و کۆمەلایەتیان لە ئاستی بیرکردنەوە و کۆمەلایەتی ئینگلیزەکان کەمتر بێ.

کاتێک هەستی یەکسانی و هاوتەریب لە توانایی لە نێو ئینگلیزەکانی بەریتانیا پەرە دەسەنێ پێیان وابوو توانای ئەوان لە هی پادشا و حاکمەکان کەمتر نیەیە کە دەتوانن کۆلنیالەکان ببەن بەڕێوە هەروەکو پادشاکان دەیبەن بەڕێوە، لەم کاتە هەستی زاڵ بوون و دەسەلاتی رەها لای پادشا دروست دەبێ بەتایبەتیش بیرۆکەی دابڕاندنی کۆلۆنیەکان لە نیشتمانی دایک، دیارە ئەم بیرۆکە لەگەل بیرکردنەوەی دانیشتوانی کۆلۆنیەکان دێنەوە، بەڵام ئەم کۆلۆنیانە دەبێ سەربە حکومەتی دایک بن ئەگەرنوێنەریشیان لە پەرلەمانی لەندەندا نەبێ دەبێ ئەوەیان قەبول بێ کە لە ژێر سەروەری بەریتانیا دان ، پێیان خۆش بێ یا نەخۆش.

مێژونوسەکان ئەوەیان لەبیرکرد کە ئاماژە بەوە بدەن ئەگەر دانیشتوانی ئەو کۆلۆنیانە ئەوروپی بن یا ئەوروپی نەبن، چونکە ئەمە لەسەر کۆلۆنیەکانی ئینگلیزی جێبەجێ ناکرێ کە لەژێر حوکمڕانی مافی ئۆتۆنۆمی دابوون و بە گیانێکی ئەوروپیانە جۆش و پەرەردە کرابون، خۆراک و ئەدەبیاتیان لە سەدەی هەژدەهەم بە هزری ئەوروپیی پێشکەوتوخواز پێدرابوو کە ئەنجامەکەی شۆڕشی فرەنسیی مەزنی لێ دەکەوێتەوە.

دەکرێ ئەم بیرکردنەوانە بۆ ماوەیەک کپ بکرێن، بەڵام ئەمڕۆ بەگژیەکدا چونی بەرژەوەندیەکانی ئابوریی دنیشتوانی کۆلۆنیەکان و حکومەتی بەریتانی ئاسان نیە بشتگوێ بخرێن. بەتایبەتی دوای ئەوەی خەرجیەکانی حکومەتی بەریتانی لە ئەنجامی شەڕی

حەوتساڵ ە توشی قەیران و ئاستەنگی دارایی دەبێ و بیرکردنەوەی حکومەتی بەریتانی بە ئاراستەی ئەوەی زۆرینەی ئەو خەرجیانە بخاتە سەر ئەستۆی کۆلۆنیەکان و مەسروفی دامەزراندنی سوپایەکی نوێیان بخاتە سەر، ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێ حکومەتی بەریتانی پاساوی ئەوەی بەدەستەوەیە باجی زیاتر بخاتە سەر هاولاتیانی.

لەم روەوە دانیشتوانی کۆلۆنیەکان بۆچونێکی جیایان هەبوو لەوەی حکومەتی بەریتانی هەیبوو، پێیان وابو بارکردنیان بە تێچوی دامەزراندنی سوپایەکی جێگیر ئەوکاتە دەبێ کە کاری پێیان نەماوە، دواتر سەپاندنی باجی زیاتر بەسەر کۆلۆنیەکان مانای ئەوەیە روخساری حوکمی ئۆتۆنۆمی وەلا دەنێ چونکە ئەوان نوێنەریان لە پەرلەمانی بەریتانیدا نییە ئیتر باجی چی ، ئەو پەرلەمانەی پێگەکانی لەسەر بنەمای بڕوای مەزن without Representatio No taxation چەسپاند، واتە (هیچ باجێک بەبێ نوێنەری گەل لە پەرلەمان نابێ.)

بەڵام ئەم ئارەزوانەی لەلایەن پادشای ئینگلیز جورجی سێیەم و حکومەتەکەی ئاوەژوی ئامانجەکانی دەبنەوە.

پادشا پەنای بۆ مافەکانی خۆی برد کە مافی سەروەری و دەسەڵاتی رەهایە بەسەر کۆلۆنیەکان، سەپاندنی باجیش یەکێکە لەو مافانەی ئەو، بەم شێوە هەردووکیان دوو رێگای لەیەک جیایان گرتە بەر.

لەم پرسە پادشای ئینگلیز پێداگریەکی توندی کرد، تاکی ئەمریکیش دەستی بە کەساتی خۆی و کیان و مافەکانی خۆیەوە گرت کە وەکو کەسێکی ئەوروپی مافی خۆیەتی لەگەڵ براکەی لە دورگەی بەریتانی بە یەکسانی بژی.

ئەمە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە حکومەتی بەریتانی چەندە سوربوە لەسەر سەپاندنی باج لەدوای باج بەسەر هاولاتیانی کۆلۆنیەکان.

کاتێک لە ١٧٦٥ حکومەتی بەریتانی بڕیاریدا (باجی مۆر) بەسەر هاوڵاتیانی کۆلۆنیەکاندا بسەپێنێ بەو هۆیەوە نارەزاتیەکی توندی لێکەوتەوە، ئەوان پێداگریان لەسەر مافەکانی خۆیانکرد بۆ دانی باج، بەو هۆیەوە لە ١٧٦٥ کۆنگرەیەک لە نیویۆرک دەبەسترێ تیایدا نۆ ویلایەت بەشداری دەکەن، کارێکی هاوبەش لەو کۆنگرەیەدا کرا تیایدا بڕیاریاندا داوا لە حکومەتی بەریتانی بکەن ئەم باجە هەلوەشێنێتەوە .

لەراستیدا حکومەتی بەریتانی باجی مۆری هەلوەشاندەوە، بەڵام مافی سەپاندنی باج بەسەر کۆلۆنیەکان بەدەستی پەرلەمان هێشتەوە، کێشەکە هەر مایەوە بنبڕ نەکرا ئاگری ژێر خۆلەمێش بوو، لە ١٧٧٠ ئەوکاتەی حکومەت لە بۆستن باج دەخاتە سەر چای و بە هێز بەسەریاندا دەسەپێنێ کوشتارێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە . ئێستا پرسی مانەوە و هەلوەشاندنەوەی بڕیاری سەپاندنی باجی چای بەسەر هاوڵاتیان ، بوە ململانێی نێوان دکتاتۆریەتیی حکومەتی بەریتانی و مافی گەل لە خۆبەرێوە بردن و حوکمڕانی.

حکومەت بەردەوام دەبێ لە سەپاندنی باجی چای، گەلیش بەردەوام دەبن لە بایکۆت کردنی چای ئینگلیزی، لە ئاهەنگی چای لە بۆستن لە ١٧٧٣ وەکو ناڕەزایی چای فڕێ دەدەنە ناو دەریا، هەرکە حکومەت و پادشا بەندەری بوستن دادەخەن ئەوان داوای هاوکاری کاسۆلیکەکانی کەنەدا دەکەن دژی داگیرکاری ئینگلیز لە ویلایەتەکان. هاوڵاتیانی داگیرکراو تورەبونیان زیاد دەبێ، لە ١٧٧٤ لە فیلادلفیا کۆنگرەی ویلایەتەکانی ئەمریکی گرێدەدەن و لەو کۆنگرە کۆنگرێسی یەکەمی ئەمریکیان دامەزراند، پێکهاتبوو لە نوێنەری ئەو ویلایەتانەی بشدار ببون لە کۆنگرەی فیلادلفیا.

لەم کۆنگرە داوای جیابونەوەیان نەکرد بەڵام هۆشداریان دایە گەلی ئینگلیزی کە حکومەتەکەیان ئاگاداریان دەکاتەوە لە هەلگیرسانی شەڕ لە نێوان کاسۆلیکەکانی کەنەدا و هاوڵاتیانی پرۆتستانتی کۆلۆنیەکانی ئەمریکی. کۆنگرە داوای وەستانی کاری توندو تیژیان لێ کردن . بەڵام حکومەتی بەریتانی لە کارەکانی بەردەوام دەبێ و هێزی زیاتری نارده بۆستن ، شەڕ دەستیپێکرد، ئاشکەرایە کە گەڕانەوە بۆ هەمان ئاستی جاران لە پەیوەندیەکان کارێکی ئەستەمە. لە ماینی ئەم دۆخە کۆنگرەی دووەمی ئەمریکی لە ئایاری ١٧٧٥ لە فیلادلفیا دەبەسترێ، ئاراستەیەکی بەهێز هەبوو لەم کۆنگرە کە کۆلۆنیەکان خۆیان حکومرانی خۆیان بکەن و سوپای بەرگری تایبەتی خۆیان دامەزرێنن.

دوا دەرفەت هەبوو بۆ گەیشتن بە چارەسەریەکی ئاشتیانە کاتێک کۆنگرە نامەیەک ئاراستەی پادشا جۆرجی سێیەم دەکا داوای پێداچونەوە بە بڕیارەکانیدا دەکا، بەڵام لای پادشا پرسی سەروەری لە سەروی هەموو پرسەکانەوە بوو، بۆیە بڕیاریدا بە دەستێکی پۆلایین لە شۆڕشگێڕەکان بدا، ئیتر چارە نەما ویلایەتەکان لە ٤ی ئەیلولی ١٧٧٦ سەربەخۆییان ڕاگەیاند. لەسەر ئاستی ناوەخۆو نێودەولەتی دوو هۆکاری سەرەکی هەبوون بۆ سەرکەوتنی شۆڕش و بزووتنەوە سەربەخۆییەکان:

و: خالید هەرکی

١/ گەلێک هێزی ئەورووپی هەبوون، بە دڵەراوکێ چاویان بڕیبوە بەریتانیا کە لەم هەموو شەڕانەی نێودەولەتی لە سەدەی هەژدەهەم بە سەرکەوتویی دەردەچێ، ئەوەتا فرەنسا لە بەرژەوەندی ئینگلتەرا هەموو کۆلۆنیەکانی لە هەردوو دونیای کۆن و نوێ لە دەستدان، ئیسپانیا پێێ وابو بەریتانیا مافەکانی خۆی بەدەست گەیشتوە لە دەریا و لە بازرگانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی خۆش نەبوو دەولەتێکی سەربەخۆ بەجیا لە ئەمریکا دروست بێ کە پێشتر کۆلۆنیی ئیسپانی بوونە. ئیترمەترسیەکانی بەریتانی لەسەر ئیسپانیا زیاتر بوون لە مەترسیەکانی ئەمریکا لەسەر ئیسپانیا. بەشداربونی فرەنسا لە شەڕی دژ بە بەریتانیا هاندەرێکی باش بوو تا ئیسپانیا و دواتریش هۆڵەندا لەو شەڕە بەشدار بن کە ویلایەتەکانی ئەمریکی دژی بەریتانیا هەلیان گیرساندوە.

٢/ بانگەوازەکانی ئەمریکا لە ئەورووپا گوێیان لێدەگیرا، چونکە ئەوان هەلگری هزرو بیرێکی ئەورووپی بوون ، لەم رووەوە لەیەک نزیک بوون، هەندێک دیدی ئەورووپیش هەبوون کە ئەوان لە ئەمریکا شوێن بەریتانیا بگرنەوە، بەتایبەت لەروی ئالوگۆڕی بازرگانی، گومان لەوەدا نەبوو فرەنسا لە پێناو ئەوانەی بەدەست بەریتانیا دەچەوسێندرێنەوە ئامادەیە قوربانی بە سامان و رۆلەکانی بدا و هاوکاری شۆڕشی ئەمریکی بکا.

بەڵام بۆچی حکومەتی بەریتانی شکستی لە سەرکەوتن بەسەر شۆڕشی ئەمریکادا هێنا و نەیتوانی بەسەریاندا زاڵ بێ و لەچەندنین رووبەڕوو بوونەوە شکستی هێنا؟ کەچی پێشتر بەریتانیا لە هەرشەرێک بەشداریی بکردبایە تێیدا سەردەکەوت بەتایبەتی لە پچراندنی هێلەکانی هاتوو چۆی ئەورووپا و فرەنسا بە کۆلۆنیەکانیەوە . ئەمە لەبەر ئەوەبوو کە بەرنامەی بەشداری پێکردنی کەشتیگەلی بەریتانی بۆ پچراندنی هێلی گواستنەوە لە ئارادا نەبوو تا ئەو کاتەی فەرنسا بەشداری شەڕ دەکا. بەریتانیا تەنها پێویستی بە سوپای وشکانیی مەزن هەبوو تا لەسەر وشکانی شەڕی ئەمریکا بکا، ئەو شەڕی لەگەڵ گەلێک دەکرد نەک لەگەڵ سوپایەکی ئەودیو دەریا، بەڵام ئەم دۆخانە وزە و توانا بە هێزەکانی ئەمریکی دەبەخشێ وێڕای ئەوەی ئەمریکیەکان خاوەنی پرسێکی رەوا بوون بەرگریی لێیدەکرد و فرەنساش بوە هاوکاری لەم شەڕەی دادپەروەریەیدا.

سەرکەوتنەکانی ئەمریکی یەک لە دوای یەک بەردەوام دەبن تا شکست بە هێزەکانی بەریتانی دێنن، دوایین شکستەکانی رادەست بونی فەرماندەی بەریتانی ( کورنوالس) لە ئۆکتۆبەری ١٧٨١ بوو، کە لە ئەنجامی بەزینی کەشتیگەلی بەریتانی لە کەنارەکانی ئەمریکا بە هۆکاری هاوکاریەکانی فرەنسیەوە دەبێ.

کە بەریتانیا ناتوانێ لە رێگەی شەڕەوە بە ئامانجەکانی بگا ناچار ئامادە دەبێ لە ١٧٨٣واژۆ لەسەر پرۆسەی ئاشتی بکا. بەپێی ئەو رێککەوتنە حکومەتی بەریتانی دان بە سەربەخۆیی ئەمریکا دەنێ و روباری مسیسپی دەکاتە سنوورەکانی رۆژئاوای. ئەوەندە نابا پەیوەندیی نێوان حکومەتە سەربەخۆیە نوێکە و حکومەتی بەریتانی خۆش و ئاسودە دەبێ، بەڵام حکومەتی شۆرشی فرەنسی مەزندەی ئەوەی دەکرد دوای سەربەخۆیی حکومەتی ئەمریکا پشتیوانیی لێدەکا لە ئەگەری روودانی شەڕ لەگەڵ بەریتانیا لە ١٧٩٣، وەکو پێدانەوەی چاکەی فرەنسا لە هاوکاریکردنی لە شەڕی نێوان ئەوو بەریتانیا، بەڵام حکومەتی شنتون لەژێر کاریگەری پەیوەندیەکانی ئابوریی نێوان خۆی و بەریتانیا بڕیاریدا لەو ناکۆکیانەی نێوانیان بێلایەن بوەستێ ، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو حکومەتی ئەمریکی لە ١٧٩٤ رێککەوتنێکی بازرگانیی لەگەڵ حکومەتی بەریتانی واژۆ کرد، ئەمە بوە هۆکاری تێکچونی پەیوەندیەکانی نێوان فرەنسا وئەمریکا. هۆکارێکی دیکەی تێکچونی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و فرەنسا، ئەوەبوو کە فرەنسا لەسەردەستی ناپۆلیۆن (لویزیانا)ی ئیسپانیی دەست بەسەردا گرت و ئەمریکاش خۆی بۆ نیولیانز مەلاس دابو ، بەمەبەستی تەواو کردنی سنوورەکانی

بەڵام هەردوولا مابەستیان ئاشتی و لەیەک تێگەیشتن بوو، بۆیە ئەمریکا لە رێگەی کڕینەوەی لویزیانا و نیو ئورلیانزی دەست کەوت، بەو هۆیەوە گەیشتنە رێگە چارەیەک چونکە ناپلیۆن لەوە ئاگادار بوو کە ناتوانێ بەرگری لە نیو ئورلیانز بکا ئەگەر مکوڕبێ لە داگیرکردنی.

پێداگری لە دەست بەسەرداگرتن واتە کەوتنە جەنگ لەگەڵ ئەمریکا، ئورلیانزیش کلیلی مسیسپیە، دواتر دۆخەکانی نێوان بەریتانیا و فرەنسا لە ١٨٠٣ وردە وردە بەرەو گرژی و شەڕ دەچون ، هێور بوونەوەی پەیوەندیی نێوان ئەمریکا و فرەنسا لە بەرژەوەندی فرەنسادایە، ئەمە تاقە رێگەی دژ بە بەریتانیا بوو.

هەر بە دروستیش ئەمرکا مەبەستی بوو بێلایەن بوەستێ لەو شەڕی نێوان بەرەیتانیا و فرەنسا، بەڵام ئەو گەمارۆ دەراییەی بەریتانیا بەسەر ئەمریکایدا سەپاندبوو وەکو کاردانەوەی گەمارۆکەی ناپۆلیۆن بوو بەسەر بەریتانیا، ئەمە بوە مایەی ئەوەی کەشتیەکانی ئینگلیزی کەشتیەکانی ئەمریکی لە دەریا بپشکنن ، ئەمریکیەکان بەم کارە رازی نەبون، کاتێک ئینگلیزەکان سوربون لەسەر ئەم رێکارە شەڕ لە ١٨١٢ لە نێوانیان روو دەدا، تا ماوەیەک درێژەی دەبێ تا ئەوکاتەی لە ١٨١٤ لە رێککەوتنی خنت Chent ئاشت دەبنەوە، بەو

و: خالید هەرکی

ڕێککەوتنە کارەکان دەگەڕێنەوە سەر ڕێڕەوی جارانی خۆیان، بە تایبەتیش دۆخی ئەورووپا بە ڕوخانی ناپۆلیۆن گۆڕانی تێدەکەوێ.

## سیستەمی حوکمڕانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

لەو کاتەی گەلی ئەمریکی لە شەڕی سەربەخۆییدا بوون دووچاری کێشەیەکی دیکەی ئالۆز بوونەوە، ئەویش شێوازی حوکمڕانی داهاتوی وڵات بوو. کۆلۆنیەکان حوکمێکی ئۆتۆنۆمیان هەبوو بە ئەنجومەنەوە، یەکخستنیان بە دەولەتێکی نەتەوی کارێکی دوور بوو. دۆخی شەڕ پێویست بە یەکگرتن و پێکهێنانی هاوپەیمانی دەکا، بۆیە دەبوایە ئەم ویلایەتانە لەنێو خۆیاندا یەکگرن و لە ئاستی سەربازی کوتلەیەک پێکبێنن، بەم شێوە یەکێتی فیدرالی لەنێوان ویلایەتەکان لەدایک دەبێ کە بە ویلایەتە یەکگرتووەکان ناونرا.

دیاربوو ڕێککەوتنێکی نیمچە سەرتاسەری لەسەر ئەوە هەبوو کە وڵات حوکمێکی دەستووریی هەبێ بۆیە دوای تەواو بوونی شەڕی سەربەخۆیی کاریان لەسەر دانانی دەستورێک کرد کە هەر سیانزە ویلایەتەکە پێی ڕازیبن.

یەکەم کێشە کە بەرۆکی دانەرانی دەستوری گرت، ویلایەتە بچوکەکان پێداگریان لەسەر ئەوەدەکرد کە هەر ویلایەتێک لە پەرلەمان یا کۆنگرێس خاوەنی یەک دەنگ بن ،بێ گوێدانە ژمارە یا ڕوبەری ئەو وڵاتە، هەرچی ویلایەتە مەزنەکان بوون ئەمەیان پێ قەبول وراست نەبو، ئەمەش بوە مایەی ئەوەی دوو ئەنجومەنی کۆنگرێس دامەزرێنن.:

١/ ئەنجومەنی نوێنەران: لەسەر ڕێژەی ژمارەی هاوڵاتیان ئەندامەکانیان دیاری دەکرد و هەڵدەبژێردرا..

٢/ ئەنجومەنی پیران: بۆ ئەم ئەنجومەنە هەر ویلایەتێک بێ گوێدانە ژمارەی دانیشتوانەکەی دوو ئەندامی دەبێ.

لە دەستووردا هاتبوو کە هیچ یاسایەکی داڕێژراو کارا نابێ تا هەردوو ئەنجومەنەکە ڕەزامەندیی لەسەر نەدەن، دەسەڵاتی جێبەجێکردنیش دەکەوێتە دەست ئەو سەرۆکەی کە حزبەکەی لە هەڵبژاردن بە دەنگی زۆرینە دەردەچێ. دیارە لە سەرەتاوە سیستەمی حزبایەتی لە ئەمریکا دوو حزبی بووە، بەدەر لە هەندێک جارانی کەم.

لە ئەرمیکا وەکو هەر دەولەتێکی دیکەی ئەوروپی ئەنجومەنی وەزیرانی نییە، بەڵام سەرۆک دوای دەرچونی لە هەلبژاردنەکان، خۆی سکرتێر دادەمەزرێنێ، بۆ هەر بوارێک بەرپرس و وەزیر خۆی دەستنیشانی دەکا، ئیتر ئەوان لەبەردەم ئەودا بەرپرسیارن لە جێبەجێکردنی سیاسەتی وڵات. وەکو پیادەکردنی بنەمای (جیاکردنەوەی دەسەڵات) دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆیە هیچ پەیوەندیەکی بە دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجیکردندا نییە، سیستەمی حکومرانی کە لە دەستوری ١٧٨٨ سەرجەم ویلایەتەکان (١٣ ) رەزامەندیان لەسەریدا بەم شێوە هاتووە.

گومان لەوەدانیە کە دەستوری ئەمریکی رەچاوی دۆخی تایبەتی ئەمریکا و مافەکانی مرۆڤ دەکات، لەسەر ئەو بنبەمایە بانگخوازانی رەوتی هزر و بیر لەو سەردەم دایانرشتبوو، لە نمونەی مونتسکیو خاوەنی ( رۆحی یاسا ). هەروەها دەستوری ئەمریکی هەندێک برگەی لە دەستوری بەریتانی وەرگرتوە.

بەڵام دانەرانی دەستوری ئەمریکی نەگەیشتوWنەتە ئەو ئاستەی وەکو مرۆڤێک لە پێناو مرۆڤدا کار بکەن، بێ گوێدانە رەنگ و رەگەزی مرۆڤ، بەپێێ ئەو دەستور مافەکانی مرۆڤ تایبەتە بە ئەوروپیەکانەوە یا هەلگری کەلتوری ئەوروپی. بەدەر لەمانە هیچ بەهایەکیان بە مافەکانی مرۆڤ نەداوە.

شاراوە نیە کە شۆڕشی ئەمریکی مافەکانی رەشپێستیان پێشێل کرد هیچ بەهایەکیان بۆیان نەداناوە، ئەوانیان وەکو کۆیلە و بۆ خزمەت خۆیان بەکاریان هێناون، مامەڵەیەکی دڕندانەیان لەگەڵدا کردون.

# بەشی حەڤدەهەم

## ئەوروپا لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم

لە کۆتـایی سـەدەی هەژدەهەم بە دەرکەوتنـی پرۆسـیا و رووسـیا ، هاوسـەنگ و ناوەندی هێز دەگۆڕدرێ. ئەمە و زاڵبـوونی بەریتانیـا لەودیـو دەریـا و بـووژانەوەی کودەتـای پیشەسـازی، بـوونە مـایەی ئەوەی بەریتانیـا ببێـتە دەولەمەنـدترین دەولەتـی ئەوروپـی و خۆشـگوزەرانترینیان و خـاوەنی مەزنتـرین کەشـتیگەل، وێـڕای ئەوەی ژمـارەیەکی زۆری کۆلۆنییەکـانی لە ئەمریکـا دوای شۆڕشـی سـەربەخۆیی لەدەسـت دابـوور. فرەنسـاش کە لە جەنگەکـانی سـەدەی هەژدە تەواو ببـو بێهێزتـرین دەولەت بـوو ، لاوازتـر لەوەی سـەردەمی لویسـی چـواردەهەم. بەڵام پـێگەی نێـودەوڵەتیی لە شارسـتانێتی ئەوروپـا و ئاراسـتەکردنی سیاسەتی نێودەولەتی لەدەست نەدابـوو، ئەو پـێگەی کە لە ئەنجامی هاوپەیمانێتی لەگەل شۆڕشگێڕەکانی ئەمریکا وەدەستی هێنابوو تـا ئەوکـاتەی دەوڵەتـانی ئەمریکـی سـەربەخۆیی خۆیـان وەدەسـت دێـنن فرەنسـا لەم ئاسـتە مـایەوە. ئیمپراتـۆریەتی رۆمـانیی پیـرۆز ( ئیمپراتۆریەتی نەمسایی ) هەمان کەلتوری ئیمپراتۆریەتی مابۆوە کە لە چەرخی ناوەڕاست بە رووداوەکـانی دونیـای کـاس کردبـوو، ئەمە وێـڕای ئەو شکسـتانەی لە سـەدەی هەژدەهەم هاتە سەری وئەو لەبەریەک هەڵوەشانەوەی بەسـەر جەسـتەیدا هـات، لەگەڵ ئەمەشـدا وەکـو هێزێکی مەزن لە نێوجەرگەی ئەوروپا دەمێنێتەوە، دۆخـی جـوگرافیی ئیمپراتـۆریەت ئەوەی بەسەردا کردە ئەرک کە بەردەوام دەبێ چاوی لەو پێشکەوتنانەی رووسی بێ کە لە نـاوچەی بەلکان لەسەر دەوڵەتی عوسمانیی بەدەستی دەهێنا، دەوڵەتی عوسمانی لە کۆتایی سـەدەی هەژدەهەم نیشانەکانی پیربوونی زۆر بە روونی پێوە دیار بوون. بەتـایبەتی دوای پەیماننـامە شـەرمەزاریەکەی ١٧٧٤ ی لەگەڵ رووسـیا، دوای ئەو هاوپەیمـانیتیە موڵکەکـانی دەولەتـی عواسمانی لە بەلکان بـوونە مەیـدانی کێبەرکـێ لە نێـوان هێزەکـانی رووسـی و نەمسـایی بـۆ دەسـت بەسـەردا گـرتن. لەهەمـان کاتـدا دەبـوایە ئیمپراتـۆریەتی نەمسـایی چـاودێری جووڵانەوەکانی سیاسی و سەربازیی پرووسیا بکا تا بە تەنیا هەلەکان نەقۆستەوە.

لەم جۆرە دۆخانە دەبێ نەمسا باری قورس هەڵگرێ، وێڕای بەرفراوان بوونی بەڵام کەوتبووە ژێر بارێکی قورسی دارایی ئەمەش بۆ هەڵوەشانەوەی سیاسیی ناوەخۆی دەگەڕێتەوە، میرنشین و ویلایەتی زۆری لە ئەڵمانیا هەبون، کارێکی ئەستەم بوو ئەو میرنشین و ویلایەتە پەرش و بلاوانە لە سەربازی و سیاسی لە ژێر یەک چەتر کۆیان کاتەوە، دواتر حکومەتی نەمسایی پێی کارێکی قورس بوو باج لەم میرنشینە پەرش و بلاوانە بستێنێ، ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە چەندین نەتەوە پێکهاتبوو هەر چاکسازییەکی ئەنجام بدابا نەتەوەیەک پێی رازی دەبوو بەڵام نەتەوەکانی دیکە دژی دەوەستانەوە بۆیە نەیدەتوانی بڕیارەکانی بە سەرتاسەری جێبەجێ بکا.

یەکێک لە گرفتەکانی بیرۆکەی چاکسازی ئەوەبوو کە موڵکەکانی ئیمپراتۆریەت لەیەک دوو روو بڵاوبوون، هەندێکیان لە رۆژئاوای ئەوروپا بوون، لەسەر سنووری فرەنسا وەکو بەلژیک ، ئەمە ناوچەیەکی سەخت و پڕ ئالۆزی بوو، لەولا تریش لەو پەری رژهەلات هەبیوو، وەکو مەجەر کە لەژێر دەستی نەمسا دەینالاند ئامادەی هەڵگیرساندنی شۆرش بوو، لە ئیتاڵیا دەستی ئیمپراتۆریەتی نەمسای بەسەریانەوە درێژ بوو، ئەم پەرش و بلاویە لەلایەک و بوژانەوەی رووسیا لە لای رۆژهەلاتیەوە و پرووسیا لە لای باکووری رۆژئاوایەوە لەلایەک، ئەمانە هەمووی هۆکاری گرفتەکان بون لەبەردەم حوکمرانی ئیمپراتۆریەت لە ڤیەننا.

پێمان وایە هەڵوێستی ئیمپراتۆریەتی نەمسایی لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم ووردترین هەڵوێستی سیاسی بوو لە کشوەر، بەهۆی نەبوونی متمانە لە نێوان پرووسیا و رووسیا و نەمسا بەرانبەر بە بەرپرسیارێتی ئەوروپیانەیان لە یەک هەوڵێستیان بەرانبەر بە بونی عوسمانیە ئیسلامیەکان لە بەلکان، هەرکاتەی هەلوێستی نێودەوڵەتی تووشی قەیران دەهات ئیمپراتۆریەتی نەمسایی لە چەندین بەرە دووچاری شەڕ دەبۆوە، ئەمەش بۆ ئەو بارێکی گرانە.

لەتەک ئەم دەولەتە مەزنانە، هەندێک دەوڵەتی مامناوەندی لە رووی هێزەوە لە ئەوروپا هەبون، کە کۆلۆنی زۆریان لەودی و دەریاوە هەبوون، مەبەستمان زەوییە نزمەکان یا هۆڵەندا بوو، رۆلی هەبوو لە ململانێکانی داگیرکاری و قەیرانە نێو دەولەتیە مەزنەکان کە دوای شۆڕشی فرەنسی سەریان هەڵدا یا لە کاتی جەنگی ناپۆلیۆن.

تا ئەوکات ئیتاڵیا تەنها دەربڕێکی جوگرافی بوو، هەندێک شانشینی سەربەخۆی هەبوون یەکێکیان لەوپەڕی باکووری رۆژئاوا بوو لەسەر سنوورەکانی فرەنسا، ئەویش شانشینی

و: خالید هەرکی

سەردینیا ( بیدمونت ) بوو، ئەویتریان لەوپەری باشوور بوو شانشینی ناپۆلی بو کە بەسەر نیوەی ئیتاڵیای باشووردا زاڵ بوو. لە یئتالیا دوو کۆمار هەبوون، کۆماری بوندقیە ( ڤینیسیا ) لە باکووری رۆژهەلات و کۆماری جنوەی رکابەری لە باکووری رۆژئاوای ئیتاڵیا، لە ناوەراستی ئیتاڵیا ویلایەتی پاپاگەرایی هەبوون کە لەسەر کەلتوری رابردوو بە شێوازی کۆن دەژیا لێرەو لەوێش چەند میرنشینێکی بەنابانگ هەبون، وەکو مودینا، پارما، تسکانیای بەستراو بە ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆز. میرنشینی میلانی دەولەمەند سەربە ئیمپراتۆریەتی نەمساییەوە بوو.

لە نیمچە کشوەری ئیبیریە دوو دەوڵەتی نەتەوی هەبوون ئەوانیش: ئیسپانیا و پۆرتوگال بوون. بۆماوەیەک یەکیان گرت بەڵام ئەم یەکگرتنە ئەوەندە ناخایەنێ هەڵدەوەشێتەوە ( ١٥٨٠-١٦٤٠ ) هەریەکەیان لەو دیو دەریاوە خاوەنی ئیمپراتۆریەتێک بوون بەڵام ئیمپراتۆریەتەکان کە کاتیان دەهات هەڵدەوەرین، هەردەبێ سەرکەوتنی شۆرشی ئەمریکی و سەربەخۆبونی ئەمریکا گورزێکیکوشندەبێ بەر ئیمپراتۆریەتی ئیسپانی کەوتبێ، ئەم رووداوە پرسی سەربەخۆیی کۆلۆنییەکانی ئیسپانی لە ئەمریکای لاتینیی کردە پرسی کات.

لە ئەورووپای رۆژئاوا جوولەیەکی فکریی باش هەبوو بەناوی بزووتنەوەی ( رۆشنگەری ) دەهاتە ناسین، درێژبووەوەی چەرخی رێنسانس بوو بەڵام لەسەر بنەمایەکی نوێ، توانایەکی بەرزتریان هەبوو لە بلاو کردنەوەی دەستەواژەکان.

ژمارەی دانیشگاکان زۆر ببوون، لە فرەنسا و ئینگلتەرا، ئەکادیمیای ئاست بەرز دەرکەوتبوون رۆژنامەکان لە شارە مەزنەکانی ئەورووپا بلاو ببوونەوە، کەسایەتی ناوداریان لێ هەڵکەوتبوو کە بایەخیان بە هزرو زانست دەدا، ئەم هزرو بیرانە لە رێگەی رۆژنامەکانەوە لە ولاتان بلاو دەبوونەوە، لە شێوەی رۆژنامە و کتێب چاپ دەکران دەگەیەندرانە دەست خوێنەران چونکە هۆکارەکانی هاتووچۆ لە ئەورووپا بەتایبەت لە فرەنسا باش و ئاسان بوو.

لە ساڵ انی سەدەی هەژدەهەم یانە و هۆڵی زانستی دروست کرابون رەوشەنبیر و زانایان لێی کۆدەبوونەوە، ئالوگۆری بیرو هزرەکانیان دەکرد بۆ گوێدانە چینایەتی، کەسانی هەژار لەگەڵ ئرستوکراتەکان بەیەک دەگەیشتن و دیالۆگ و گوتوبێژی زانستی و هزریان دەبرد بەرێوە، ئەمە ش بوە مایەی ئەوەی بیرکردنەوە هزریەکان لە نێوان چینی بۆرژوا و ئورستوکرات و هەژارەکان ئالوگۆر دەکران، لەم ئالوگۆرە چینی بۆرژوا براوەی یەکەم بوو

چونکە ئەوان لایەنگریان لەنێو چینی ئرستوکرات پەیدا دەکرد، ئۆرستوکراتەکان لایەنگریان لە بۆرژواکان لێ بەدەست نەدەهات، تەنها بە کەمی نەبێ.

خاوەنی ئەو هۆلانە لە ژن و پیاوەکان شانازیان بە خۆیانەوە دەکرد کە ئەم زانا و هزرمەندانە هامشۆی هۆلەکانیان دەکەن و لێی دادەنیشن، ئەو فەیلەسوف و زانایانە هەموویان لە چینی بۆرژوا بوون، بۆچونەکانیان لەسەر چینی ئرستوکراتیی فرەنسی هەمویان رەخنە بون لێیان دەگیران، حکومەتی پێ هار دەبوو. بەڵام حکومەت لە توانایدا نەبوو سزای ئەو فەیلەسوف و زانایانە بدا، لە پای رەخنەگرتنیان چونکە خاوەن هۆلەکان لە ژن و پیاوەکانیان بەرگریان لێیان دەکرد و دەیان پاراستن، دیارە دەستڕۆیشتوو بوونە. یەکێک لەو خانمانەی بەهۆی پاراستنی زانا و نوسەرە فرەنسیەکانەوە بەناوبانگ بوو خاتو (بمبادور) بوو، ئەو خانمە دەرفەتی باشی بەو نوسەر و فەیلەسوفە فرەنسیانە دەدا بە هەوەستی خۆیانْ قسە بکەن و گوتوبیژ لەسەر راو بۆچونەکانیا بکەن.

لە تەک ئەو هۆلانە هەندێک کۆمەڵەی نهێنی هەبوون کە شێوازی کارەکانیان زۆر ئاڵۆز بوو، بەتایبەت بۆ وەرگرتنی ئەندامێتی. لە بەناوبانگترینی ئەو کۆمەلانە ( کۆمەڵەی ماسۆنی ) بوو، هەڵگری ئامانجی جیهانی بوون و لە هەموو ئەوروپا بلاو ببونەوە، ئەم کۆمەلە بێئاینە رێورەسمی تایبەتی خۆیان هەبوون، هەر ئەندامێکیان پلەیەکی دیاری هەبوو، پلەی نەدەگۆردرا تا ڕووبەڕووی چەند تاقیکردنەوەیەکی نەکەن، لە بارەگای ماسۆنییەکاندا ئەندامانیان لە چینی بۆرژوا و ئۆرستوکرات لە کەش و هەوایەکی برایانەدا بەیەک دەگەیشتن و راو بۆچون و هەوالەکانی کۆمەلایەتیان ئاڵوگۆڕ دەکردن بەبێ کۆت و بەندی چینایەتی و زۆر بەکراوەیی.

ئەم یانە و هۆڵانەی ماسۆنییەکان هزر و بیرۆکەی سەیریان لەسەر یەکسانی و ئازادی و برایەتی بلاو دەکردەوە، هەندێکیان بانگخوازی ئازادی بوون، لە میانی ئەو ئازادییە رەخنەی توندیان لە هزروان و بیرمەندان دەگرتن بەشێوەیەکی رادەبەدەر، ئاراستەی گفتوگۆ و رەخنەکانیان ڕووبەڕووی سیستەمی پادشایەتی و دەستگرتنی چینی ئۆرستوکراتەکان بەسەر دەسەلات و سامانی ولات دەکرد، پێیان وابوو ئەمە سیستەمێکی کۆنە کەڵکی فرەنسای ئێستا نایە، رەخنەکانیان لە پیاوانی ئاینی و خانەدانەکان دەگرت. لە سەرووی ئەو کەساتیانەی کە کاریگەریان لەسەر شۆڕشی فرەنسیدا هەبوو:

و: خالید هەرکی

١/ ڤۆلتێر. Voltaire

٢/ مونتسکیو. Montesquieu

٣/ جان جاک روسو. Rousseau

دەتوانین بلێین پێگەی ڤۆلتێر لە نێو فەیلەسوف و بیرمەندەکان لە شۆڕشی مەزنی فرەنسی لە ١٧٨٩ لە پێشی پێشەوەدا بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی نوسین و کتێبەکانی باش بڵاو ببونەوە و نوسینەکانیشی لەسەر هێرش بردنە سەر ئەکلیرۆس و کاسۆلیک چڕ کردبونەوە.




تەنها هێرش کردنە سەر ئەکلیرۆس بەس بوو بۆئەوەی سەرنجی هەموو کەسێک بەلای خۆیدا بکێشی، بە تایبەتی ڤۆلتێر خاوەن داهێنانێکی سەیر بوو لە نووسینی گاڵتەجاری، ئەمە وایکردبوو کتێبەکانی چەندین جار چاپ بکرێنەوە و هزر و بیرەکانی بە شێوەیەکی فراوان بڵاو ببنەوە زیاتر لە بەرهەمی فەیلسەسوف و زاناکانی دیکە.

ئەوەی بوە هۆکار و یارمەتیدەری بڵاو بوونەوەی هزرەکانی ڤۆلتێر لە رەخنە گرتن لەسەر حکومەتی فرەنسا و ئەکلیرۆس ئەو شێوازە گەیاندنە بوو کە ڤۆلتێر گرتبویە بەر بە گواستنەوەی بۆچون خواستەکانی خەڵک لە رەخنەگرتن لە حکومەتی فرەنسا و ئەکلیرۆس کە بە گاڵتەجاری لە دانیشتنەکانی گشتی و تایبەتی دەریدەبڕی. یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی پێشوازی کردنی خەڵک لە هزرو بۆچوونەکانی ڤۆلتێر تەنها ئەو شێوازە دەربڕینە نەبوو بەڵکو سەدەی هەژدەهەم بەوە هاتە ناسین کە سەدەی کارکردنی خەڵکە بە ئەقلەکانیان نەک بە کەلتورو جێماوەی کۆن. ئەوان زیاتر لە هاوڵاتیانی هەر سەردەمێک

پێشـوازیان لە بیـری نـوێ دەکـرد، ئەم بیرکـردنەوانەش بەتەواوەتـی دژی پادشـاگەراییەکان وئەکلیرۆس و ئرستوکراتەکان بوون کە دەستیان بە دەستورو کەلتـورە کۆنەکەوە گرتبـوو. بانگەوازی ڤۆلتێر بۆ یەکسانی، هەمووکەسێک لە بەرانبەر یاسا دەنـگ و سـەدای تـایبەتی خۆی هەبوو، ڤۆلتێر دەیوت دەبێ جووتیار زۆر رازی بێ لەو باجەی بەسەریاندا سـەپاندووە، ئەمەش ئەوکاتە دەبێ کە یەکسانی و دادپەروەرییەکی باش پیادە بکرێ، ئەم بانگەوازانە دڵی چینی سێیەمیان خۆش دەکرد و بەپیـریەوە دەچـوون، گیـانی یەکسـانیی بـاجی دەبزوانـد. هەروەهـا ڤـۆلتێر داوای لادانـی هەمـوو ئەو باجـانەی دەکـرد کە خـراونەتە سـەر بازرگـانی لە نێـوان شـارەکان، ئەمەش ئامـانجی بۆرژواکـان بـوو کە لە بەرژەوەنـدی ئەوانـدا بـوو بـۆیە پێشوازییەکی باشیان لێدەکرد، بەم شێوە هزرو رەخنەکانی ڤۆلتێر لە سیسـتەمی حـوکمڕانی پادشایەتی و ئەکلیرۆس لە فرەنسا بلاو دەبێتەوە.

لە راسـتیدا ڤـۆلتێر وەکـو لـۆک و رۆسـۆ خـاوەنی بیـردۆزی حـوکمڕانی نەبـوو، ئەو ئەلتەرنـاتیفی حـوکمی بـۆ فرەنسـا نەبینـیەوە تەنهـا رەخـنەی لێـدەگرتن لە حکـومەت و ئەکلیرۆس، بەڵام خـاوەنی دەسـتی درێـژی روخانـدنی رژێمـی کـۆن بـوو، ئەو پاڵپشـتیەکانی ئۆرستوکراتی روخاند، لە میانی رووخانی ئەوانەوە توانیی پادشاگەرایی رەها و دەسەڵاتەکەی برووخێنی کە ئۆرستوکراتەکان پشتیوانیان بوون، بەم کارەی مەزنترین ئەرکی بەجێ گەیاند، ئەو بوو رژێمی کۆنی وا لێکرد نەتوانێ خۆی لەسـەر پـێ بگـرێ و چاوی لە رژێمێکـی نـوێی شایستە بە فرەنسا بێ.

ئەرکی دارشتنی سیستەمێکی نوێ بـۆ فرەنسـا هەریەک لە مۆنتسـکیو و رۆسـۆ گرتیـانە ئەستۆ، رژێمە کۆنەکە لەسەر بنەمای دەسەڵاتی پادشاگەرایی رەها دەچوو بەرێوە کە بەناوی ( راستی خواوەنـد ) حـوکمی دەکـرد. پادشـا حـاکمی بـاڵا بـوو گـوایە لەلایەن خواوەنـدەوە رێگەپێدراو بوو. بۆیە دەبێ گەل ریز لە پادشا بگرێ و فەرمانەکانی جێبەجـێ بـکەن و نـابێ لێی یاخی بن، ئەم هزر و بیرکردنەوانە هی بوسویەت Boussuet بـوو کە لە سـاڵەکانی (١٦٢٧- ١٧٠٤) بـڵاوی کردبـوونەوە، ئەمەش زۆر لەگە سـەردەمی لویسـی چـواردەهەم دەگونجا، هەندێک بیردۆزی دیکەی دژ بەو هـزرانە دەرکەوتـن بەتـایبەت لەلایەنە فەیلەسـوفی ئینگلیزی (لۆک Lock ١٦٣٢- ١٧٠٤ ) کە داوای سـنووردارکردنی دەسـەڵاتەکانی پادشـای دەکـرد و مـافی هەڵگیرسـاندنی شۆرشـی بە گەل بەخشـی لە حـالەتی ئەوەی پادشـا سنوورەکانی ببەزێنـێ، ئەو بیرکـردنەوانە لەگەڵ گەلـی بەریتـانی دەهـاتنەوە کە دژی پادشـا سـتەمکارەکەیان راپەریـن. ئەم هـزرانەی لـۆک لە ئینگلـتەراوە گواسـترانەوە فرەنسـا،

و: خالید هەرکی

بانگخوازەکەی فەیلەسوفی مەزن مونتسکیو بوو (١٦٦٩-١٧٥٥) خاوەنی کتابی ( رۆحی یاساکان ) کە لە ساڵی ١٧٤٨ دەریکردبوو.

مۆنتسکیو لەسەر رووخاندنی رژێمی کۆن لەگەڵ ڤۆلتێر ناکۆکیی هەبوو، ئەو لەگەڵ لەناوبردنی رژێمی پادشایەتیی کۆندا نەبوو، مەبەستی بوو سیستەمێکی حوکمڕانیی نوێ بخاتە بەردەست هاوڵاتیان، تیایدا ریز لە ئازادییەکانی مرۆڤ بگرن لەسەر بنەمای سنووردار کردنی دەسەڵاتەکانی حاکم. کاری حکومەتیشی بە بەرژەوەندیەکانی سەرجەم گەلەوە دەبەستەوە نەک بەرژەوەندیەکانی پادشا یا ئۆرستوکراتەکان، لەمیانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیدا لەسەر شێوە حوکمڕانیی گونجاو بۆ فرەنسا دیراسەیەکی تێروتەسەلی لەسەر سیستەمی حوکمڕانیی کۆماریی دیموکراسی و کۆماریی ئرستوکراسی و پادشایەتی ستەمکار و پادشایەتی سنووردرار دانابوو.

مونتسکیو سەرەتا لایەنگری سیستەمی کۆماریی دیموکرایسیی نوێنەرایەتی بوو تیایدا گەل سەروەر بێ، پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوی هەبێ. بەڵام دوای سەردانیی بۆ ئینگلتەرا و لە نزیکەوە سیستەمی حوکمڕانیی پادشایەتیی پەرلەمانیی بینی، پێی وابو ئەم جۆرە سیستەمە بۆ فرەنسا گونجاوە. ئەو سیستەمی پادشاگەرایی دەستوریی پەرلەمانیی هەڵبژێردراوی پێ باش بوو کە ریز لە مافەکانی تاک و ئازادییەکانی گشتی بگرێ.

مونتسکیو لەبەر ئەوە رقی لە سیستەمی پادشایەتی نەبوو کە پادشایەک لە لووتکەی دەسەڵاتەکانە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە ئەم پادشایە ستەمکارە و دەسەڵاتەکانی هەموو خستۆتە دەست ئۆرستوکراتەکان، ئەوانیش بە بێ رەوشتانە حوکمی گەل دەکەن و ئازادییەکانیان لێ زەوت دەکەن. رەخنەی توندی لە ئەکلیرۆسە کاسۆلیکەکان دەگرت چونکە بە هۆکاری ئاینەوە خەڵکیان دەچەوساندەوە، بەهۆ ئەو جیاوازیەی لە نێوان کاسۆلیک و پرۆتستانتدا هەبوو، بە دیدی مونستکیو باشتر وابوو بۆ ئەکلیرۆس ببنە نێردەی چاکە و لێبوردەیی و پاسەوانی ئازادیەکانی تاک.

هەرچۆنێکی هەبێ مونتسکیو نموونەیەکی حوکمڕانیی خستە بەردەست گەل کە بەدوایدا دەگەڕان، حوکمێک لەسەر بنەمای ئازادی و دەستور و پەرلەمانێکی هەلبژێردراو و پادشایەکی دەسەڵات سنووردارکراو بێ.

ڤولتێر قەوارەی رژێمی هێنایە لەرزین، ئەوەتا مونتسکیو سیستەمێکی ئەلتەرناتیڤی ئەو سیستەمە کۆنە دادەنێ، ڤولتێر بە حوکمڕانی بۆرژوای باڵا کە لایەنگری ( پادشای

ستەمکاری دادپەروەر ) بون رازی دەبێ، لە شێوازە حوکمی فردریکی مەزن پادشای پرووسیای پێ باشتر بوو. بەڵام مونتسکیو هەنگاوێکی پێشکەوتووترانەی هاویشت چونکە ئەو شێوە حوکمێکی پادشاگەرایی دەستوریی نوێنەرایەتیی دەوێ کە دەسەڵات لە دەست ئۆرستوکراتەکاندا بێ، هەرچی سێیەم فەیلەسوفە مەزنەکەی بەر لە شۆڕشی فرەنسی بوو کە (جان جاک روسو) بوو ١٧١٢٠-١٧٧٨ داوای حوکمی گەلی دەکرد، بەراستی بە ( باوکی دیموکراسی ) دێتە ئەژمار. رۆسۆ سێ کتێبی هەبوون ئەمانیش:

١/ دانپێدانانەکان.

٢/ پەروەردەی ئیمیل ( یا ئەمیل ).

٣/ گرێبەستی کۆمەڵایەتی .

کتێبی دوایینی بوو ئەو ناوبانگەی بە رۆسۆ بەخشی لەسەر ئاستی هەموو دونیا، بەڵام مانای ئەوە نیە بیرۆکە و هزری ناوەوەی کتێبەکە لە داهێنانی رۆسۆ بووە بەڵکو پێش ئەو چەند کەسێکی دیکە درکی پێ کردوە، بەڵام بایەخ و گرنگی ئەو کتێبە لەوەدابوە لە کات و ساتی خۆیدا بلاوکراوەتەوە، لەو کاتەی گەلی فرەنسی لەلایەن رەوتە سیاسییەکانەوە هاندەدران بۆ متمانە پێکردن و داوا کردنی مافەکانی گەل.

جان جاک رۆسۆ فەیلەسوفێکی ئومێدخواز بوو. دیدی تایبەتی خۆی لەسەر ژیان وکۆمەلگا و فێرکاری هەبوو، ئەو کەسێکی یاساناس نەبوو دواتر کتێب و فەلسەفەی سیاسیی لەسەر بنەمای ئومێد و بۆچوون بنیاد نرابوو زیاتر لەوەی لەسەر بنەمای لێکۆلینەوە و توێژینەوە بنیاد نرابێ، ئیتر لێرەوە لایەنی ئەندێشە و خەیال لە کتێبەکەی گرێبەستی کۆمەلایەتیدا بەدی دەکرێ.

بیردۆزی گرێبەستی کۆمەلایەتی بیردۆزە سیاسیەکانی پێشتر رەت دەکاتەوە. پێشتر ئامارەمان بە لۆک دابوو کە داوای ئەوەی دەکرد دەبێ گەل ئیرادەو دەسەڵاتی خۆی بەسەر حاکمدا بسەپێنی، دەبێ گەل ئەو مافەی هەبێ هەرکاتەی ویستی متمانە لەو کەسانە بسێنێتەوە کە پێی بەخشیون، لە کاتی بونی حاکمی نا دادپەروەر مافی گەلە شۆڕشی بەسەردا بەرپا بکا، بەهۆی پێشێلکردنی بەندەکانی گرێبەستی نێوان خۆیان و ئەو.

بەڵام رۆسۆ لەویانی تێپەراند، دەڵێ کاتێک مرۆڤەکان بەیەکەوە کۆدەبنەوە و کۆمەلگایەک پێکدێنن ئەمانە بە گرێبەستێکی کۆمەلایەتی لەگەڵ یەکتریدا کۆبونەتەوە ، وای دەبینن بۆئەوەی دۆخێکی ئارام و ئاسودەیان هەبێ ، دەبێ لە نێوان خۆیاندا لەسەر ئەوە

و: خالید هەرکی

ڕێککەون کە دەسەڵاتێک بەسەریانەوە هەبێ دادپەروەر و یەکسان بێ بۆ هەموویان تا دۆخەکان سەقامگیر بن، لێرەوە دەولەت لەسەر بنەمای گرێبەستی کۆمەلایەتی دادەمەزرێ، ئەو گرێبەستەی لە نێوان کۆمەڵگا و حاکم واژۆ کراوە، ئەو حاکمەی وەکو نماینـدەی گەل حوکمڕانی دەکا دەبێ پابەندی ئەو خاڵانە بێ کە لەسەری ڕێککەوتون، ئەگەر لەو خالانەی لادا دەبێ بگۆڕدرێ، ئەم وای دەبینێ کە هەر حاکمێک پشت بە گەل نەبەستێ حاکمێکی نادادپەروەر و ستەمکارە، ئەم ئاماژە نادات مەبەستی کام میرە بەڵام دەڵێ حاکم کە وەکو نمایندەی گەلە. کاتێک ڕۆسۆ ئاماژە بە ئەندامانی کۆمەڵگا دەدا و باس لەو گرێبەستە دەکا کە لە نێوان خۆیاندا بۆ حوکمڕانی واژۆیان کردوە، ئاماژە بە هیچ چینێک نادا لە کۆمەڵگا، نە چینی ئۆرستوکراسی نە ئۆرستوکراسیی تایبەتی چونکە لای ئەو لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا یەکسانن.

ئایا ڕۆسۆ شۆڕشگێڕ بوو؟ بەمەبەستی ڕوخاندنی پادشا و ڕاگەیاندنی سیستەمی کۆماری؟ لە ڕاستیدا ڕۆسۆ هەمیشە هۆشداریی لە کودەتا و شۆڕش دەدا، کاتێک کتێبەکەی دەرکرد لە ١٧٦٢ هێشتا شۆڕشی فرەنسی هەلنەگیرسابوو ( ١٧٨٩) واتە دوای چارەگە سەدەیەک لە دەرکردنی کتێبەکەی شۆڕشی فرەنسی هەڵدەگیرسێ، ئەو هەموو ماوە تێدەپەڕێ بێ ئەوەی گەلی فرەنسی جولەیەک بکەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دۆخی ئابوری و کۆمەلایەتی و ئیداری پێنەگەیی بوو تا شۆڕش بتەقێتەوە، لەو ماوەیەدا دۆخەکان بەدەست ئاراستە سیاسییەکانەوە بەرەو ئازادی و یەکسانیی تاک ئامادە دەکران بۆ هەلبژاردەی گەل لە مافی نمایندەیی و یئدارەی خۆبەڕێوە بردن و سنووردار کردنی دەسەڵاتەکانی پادشا.

گرنگی ڕۆسۆ لەوەدا بوو سیستەمی کۆنی لەناوبرد. پێگەی تاکی بەرز کردەوە، یەکسانیی کردە بنەمای کۆمەڵ. بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە دۆخی گشتیی پادشایەتی و کۆشک و تەلاری وەزیرەکان و چینەکانی گەل و دەزگا حکومیەکان و باری ئابوری، بەرپرس بون لە هەڵگیرسانی شۆڕشی فرەنسی ، نەک هزرەکانی ڕۆسۆ و مۆنتسکیۆ و ڤۆلتێر بەتەنیا.

# بەشی هەژدەهەم

## سیستەمی ئیدارە و حوکمڕانی لە فرەنسا، بەر لە شۆڕشی فڕەنسی سیستەمی کۆن

شۆڕشی فرەنسی یەکێکە لەو شۆڕشە مەزنانەی دونیا کە دەستەواژەی نوێی بە دونیا بەخشی. هەندێک بنەمای تیوریی پراکتیزە کردن کە پێشتر تەنها تیۆری بوون. لەو میانە سیستەمی کۆن لە فرەنسا لەناو دەچێ، لەسەر کەلاوەی ئەو رژێمە رژێمێکی نوێ دادەمەزرێ. کە ماوەیەکی زۆر بوو بەردەوامیی هەبوو، ئەو بنەمایانەی رژێمی نوێ لەسەری دامەزرا ماوەیەک بوو دەرکەوتبوون بەر لە شۆڕشی فرەنسی لە ١٧٨٩، گرنگی ئەو ساڵەی کە شۆڕشی فرەنسی تێدا هەڵگیرسا ئەوە بوو کە سەرەتای کۆتایی هاتنی رژێمی کۆن بوو، نیشانەکانی لەناوچوون و توانای درێژە پێنەدانی دەرکەوتبوو، گۆڕانکاری و پیادە کردنی سیستەمێکی نوێ بوە کارێکی مسۆگەرو پێویست.

دابەشبوونێکی کلاسیکیی کۆمەڵگای فرەنسیی بەر لە شۆڕشی فرەنسی بەم شێوەیە بوو:

١/ چینی ئرستۆکراتیی دەرەبەگایەتی.

٢/ چینبی بۆرژوای دەولەمەند.

٣/ چینی گشتی یا چینی سێیەم.

### ١/ چینی ئۆرستوکراتیی دەرەبەگایەتی.

مەبەستمان لە ئۆرستوکراتیی دەرەبەگایەتی، چینی خانەدان و ئەکلیرۆسەکانە، خانەدانەکانی بەر لە شۆڕشی فرەنسی جیاواز بوون لەگەڵ خانەدانەکانی فرەنسیی چەرخی ناوەڕاست، ئەوکات لە چەرخی ناوەڕاست خانەدان هێزێک بوون توانای خۆسەپاندنیان بەسەر

پادشادا هەبوە. فرەنسا بەسەر خانەدانەکاندا دابەش ببو هەر هەرێمێک خانەدانێک یا میرێک وحوکمرانیی دەکرد، بەڵام دەسەڵاتەکانی پادشا دەتوانێ بەسەر ئەو خانەدانانەدا زاڵ بێ و بیانخاتەوە ژێر دەستی خۆی و حوکمی فرەنسا بەتەواوەتی کۆنترۆڵ کا، بە شێوەیەک هەموویان بێنەوە ژێر دەستی پادشا.

پاش ئەوەی بەم شێوە لاواز دەبن، پادشاکان قەبوڵیان نییە خانەدانەکان لەم نازو نیعمەتەی کۆشکدا بەشداربن و بە مەزنی بێنە بەرچاو، دواتر ئەو هەزرەی لەو سەردەم بلاو ببۆوە قەبولی ئەوەی بوو خانەدان بێنە ژێر رکێفی پادشا و مافە نایابەکانیان لێ بسێندرێتەوە، بەڵام بەو مەرجەی چینەکەیان لەناو نەبردرێ، بەم جۆرە وەکو چینێک مانەوە لە فرەنسا کە خاوەن پێگە و تایبەتمەندی خۆیان بوون، پۆستە باڵاکانی سوپا و فەرمانگەکانی دادوەری حکومی بەدەست ئەوانەوە بوو لە گوندەکانیش خاوەنی پانتایی زۆری زەوی و زار بون ، لەو رێگایەوە داهاتی زۆریان بۆ دەهات ئەوەتا پێنج یەکی زەویەکانی فرەنسا بەدەستی ئەو خانەدانە خاوەن پۆپستە باڵانەوە بوو لە سوپاش پۆستی هەستیاریان بەدەستەوە بوو، بۆیە ئەوان دەبنە بەشە هەرە دەولەمەندەکەی چینی ئۆرستوکرات.

چینی خانەدان وێرای ئەو دەستکەوت و ئیمتیازانەی هەیان بوولە باجیش بوردرابوون، تەنها چونکە لەم چینە بوون هیچ جۆرە باجێکیان نەدەدا، تەنانەت هەندێکان باجی دەرەبەگایەتیان بۆ مابۆوە، ئەم جۆرە باجانە لە هیچ شوێنێک نەمابوون بەڵام ئەوان بۆ کۆکردنەوەی پارە و پول هێشتبوویانەوە، ئەو باجانە ببونە سەرچاوەی دەوڵەمەند بوونی خانەدانەکان ئەوان هیچ کاتێک بیریان لە کۆکردنەوەی پارە و سامان نەدەکردەوە چونکە بەهۆی کۆکردنەوەی ئەو باجانەوە دەولەمەند دەبوون، ئەوان ئەمەیان بە مافێکی رەوای خۆیان دەزانی بە شێوازی نابەجێ و ئازاربەخش باجیان لە جووتیارەکان دەسەند.

هەندێک لەو دەرەبەگانە توانیان سود لە بەکارهێنانی شێوازی زانستیی بەرهەم هێنان وەرگرن، بۆیە پەرەیان بە ئامێری بەرهەمهێنان دەدا، ئەم شێوازە تەنها داهاتی خانەدان یا دەرەبەگ زیاد ناکا بەڵکو پەرە بە بیرکردنەوەشی دەدا، وای لێدەکا بیر لە شێوازی زانستی بکاتەوە و زیاتر داهێنانی پێشکەوتو قەبوڵکا، ئیتر خانەدان ئەرکی تەنها کرینی زەوی و زیادکردنی پانتایی زەویەکانی نابی بەڵکو پەرەدان بە بەرهەمهێنان و بەشداری لە چالاکییە گشتییەکانیش دەبێ.

هەموو خانەدانێک خاوەن زەوی نەبوو، هەندێکیان لەم چینە بوون و خاوەنی هیچ پارچە زەویەک نەبوون، ئیتر زۆربەی ئەم جۆرە خانەدانانە لەسەر ماڵی دەستکەوتە و

بەخشندەی لەلایەن پادشاوە دەژیان، بۆ ئەوەی روخسارە پۆشتەییان هەر بمێنی، بەنمونە چوار هەزار خانەدان لە کۆشکی فێرسای دەژیان. ژیانێکی ئەوپەڕی خۆشی هەرچەندە هەندێک لەو ژمارە خاوەنی داهات و سامانیکی باش بوون بەڵام لێیان خۆش دەهات بە سامانی پادشا بژین ، هەندێکیان لەم رزقە بەولاوە هیچی تریان نەبوو، چاویان لە دەستی پادشا بوو بەخێویان کا.

بە شێوەیەکی گشتی دیاردەی بێکاری بە خانەدانەکانەوە بەسترابۆوە بەتایبەت ئەوانەی لە شار دەژیان و پایتەختیش بە پلەی یەک، زۆر بێ شەمانە لە پەنای سەرکەوتنەکانی پادشا بوو کورتیەکەی ژیانێکی شەرمەزاری بوو، یەکێک لە فەیلەسوفە فرەنسیەکان بەم شێوە باسیان دەکا ودەڵێ ئەوانە لە نەتەوەی فرەنسی نین بەڵکو چینێکی نامۆن.

دیاردەی رابواردن گەشەی کردبوو خەرجی و تێچوەکانیشی زۆر بەرز ببۆوە، بۆیە لە هەموو کون و کەلێنێک بەدوای پەیداکردنی ئەو خەرجیانەدا دەگەڕان.

## ٢/ چینی بۆرژوای دەوڵەمەند

ئەوکات بۆرژوای فرەنسی بووژابۆوە، هەندێک خانەوادەی یەکجار دەوڵەمەند پەیدا ببون، بۆ مەبەستی چاوتێبڕین لە سامانی ئەوان خانەدانەکان بە ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری و تێکەڵاو بون لەگەڵیاندا خۆیان لێیان نزیک دەکردنەوە تا سوود لە سامانەکانیان وەرگرن، دیارە بۆرژواکان لەروی بیرکردنەوەوە پێشکەوتوو بوون بۆیە ناکۆکی و بەگژیەکداچون لە نێوان ئەو دوو بیرکردنەوە دروست دەبێ.

خانەدانەکان پێویستیان بە سامانی زۆرتر بوو، دەولەمەند بوونی بۆرژواکان و چاویان لێبوو زەوی و زاری زیاتر بکڕن، ئەمەش بوە هۆی ئەوەی خانەدانەکان لاسای بۆرژواکان بکەنەوە و بە هەمان هزری ئەوان بیربکەنەوە، کار بکەن تا دەوڵەمەند بن، چونکە بۆرژواکان فێری سیستەم و شارەزایی کاری بازرگانی ببوون خانەدانەکان پێیان وابو پارەکانیان بە هاوبەشی لەگەڵ بۆرژواکان بخەنە ناو مامەلە، داهاتی باشیان بۆ دێت و فێری پیشەکەش دەبن.

بە شێوەیەکی گشتی خانەدانە خاوەن زەویەکان لە دێهات کۆببونەوە توانای ئابوری و داهاتیان وردە وردە لاواز دەبوو، هەرکە بێتوانا دەبون بەرەو ژێر دەبونەوە، ئاسایی بوو لە

گوندێک کۆشکێکی مەزنی خانەدانێکت دەبینی بەڵام ئەو پارەی نەبوو ئاوەدانیکاتەوە تەنها دیمەنەکەی دەرەوەی مابۆوە، کۆشک و تەلار بێناز لەوێ کەوتبون. ئەوەتا خانەدانانی کۆشکی ڤێرسای لە قەرز و کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا نقوم ببون، تا گەندەلی و بێ ئابڕوییان ئاشکەرا دەبێ ئەوسا پێگە و ناوبانگ لەدەست دەدەن. ئەمە لەکاتێکدا جووتیاران لەژێر باری باجدا دەیانناڵاند کە خانەدانەکان گیرفانی بۆخۆیان کۆیان دەکردەوە.

بەم شێوە چینی خانەدان هەندێکیان دەوڵەمەند و هەندێکیان هەژار، بەشەکەی دیکەی خۆیان لە بۆرژواکان نزیک دەکردەوە، دواجار بونە چینێکی لەبەریەک هەڵوەشاوە، خانەدانە هەژارەکان رقیان لە خانەدانە دەولەمەندەکان دەبۆوە، ئەو بەشە خانەدانەی خۆی بە بۆرژواکە و بزووتنەوەی بازرگانیەوە هەلپەسارد رەخنەیان لە پادشاگەرایی رەها دەگرت، بۆیە کە کاتەکەی دەگات شۆڕش هەڵدەگیرسێ چینی خانەدان بە یەککرتویی نامێنێ، هەندێکیان دەستیان لەگەڵ شۆڕشگێڕان تێکەڵ کردبوو.

ئەکلیرۆسەکان ژمارەیەکیان لە دەولەمەندەکان بوون، بەڵام زۆربەی پیاوانی ئاینی هەژار بوون بەدەست هەژاریەوە دەیانناڵاند، بەنموونە موچەی ئەسقوفی ستراسبورگ بەقەدەر پێنجسەد جاری موچەی پیاوێکی ئاینیی ئاسایی بوو .

دەولەمەندی ئەکلیرۆس و کڵێسا بۆ ئەو رێژەی دەیەک دەگەرایەوە کە بەسەر زەویوزارەکاندا سەپێندرابوو و دەدرا بە کڵێسا، لەتەک ئەمەشدا زەویەکانی کڵێسا لە باجدان بووردرابوون، سەرباری ئیمتیازەکانی پیاوانی ئاینی کە هەستی کەسانی رەوشەنبیری بریندار دەکرد، ئەمە زۆربەی هۆکارەکانی ئازاری جووتیار بوو، بەڵکو زۆربەی جووتیارەکان لاریان نەبوو لەوەی باجیان بدرێتە کڵێسا و بۆ خزمەت کڵێسا خەرج بکرێ، بەڵام نەچێتە گیرفانی ئەوانەی کە ئاینداریش نەبوون بەڵام بەوناوە سودیان لێی دەبینی ( واتە بندیواری ئاینی )، لە چواریەکی دواییی سەدەی هەژدەهەم پیاوە ئاینیەکان بەتایبەت گەورەکانیان هەلسوکەوتیان وەکو هەلسوکەوتی میرەکان دەکرد، بۆ رازاندنەوە و بۆنە تایبەتیەکان زۆر دەستبڵاو بوون ، خەرجی زۆریان لە کاری بێ ئابرویی بەفیرۆ دەدا، ناوبانگیان پێی لەکەدار دەبوو دواجاریش لەلایەن گەل پێگەیان لەدەست درا.

لەگەل ئەمەشدا ئەکلیرۆسە کاسۆلیکەکان ئەوکات زۆر توند بوون ئەوە نەبوون کار بە رێنما و یاسا و ئاراستەکانی گشتی بکەن ، لێبووردەیی ئاینیان لەگەڵ مەزهەبەکانی دیکەی کریستی نەبوو بەتایبەت لەگەڵ پرۆتستانتەکان، بۆیە ئەم ئەکلیرۆسانە بوونە ئامانجی رەخنە

و هێرش کردنەسەر لەلایەن هزرمەند و فەیلەسوفەکانەوە، بەتایبەت لەلایەن ڤۆلتێر، ڤۆلتێر هێرشی توندی دەکردە سەر ئەکلیرۆسە کاسۆلیکەکان بۆ توندڕەویان. کڵێسای فرەنسی لە توانایدا نەبوو بەسەر هزرەکاندا زاڵ بێ و پێشیی لێبگرێ، هاوڵاتیی فرەنسی خۆشیی بە خوێندنەوەی کتابەکانی ڤۆلتێرەوە دەبینی کە هێرش دەکاتە سەر کڵێسا و پیاوە ئاینیە دەولەمەندەکانی.

## ٣/ چینی گشتی یا چینی سێیەم

چینی سێیەم زۆرینەی گەل دەگرێتەوە، ئەم چینە کەمترین خۆشیان بە دەسەڵات و داهاتەکەی دەبرد، نەک هەر خۆشیان پێی نەدەبرد بەڵکو ئەوان ببونە سەرچاوەی پێدانی باج و سامان بە خانەدان و پادشاکان، بەر لە شۆڕش لە هیچ پۆستێکی حکومی بەشدار نەببون، تەنها لەرێگەی کەمینەی بۆرژواوە ئەوانەی لە چینی سێیەم دەردەچون دەیانتوانی رێگا سەختەکە ببرن و بگەن بە پۆستی باڵای حکومی و دەولەمەند و ساماندار بن.

هەندێک چینی سێیەم دەکەن بە چەند بەشێکەوە:

١/ لادێییەکان، ئەوانەی بە هیچ شێوەیەک خاوەنی هیچ نین.ا

٢/ لادێییەکانی خاوەنی پارچەیەک زەوی بچوکن.

٣/ مولکدارە مامناوەندیەکان.

٤/ بۆرژوای باڵا.

لادێیی و کۆیلەکان لەو بەشە بون کە خاوەنی هیچ پارچەیەک زەوی نەبوون، بۆ پەیداکردنی رزقیان پشتیان بە بازوبانەوە بەستبوو، یا بەکرێی رۆژانە یا لە رێگەی هاوبەشی لە چاندن و بەرهەمهێنان لەگەڵ خاوەن زەویەکان، ئەم سیستەمەی هاوبەشی لە فرەنسا باو بوو، لەگەڵ زەویە بچوکەکان دەکرا نەک مەزنەکان، لەسەر ئەم بنەمایە داهاتی لادێنشینەکان کەم بوو بەشی هەموو پێداویستیەکانی ژیانی رۆژانەیانی نەدەکرد. لەتەک ئەم جووتیارە ئازادانە ژمارەیەکی زۆری کۆیلە هەبوون بە رێژەی نزیکەی ٢٠/١ ی دانیشتوانی گوندەکان دەبوون. لە راستیدا ئەو بارقورسیەی خرابووە سەر کۆیلەکان سوکتر بوو لە باری قورسی سەرکۆیلەکانی چەرخی ناوەڕاست، بەڵام ئەم قورسایی و کۆت و بەندانەی ئەوکات لە چواریەکی دواییني سەدەی هەژدەهەم بۆ سەردەم قورس بوون، کەدەڵێین قورس بوون

ئەوەندە بەسە، کاتێک کۆیلەیەک لەدەست خانەدانێک رادەکا ، خانەدان مافی ئەوەی هەبوو دەستگیری بکاتەوە و بیهێنێتەوە لای خۆی. ئەمە سەرباری ئەو کۆتانەی دەرەبەگەکان خستبویانە سەریان کە تا ئەوکات بەردەوامییان هەبوو، چاکسازی فرەنسی ( نکر ) هەستی بەم مەترسیانە دەکرد بۆیە هەوڵی سووککردنی ئەو کۆت و بەندانەی دان.

ئەم لادێیی و کۆیلانە لە هەموو توێژک زیاتر رووبەرووی کارەسات و نەداری ئابووری دەبوونەوە کە رویان لە فرەنسا دەکرد. چونکە فرەنسا دەوڵەتێکی کشتوکاڵی بوو لە هەر کارەساتێکی سروشتی فرەنسا توشی قەیران دەبۆوە ئەم قەیرانەش بەهۆی دابەزینی ئاستی بەرهەمهێنانی لە گوندەکانەوە دەستی پێدەکرد. لەکاتی ئەم قەیرەانانە جووتیارەکان بە بەرهەمێکی کەم لێی دەردەچون دیارە لەم حاڵەتەش نرخی بەرهەمەکان بەسەر دەکەوێ ئیتر لە توانای جووتیاردا نابی بەرهەمی دیکە بۆ پێداویستیەکانی ژیانی رۆژانەی بکرێ هەروەکو ئەوەی لە ساڵی ١٧٨٨ رویدا.

مولکدارانی لادێکان لەرووی ئابووریەوە سەقامگیر بوون ، بەشی ئەوە داهاتیان هەبوو لە برسێتی و نەداریان دوورخاتەوە بەڵکو بۆ ئاستێکی بالاش بەرزیان دەکردەوە.

باری قورسی باج تەنها بەسەر گوندنشینەکانەوە بوو ئەوان دەبوایە باجی سەرانە و خوێ و داهاتی دیکە بدەن کە رژێمی پادشایەتی بەسەریدا دەسەپاندن و هەر خۆی داهاتەکانی دەخەملاندن وباجەکەی دیاری دەکرد.

قورسترین بارگرانیی سەرشانی گوندنشینەکان وێرای دەیەکی زەویەکان بۆ کلێسا و باجەکانی دیکە، باجی خوێ بوو کە حکومەت قۆرخی کردبوو، چونکە ئەم باجە داهاتێکی فەرمی و سەرەکیی دەولەت بوو بۆیە بایەخی بە کۆکردنەوەی دەدا، لەهەموویان ناخۆشتر ئەوەبوو کۆکەرەوەی باجەکانی سەر چینی سێیەم زۆر سورو توند بوون لە کۆکردنەوەی چونکە رێژەیەک بەر خۆیان دەکەوت، باقیەکەی دیکەیان رادەستی گەنجینە دەکرد.

باجی داهات بەسەر هەمووکەسێکدا سەپێندرابوو پێی دەوترا باجی بیست یەک، بەلام چینی ئرستوکراتی توانیی خۆیان لێی دەرباز کەن تەنها بەسەر چینی سێیەمدا مایەوە، دوای ئەوە ئەکلیرۆسەکانیش دەتوانن خۆیانی لێی دەرباز کەن و خانەدانەکانیش بەهەمان شێوە.

لەتەک وەرگرتنی باجی ( سەرانە و بیستیەکی و داهات ) شێوەی کۆکردنەوەی ئەم باجانە زۆر نادادپەروەرانە بوو، سیستەمی کۆکردنەوەیان بەم شێوە بوو کە یەکێک لە

و: خالید هەرکی

سەرمایەدارەکان ئەرکی کۆکردنەوەی دەگرتە ئەستۆ ئەویش زۆر بەتوندی و بێ بەزەییانە خەڵکی ناچار دەکرد ئەو باجانە بدەن، بە هەوەستی خۆی باجەکەی دەخەملاند هیچ پێوەرێکی فەرمی نەبوو بۆ خەملاندنی، هەندێکی بۆخۆی ئەویتریانی بۆ دەولەت لەپەنای ئەم کارەیدا داهاتێکی زۆری دەست دەکەوت و پێی دەوڵەمەند دەبووو، هەژارەکانیشی ووشک دەکرد، ئیتر ئەم هەموو جۆرە باجە هیچی لە داهاتی جووتیارەکان نەدەهێشت هەمووی لووش دەدا.

جگە لەم باجانە باجێکی تری خرابووە سەر گوندنشینەکان ئەویش باجی پابەندبوونی بە خانەدانەکان بوو، جووتیار دەبوایە کاتێکی زۆر لە خزمەت ئەودا بێ بۆ کاری سوخرە، زیاد بوونی رێژەی دانیشتوان و پەرە سەندنی هاتووچۆ و بازرگانی پێویستی بە دروستکردنی رێگاو بان دەبوو ئەم رێگاو بانانەش بە بازوی گوندنشینەکان دەکران ئەمانە هەموویان ژیانی گوندنشینەکانیان سەخت کردبوو.

ئەمە لە گوندەکان لەشاریش کەسانێک هەبوون ئاستی بژێویان نزم بوو بە کرێی رۆژانە دەژیان،ئەمانیش زۆرینەی شارنشینەکانیان پێک دەهێنا. بەشێکی کەمیشیان ئاستی بژێویان بەرز بوو لەسەر داهاتی بازرگانی وپۆستی بالای حکومی دەژیان.

ژیانی کرێکارانی شار لە ژیانی گوندنشینەکان قورستر بوو، پەیوەندییەکانی لادێی باری هاولاتیان هەندێک سووکتر دەکەن، بەڵام ئەم جۆرە تەبایی و هەماهەنگیی کۆمەلایەتیە لە شار نابینی.

کێشەیەکی دیکە هەبوو لە شار بۆ کرێکار و پیشەوەرەکان، ئەویش بەرز بوونەوەی نرخی کاڵاکان بوو کە بەردەوام لە زیادبوندا بوو، دواتر بەهۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسا کە ئەویش لە هەڵکشانێکی بەردەوامدا بوو کێشەکەی قورستر دەکرد.

کرێی جووتیار و کرێکارانی شار دادەبەزێ، ئەمەش وادەکا ژیانێکی کۆلەمەرگی ببەنەسەر، بەو هۆیەوە رق و کینەیان لە دەوڵەمەند و ئۆرستوکرات و خانەدانانی کلێسا زیاد دەکا چونکە ئەوان باجی سەر جووتیار و کرێکارانیان بەرز دەکردەوە و لەسەر رەنجی ئەوان دەژیان.

بەڵام بۆرژوای باڵا کە لە چینی سێیەمەوە بەرز ببوونەوە هەندێکجار لە زیادکردنی باجەکان بەرپرسیار بوون بەهۆی بەرز کردنی نرخی دانەوێلە و هەندێک کەرەستەی زەرور،

لای بۆرژوای بازرگان تەنها قازانج و بەرزکردنەوەی نرخەکان بایەخی هەبوو ، گوێیان بە حاڵی گوزەرانی گەل نەدەدا چیان بەسەردێ یان نا .

قازانجی بازرگانەکانی بۆرژوا بە ئاستێکی دیار بەرز دەبێتەوە هەر ئەمەش بوە هۆکاری بەرەو ژوور چونی هەناردەی بازرگانیی فرەنسا، وێڕای ئەوەی بزووتنەوەی بازرگانیی جیهانی لە سەدەی هەژدەهەم جولەیەکی تێکەوتبوو و نەختێک بوژابویەوە. بەو هۆیەوە بازرگانێتی بوە سەرچاوەی قازانجێکی زۆر کە لە چینی سێیەمدا بوون.

پیاوانی یاساش لە بۆرژوای باڵا هەلکەوتبوون، هەروەها مامۆستا و پارێزەر و پزیشک، دەتوانین بلێێن ئەوان بۆ ئەو سەردەم هێزی رەوشەنبیری وڵات بون بەم شێوە بۆرژوای باڵا هێزی فکر و ئابوری یەکدەخا. ئەمانیش هەمویان لە روی فکر و سامانەوە دەولەمەند بوون، دژی قۆرخکردنی پۆستەبالاکانی دەولەت و سوپا بون، کە بەبێ پاساو لەلایەن ئۆرستوکراتەکانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو جگە لەوە پاساوە نەبێ گوایە لە کۆنەوە ئەمەیان بە بەجێماوەیی بۆ ماوەتەوە.

پیاوانی بۆرژوای بالا تەنها پێویستیان بە راگەیاندنێک هەبوو تا شوێن چینی خانەدان بگرنەوە کە هیچ توانایەکی جەنگی و ئیداری و لێپرسراوەتیان نەمابو، لە کاتێکا بۆرژوای باڵا پێی وابو ئەوان بە تواناترن بۆ بەرێوەبردنی وڵات، باشتر لەوەی ئەوان دەیبەن بەرێوە کە وڵاتیان گەیاندە ئەو دۆخە نالەبارە لە رووی سەرازی و ئابووری لە سەردەمی لویسی پانزەهەم.

## ئیدارەی حکومی

ئیدارە یا دام و دەزگاکانی حکومی خاوەنی راستەقینەن لە حوکمڕانی و ئیدارە و دادوەری و بەرگریکردن لە وڵات، لە رژێمی کۆن حکومەت لەم دام و دەزگا سەرەکییانە پێکهاتووە:

١/ پادشایەتی.
٢/ دام و دەزگاکانی بەریتانی و ئەنجومەنەکان.
٣/ ئیدارە .
٤/ دادوەر.
٥/ سوپا .

## پادشاگەرایی فرەنسی

لە چەرخی ڕێنسانسەوە تا سەردەمی حوکمڕانی لویسی شانزەهەم ، پادشاگەرایی فرەنسی بە بەهێزترین پادشاگەرای ئەوروپا دێتە ئەژمار. پادشای فرەنسا بەناوی (مافی خواوەندی)ەوە حوکمی دەکرد، دەرکردنی یاسا و ڕاگەیاندنی جەنگ و گرێبەستی ئاشتەوایی هەمووی خۆی بوو، دەسەڵاتی وای هەبوو لە سەروی دەسەڵاتی دادوەرییەوە بوو ئەگەر پێویست بکرابا، واتە لە شوێن ( دادوەری شانشینی مەزن ) بوو، دەسەڵاتی لێبووردنی حوکمدراوی هەبوو. دەسەڵاتی زیندانی کردنی هەر کەسێکی هەبوو بەبێ دادگایی کردن، دامەزراندن و لادانی وەزیرەکان هەر خۆی بوو.

.پادشا بودجەیەکی زەبەلاحی بۆ خۆی و دەست و پێوەندەکان و کۆشک و تەلارەکانی تەرخان دەکرد، پێیان ئاسایی و شایستە بوو. دۆخی سەردەمیش هەندێک داب و نەریتی بەسەر ئۆرستوکرات و پادشایەتیدا سەپاندبوو، ئاهەنگی مەزن بە تێچویەکی زۆر، کردنەوەی یانە و هۆلی مەزن بۆ ئاهەنگگێڕان پاریسی پڕکردبوو، گەندەڵییەکان تا سەر لێو هاتبوون، پادشایەتی پێی وابو بونی ئەو شوێنانە بۆ ڕابواردن و کات بەسەر بردن کە بۆرژواو ئۆرستوکراتەکانی لێ کۆدەکردەوە مایەی بەردەوامی و خۆشگوزەرانیە، بەڵام کاتێک پادشا لاواز دەبی ئەم ڕەفتارانە دەبنە مایەی هەڵچونی میلەت و دەربڕینی ناڕەزایی و بێزاری.

نیمچەها و بۆچو نێک هەبوو لە نێوان مێژوونوس و هزروانەکانی فرەنسا، کە لویسی شانزەهەم پادشای فرەنسا ( ١٧٧٤-١٧٩١ ) کەسێکی بێ کەم و کوڕی بووە بەڵام ئەو دۆخەی ئەو تیایدا ژیاوە بۆ سروشتی بیرکردنەوە و تواناکانی یەک نەبوون، ئیتر دەبوایە حاشا لە پادشاکانی پێش خۆی بکا.

هاوسەری پادشا ماری ئەنتوانێت ڕۆلێکی خەراپی دەگێڕا لە لاواز کردنی کەساتیی هاوسەری. ئەو کچی ماریا تریزا بوو (ئیمپراتۆری نەمسای بەناوبانگ)، هەرچەندە سەرەتا لای خەڵک خۆشەویست بوو بەڵام دواتر دەستی خستە نێو پیلانگێڕان لە دامەزراندن و لادانی وەزیرەکان و ئاراستە کردنی سیاسەتی دەولەت، چیرۆکی زۆریان لەسەری دروست کرد یا بلێین خانەدانانی کۆشک لەسەریان دروست کرد هەندێک لەو چیرۆکانە خەیالی بوون ، بەڵام بەهۆی ڕەفتارەکانی لە کرینی کۆشکی گران بەهای وەکو (کۆشکی سان کلو) خەڵک گوێیان بۆ چیرۆکەکان شل دەکرد، ئەم زیادە خەرجیانەی ماری ئەنتوانێت لە کاتێکا دەبن کە فرەنسا بەهۆی کارەساتی سروشتی و ئابوریەوەی ساڵ انی ( ١٨٨٧-١٨٨٨) خەڵکی

توشی برسێتی و نەداری کردبوو، دواتر چونکە کەسێکی بەرەگەز نەمسایی بوو لای خەڵک خۆشەویست نەبوو، خەڵک نەمسایان بە دوژمن دەزانی چونکە ئەو کارەسات و جەنگانەی لە سەدەی هەژدەهەم توشی فەرەنسا هاتن لە نەمسایان دەزانین.

لە فرەنسا هیچ دەزگایەکی بەهێزی پەرلەمانی نەبوو سنوورێک بۆ دەسەڵاتەکانی پادشا دابنێ، یا چاودێری کارەکانی بکا. دادگای پاریس هەبوو ئەویش تەنها بەرپرس بوو لەو یاسایانەی پادشا دەریدەکردن، هەرچەندە ئەو یاسایانە تا تۆمار نەکرابان شێوەی یاسایی خۆیان وەرنەدەگرت، پەرلەمان ئەم برگەی بۆ ئەوە دانابوو تا دەسەڵاتەکانی پادشا سنووردار بن و لە خۆیەوە بڕیارەکان کارا نەکا. بەڵام لەو ماوەی نێوان حوکمی کاردینال رشیلیۆ و لویسی پانزەهەم، پەرلەمان بە تەواوەتی کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی رشیلیۆو دواتریش لویسی چواردەهەم. لەم ماوەیە پێگە و بایەخی خۆی لە دەست دابوو تا لە سەردەمی لوسی شانزەهەم پادشایەتیی بە تەواوەتی لاواز کرد.

ئەنجومەنی چینەکانی میلەت، ئەویشیان هاوشێوەی پەرلەمان بوو، لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمەوە لەکار وەستابوو بەتایبەتیش لەسەر دەستی کاردینال رشیلیۆ. ئەم پیاوە کارەکانی لەسەر لاواز کردنی دەزگاکان و بەهێز کردنی پادشا چڕ کردبۆوە، لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم دەتوانین بڵێین ئەنجومەنی چینەکان بەیەکجاری لەبیر کرابوو. نوێنەری هەموو چینەکانی گەلی تێدا بوو.:

هەردوو باڵەکەی ئۆرستوکراتەکان (ا/ خانەدان ب/ ا/ ئەکلیرۆس) . ج/ چینی سێیەم، هەر چینەو ژوری تایبەتی خۆی هەبوو. ژورێک بۆ خانەدانەکان یەکێک بۆ ئەکلیرۆس یەککیش بۆ چینی سێیەم، دەنگەکان لەسەر بنەمای ژورەکان وەردەگیران نەک بە زۆرینەی کۆی دەنگەکانی ئەنجومەن بەگشتی بەڵکو هەر ژوورەو بەتەنیا. ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئۆرستوکراتەکان هەمیشە زۆرینە بوون چونکە دوو ژووریان هەبوو.

ئەنجومەنی چینەکانی میلەت دەسەڵاتی دەرکردنی یاسایان نەبوو تەنها راسپاردەیان دەردەکرد. ئەرکیان هەر ئەوە بوو هەر ئەندامێک یاداشتێک لەسەر داواکاری و پێشنیارەکانی ئەو ناوچە پێشکەش بکات کە نوێنەرایەتیی دەکا ، دواتر هەر ژورێک واتە هەر چینێک بەیاننامەیەک بە کۆنوسی ئەو یاداشتانە ئامادە دەکات کە کۆی داواکاری و سکالاکانی هاوڵاتیانە و پێشکەشی کۆشکی پادشایەتی دەکا. بەم شێوە ئەرکی ئەنجومەن کۆتایی دێت.

ئەنجومەن ئەو دەسەڵاتەشی نەبوو بەدوای کارەکانی حکومەت و جێبەجێکردندا بڕوا، بەڵام لە ڕاستیدا نوێنەرایەتیەکی باش بوو چونکە نوێنەرایەتی بەرفراوانترین پانتایی گەل دەکا واتە نوێنەری سەرجەم گەلی فرەنسی بوون. دواتر گرنگیەکی دیکەی ئەم ئەنجومەنە لەوەدابوو کە لە ڕێگەی هەلبژاردنەوە دادەمەزرا ئەم دوو خەسلەتە بۆ ڕەوشەنبیرانی فرەنسی لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم کەم نەبوو.

لە هەرێمەکانیش لەژێر چەتری یەک ئەنجومەندا هەموو چینەکان کۆدەبوونەوە، ئەم ئەنجومەنە تا سەدەی شانزەهەم مافی دەنگدانی لەسەر باج هەبوو، بەڵام دوای ئەوە دەسەڵاتەکانی پادشا بەهێز دەبن و ڕۆلی ئەم ئەنجومەنە و پەرلەمان نامێنی و ژیانی پەرلەمانی کۆتایی دێت، هەرکاتەی پێویستیان پێی بوایە ئەوا لەسەر داوای پادشا ئەم ئەنجومەنە دادەمەزرایەوە.

خۆی ئیدارەی حکومەت لە ئاست پادشایەتی فرەنسی زۆر لاواز بوو. ئەم ئیدارە ڕێچکەی بەڕێوەبردن و سیستەمی کۆنی دەگرتە بەر، تا ماوەیەکی زۆر ئامادە نەبوو خۆی بگۆڕێ. بیروکراسیەتی چەقبەستو ئەم ئیدارەی دەبرد بەڕێوە. بۆیە هەرگیز بیروکراتیەت ئامادە نابێ چاکسازی ئەنجام بدا و خۆی لەدەسەڵات دورخاتەوە، بۆ گۆڕینی ئەم ئیدارە لە سیستەمی کۆنەوە بۆ سیستەمی نوێ پێویستی بە هێزێکی کاریگەر هەبوو ئەم ئەرکە جێبەجێ بکا.

ناشیرنترین دەزگای حکومی لەبەر چاوی گەل ( نوێنەرانی پادشا) بوو کە لە کۆکردنەوەی باجەکانی داهات وسەرانە بەرپرسیار بوون، خەڵک ڕقی زۆری لێیان بوو کاتێک بەم شێوازە ستەمکاریە ئەم باجانەیان کۆدەکردەوە، ئەمان دەسەڵاتێکی زۆریان پێدرابوو لەوە بەهێزتر بوون سەر بۆ هەر دەزگایەکی دیکەی حکومی دابنوێنن.

سیستەمی حوکمڕان و بەڕێوەبردن لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی دیکە جیاوازیی هەبوو، چونکە فرەنسا تا ئەوکات لەسەر بنەمای سیستەمی کۆن دابەش رابوو کە هەندێک هەرێم ئیمتیازیان پێدرابوو و یاسای تایبەتیان هەبوو. ئەوەتا ڤۆلتێر لەسەر ئەم شێوازە دەڵێ: یاساکانی فرەنسی لە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکان، گۆڕانکاریی بەسەردا دێ. دواتر گومرگی ناوەخۆ لە نێوان هەرێمەکاندا هەبوو، بازرگان لە گواستنەوەی کالاکانیدا هەروەکو لە وڵاتێکەوە بڕوا بۆ وڵاتێکی دیکە ئاوەها دەبوایە باج بدا. تەنانەت شێوازو ڕوخساری هاوڵاتیانی هەرێمەکانیش جیاوازیان هەبوو، مێژوو نوسەکان دەڵێن ڕوخساری هاوڵاتیانی

نەتەوەی هەرێمی (برتیانی) وهەرێمی ( پروفنسالْ ی) تا ئێستا بە یاساکان و زمان و دیالەکتیکیانەوە دیارە .

دادگاکانیان شێوەیەکی ئالۆز لە شێوەی سیستەمی حوکمڕانی کۆنیان وەرگرتبوو. پێشتر پادشا دادوەری دادەمەزارند، بەڵام دواتر دادوەرەکان پۆستەکانیان لە پادشا دەکری. ئیتر پادشا ناتوانێ دادوەرێک لەسەرکار لابەرێ لەکاتێکا ئەو پۆستەکەی لەو کڕیوە، ئەو دادوەرەی پۆستەکەی دەکرێ سوردەبێ لەسەر پێدانی پۆستی بالا بە منداڵەکانیان بەم شێوە دەست و پێوەندەکانیان دەبونە منداڵ و ئەندامانی خانەوادەکانیان، سوپای فەرەنسی بەهێزترین دەزگای حکومی بوو، لەسەر شانی ئەوان فەرەنسا توانیی سەروەری فەرەنسا لە نێو ئەوروپا و لەو دیو دەریا وەدەست بێنی. سوپای فەرەنسی سەرچاوەی هێزی پادشا بوو، چونکە سەرکەوتنی مەزنی بەدەست هێنابوو ببوە جێی چاوی گەلی فەرەنسی وسەریان پێیەوە بەرز دەبوو قوربانیان بۆی دەدا. ئەم هێزو پێگە مەزنەی سوپا لە سەردەمی لویسی چواردەهەم دەبێ بەڵام لە پەیمانی ئوتریختەوە ( ١٧١٣) لە کۆتایی حوکمڕانیی ئەو پادشایە مەزنە و لە کاتی دەستپێکی شەڕی حەوتساڵە (١٧٥٧-١٧٦٣) وە شکستەکان یەک لەدوای یەک بەسەر سوپای فەرەنسی دێن دوای ئەوەش بەسەر پادشا بەڵام لویسی شانزەهەم هەستی بەوە کرد کە بۆ وەدەست هێنانی سەرکەوتن ورێگەگرتن لەم شکستانە فەرەنسا پێویستی بە پادشایەکی بەهێزە بۆئەوە پێگەی خۆی لە ئەوروپا بگێڕێتەوە، بەڵام دڵنیابوو لەوەی گەندەلی ئیداری و دەوروبەری هۆکاری ئەم شکستانەن.

گەندەلی پادشایەتی و لاوازی کەسایەتی پادشا و شپرزەیی ئیدارە و دادگا و شکستی سوپا ئەم پرسانە هەمویان ئەوانەن کە گەل لەچاوەروانی چارەسەریاندا بوو پێی وابو دەبێ بە زوترین کات چارە بکرێن، بەڵام ئەوەی گەل بە شێوەیەکی ببڕای ببڕای رەتی دەکردەوە ئەوەبو کە گەنجینەی مایەپوچی دەولەت لەسەر گیرفانی ئەوان واتە یەک چین پڕبکرێتەوە بەتایبەتیش لەسەر گیرفانی چینی سێیەم، لە ١٧٧٤ کێشەکە ڕووبەڕووی لویسی شانزەهەم و وەزیرەکانی دەبێتەوە کە لە دەستپێکی دەسەڵاتیەوە بوو، بۆ بەدبەختی خۆی توشی ئەم گرفتە دەبێ.

# بەشی نۆزدەهەم

## دۆخەکانی ئامادەسازیی شۆڕشی فەرەنسی

ئەگەر فرەنسا لە شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکاش بەشداریی نەکردبا، ئەوا جەنگەکانی سەدەی هەژدەهەم گەنجینەی فرەنسایان مایەپوچ دەکرد. خەرجیی حکومەت بە رێژەی ٢٠% لە کورتییدا، لەگەل ئەو کورتکردنەش حکومەتی لویسی شانزەهەم لە پێدانی بەخشین بە (کونت دارتو) و ( خانەوادەی بولینیاک) ناوەستێ، ئیتر قەرزەکانی سەر حکومەت کەلەکە دەبن و هەلوێستی حکومەت لەرودادەمێنی.

دەبوایە لویسی شانزەهەم پۆستی دارای بە کەسێکی شارەزا و پسپۆر بسپێرێ کە خاوەن ئەزمون بێ لە بواری دارایی و خاوەنی شارەزاییەکی باش بێ لە پەیوەندیەکانی سیاسی و ئابوریی نێودەولەتی . دید و بۆچوونەکانی لەسەر چکسازی ئابووری ولآت و پرسی رووبەڕوو بوونەوەی قەیرانی دارایی بەم شێوە بوو:

١/ جێبەجێکردنی سیستەمێکی دادپەروەرانەی باج.

٢/ ئازاد کردنی بازرگانی لە نێوان ویلایەتەکانی شانشین، هەروەها لە نێوان فرەنسا و دەولەتانی دیکە.

٣/ لەناو بردنی دیاردەی گەندەلی لە نێو ئیدارەی حکومەت، پۆستەکان بدرێنە کەسانی دەستپاک.

٤/ سنووردارکردنی دەسەلآتەکانی کلێسا.

دژکاری ئەم خالانە هەمویان لە خاوەن ئیمتیازەکانی چینی ئرستوکرات ( خانەدان و پیاوانی ئاینی) بوو، کە لە هەندێک باج بوردرابوون . خانەدانەکان لە کۆشکی پادشا دەسترۆیشتوو بوون، شاژنیش تەنگەی بە ئرستوکراتەکان هەلچنیبوو.

ئەرستۆکرات Aristokrat لە توانایدا بوو خۆیان لە بڕیارەکانی وەزیر رزگار کەن کە هەولی پڕ کردنەوەی گەنجینەی دەولەتی دەدا، بەلآم ئەمە کێشەکە چارەسەر ناکا، بۆیە

ئەوە لەبەردەم لویسی شانزەهەم مایەوە کە ئەم پۆستە هەستیارە ( چاودێری دارایی) بە نێکەر Necker بسپێرێ ( ١٧٧٦- ١٧٨١).

ئەو دۆخانەی کە نیکەر کاریتێدا دەکرد هەستیار و وورد وون، لە سەردەمی ئەو شەڕی سەربەخۆیی هەلدەگیرسێ و فرەنساش بەشداریی تێدا دەکا. لەئەنجامی ئەمە گەنجینەی فرەنسا بارێکی قورسی دەکەوێتە سەر، بەڵام نیکەر بە زیرەکی و وشیاری خۆی توانیی لە ڕێگەی قەرزی بە سودی کەمتر لە جاران وڵات لە مایە پوچی ڕزگارکا، هەرچەندە ئەمە چارەسەریەکی کاتی بوو.

نیکەر بە وردی دیراسەی دۆخەکانی دارایی کردبوو، بەیاننامەیەکی بۆ دەرەوەی ژوورەکانی ئیدارەکانی دارای بۆ خوێنەرانی فرەنسی دەرکرد، چونکە خەلک تامەزرۆی ئەو هەواڵانە بون، مەبەستیان بوو بزانن چی لە نێو ژوورەکانی ئەو ئیدارانە روو دەدا، وێڕای ئەوەی کەسانێک هەبوون ئامادەیی خۆیان دەربڕیبوو لە دژی ئرستوکراتەکان، هەموو شتێکیان لەسەر ئیمتیازەکان لێ ئاشکەرا بکەن، بەیاننامەی نیکەر لەم شێوە بوو.

نیکەر پێی وابوو ڕزگارکردنی وڵات لەم قەیرانە داراییە دەبێ دووبارە چاو بە دابەشکردنی باجەکاندا لەسەر هەموو ئاستەکان بخشێننەوە. داوای یەکسانی لە دابەشکردنی باجی دەکرد واتە داوای سەپاندنی باجی بەسەر خانەدان و پیاوانی ئاینی دەکرد هاوشێوەی چینی سێیەم، لەهەمان کات داوای یەکسانی لە دابەشکردنی باجی بۆ هەرێمەکان دەکرد نەک هەندێک لە باجەکان ببوردرێن وهەندێکیش بەسەریاندا بسەپێندرێ.

سەبارەت بەچینی سێیەم ڕاستگۆیانە پێی وابو باجەکانیان قورسن، لەوە زیاتر هەڵناگرن، ئەستەم بوو داهاتی حکومەت لە ڕێگەی زیادکردنی باجەکان بەرز بکرێتەوە، چونکە توانای کرین و فرۆشتن بەهۆی گران بوونی کاڵاکان دابەزیبوو، لەکاتێکدا کرێی ڕۆژانەی کرێکارانیش کەمیکردبوو.

ئیتر ئەم داخوازیانەی نیکەر لە هی چاکسازخوازی پێشوتر ( ترجو) باشتر و زیاتر بون ، بۆیە کۆشکی پادشایەتی لەوکاتەی بەیاننامەکەی دەرکرد بە نیگەرانی سەیری نیکەری دەکرد ، بەدوایەوە بوون تا لە ١٧٨١ لە پۆستەکەی وەلا دەنێن.

جارێکی دیکە ئۆرستوکراتە کورتبینەکە بەسەر چاکسازیکدا زاڵ دەبێ کە ئەگەری ئەوە هەبوو وڵات لەم قەیرانە داراییە ڕزگارکا. ئیتر کێشەی دارایی بەبێ چارەسەری دەمێنێتەوە.

و: خالید هەرکی

پۆستی وەزارەتیان بە کالون Calonne ( ١٧٨٣-١٧٨٧ ) سپارد، قەرزەکانی گشتی بەرز ببونەوە، بەڵام کالون لەرێگەی هەست کردنی بە سیاسەتی دەستبلاوی کە پیادەدەکرا پێی وابو ئەمە ئاماژەیە بۆئەوەی دڵنیا بین کە حکومەت لەسەر گفت و پابەندیەکانی پێداگرە. مەبەستی لەمە ئەوەبوو گرێبەستی زیاتر بکرێ بۆ وەرگرتنی قەرز و داپۆشینی دارایی حکومەت. بۆ جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە شاژن ماری ئەنتوانێت کۆشکی (سان کلو) دەکرێ، کالونیش گرێبەستی قەرزی زۆری ئەنجامدا کە قەرزەکانی حکومەتی بۆ دوو بەرانبەر بەرز کردنەوە. ئێستا کالون پێی وابو دەبێ بە سیستەمی باجەکاندا بێنەوە، بەو مەرجەی دەستکاری باجی چینی سێیەم نەکرێ و چیتر باجەکانیان زیاد نەکرێ، بەڵکو بۆیان کەم کرێتەوە. لەم رووەوە چینی ئروستوکارت ( خانەدان و پیاوانی ئاینی) بە هاوشێوەی چینی گشتی دەبێ بخرێنە ژێر سیستەمی باجدان، ئەگەر جیاوازیەکی کەمی هەبێ لە باجە سەرەکیەکان ئەگینا دەبێ هاوشانی ئەوان باج بدەن.

دەتوانین بەرنامەی کالونی چاکسازی بەم شێوە پوخت کەین:

١/ باج بخرێتە سەر زەوی نەک کەسەکان، ئەم باجەش بەبێ گوێدانی چینایەتی بێ، ئەگەر ئرستوکرات بێ یا چینی سێیەم، مولکی چینی ئرستوکرات ئەوەندە زۆر بوو دەکرا لە باجەکانیان بەشێکی زۆری قەرزەکانی حکومەتی پێ بدرێتەوە، ئەمەش مەترسی لاوازی دارایی حکومەت ئەگەر نەیرەوێنتەوە ئەوا کەمی دەکاتەوە .

٢/ هەلگرتنی باج لە نێوان سنووری هەرێمەکان، تەنها باج لەو کالایانە وەردەگیرێ کە لە دەرەوەی فرەنسا هاوردە دەکرێن ئەمەش مانای ئەوەیە فرەنسا سەرتاسەری بوو بە یەک بازار، ئیتر جولەی بازار زیاد دەکا و بەرهەمەکان بە مسۆگەری دەبوژێنەوە.

٣/ بەرزکردنەوەی توانای کرین بەهۆی هەلگرتنی باجی سەرانە و باجی خوێ کە بەتایبەتی چینی سێیەم سودی لێدەبینێ ، ئەمەش دەبێتە رێخۆشکەر بۆ نەهێشتنی جیاوازی کۆمەلایەتی لەرێگەی یەکسانکردنی باجەکانەوە.

٤/ نەهێشتنی باج لەسەر هاوردەکراوەکان.

ئامانجی ئەو چاکسازیانە نەهێشتنی جیاوازیە کۆمەلایەتیەکان بوو لە نێو کۆمەلگای فرەنسی بەبێ جیاوازی بمێننەوە، تا بە یەکسانی باج بدەن، کردنەوەی دەرگاکانیش بەروی فرەنسیەکان هەستی یەکبون دەخولقێنی ئاسۆی بازرگانی و پیشەسازی هەمو بەشەکانی

وڵات یەکدەخا، هەستی نەتەوایەتی هاوڵاتیان دبوژێتەوە، دواجار توانا ئابوریەکانی وڵات بەرز دەبنەوە.

ئامانجێکی لەوە بەرزتر هەیە کە کالون ئامـاژەی پێـنەداوە، ئەویش کارکردن بـۆ بەشداری هەموو توێژەکانی گەل لە ئیدارەی وڵات لە ڕێگەی هەلبژاردنی ئەنجومەنە خۆجێیی و هەرێمیەکانەوە. لەراستیدا مافی هەلبژاردن لای کالون تەنها بۆ ئەوکەسانە بـوو کە خاوەن مولک و داهاتێکی مامناوەندیان هەیە بەڵام ئەمەش هەنگاوێکی باش بـوو بۆ ئەو سەردەم. لانیکەم گەل فێری سیستەمی هەلبـژاردن دەبـوو و چاوی لە داهـاتوی وڵات و ئەو بابەتـانە دەبێ کە پەیوەندیان بە ژیانی ڕۆژانەیانەوە هەیە.

وێڕای گرنگی ئەو هەنگاوە بۆ پرسی هەلبـژارد، بەڵام بەهـۆی ئەوەی ئەنجومەنەکـانی هەرێـم بـوونە ئەنجـومەنی راوێژکـاری و دەسـەڵاتی بڕیاردانیـان نەبـوو بـێ کـاریگەر مـانەوە، دەسـەڵاتەکان هەمـووی لە دەسـت نماینـدەکانی پادشـا کـۆکرانەوە، ئەوان بـوونە خـاوەنی چارەسە ری و گرفت، بەتایبەتی لە پرسی باجدا.

پادشا لەوە دڵنیا بـوو کە هەر مەرسـومنامەیەک لە پادشـاوە دەرچـی لە دادگـا تۆمـار ناکرێ چونکە ئەو دادگایانە ببونە شوێن پێگەی ئرستوکراتەکان، هەرکاتیک مەرسومنامە لە دادگا تۆمار نەکرێ شەرعیەت وەرناگرێ، بۆیە داوای پێکهێنانی (ئەنجومەنی پیران) ی کرد، ئەم ئەنجـومەنە لە سـەدەی شـانزەهەم و حەڤـدەهەم ناسـراو بـوو، نـاوە نـاوە پادشـا داوای کۆبـونەوەی لێـدەکردن بەڵام ئەوەنـدە نابـا ئەنجـومەنەکە پشـتگوێ دەخـرێ. داواکردنـی ئەم ئەنجومەنە لەلایەن کالونەوە لاوازی پادشا دەردەخا، چـونکە پادشـا نـاتوانێ بڕیارەکـانی بـۆ جێبەجێ کردن بخاتە بواری یاسایی بۆیە پەنا دەباتە بەر ئەنجومەنی پیران.

ئەمەش هەر لەناوکەیرا دیارە کە ئەنجـومەنەکە لە ئرسـتوکراتەکان پێکـدێ (خـانەدان و پیاوانی ئاینی)، دواتر نوێنەرایەتی هەموو گەلی فرەنسـی ناکـا، ئەم ئەنجـومەنە نـوێنەرایەتی ئەو چینە دەکا کە کالون مەبەستی بوو زیاتر باریان گرانکا لە ڕێگەی سەپاندنی باجی زیاتر بەسەریانەوە.

لە شـوباتی ١٧٨٧ ئەم ئەنجـومەنە کـۆدەبێتەوە، کـالون پێـی وابـو ئرسـتوکرات لەمەبەسـتەکانی دەگـا، بەتـایبەت کە خـۆی ئەم ئەنجـومەنەی دەسـت نیشـان کردبـوو بەڵام ئەنجامەکەی بە پـێچەاونە هـاتەوە، ئرسـتوکراتەکان پێـداگریان لەسـەر ئمتیازەکـانی خۆیانـدا

گرت، ئەگەر دەستبەرداری هەندێکیش بن ئەوا دەبێ لە بەرانبەردا بۆیان قەرەبوو بکرێتەوە بەڵکو لە بواری مافەکانی سیاسی.

بەتاوانبار کردنی بەرپرسانی دارایی وڵات کە ئەوان لەم مایە پوچەی وڵات بەرپرسن لەلایەن ئرستوکراتەکانەوە ، کالون توشی لەرودامان دەکەن. دیارە ئیتر بۆجاری سێیەم ئرستوکراتەکان دەتوانن لە نیسانی ١٧٨٧ چسکازیەکی دیکە دورخەنەوە کە لە بواری چاکسازی دارایی وڵات دەدرا.

وا پێدەچوو ئرستوکراتەکان زۆر لەوە بەهێزتر بن کە وەزیرەکان یا کاربەدەستانی پادشا بتوانن کاریان لەسەر بکەن، بەڵام دەرکەوت ئەوان یاریەکی سیاسیی مەترسیدار دەکەن، هەر لە میانی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی پیران داواکاریەک لەلایەن ( لاڤاییت ) خاوەنی ئەو ناوبانگەی کەلە جەنگی سەربەخۆیی ئەمریکا بەشداریی کرد بەرز دەکرێتەوە، داوای کۆبونەوەی (ئەنجومەنی چینەکان) دەکا، هەرچەندە ئەم بانگەوازە پێشتر ئەوەندە دووبارە نەدەکرایەوە بەڵام ئەمجارەیان زۆر بەهێزەوە خەریک بوو بەرە و جێبەجێکردن دەچوو.

ئێستا کێشە لە نێوان ئۆرستوکراسیەکان و پادشاگەراییەکان دروست بوو، پادشاگەراییەکان دەیانەوێ بیسەلمێنن کە ئرستوکرات لەژێر فەرمانی ئەواندان، ئرستوکراتەکانیش پشتیان بە دەزگای حکومی دادوەریەکانەوە بەستوە بۆ ناچارکردنی پادشاگەرایی و پاراستنی پێگەی بەهێزی خۆیان بە ئمتیازەکانەوە. لەوە بێخەبەر بوون کە ئەم ململانێیە ئەوان و پادشا لاواز دەکا.

بە لادانی کالون و دانانی ( دی براین De Briene ) سەرۆکی ئەسقوفەکانی تولوز لە شوێنی ئەو، کێشەکەی نێوانیان توندتر دەبێ و دەتەقێتەوە. ئەم ئالوگۆرە بە پشتگیری شاژن ماری ئەنتوانێت بوو. هەرچەندە ئەو پیاوە لە ناحەزەکانی کالون بوو بەڵام ئامادە بوو هەندێک راسپاردە و ئامۆژگاری لە کالون وەرگرێ، دی براین لە کەسە زانا و خاوەن پێگەکان بوو کە گوێ لە بۆچونەکانی دەگیرا، هەرچەندە لە سەرەتا هەندێک چاکسازیی ئەنجامدا و گەنجینەی دەولەتی لە مایەپوچی رزگار کرد بەڵام دواجار هەردەبوایە کار بە راسپاردەکانی کالون بکا و لەسەر رێچکەی ئەو بڕوا، دی براین بە ئازادکردنی بازرگانی دانەوێلە پرۆژە چاکسازیەکانی کالونی زیندوو کردنەوە. ئەوەندەی نەمابوو سەرکەوتن بەدەست بێنێ لە باج خستنەسەر زەویەکان بە یەک پاکێج، تەنانەت ئەگەرمولکی یا لەدەست ئۆرستوکراتەکانیش بێ، بەڵام لەلایەن چینی پەیوەندیدار بەرگریەکی توندی

توش هات نەیتوانی جێبەجێی بکا، ئەم چینەش پشتیان بە ئەنجومەنی پیران و دادگا بەستبوو چونکە زۆرینەی ئەندامەکانی لە خۆیان بوون.

ئەنجومەنی پیران رەتیکردەوە باج بخاتە سەر زەویەکان، ئاسایی بوو دی برایین ئەم بڕیارەی پشتگوێخست، بە نیازی ئەوەی رێورەسمنامەی پادشا لە دادگا تۆمارکا و بڕیارەکەی خۆی بباتە سەر.

لە دادگا پادشاگەرایی رەها لەگەل ئرستوکراتەکان رووبەڕووی یەک بوونەوە، لویسی شانزەهەم ویستی هەمان رۆلی لویسی چوارەهەم بگێرێ، بەڵام دادگا داواکەی لویسی شانزەهەمی رەت کردەوە و ئامادە نەبوو رەزامەندیی لەسەر بدا و مل بۆ هەڕەشەکانی کەچ بکا. ووتی ئێمە پارێزگاری لە ئازادیەکان دەکەین لە دژی ستەمکاریەکانی پادشا و ئەنجومەنی چینەکانیش تاقە دەسەڵاتە کە بتوانێ بڕیار لەسەر باجەکان بدا.

ئەوەندە نابا پادشا و دارو دەستەکەی لە راوێژکارەکانی، سیستەمی دادگایان گۆڕی تا کاری ئۆپۆزسیۆنی ئرستوکراتەکان پێ خاو کەنەوە یا پەکخەن. ئەمەش پێشەکیی هەندێک گۆڕانکاریی ئالۆز بوو. ئرستوکراتەکان رایانکردە لای بۆرژواکان بۆ بەستنی هاوپەیمانێتیەک لە دژی پادشا، دی برایین هەستی بەوەکرد کە ئەم دژاتیە زۆر لەوە بەهێزترە ئەوان بتوانن روو بەروویان ببنەوە و بەسەریاندا زاڵ بن.

کێشەی دارایی و گەنجینە چارەسەر نەکرابوو کە کێشەی دیکە لە نێوان ئۆرستوکرات و پادشا سەرهەلدەدا ، دی براین لەم میانە ناچار دەبێ کاتی بەستنی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی چینەکان بە یەکی ئایاری ١٧٨٩ دیاری دەکا.

دوای ئەوە دی برایین دەست لەکار دەکێشێتەوە جارێکی دیکە نیکەر پۆستەکە دەگرێتەوە دەست، یەکەم کار کە نیکەر کردی گەڕاندنەوەی دادگا بۆ حالەتی جارانی بوو، بەم شێوە هاربونی ئرستوکراتەکان هێور دەبێتەوە. داوای کۆبونەوەی ئەنجومەنی چینەکانی کرد لەسەر هەمان شێوەی کە پێشتر دادگا داوای دەکرد کە بریتی بو لە کۆبونەوەی نوێنەرانی خانەدانەکان لە ژوری خۆیان، دواتر کۆبونەوەی پیاوانی ئاینی لە ژوری تایبەتی خۆیان و نوێنەری چینی سێیەمیش هەر لە ژوری تایبەتی خۆیان، بۆئەوەی زۆرینەی دەنگەکان لە بەرژەوەندی چینی ئرستوکرات بێ، هەروەکو ئاماژەمان پێیدا دەنگەکان لەسەر بنەمای ژورەکان دەهاتە ئەژمار نەک لەسەر بنەمای کۆو دەنگەکانی ئەنجومەن بە گشتی. بەم شێوە دەنگەکان لە بەرژەوەندی ئرستوکراتەکان نابێ چونکە، ژوری پیاوانی ئاینی و

و: خالید هەرکی

خانەدانەکان بەیەکەوە نابێتە بەرژەوەندی ئۆرستوکراتەکان بڕیارەکە لە دژی ویتس و ئیمتیازەکانیان دەبێ.

هەرچەندە دادگای پاریس بڕیاری دابوو ئەژمارەکە لەسەر بنەمای زۆرینەی دەنگ دەبێ لەم حالەتەش دەنگەکانی ژوری چینی سێیەم و بە مەزندەی ئەوان هەندێک لە دەنگەکانی ئەکلیرۆس لە بەرژەوەندی ئەواندا دەبێ. زۆرینە دەبێتە بۆخۆیان بەڵام ئۆرستوکراتەکان پێداگریان لەسەر ئەوەکرد کە دەنگدانەکان لەسەر بنەمای ژورەکان دەبێ تا بەرژەوەندی و ئیمتیازەکانیان پارێزراو بن.

نوێنەری بۆرژواکان کە چینی سێیەمی دەبرد بەڕێوە، هەستی بەو پیلانە دەکرد کە ئۆرستوکراتەکان دەیبەن بەڕێوە. بۆرژواکانیش دڵنیا بوون لەوەی ئەمە تاقە دەرفەتە بۆئەوەی پێگەی کۆمەلایەتی و سیاسیان هاوشانبێ لەگەڵ چینی ئرستوکرات.

بورژواکان سەرکردە و پسپۆری زیرەکیان لێ هەڵکەوتوبوو، ئەمە لە نێو ئۆرستوکراتەکاندا نەبوو، نوێنەرانی چینی سێیەم لە ئەنجومەنی چینەکانی نەتەوە لە دادوەر و پارێزەر و ئابوریناس و بازرگان و پیشەوەر و زانا و نوسەرەکان خاوەن توانایەکی کەموێنە بوون لە نمایشکردن و بەڕێوە بردنی کاروباری ئیداری.

ئۆرستوکراتەکان بوون ئامادەبون بە شپرزەیی و پەرشوبڵاوی لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی چینەکان بەشداربن، سەرکردایەتی باڵایان تەنها دیمەنێک بوو لەدەست خانەدانەکان بوو، ئەکلیرۆسەکانیش وێڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان لە نێو نوێنەراندا هەبوو بەڵام لایەنگری چینی سێیەمیان دەکرد، لەبەر هۆکاری ئیمتیازەکانی ئرستوکراتەکان هاوکاری خانەدانەکانیان نەدەکرد.

بەڵام ژمارەی ئەکلیرۆسەکانی دژ بە ئیمتیازەکان لە نێو نوێنەرانی ئەم چینە زۆر بوون، گرنگیان دەبێ لە بەهێز کردنی چینی گشتی دژی ئرستوکراتەکان.

لەم ماوە بەهۆی ڕوودانی چەند گۆڕانکارییەکی گرنگەوە جەماوەری شارو گوندەکان هاندەدرێن کە بجولێن، بەرهەمی کشتوکاڵی ١٧٨٨ کەم بوو، نرخی دانەوێلە و پێداویستیە زەرورەکان بەرز دەبێتەوە، بەو هۆیەوە برسێتی لە نێو چینی هەژار بلاو دەبێتەوە.

ئەوەی قەیرانی ئابووریی توندتر کرد ئەو پەیمانەی نێوان ئینگلتەڕا و فەرەنسا بوو کە لە ساڵی ١٧٨٦ بەسترابوو لە بەرژەوەندی ئینگلتەرا دابوو، ئینگلتەرا بەو هۆیەوە لەبواری پیشەسازی گەشە دەکا، بەرهەمەکانی دەتوانن رکابەری لەگەڵ بەرهەمەکانی فرەنسیدا بکەن

و بەسەریدا زاڵ بن. لە ئەنجام کرێکاری پیشەسازیی فرەنسی بێکار دەبێ و ئامادە دەبی هەرکارێکی دەستکەوێ بیکا.

ئەم چینە هەژارە زۆر رقی لە ئرستوکراتەکان بۆوە، ئامادەییان تیادابوو شۆڕشیان لە دژ هەلگیرسێنن. ئەمە یەکێک بوو لە هۆکارە گەوهەریەکانی روداوی ١٧٨٩. ململانێی نێوان پادشاگەرایی و ئرستوکرات و بۆرژوای هەلگەڕاندەوە بۆ شۆڕشێکی گەلەریی سەرتاسەری.

بۆیە ئۆرستوکراتەکان و بۆرژواکانی ئەنجومەنی چینەکانی نەتەوەی فرەنسی بەیەکەوە لە راو تەکبیردا دەبوون تا هەر هەنگاوێک بهاوێژن بە هاوبەشی بیکەن و لە ئەنجومەن دەنگی پێویستی لەسەر بەدەست بێنن و لە بڕیارەکانی ناوەخۆو دەرەوەشدا یەک هەلوێست بن، بە ئەسپایی کاریان لەسەر پاراستنی دەستکەوت و ئیمتیازەکانی ئۆرستوکرات دەکرد.

ئا لەم کەش و هەوا گرگرتوە ئەنجومەنی چینەکانی نەتەوەی فرەنسی دانیشتنی خۆی دەست پێدەکا. یەکەم کێشە کە رووبەڕوویان بۆوە لێکۆڵینەوە لەسەر راستی دەنگە وەدەست هێنراوەکانی نوێنەرانی ئرستوکرات و چینی سێیەم بوو. ئەم پرسە دەستپێکی جوولەی بۆرژوا بوو دژی ئۆرستوکراتەکان دوایئەوان جەماوەر لە دژی ئرستوکرات وپادشا هاتە دەنگ.

# بەشی بیستەم

## شۆڕش

ئەنجومەنی چینەکانی نەتەوە لە پێنجی ئایاری ١٧٨٩ کۆدەبێتەوە. نیکەر وەکو راپۆرت و بەرنامەی داهاتوی گوتارێکی خوێندەوە، لەسەر ئەو رێکارە داراییانەی دەبێ بیگرێتە بەر بۆ رزگار کردنی گەنجینەی دەولەت لە مایەپوچی. پێشنیاری هەبوو لەسەر ئەو باجە نوێیانەی بە دیدی چینی سێ دەچێتە گیرفانی کۆشکی پادشا و ئرستوکرات. ئەمە یەکێک بوو لە هۆکارەکانی بێزاری چینی سێیەم. چونکە ئەوان نەهاتبون تا گەنجینەی دەولەت بە پارەی هەژاران و چینی سێیەم پڕکەنەوە بەڵکو بۆ رزگارکردنی چینی ژێرکەوتە و مافخوراو هاتبوون. ئەوان بەرنامەیەکی چاکسازیی گشتگیریان دەویست، بەڵام حکومەت خۆی لەم هەنگاوە دزیەوە، بۆیە نوێنەرانی چینی سێیەم پێیان وابو دەبێ خۆیان ئەمە بکەن، بەڵام ئەکلیرۆس و خانەدانەکان سوربون لەسەر ئەوەی هەر ژورە و بەجیا کۆبونەوەی خۆی بکا و بڕیارەکانی بدا، وەکو هەر دەرهاوێشتەیەکی دوای هەلبژاردنەکان دەکرا لێکۆلینەوە لە سەر راستی هەر نوێنەرێک لە نوێنەران ئەنجام بدرێ.

نوێنەرانی چینی گشتی داوایەکی راستگۆیانەیان لە خانەدان و ئەکلیرۆسەکان کرد تا بەیەکەوە دانیشن و گفتوگۆ لەسەر هەموو پرسەکان بکەن، بەڵام ئرستوکراتەکان لە هەڵوێستەکانیان توند بوون، نوێنەرانی چینی سێیەمیش بەهەمان شێوە توندیان کرد، جگە لەوەی هەندێک لە ئەکلیرۆسەکان هاتنە ریزیان بەهۆی ئەوەی کە نوێنەری راستەقینەی گەلن ئەگینا چینی سێیەم دەستبەرداری بەرگری نەرێنی بوون. لە میانی ئەم قەیرانە دوو بیرۆکە سەرهەڵدەدەن کە بۆ مێژوی شۆڕشی فرەنسی بایەخی دەبێ:

یەکەمیان/ ناو نانی ئەنجومەنی چینەکانی نەتەوی بە ( کۆمەڵەی نیشتمانی ).

دووەمیان/ بانگخوازی بۆ دانانی دەستورێک.

هەروا بوو لە ١٧ی تەموزی ١٧٨٩ ئەنجومەن ناوی خۆی گۆڕی بۆ ( کۆمەڵەی نیشتمانی ) ئەوەندە نابا کە دەستور دادەنێن بە ناوی کۆمەڵەی دامەزارندن خۆیان دەناسێنن.

ناونانی ئەنجومەنەکە بە ناوی ( ئەنجومەنی نیشتمانی )ەوە سەرکەوتنێکی گشتی بوو بەسەر ئۆرستوکراتیدا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کارەکان دەچن بەرێوە جا ئەگەر

ئۆرستوکراتەکان بەشداری بکەن یا نەیکەن. ئەمە پیادەکردنی بیردۆزێکی ( سیەس Syes ) ی یەکێک لە فەرماندەکانی شۆڕشی فرەنسی بوو، بە کاری دەستورەوە سەرقاڵ بوو لە هەمان کاتیشدا بانگخوازی ئەم رەوتە بوو، پێی وابوو ( گشتییەکە ) هەموو شتێکە بۆیە دەبێ هەموو شتێکی بەدەست گشتەوە بێ، بە دورخستنەوەی ئۆرستوکرات دونیا کۆتایی نایە.

لێرە بە پێویستی دەزانین بپرسین: بۆچی پادشا و یاوەرانی لەگەڵ ئۆرستوکراتەکان یەکیان نەگرت لە دژی نوێنەری شۆڕشگێڕەکان لە کاتێکا بە ڕاشکاوی هەڵوێستی خۆیان لە دژی ئۆرستوکرات ڕاگەیاندبوو؟ ئەی بۆچی پادشا گوێی لە ماری ئەنتوانێت و چەند میر و خانەدانێک نەگرت لە سەروی هەموویانەوە ( کونت دارتو ا) کاتێک داوایان لێکرد، ئەویش پێداگریی لەسەر بەکار هێنانی هیز لە دژی سەرکردە تازە هەڵکەوتوەکانی دەکرد.؟

لە ڕاستیدا پادشا نیازێکی بەهێزی هەبوو هەناسەی نوێنەرانی چینی سێیەم کپ و بێدەنگکا. بەڵام هەر لەسەرەتاوە پێویستیی پێیانەوە هەبو، هەر ئەوبوو کۆیکردبوونەوە بۆ ڕزگار کردنی وڵات لە مایەپوچی، بەڵام کێشەکان هەر وەکو خۆیان مانەوە بێ چارەسەری بۆیە دەبوایە بە سیاسەت لەگەڵیاندا بێتەوە تا ئامانجەکانی جێبەجی دەکا، ئەمە بوو ئەو ڕێچکەی لویسی شانزەهەم بە ئاماژەی لایەنێک گرتبویە بەر کە فشار بخاتە سەر لایەنێکی دیکە بۆ هاوهەنگاوبون لە گەڵ چینی سێیەم کە دەستیان لێنەدا و نەیان وروژێنێ.

بۆ لویسی شانزەهەم ئاستەم بو ئەم بزووتنەوە لەبەین بەرێ، چونکە هەندێک دۆخی لەو بەهێزتر هەبوون ڕێگریان لێی دەکرد، لەوانە حزبی پادشاگەرای توندڕەو بەسەرۆکایەتی شازن ( کونت دارتوا ) ڕێگربوو لە ئەنجامدانی هەر ڕێکارێکی سەربازی دژی ئەنجومەنی نیشتمانی، ئەمەش مانای ئەوەیە پادشا پێویستییەکی زۆری بە پارە هەیە بۆیە دەبێ نەیکەری خۆشەویستی گەل لەسەر دەسەڵات بمێنی، کە ئەو مەبەستی بوو لەگەڵ سەرکردەکانی چینی سێیەم بگەنە ڕێککەوتن.

بۆیە ئەو ڕێکارانەی لویسی شانزەهەم گرتنیە بەر بریتی بوون لە ڕەفتاری ڕازیکردنی چینی سێیەم و ئامارەدان لە بەکار هێنانی هێز ( سیاسەت بە چاو زەقکردنەوە.و ). بەڵام تا کەی دەتوانی بەم شێواز و ڕێکارە پرسەکە ببا بەڕێوە؟ لە کاتێکا سەرکردەکانی بۆرژوا بە هیچ ڕازی نابن جگە لە جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی سیاسی و کۆمەلایەتی و دارایی خۆیان نەبێ.

و: خالید هەرکی

ئەمەو شازادە ( ئورلیانز ) پێێ وابو گەشە کردنی چینی سێیەم لەسەر حسابی پێگە و هێزی لویسی شانزەهەم دەبێ، ئەمە راست بوو، بەڵام دواتر وا رێکخرا کە ئەنجامەکەی وا نەبێ ، چونکە لاواز بوونی لویسی شانزەهەم دەرفەت بۆ ئەو دەرەخسێ بێتە شوێنی، هەر ئەمەشی کرد، دارایی و سامانی خۆی خستە خزمەت چینی سێیەم و کاری لەسەر زیاد کردنی ئاژاوە و کێشە لە نێوان پادشا و ئەنجومەنی نیشتمانی کرد، هەموو دەرفەتەکانی لەناو دەبردن کە ئەگەری گەیشتنی پادشا و چینی سێیەمی لێ بەدی دەکرا.

هەر بە تەواویش پادشا هەموو تواناکانی خستنە گەر بۆئەوەی بروا بە چینی سێیەم بێنێ کە ئەو رێچکەیەکی نیانی گرتۆتە بەر، هەر لەم روانگەیەوە پادشا نەریتێکی کۆن لاسایی دەکاتەوە کە جاران پیادە دەکرا، ئەویش ئامادە بونی پادشا بوو لە ئەنجومەنی چینەکانی نەتەوی و لە کۆبونەوەکانیان، ئەمەشیان بۆئەوە بوو ئەنجومەن هاتنیان و ئامادە بونی بە هەند وەرگرێ و مەرسومنامەکانی تۆمارکا، بەم شێوە پادشا بڕیاریدا (دانیشتنێکی پادشایانە) لە ٢٢ی تەموز ئەنجام بدا، دەرگای هۆلی کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی چینەکان داخرا تا بۆ کۆبونەوەی داشایانە ئامادە بکرێ بەڵام رۆژی کۆبونەوەکە دواخرا بۆ ٢٣ی تەموز.

نوێنەرانی چینی سێیەم بەم شێوەی لێ تێنەگەیشتبوون، پێیان وابوو پیلانێکی ژێربەژێرە بۆیان دانراوە بۆیە بڕیاریان دا لە هەر شوێنێکی دیکە بێ کۆبونەوەکانیان ئەنجام بدەن، ووتیان کۆبونەوەکانمان راناگرین تا دەستوری پێ دەرنەکرێ، چون لە گۆرەپانی تێنس کۆبوونەوە ، ئەمە یاخی بونێکی ئاشکەرایە لە دژی پادشا. لەم ئان و ساتانە گۆرانکاریەکی گرنگ لە بەرژەوەندی ئەوان روو دەدا ، ئەکلیرۆس بڕیاریدا لەگەڵ چینی سێیەم کۆبێتەوە، لە ٢٠ی تەموز لە کڵێسای سان لویس لەگەڵ چینی سێیەم کۆبوونەوە، ئەو وەختەی کاتی کۆبونەوە پادشاییەکە دێت، هێزی چینی گشتی یەککگر و پتەو دەبێ زال بون بەسەریاندا سەخت دەبێ.

کۆبونەوەکە لە ٢٣ی تەموز ١٧٨٩ ئەنجام درا، پادشا سیاسەتێکی مامناوەندیی گرتەبەر، نەبە تەواوەتی لەگەڵ ئرستوکراتەکاندا بوو نە لەگەڵ چینی سێیەم، لەهەمان کاتیشدا پێداگریی لەسەر مافی پادشا دەکرد لە بڕیاردان لەسەر یەکلایی کردنەوە، بەڵام دۆخەکان ئەوە نەبوون بەم نیانیە چارەسەر بکرێن لەوە بەهێزتر بوون.

پادشا لەسەر یەکسانی فرەنسیەکان بۆ باجدان رازی بوو، هەروەها لەسەر ئازادیەکانی تاک و ئازادیەکانی رۆژنامەگەری. بەڵام پێداگریی لەسەر شێوازی کۆن کردەوە لە بەستنی

کۆبونەوەی ئەنجومەنی چینەکان لەسەر بنەمای دەنگدانی چینایەتی واتە زوورەکان، بەڵام ئەم شێوازە لای چینی سێیەم کەوتۆتە نێو مێژوو چیتر کاری پێناکەن.

ئێستا دۆخەکان ئالۆز بوون نوێنەرانی چینی سێیەم ئامادە نین هۆلی کۆبونەوە جێبێلن، پیاوانی پادشا هاتنەسەریان داوای چۆلکردنیان لێکردن، بەڵام ئەوان رەتیانکردەوە . پادشا بیری لەوە کردەوە فەرمان بە پاسەوانەکانی بدا بە هێز بلاوەیان پێبکەن بەڵام ئەمە دۆخەکەی ئالۆزتر دەکرد، چونکە دیار بوو کە ( لاڤاییت ) و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون سوربون لەسەر ئەوەی بە گیان قوربانی بدەن و ئەم هۆلە جێنەهێلن، ئەمە هەلوێستێکی مەردانە و خۆراگر بوو، کە پادشا کوشتنیان بەسەردا بسەپێنێ و ئەوانیش ئامادەیی خۆیان بۆ بەرگری نیشان بدەن، فەرماندرا ئەو شەڕە راگرن، ئەمەش دەبێتە سەرکەوتنێکی دیکەی چینی سێیەم.

لەو کاتەوە سەرکەوتنەکانی چینی سێیەم یەک لەدوای یەک دێن، لە ٢٤ی تەموز ژمارەیەکی زۆر لە ئەکلیرۆس دێنە ریز ئەنجومەنی نیشتمانی، بەهەمان شێوە ژمارەی ٤٧ ئەندامیش لە خانەدانە ئازادەکان بە سەرۆکایەتی ئورلیانز دێنە ناو ئەنجومەنی نیشتمانی، بەم شێوە زۆرینە بۆ چینی سێیەم دەبێ. تەنها کەمینەیەک لە ئەکلیرۆس و زۆرینەی خانەدانەکان لە دەرەوەی چینی سێیەمدا مانەوە، دیار بوو کۆمەلەی نیشتمانی وێڕای هەلوێست توندی هەندێک لە کۆنەپەرستان لەکارەکانیان بەردەوام دەبن. دوای ئەوەی پادشا هەستیکرد ناتوانێ میلی کاتژمێرەکە بەرەو دواوە بگێڕێتەوە، وەهای دەرخست کە کارەکان بە فەرمانی ئەو ئەم رێچکەیان وەرگرتوە، بۆیە بەباشی زانی رەزامەندی لەسەر بەستنی کۆبونەوەی کۆمەلەی نیشتمانی بدا بەبێ رەچاوکردنی چینایەتی و ئیمتیازەکان بۆئەوەی کارەکان بە ئارامی بچن بەرێوە.

بەڵام بیرکردنەوەکان نەهاتنە جێ و مەزندەکان هەلە بوون، چونکە چینی سێیەم سەیری دواوە ناکا، بەم سەرکەوتنانەش ناوەستێ مەبەستی سەرکەوتنی یەکجارەکی بوو. ئامانجی بۆرژواکان نەهێشتنی سیستەمە کۆنەکە بوو، هەرچەندە بەشێک نوژەن دەکرایەوە ئەوان بەشێکی دیکەیان لەناو دەبرد.

دوای ئەم قەیرانانە کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ دانانی دەستور خۆی وەکو کۆمەلەی دامەزارندن رادەگەیەنێ و لیژنەیەکی بۆ ئەم مەبەستە لە سەرەتای تەموز پێکهێنا. بەڵام ئەم کۆبونەوانە چۆن ئەنجام دەدرێن لە کاتێکا ماری ئەنتوانێت و کونت (دارتوا) پیلانەکانیان دژی کۆمەلەی نیشتمانی بەرێوە دەبەن، شاژن پێی وابوو بەرێوەچوونی ئەم پرسە بێنەوەی

و: خالید هەرکی

هێزیان لە دژ بەکاربێ دەرفەت دەداتە کۆمەڵەی نیشتمانی خۆی قایمتر بکا ، دواتر شاژن لەوە دڵنیا بوو کە شازادە ئورلیانز بەنیازە و کار بۆ ئەوە دەکا خۆی و پادشا وشازادەی کوڕی لەناو بەرێ تا خۆی شوێن پادشا بگرێتەوە، ئەم جۆرە ناحەزانەش تەنها بە هێز لەناو دەچن، کونت (دارتوا) هەمیشە هانی دەدا تا کارێکی وای پێبکا و بە هەمان ڕێچکەسیاسیی پادشا نەگرێ. ئەم جۆرە ئامۆژگاری و بەرنامانەی لەلایەن کونت (دارتوا) بە شاژن دەدران بەتەواوەتی لەگەل خەسلەتی شەڕانگیزی کونت دەهاتنەوە. بۆیە خۆی و دەوروبەرەکەی پیلانێکیان ڕێکخست بەناوی (کودەتای پادشاگەرایی).




بەر لە ڕودانی دەنگۆ بلاو بونەوە کە کودەتا لە دژی کۆمەلەی نیشتمانی ئەنجام دەدرێ بەڵام هیچ شتێک نەدەبینرا تا ئەوکاتەی مارشال (بروگلی Broglie) بە هێزێکی کرێگرتەی سویسری و ئەلمانی لە ١١ی ئەیلولی ١٧٨٩ لێیان نزیک دەبنەوە تەنانەت بە هاندانی شاژن پادشا و دەست و پێوەندەکانیان دور خستنەوە لەوانە نیکری وەزیریش .

ئەم ڕەفتارە جەماوەر و کۆمەلەی تورەکرد و ئالۆزیی خستە نێو دۆخەکان ، بۆرسە دادەخرێ، شانۆ و ئاهەنگەکان دەوەستێندرێن، جەماوەرە تورەکە ڕێک دەخرێ، لە هەموو شوێنێک دەنگۆی نارەزا یی بلاو دەبێتەوە، بلاوکراوەی دژایەتی پادشا و خانەدانەکان لە هەموو شوێنێک دەبینرێ و هەلدەواسرێن، ڕۆژنامەکان گر دەگرن لە هەوالی بە پەرۆش، چەند نوسەر و ڕەوشەنبیرێکی شۆڕشگێڕ بەدەر دەکەون گوتار خوێنە شۆڕشگێڕەکان دێنە مەیدان و بە هەمویانەوە سەرنج و توانای جەماوەری پاریس یەکدەخەن و بۆلای خۆیان دەکێشن، ئەمەش دەبێتە ئومێدی (کۆمەلە) بۆ دژایەتی کردنی پادشا و خانەدانەکان کە پشتیان بە سوپا بەستوە بۆ هێرش بردنە سەر جەماوەری ڕاپەڕیو.

(کۆمەڵە) هەستی بەو مەترسیە مەزنانە کرد لە ڕوبەروو بوونەوەیان لەگەڵ هێزە بەکرێگیراوەکە بۆیە لە سەرەتا هەلوێستێکی ئاشتیانەیان گرتەبەر، هەندێک لە ئەندامانی کۆمەڵە داوایان لە پادشا کرد ئەم هێزە لە پاریس دوورخاتەوە، بەڵام پادشا سازشیەکی زۆری کردبوو بۆیە گوێڕایەلی هەلوێستەکانی شاژن دەبێ لە بەکار هێنانی هێز و پۆستی وەزارەتی بەرگریی بە (بروگلی) بدا.

کاتژمێری سفر نزیک دەبێتەوە و کۆمەڵەی نیشتمانی پشتی بە نوێنەرە جەربەزەکانی بەستوە شتێ بکەن بەڵام ئەم نوێنەرانە بەدەستی خاڵی ناتوانن بەرگەی هێرشەکانی سوپای بروگلی بکەن. دواتر دەبوایە کۆمەڵە هێزێکی هەبێ بەرگریی پێ لەخۆی بکا بۆیە گرنگی (جەماوەری پاریس) بە بایەخ زاندرا.

بەقەدەر سەرکەوتنەکانی کۆمەڵە جەماوەری پاریسیش مۆرالیان سەردەکەوێ و جۆش دەدرێن، دڵنیا بوون لەوەی ئەگەر ئەم سەرکەوتنانە نەپارێزرێن هەرکاتەی پادشا دەستی باڵا بوو ئەو دەستکەوتانە یەک لەدوای یەک لەناو دەچن. لەولاوە ژمارەیەک لە گوتارخوێنی شۆڕشگێڕ لە گۆڕەپانەکانی پاریس گوتاریان دەخوێندەوە جەماوەری پاریسیش بە تامەزرۆییەوە گوێیان لێی رادەگرت، هانی پاراستنی دەسکەوتەکانیان دەدا لە سەروی ئەو گوتارخوێنانە ( دی مولین) بوو، بەهەزاران جەماوەری پاریس کە کاریان لەدەست دابوو بێکار و بێ دەرامەت توانای کرینی دانەوێڵەیان نەبوو لەبرسا دە ناورانەوە. دەنگۆی ئەوە بلاو بۆوە کە ئرستوکراتەکانن دانەوێڵەیان لە عەمبارەکاندا شاردۆتەوە تا چینی سێیەم توشی نەهامەتیبێ. هەرکە پۆلێک لە جەماوەری جۆشدراو لەگەڵ پاسەوانە ئەلمانیەکان بەگژ یەکدا دەچن دۆخەکان گڕ دەگرن. ئێستا هاوڵاتیانی پاریس لەوە دڵنیا بوونەوە کە پادشا لە پیلان و بەرنامەکەی بەردەوامە ئەم پیلان و بەرنامانەش تەنها بە پرچەککردنی جەماوەر لە گۆڕ دەنرێن، بۆ ئەم مەبەستە شەپۆلی جەماوەر بەرەو ئەو شوێنانە چون کە گومانی بونی چەکیان لێدەکرێ، لەم میانە ئاژەوەگێڕان کۆگا و دوکانەکانیان تالانکردن.

لە ئوتێل ئەنڤالید کۆگایەکی چەک هەبوو. (جەماوەری پاریس) هێرشیان کردە سەری و توانیان ٣٢ هەزار پارچە چەکی تفەنگ دەست بەسەردا بگرن، ئێستا جەماوەری ڕاپەڕیوی پاریس بوە خاوەن چەکی خۆی، هەرکە بەشێک لە (پاسەوان) دێنە ریز جەماوەرەوە، زیاتر ورەیان بەرز دەبێتەوە و لە دەوری قەلای باستیل کۆدەبنەوە.



و: خالید هەرکی

ئەم قەڵایە یەکێک بوو لە قەلاکانی دەرەبەگایەتیی کۆن، بایەخی ئەم جۆرە قەڵایانە لەروی سەربازییەوە ئەوکاتە نامینێ کە ( مازاران) لە هەوڵی نەهێشتنی دەسەڵاتی خانەدانەکاندا هاوشێوەی ئەم قەلایەی روخاند. دوای ئەوە ئەم قەلایە دەکرێتە زیندانی دەولەت، هەموو ئەوانەی بۆ ماوەیەکی دوور زیندانی دەکران دەخرانە ئەم زیندانەوە، دەوری ئەم قەلایە بە چەند ئەفسانەیەک دەور درابوو کرابوە سمبولی ستەم و زۆرداری.

لەروی سەربازییەوە تەنها بە ژمارەیەکی کەمی سەربازی پاسەوانیی دەکرا ئەگەر بە رووبەرەکەی بەروارد بکرێ، نزیکەی هەشتا پاسەوانی لێدانرابوو یەکێک لە مێژوو نوسان ئەو زیندانیانەی بە شێوێندراوانی شەڕ ناوی بردبوون، لە تەک ئەوانیشەوە نزیکەی ٣٠ سەربازی سویسری هەبوون.

بەرپرسیارێتی قەلای باستیل بە ئەفسەرێکی کەم ئەزمون سپێردرابوو، بەناوی دی لێونای De Launauy هەندێک هاونی لەبەر دەستدا بوو لەسەر شورەی قەلاکەی دایمەزارندبوو، پێی وابو بەبێ فەرماندە جەماوەر ناتوانێ ئەم قەلایە بگرن، بەڵام ئەو هێزەی جەماوەر کە هێرش دەبەن دوو هێزیان لەبەردەست دابوو کە ئەوان حسابیان بۆی نەکردبوو:

١/ ئەو مۆراله بەهێزە کە جەماوەر بۆ قوربانیدان هاندەدا، دوای ئەوەی گەل چەکی کردە شان پێویستیی بە سەرکەوتنی سەربازیە، ئەمەش ئەو دەرفەتە رەخساوە.

٢/ ژمارەیەکی زۆری پۆلیس چونە ریز جەماوەرەوە، ئەوان شارەزاییان لە کاری سەربازیدا هەبوو، بیە هەر خۆیان بونە فەرماندەی جەماوەرو بەرەو گەمارۆدانی قەلایان بردن.

لەژێر دەنگی هاون ومۆرالی جەماوەری گرگرتو دەتوانن بەسەر شورەی قەلا بکەون و دەست بەسەر زۆربەی بەشەکانیدا بگرن، کاتێک بەرگریکارانی قەلا ئەمە دەبینن ، هەر ئەوەندەیان بۆ مایەوە داوای پاراستنی ژیانی خۆیانیان لێ بکەن لە بەرامبەر خۆوەدەست دان و کردنەوەی دەرگاکانی قەلا. جەماوەر گوێیان بۆ داواکەیان راگرت هەرکە دەرگاکان کرانەوە شەپۆلی جەماوەر بەزۆر دەکەوێ و شمشێرەکانیان لەسەر ملی ئەوانە دەخەنە کار کە داوای پاراستنی ژیانیان لێ کردبوون. جەماوەر بەدوای زیند انیەکاندا دەگەڕان کە ستەمیان لێکراوە و زیندانی کراون بەڵام تەنها حەوت کەس دەدۆزنەوە ئەوانیش لە حالەتێکی شپرزە و نەخۆشیدا بوون، هەر لە مردوو دەچون، ئیتر جەماوەری راپەڕیو ئەو زیندانیانە بە شەقامەکاندا دەگێڕن وەکو خۆشی سەرکەوتنەکان ،ئەو خۆشیەی ماوەیەکی زۆر بوو پادشاکان لێیان زەوت کردبوون. ئەو رۆژە گەلی پاریس رۆژێکی پڕ ئاهەنگ و

خۆشیان بردەسەر، تا ئەمرۆش گەلی فرەنسی یادی ئەو رۆژە وەکو جەژنی نیشتمانی دەکاتەوە.

هەلوێستی سەربازی دوای روخانی باستیل ناگۆردرێ، بەلام هەلوێستی گشتی دەگۆردرێ، هەموو خەلک لە دۆخێکی شۆرشگێریدا دەژیان شۆرش لە پێناو ئامانجە بالاکان (ئازادی)، دلسۆزی بۆ پادشا و رژێمە کۆنەکە نامێنێ، هێزی جەماوەر زیاد دەبێ

تەنانەت پادشا خۆی ناتوانێ پێشیان لێ بگرێ، رۆژی دواتر واتە ١٥ی تەموز رەزامەندی لەسەر دور خستنەوەی سوپا لە پاریس دەدا، لە ١٧ی تەموز خۆی دەچێتە پاریس وەکو رازی بون بە داخوازیەکانی ١٤ تەموز، بۆ نوێژکردن لە کاتدرائیەی نوتردامی بەناوبانگ ئامادە دەبێ. لە کۆشکی پادشایەتی پێشوازیی لە گەردونناس (بایلیە Baillie) کرد کە ئاماژەی (سێگۆشەی رەنگاو رەنگ)ی پێشکەش بە پادشا کرد کە دواتر دەبێتە دروشم و سومبولی شۆرشی فرەنسی.

پادشا هەموو هەولەکانی دەخاتە گەر بۆ ئەوەی دۆخێکی ئارام بێنیتەکا بەلام جەماوەرەکە بە شێوەیەک گڕی گرتبوو لەوەدانەبوو بەم ئارام بەخۆوە گرتنەی پادشا بتوانێ هێوریان کاتەوە، تەنها بە رووبەڕوو بوونەوەی سوپا و جەماوەر لە شەقامەکانی پاریس ئەگەر بەسەر دۆخەکەدا زاڵ بوایە ئەمەش ئەو کارەبوو کە پادشا هەمیشە خۆی لێ دوور دەخستەوە. لە راپۆرتێکدا (بروگلی) ئەم راستیە دەردەخا و دەڵێ: ناتوانم بەم شێوە بەسەر دۆخەکەدا زاڵ بم و هێوری کەمەوە بۆیە دەست لەکار دەکێشێتەوە.

کارەکان ئەوەندە بە خێرا دەرۆیشتن لەوەدا نەمابو بە سازشیەکانی پادشا بتوانرێ شەقام هێور بکرێتەوە رژێم لە فەوتان رزگاری بێ. ئاراستەکان بەخێراتر بەرەو نەهێشتنی رژێمی کۆن هەنگاویان دەنا، ئەمەش دوای رودانی روخانی قەلای باستیل لە ١٤ی تەموز سەریهەلدا تا دوایین رۆژەکان بەردەوام دەبێ.

(کۆمەلە) بەوەی دەزانی کارەکان گەیشتونەتە ئەو ئاستەی گەڕانەوەیان بۆ نییە، پادشاگەراییش وێرای لاوازیی ئەو نیازەی نیە لە دواساتەکانی گورزێک بوەشێنێ، جا ئەگەر جەماوەری پاریس سورە لەسەر ئەوەی بەرگری لە (کۆمەلە) بکا ئەوا کارەکان لەسەر ئەم بابەتە نەوەستاون، چونکە رژێمە کۆنەکە وا خەریکە لەبار دەچێ، هەردەبێ بینای سیستەمێکی نوێ لەسەر کەلاوەی ئەو رژێمە کۆنە بکەیت، رژێمێک بە بزووتنەوەی

شۆڕشگێڕی پارێزرابێ و دەزگای نوێی تیادا بنیاد نرابێ کە خزمەتی ئەو بزووتنەوە بکا، ئێستا شۆڕش دەستی دایە دامەزراندنی حکومەتەکەی.

بەهێزترین ئاراستەکان بریتی بوو لە دامەزراندنی حکومەتێکی شارەوانی بۆ پاریس، پۆستی ئەمینداریان بە (بایلیە Baillie) سپارد، کە یەکێک بوو لە فەلەکناسە بەناوبانگەکانی فرەنسی خۆی بۆ خزمەتی شۆڕشی فرەنسی تەرخان کرد.

(کۆمەڵە) و بۆرژوا تواناکانیان بە تواناکانی سەربازی بەهێزکرد کە بتوانێ بۆ بەرگری کردن لە هێرشەکانی مولکداران پشتی پێ ببەسترێ ئەگەر هێرشیان کردە سەر (کۆمەڵە)، جەماوەری پاریس بۆ بەرگری کردن لە مومتەلەکانی پاریس کە بەدەست ئروستوکراتەکانەوە نەبون خۆی کۆکردەوە بۆ پاراستنیان لە تیاچون و دەست بەسەردا گردن. کە (کۆمەڵە) لە ١٣ی تەموز بڕیاری دامەزراندنی (پاسەوانی نیشتمانی)ی دابوو لە دوای رووداوەکەی ١٤ی تەموز فەرماندەیی ئەو پاسەوانە بە (لافاییێت) دەسپێردرێ.

سەرەتا پاسەوانی نیشتمانی لە چەند خۆبەخشێک پێکدەهات، دواتر پۆلیسەکان کە بە هزری شۆڕشگێڕی جۆشدرابوون دێنە ریز ئەو دەزگایە، حکومەت متمانە لەدەست دەدا و هێزی پاسەوانی نیشتمانی پەرەدەستێنێ تا ژمارەیان دەگاتە ٥٠٠٠٠ پەنجا هەزار جەنگاوەر.

ئاستی سەربازی ئەو سوپایە ئەوەندە بەرز نەبوو، بەڵام مۆرالیان بەرز بوو، ئەم مۆراله لە نێو سوپاکەی پادشادا نەبوو، بونی لافاییت بە فەرماندەی سوپاکە متمانە و ورەی بە جەنگاوەران بەخشی کە هەموو کەم و کوڕیەکانیان بۆ جێبەجێ دەکا.

لەتەک ئەو سوپا نیشتمانیەی بەردەست کە ئامادە بوو بەرگری لە (کۆمەڵە) بکا ، کۆمەلەی نیشتمانی فاکتەرێکی دیکەی لەدەستدا بوو بۆ بەرگریکردن لە دەستکەوتەکان، ئەویش رۆژنامەگەری بوو، رۆژنامەکان یەک لەدوای یەک دەردەچن هەلمەتی توند دەکەنە سەر رژێمە کۆنەکە، خەڵک بە پەرۆشەوە دەیانکرێ، بەڵام ئەم رۆژنامانە کارێکی نەرێنیان کرد لەوەی بە زیادەوە دەنگو باسی پیلانەکانی دژ بە شۆڕش و هەوالەکانی پادشا و بۆرژوایان بلاو دەکردەوە، بەو هۆیەوە خەلک دەتۆقێنن، بەڵام لە روێکی دیکە ئەم رۆژنامانە ئەوەندە پرفرۆش و بەهیز بوو، رۆژنامەکانی رژێم لەو ئاستەدا نەبون بەرپەرچیان بدەنەوە، پادشاگەرایی لەم بوارە بێبەش دەبێ بەو هۆیەوە ناتوانرێ بەرەیەکی یەکگرتووی هزری یا سەربازی دامەزرێنێ حزبی پادشایەتی بە راو تەکبیرەکانیەوە دیار بوو بەرەو ئفلیجی دەڕوا. لە گوندەکان دەسەڵاتی پادشا نەما، لە شوێن ئەو ئەنجومەنی شارەوانی دامەزارن، نمایندەکانی پادشا کۆچیان کرد و باج وەرگرتن وەستا.

لە لادێ جووتیارەکان دەست بەسەر زەویی ئرستوکراتەکاندا دەگرن لەو میانە دەنگۆی پیلانی مولکداری ئرستوکراتەکان بلاو دەبێتەوە بۆ تێکدانی نێوان جواتیاران. ئەم هەستانە قەیرانی ئابوری توندتر دەکەن، بەهەزاران جووتیار هێرش دەکەنە سەر خانەدانەکان دەست بەسەر زەویەکانیاندا دەگرن و قەوالەی زەویەکانیان پێ دەردێنن و پێیان دەسوتێنن کە مولکدارێتی ئەو زەویانەیان دەسەلمێنێ، یا ناچاریان دەکەن بەلگەی دەست هەلگرتن لەم زەویەکانیان پێ واژۆ بکەن، ئیتر لە زۆربەی گوندەکان دەسەلات دەکەوێتە دەست جووتیار.

لە ژێر ئەم گوشارە خانەدان و میرەکان لە مەیدان دەکشێنەوە ئەم گۆڕانکاریە بەناوی (کۆچکردن) دەناسرێ، لە پێشەوەی ئەو کۆچکردوانە ((کونت دارتوا) دەبێ کە لە هەموویان تووڕەتر و سەرسەختتر بوو لە ڕەفتاری بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی. (کونت دارتوا) لە ١٧ی تەموز فرەنسا جێدەهێلێ بەرەو زەویە نزمەکان کۆچ دەکا. دوای ئەو میر کۆندیە Conde دەڕوا دواتر پۆلیناک Polignaic و مارشال دی برویت De Bruit دەچنە لۆکسمبورگ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆریش دەچنە بەریتانیا، ژمارەیەکیش لە خانەدانەکان لە ویلایەتەکانی ئەڵمانیا لە کەنارەکانی روباری راین لە مینز Mainz و کوبلنز Coblinz جێگیر دەبن.

لە راستیدا ڕووداوەکانی ١٤ و ١٧ تەموز بۆ توندڕەوانی پادشاگەرایی سەلماند کە دۆخەکان ناتوانرێ لە ناوەوە بگێردرێنەوە سەر دۆخی جاران بەڵکو دەبێ لە سەر خاکی وڵاتێکی دیکە خۆیان ڕێکخەنەوە تا دۆخەکان بگێرنەوە .

زۆربەی مێژوو نوسان ئەو مافە بەوە دەدەن بلێن بەراستی کۆچی ئرستوکراتەکان هۆکاری ئەوە بوو فرەنسا ئەم کارەساتەی لە ماوەی ١٧٨٩ تا ١٧٩١ بێتە ڕێ، بەڵکو نەک تەنها فرەنسا ئەوروپاش لەگەڵی.

کۆچبەرەکان وەکو ئەوەی ئەوان خاوەنی فرەنسا بن باسیان لە ڕووداوەکان دەکرد. دوو دڵ نەبوون لەوە دژایەتی لەگەڵ شۆڕشدا بکەن، هیچ بایەخێکیان بە سازشیەکانی پادشا نەدەدا چونکە پێیان وابو ئەو سازشیانە لەژێر فشار کراون، بۆیە هیچ بایەخیکی نابێ. لەلایەکی دیکەوە ئەو خانەدان و میرانە هێزێکی مەترسیداریان نەبوو، ترسەکە لەوەدابوو خۆیان بە سوپای ئەوروپا پڕچەک و بەهێزکەن، بەتایبەت کە شاژن ماری ئەنتوانێت کچی فرانسیسی یەکەم ئیمپراتۆری نەمسا بوو.

بەهەرحال (کۆمەلە) لە ڕێچکە و کاروانی خۆی بەردەوام دەبێ تا لە ١٠،٤،١ ئاب مەزنترین دەستکەوت بۆ گەلی فرەنسی رادەگەیەنی:

و: خالید هەرکی

- لە یەکی ئاب، مەنەفێستی مافەکانی مرۆڤی راگەیاند. کە دەبێتە بەشێک لە دەستوری فرەنسی.

- لە چواری ئاب، چەند بریارێکی گرنگی دەرکرد ، رژێمی کۆنی هەڵوەشاندەوە وبناغەی دەوڵەتێکی نوێی دامەزارند کە بۆرژوا لەخۆی گرتبوو ئەمەش ئەو بریارانەن:

١/ هەلوەشاندنەوەی ئیمتیازەکانی باجدان.
٢/ نەهێشتنی کاری سوخرەیی ( بەزۆر و بێبەرانبەر ).
٣/ بێبەش نەکردنی کەمئەندام لە هیچ مافێکی.
٤/ هەڵوەشاندنەوەی مافی راوچێتیی خانەدانەکان.
٥/ قەدەغە کردنی فرۆشتنی پۆستەکان.
٦/ نەهێشتنی باجی دەیەکی ئەکلیرۆس.

بەم شێوە چینایەتی دەروخێ، ئاسەواری رژێمی دەرەبەگایەتیی کۆنیش نامێنێ، هاولاتی لەو کۆت و بەندانە رزگاری دەبێ کە خرابوونە سەری. وەکو ئەنجامێکی گشتی رژێم و سیستەمی کۆن لە روی چینایەتی و ئیداری وکۆمەلایەتی بونی نەما، فرەنسا بوە یەک یەکەی نەتەویی تەوا.

ئەمە مانای ئەوە نیە لە چواری ئابەوە هەموو شتێک تەواو، نەخێر لەو کاتەوە جێبەجێکردن دەمێنێ کە تا شوباتی ١٧٩٢ درێژەی دەبێ ئەوکات مافەکانی دەرەبەگایەتی بەبێ قەرەبوکردنەوە هەلدەوەشێندرێتەوە جگە لە کەمێکی کەم نەبێ.

- لە دەی ئاب گورزە مەزنەکەی دیکە بەر رژێمی کۆن دەکەوێ کاتێک کۆمەڵەی دامەزارندن ئەو بریارە دەدا، ئەفسەرەکان دەبێ لە سوێند خواردن سوێند بە دڵسۆزیان بۆ نەتەوە و پادشا و یاسا بخۆن. نابێ سەربازەکانیان بۆ دژایەتی هاوڵاتیان ئاراستە بکرێن تا ئەوکاتەی دەسەڵاتی سڤیلی (مدنی) رێگەیان پێنەدا، گرنگی ئەو بریارە لەوەدایە ئەو دەسەڵاتە لە پادشا سەندرایەوە کە سەربازەکانی بۆ پاراستنی خۆی لە دژی هاوڵاتیان بەکار دەهێنا، ئێستا ئەو سوپایە بۆتە قەلغانێک بۆ پاراستنی ( کۆمەڵەی دامەزارندن).

ئێستا روون بۆوە کە پادشا بێ توانا مایەوە، دەستیکرد بە بەکار هێنانی هێز، بەڵام ئەمەی لە کات چوو دەکا. ماری ئەنتوانێت سور بوو لەسەر ئەو خۆی دەسەڵات بگرێتە دەست، بتا ئەم ئامانجانە بەر لە تەموزی ١٧٨٩ بێتە جێبەجێکردن، بەڵام دوای ئەو رۆژە هەموو چاوەکان لەسەر ماری ئەنتوانێتن هەروەها لەسەر هەموو ئەوانەی هاوکاری و هامشۆی دەکەن، بەتایبەت ئەوکاتەی داوای تیپی فلاندەرز دەکات، ئەم تیپە لە کرێگرتەی دەرەوەی فرەنسا

پێکهاتبوو، ئاهەنگێکی مەزن بۆ ئەفسەرانی ئەو تیپە ساز دەکا تیایدا بەسەر پادشادا هەڵدەگوترێ و دژی بیرو بڕواکانی شۆڕش هوتاف لێدەدرێ و دروشمی سێگۆشە ژێرپێ دەکرێ.

ڕۆژی دواتر ڕۆژنامەکان دژی پیلانەکەی شاژن لاپەرەکانیان پڕ دەکەن، ئەوەی زیاتر جەماوەری تورە کرد پڕخەرجیی ئەم ئاهەنگە بوو، چونکە لە کاتێکدا دەکرێ خەڵک لە برسا و بێکاریا دەینالاند ئەمانیش بە سامان و سەروەتی وڵات ئەم بەزم و کەیفە دژی ئەوان دەگێڕن، کات نیوەی دوەمی ساڵی ١٧٨٩ بوو هەرچەندە ئەو گرانیە بە هۆکاری ڕوداوەکانی ئەوساڵ ەوە نابی بەڵکو لە ئەنجامی هەڵەی چارەسەری بێکاریەوە دەبێ . جەماوەرە برسیەکە هەروەکو ڕۆژنامەکانی شۆڕشگێڕان ڕقیان لە پادشایەتی هەڵسابوو کە هیچ بەهایەک بۆبرسێتی ئەو خەڵکە دانانێ و لەم دۆخانە ئەو خەرجیانە لە ڕابواردن و ئاهەنگ گێڕانی ئەفسەرانی کرێگرتە خەرج دەکا، لە ٤و٥ی ئۆکتۆبەر دۆخەکان دیسان دەتەقنەوە، ئێستا کۆمەڵە و بۆرژوا پێویستیان بە بزووتنەوەیەکی مللییە تا پادشا ناچارکا هیچ ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی لە دژی کۆمەڵە ئەنجام نەدا. جەماوەری برسی زیاتر لە دەوری کۆمەڵە دەئالێنەوە، بۆ فشار خستنە سەر پادشا ڕێپێوانێکی جەماوەریی مەزن بەرەو کۆشکی ئەلیزێ ڕێکدەخرێ و داوای ئامادە بونی خانەوادەی پادشا دەکەن تا لەم داوایەیان بکۆڵێتەوە، جەماوەرە برسیەکە داوای نانیان دەکرد، ئەوەی داوای ئامادە بونی خانەوادەی پادشای دەکرد بۆرژواو کۆمەڵە بون تا هیچ کردەیەکی سەربازی لە دژی پاریس ئەنجام نەدا.

لە ٥ی ئۆکتۆبەربرسیەکانی پاریس ژنەکانیان هاندان بەرەو کۆشکی ڤیرسای بچن ئەوان بە یاوەری ژمارەیەکی زۆری برسی بەرەو کۆشک چون، پاسەوانەکانیش بە فەرماندەیی لافاییت بۆ پاراستنیان لەگەڵیاندا بوو، ژمارەیەکیش لە ئەندامانی کۆمەڵە چونە کۆشکی ڤێرسای تا پرسەکە بخەنە بەردەست پادشا.

لەوێ پادشا بە ڕوێکی خۆش پێشوازیی لە ژنەکان کرد، بەڵام ئێوارەکەی هەندێک لە خۆپیشاندەران کۆشکی پادشایان گەمارۆدا، پادشا وشاژن کەوتنە مەترسی، لەم کاتە لافایێت بۆ پادشای پێشنیار کرد کە بیانگوازێتەوە پاریس، بەڵام ئەم ئامۆژگاریە لە فەرماندان نزیکتر بوو لەوەی پێشنیار بێ، پادشا گەڕایەوە پاریس و لە ٦ی ئۆکتۆبەر لە کۆشکی تویلەر جێنیش بوو، بەم شێوە دەبێتە پادشای زیندانیکراوی فرەنسا لە کۆشکی تویلەری. لە ٨ی ئۆکتۆبەری ١٧٨٩ کۆمەلەی دامەزارندن ئەم نازناوەی لێنا لە جیات نازناوی پادشای فرەنسا.

# بەشی بیست و یەکەم

## بنیادنانێکی دەستوری و ئابوری وکڵێسایی نوێ
## بۆ فرەنسای شۆڕش

دوای ئەوەی شـۆڕش بەتەواوەتـی دەسـتی بەسـەر دەسـەڵاتی پادشـا و وڵاتـدا گـرت، ( کۆمەڵەی دامەزارندن ) هەلسا بە دیراسەکردنی دەستورێک بۆ وڵات. پرۆسـەی دانـی ئەم دەستورە لە ١٧٨٩ وە تا سـەپتەمبەری ١٧٩١ ی خایانـد، مانەفێسـتی مافەکـانی مـرۆڤ کە کـۆمەلەی دامەزارنـدن لە ئـابی ١٧٨٩ دەریکردبـوو کـرایە هـاوپێچی ئەم دەسـتورە. ئەمە دۆکـۆمێنتێکی گرنـگ بـوو نەک تەنهـا بـۆ مێـژووی شۆڕشـی فرەنسـی بەڵکـو بـۆمێژووی بزووتنەوەی ئازادیخوازی جیهان هەمووی.

لە دیباجەی ئەم مانەفێستەدا هاتوە، دەبێ ریز لە مافە سروشتیەکانی مرۆڤ بگیرێت، ئەم مافانە گرنگن نابێ پشتگوێ بخرێن و پێشـێل بکرێن، هەرکـاتەی پێشـێل کـران دەبـنە مایەی تێکدانی دۆخی ئارامی هەر نەتەوەیەک، هەر حکومەتێکیش پشتگوێی بخا کارەسات و نەهامەت بۆگەلەکەی دێنێتەوە. هەر لە دیباجەکەدا هاتوە، مەبەست لە بڵاو کردنەوەی چەند برگەیەکی ئەم مەنافێستە بۆ ئەوەیە هەمیشە لەبەر چاوبێت لە کاتی جێبەجێکردنی کارەکان و یاسادانانداندا کە پێشێلی ئەم مافـانە نەکـرت، ئەم مـاف و بنەمایـانە لە ١٧ بـرگە جێگایـان کرابۆوە:

١/ مـرۆڤ بە ئـازادی لە دایـک دەبـێ بە ئـازادی و بە یەکسـانی لە مـاف و ئیمتیازەکـانی کۆمەڵایەتی بژی و دەبێ ئەم رێکارانە لە خزمەتی گشتیدا بن نەک تایبەتی.

٢/ ئامـانجی هەر دەزگـایەکی سیاسـی پاراسـتنی مافەکـانی سروشـتیی مـرۆڤە، کە نـابێ دەسـتبەرداری بـین، ئەم مافـانە بـریتین لە : ئـازادی مـافی مولکـداری، هەسـتکردن بە ئاسودەیی و ئاسایش و ئارامی، بەرگریکردن لە ستەم.

٣/ نەتەوە خاوەنی سەروەریە، هیچ کەسێک یا لایەنێـک بـۆی نـیە دەسـەڵات بگرێتەدەسـت ئەگەر سەرچاوەی دەسەڵاتەکانی میلەت نەبێ.

٤/ ئازادی مانای ئەوەیە مرۆڤ ئازادبێ هەرشتێک بکا کە زیان بەکەس نەگەیەنێ، لایەنی دیکەش مافی خۆیەتی ئەوەی هەوەستی لێبێ بیکا بەو مەرجەی بە بپێی یاسا بێ.

٥/ یاسا تاقە سەرچاوەیە کە قەدەغەکراوەکان و ڕێگەپێدراوەکان دیاری دەکا، ئەو کۆت و بەندانەی دەخرێنە سەر مرۆڤ بە پشت بەستن بە یاساوە نەبێ، شەرعی نین و ڕەوایەتیان بۆ نییە.

٦/ یاسا دەربڕی ئیدارەی گشتییە، هەموو کەسێکیش مافی ئەوەی هەیە لە یاسا دانان بەشداربێ، بەخۆی یا بە نوێنەری. هەموو هاوڵاتیەک بەرانبەر بە یاسا یەکسانن، مافی ئەوەیان هەیە هەموو کار و ئەرکێک بکەن بەپێی توانا و پسپۆرییان.

٧/ نابێ کەس دەستگیر بکرێ تەنها بەپێی ئەو حاڵەتانە نەبێ کە یاسا دیاری کردوە، بۆ سزادانی هەر کەسێک نابی شێوازی دوژمنکارانەی لەگەڵدا بەکار بێنی.

٨/ سزادانی هەرکەسێک دەبێ بەپێێ یاسا بێ.

٩/ تۆمەتبار بێگوناهە تا ئەوکاتەی تۆمەتەکەی دەسەلمێندرێ.

١٠/ هیچ کەسێک بەهۆی بۆچوونی تایبەتیی تۆمەتبار ناکرێ. تەنانەت ئەگەر پەیوەندی بە ئاینیشەوە هەبێ، بەمەرجێ ئەم بۆچوونانەی کار نەکاتە سەر تێکدانی باری ئاسایش.

١١/ ئازادی بیروڕا و زانیاری گۆڕینەوە لە بەنرخترین مافەکانی مرۆڤن، هەموو کەس ئازادە لە نووسین و بڵاو کردنەوەی هەر شتێک کە بڕوای پێی هەیە بەڵام ئەو بەپێی یاسا بەرپرسیارە.

١٢/ پاراستنی ئازادی هاوڵاتیان پێویستیی بە سوپایەک هەیە کە بخرێتە خزمەت ئەوانەوە نەک خزمەت ئەوەی دەسەڵاتەکانی سوپای بەدەستە.

١٣/ بۆ داپۆشینی تێچووی خەرجیی حکومەت و سوپا دەبێ هاوڵاتیان بەپێی توانایان خەرجییەکە بگرنەخۆ.

١٤/ هەموو هاوڵاتیەک مافی ئەوەی هەیە بەشێک لە باجەکانی دارایی وڵات بگرێتە خۆو بە دواداچون لەسەر خەرج کردنی ئەو داهاتە گشتییە و چۆنێتی وەرگرتن و خەرجکردنی باجەکانی دیکەی وڵاتدا بکات.

١٥/ ئەو کۆمەڵگایەی پشت بە یاسا نەبەستێ و کار بە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان نەکا کۆمەڵگایەکی بێ دەستورە.

١٦/ مافی مولکداری پیرۆزە نابێ کەس لەمولکداری بێبەش بکرێ تەنها ئەگەر قەرەبووی درایەوە.

پێشتر لە ئینگلتەرا گەلێک بەڵگەنامە و بەیاننامەی لەم جۆرە گرنگ وەکو بنەمای گشتی و تایبەتی دەرکرابوون، بەڵام جیاوازیەکی گەوهەری هەیە لە نێوان ئەوان بەڵگەنامە و ئەم مانەفێستەی مافەکانی مرۆڤ، ئەم بمانافێستە بۆ رەوشی هەموو دونیا دارێشتراوە نەک تەنها فرەنسا، کەچی بەڵگەنامەکانی دیکە بۆ مەبەستی خۆجێیی ( لۆکالی ) بوون نەک جیهانی، بۆیە ئەم بەڵگەنامە لە دەستوری هەموو دەولەتەکانی دیکەی دونیا سووچێکی بنەڕەتی دەگرن، ئەم بەڵگەنامەش بوو خەسلەتێکی ئازادیخوازانەی جیهانیی بە شۆڕشی فرەنسی بەخشی و بەو هۆیەوە پێگەی بەرز دەبێتەوە، لە هەندیک شوێن وا باسکراوە کە ئەم بەڵگەنامە لە سوپاکەی ناپۆلیۆن بەهێزتر بوو، لەراستیدا بایەخێکی زۆری هەبوو هیچ بڕیارێکی دواتر لە ئاستی ئەم مانەفێستەی کەم نەکردەوە جگە لە مانەفێستی کۆمۆنیستیی بۆ کرێکارانی جیهان کە لە ١٩١٧ دەرکرا لەگەڵ بڕیارەکەی ( ودرۆ ولسونی) چواردە خالی کە لە ٨ی کانونی دووەمی ١٩١٨ ی دەرکرد، نەبێ.

دەستوریش دوای مشتومڕ و گفتوگۆیەکی دوور و درێژی ( کۆمەڵەی دامەزارندن ) دەردەکرێ کە ماوەی دوو ساڵی خایاند، لە ناوەڕاستی ١٧٨٩ تا دێسەمبەری ١٧٩١ لەم ماوە رووداوی نوێ دێنە پێش.

لەم دەستورە رەنگدانەوەی فەلسەفەکانی حوکمڕان دەبینرێ، لەسەر هەر برگە و ماددەیەک گفتوگۆی زۆر کراوە، ئەم گفتوگۆیانە خۆش بوون چونکە رەنگدانەوەی هەموو دیموکراسییەت و سیستەمی پەرلەمانی و پادشاگەرایی بوو.

بیردۆزەکانی مونتسکیۆ و روسۆ دەخرانە بەر باس و لێکۆلینەوە، هەندێک لە ئەندامان چاویان لە دەستوری بەریتانیا بوو هەندێک لە ئەندامانی کۆمەڵە چاویان لە دەستوری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمرکا بوو،نموونەی دەستوری ئینگلتەرا بۆ فرەنسا گونجاوتر بوو، ئەوکات دەسەڵاتەکانی پادشا لە فرەنسا لاواز بوون بۆیە سیستەمی پادشایەتی دەستوری هیچ مەترسیەکی نەبوو، بەو ئەگەرەوە ئەمە چەسپێندرا، بەڵام پادشایەتی بۆ ( کۆمەڵەی دامەزارندن ) جێی مەترسی بوو، بەتایبەت بۆ سەرکردەکانی شۆڕش هەر لەبەر ئەمە مافی

ئیمتیازەکانی پێشوویان لێی سەندەوە کە پادشای بەریتانی هەیەتی، مەبەستمان مافی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکان ( ڤیتۆ ) بوو.

بەپێی دەستوری نوێ پادشا تەنها فەرمانبەرێکی بالایە لەم دەولەتە. پادشا هەوڵی راپەرینی دژی شۆڕشی دا، دواتریش هەولێکی نەزۆکی ترسنۆکانەی راکردنی دا کە تیایدا سەرنەکەوت و لێی ئاشکەرا بوو، لەگەڵ دەستگیرکردنی بڕیاری دوورخستنەوەیان لە کارەکانیدا تا ئەوکاتەی دەستور تەواو دەردەچێ ئەوکات ئەگەر سوێندی خوارد کە دلسۆزی دەستور دەبێ، لە شوێنەکەی وەکو پادشا بمێنێتەوە، ئەگەر سوێندی نەخوارد ئینجا سەیری پرسەکەی دەکرێ، بەلام پادشا سوێندی خوارد کە دلسۆزی دەستور دەبێ، بەم شێوە سێ مەرجەکەی دەستوریی دەولەت تەواو دەبن کە : نەتەوە، پادشا، یاسا. بوون.

بەپێی دەستور پادشا مافی دەستنیشان کردنی وەزیرەکانی هەیە بەلام دەبێ رای ئەنجومەنی وەزیران وەرگرێ لە هەر بڕیارێک کە پەیوەندیی بە نەتەوەی فرەنسیەوە هەیە. هەولەکانی (میرابۆ) کە یەکێکە لە سەرکردەکانی شۆڕش سەریان نەگرت لەوەی مافی راگەیاندنی شەڕ و ئاشتی بەدەست پادشاوە بێ، کۆمەڵە سور بوو لەسەر ئەوەی ئەم مافە دەبێ بەدەست کۆمەڵەی دامەزرندنەوە بێ، بۆیە بیردۆزی حوکمڕانی پادشایەتی فرەنسا لەسەر بنەمای دەستەواژە ( هەیەتی و دەسەلاتی بەسەردا ناشکێ) درێژەی دەبێ، ئا بەم شێوە پادشایەتی دەسەلات لەدەست دەدا و میراتگرەوەی لە بۆرژوا و ئرستوکراتەکان جێی دەگرنەوە.

دەبێ ئامارە بەوە بدەین کە ئارەزوی هاولاتیان لە هێشتنەوەی پادشا بەم شێوەیە ئاستی نیشتمان پەروەریان پێی بەرز دەبێتەوە چونکە ئەوان لەو ئاستەدا بون کە ئارەزوی ئەوەیان نەبوو ولات بکەوێتە گێژاوێکەوە، بەلام سەلمێندرا کە پادشا دژی شۆڕش و بزووتنەوەی دەستور بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەلەی دامەزرندن دەستیان پێیەوە گرت و وەکو سیستەمی حوکمڕانی پادشایەتی هێشتیانەوە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کۆمەڵە لەو میرانە دوربینتر بوو کە لە دەرەوە هات و هاواریان بوو رایاندەگەیاند کە ئەوان دەتوانن پادشا لەدەست کۆمەڵەی دامەزرندن رزگارکەن.

دەستەی یاسادانان کە دەستور ئامارەی پێدا و بڕیاری لەسەر دابوو بە ( کۆمەڵەی نیشتمانیی یاسادانان) ناونرا ، ژمارەی ئەندامانی بە ٧٤٥ کەس دیاری کرا، هیچ دەسەلاتێکیش بۆی نەبوو ئەم دەزگایە هەلوەشێنێتەوە، دەرکردنی یاسا و چاودێری کردن و

سزادانی وەزیرەکان و پێداچونەوەی سیاسەتەکانی ناوەخۆو دەرەوە و سەربازی لە دەسەلاتی ئەودا بوو.

هەموو کەسێک مافی هەلبژاردنی لەم کۆمەلەدا نەبوو، تەنها پەنجا هەزار کەس مافیان هەبوو ئەویش ئەوکەسانە بوون کە خاوەن سامان و سەروەتێکی باش بوون دیارە ئەمەش ئاراستەیەکی بۆرژواییانە بوو، بەلاّم دواتر ئەم مەرجە دوورخرایەوە چونکە بەو هۆیەوە ٣ ملیۆن هاولاّتی لەم مافە بێبەش دەبوون.

لە میانی گفتوگۆکردن لەسەر دیاری کردنی ئەنجومەنی یاسادانان لە شێوەی بەریتانیا بە دوو ئەنجومەن یا یەک ئەنجومەن، ئاراستەکان ترسیان لە دوو ئەنجومەنی هەبوو لەوەی ئۆرستوکراتەکان بە یاسایەک ئەم ئەنجومەنەی دووەم قۆرخکەن و بیکەن بە مۆلگەی خۆیان بۆ بڕیارەکانیان، دیارە ئرستوکراتەکان لەسەرەتاوە دژی ئەم دەستورە بوون ئاسایی بوو دوربخرێنەوە لە نوێنەرایەتی سیاسی. هەندێک هەموار لە یاسای باج و سیستەمی ئیداری و دادوەری و دارایی و کلّێسادا کران.

سەبارەت بە دابەشبوونی کۆن کە هەندێک مافی تایبەتیان بۆ هەندێک هەرێم دانابوو، کۆمەلّە بڕیاریدا ئەم دیاردەیە نەمێنێ هەموو هەرێمەکان وەک یەک سەیر و مامەلّە بکرێن تا فرەنسا ببێتە ولاّتی یەک نەتەوە بەبێ جیاوازی، بۆ ئەم مەبەستە هەندێک پێشنیاریان کرد لەسەر بنەمایەکی ئەندازیاری فرەنسا دووبارە دابەش بکرێتەوە، کۆمەلە ئەمەی رەت کردەوە ، بڕیاریدا لەسەر بنەمای جوگرافی بەسەر پارێزگاکاندا دابەش بکرێ، دوای ئەوە هەر پاریزگایەکیان بەسەر چەند یەکەیەکی ئیداریی بچووکدا دابەش کردەوە، هەر پارێزگایەکیش حوکمی ناوەندی و شارەوانیان پێدان بە پێکهێنانی ئەنجومەنی شارەوانیەکی هەلبژێردراو.

لەرووی سیستەمی دادوەرییەوە، یاسا کۆنەکەیان هەلّوەشاندەوە یاسایەکی دادوەرییان لەسەر رۆشنایی ( مافەکانی مرۆڤ ) دارشت، پۆستی دادوەریش بوە پۆستێک بە هەلبژاردن بێتە وەرگرتن، واتە سیستەمی کرینی پۆستی دادوەری قەدەغە کرا.

بۆ چاکسازی باج و دارایی، باجەکان لەسەر بنەمای یەکسانی بەسەر هاولاّتیاندا دابەش کران، باجە سەرەکییەکە کە شوێن باجە کۆنەکەی گرتەوە بەم شێوە دارشترایەوە:

١/ باجی خانووبەرە و زەویوزار.

٢/ باجی گواستراوەکان ( کرێ و نرخی بەکرێدامی زەویوزار ).

٣/ باجی داهاتی کاری بازرگانی و پیشەسازی.

ئاسایی بوو ماوەیەکی دەویست بۆ گواستنەوە لە سیستەمی کۆنەوە بۆ سیستەمی نوێ، بۆیە ئەستەم بوو بەم سیستەمە باجیە وڵات لە قەیرانی دارایی و ئابووری رزگار بکرێ، ئیتر بۆرژوا پێویستی بەسەرچاوەیەک هەبوو تا گەنجینەی دەوڵەت لەم کێماسیە رزگارکا، لێرە کێشەی دەستگرتن بەسەر مولکەکانی کڵێسا سەرهەڵدەدا.

هەر لەپێناو چارەسەری ئەم کێشە خالە گومرگییەکانی ناوەخۆ هەڵدەگیرێن، یاسای پاراستنی بەرهەمی ناوەخۆ دەردەچێ و یاسای ئازادی ئابووریش جێبەجێ دەکرێ، ئیتر هەموو کەسێک دەتوانێ بە تواناکانی خۆی دابەزێتە بازار و بازرگانی بکا، ئیمتیازەکانی قۆرخکاری کۆمپانیا زەبەلاحەکانی فرەنسی هەلوەشێندرایەوە، بەم شێوە بۆرژوا بەسەر دۆخەکاندا زاڵ دەبێ چونکە هەر ئەو توانای ئەوەی هەیە شوێن کۆمپانیا زەبەلاحەکان بگرێتەوە.

( کۆمەڵەی دامەزارندن ) زۆر بایەخی بە ئازادی دەدا، یەکێک لە بنەماکانی ئەو ئازادییە مافی هاولاتیانە بە بڕوابوون بە هەر ئاین یا مەزهەبێک کە خۆی دەیەوێ، بەڵام کاسۆلیکەکان بەپێێ توانایان هەوڵی ئەوەیان دا کۆمەڵە ئەوە جێگیرکا کە ئاینی دەولەت کریستی و مەزهەبی کاسۆلیکە، بەڵام سودی نەبوو، ئەکلیرۆس ئیمتیازەکانیان لەدەست دەدەن لەکاتێکا زۆرینەی هاولاتیان کاسۆلیکن.

ئەندامانی کۆمەڵە لەم ئاستە نەوەستان، خۆیان بە بەرپرس زانی لە کاروباری چاکسازی کڵێسا، بەراستی کڵێسا پێویستی بە چاکسازی بو، بەڵام کاتێک کەسانی سیکولار لە ئەندامانی کۆمەڵەی دامەزارندن بەم کارە هەڵدەستن دەبێ لەتەک ئەوەی روخسارێکی سیکولاریی پێدەدەن روخسارێکی ئاینیی ئازادیشی پێببەخشن، هەردووکیانیش لەلایەن ئەکلیرۆسە کاسۆلیکەکان دژایەتیی دەکرا.

هەر بەراستی چاکسازی کڵێسا قەیرانێکی مەزنی نایەوە، زۆربەی بۆچوونەکان لەگەڵ ئەوەدا بوون دروستکردنی ئەم کێشە بۆ دەست گرتن بەسەر مومتەلەکانی کڵێسا بوە لە بەرژەوەندی دەولەت، تا کێشەی قەیرانی دارایی دەولەتی پێ چارەسەرکەن، یەکەمین کەس کە پێشنیاری کرد دەوڵەت دەست بگرێ بەسەر مولکەکانی کڵێسا ئەسقوفە بەنابانگەکەی سەدەی نۆزدەهەم بوو ئەسقوف ( ئوتن ) کە دواتر بەناوی ( تالیراند Talleyrand) هاتە ناسین، ئەم پێشنیارە مشتومڕی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، کاتێک تالیران ئەم

پێشنیارەی لە کۆمەڵەی دامەزراندن خستە روو، زۆرینە پشتگیریان لێی کرد بەڵام هەندێکیان گەڕانەوە سەر مانەفێستی مافەکانی مرۆڤ کەدەڵی مافی مولکداری پارێزراوە کەس بۆی نیە لێی بستێنێتەوە تەنها بە قەرەبوو نەبی، جا ئەگەر ئەم مولکانەی کڵێسا لێیان بسەندرێتەوە دەبێ پادشا قەرەبوویان بکاتەوە، بەڵام مشتومڕەکە بەوە کۆتایی پێهات، گوایە کڵێسا ئەم مولکانەی نەکڕیوە بەڵکو ئەمانەت بوە پێی سپێردراوە. دەوڵەت خاوەنی راستەقینەیتی مافی ئەوەی هەیە دووبارە وەریان بگرێتەوە، بە تەواوەتی ئەمە پیادە کراو کڵێسا لە مولکەکان بێبەش کرا، بەڵام مووچەی پیاوانی ئاینیان لە خۆگرت ،هەرچەندە موچەکانی پیاوە بالاکانی ئاینی کەم کرانەوە و هی پیاوە ئاینیەکانی بچوکیش بەرز کرانەوە.




ئێستا گەنجینەی دەولەت خاڵییە و مولکەکانی کڵێساش کەوتنە دەست بۆرژواکان، بە گرەنتیی زەوییەکانی کڵێسا پارەی کاغەزیان چاپکرد. مەبەستیان ئەوە بوو ئەم زەویانە بفرۆشن، کاتێک رایانگەیاندکە ئەم زەویانە دەفرۆشن، خاوەن پارەکان هەموویان لە بۆرژواکان بون، بۆیە هەمو مولکەکان بونە بۆ بۆرژواکان چونکە هەر ئەوان توانای کڕینیان هەبوو، لە هەندێک شوێن بۆرژوایەک گوندێکی بە تەواوەتی دەکری ئەمەش خزمەتێکی مەزنی بەوان کرد چونکە بەرژەوەندییەکان بە بۆرژواکانەوە بەسترانەوە.

لە راسیدا دەولەت بەقەدەر ئەوان سودی نەبینی، گۆرینەوەی مولکەکان بە پارەی کاغەز کێشەی دارایی بۆ دەولەت دروست کرد.

ئەم پرسە ئازاری پیاوە ئاینییەکانی زیاد کرد بەڵام نەبووە کێشە، ئەوەی بوە کێشە جێبەجیکردنی دەستوری مەدەنی بوو بەسەر پۆستە ئاینییەکاندا. یا بە شێوەیەکی دیکە بلێێن ئەو پۆستانە بوونە پۆستی هەڵبژاردن ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەنگدەر تەنها

کاسۆلیک نابن، بەڵکو پرۆتستانتەکانیش مافی دەنگدانیان لەسەر پۆستە ئاینیەکان هەیە، دواتر دەبوایە پیاوە ئاینییەکان سوێند بۆ دلسۆزی دەستور بخۆن، ئەگەر ئەمەیان کرد لە پۆستەکانیان دەمێننەوە ئەگەر رەتیانکردەوە ئەوا دەبێتە دەست لەکار بکێشنەوە، بەم ئەگەرە پیاوە ئاینیەکان یا ئەکلیرۆسەکان بەسەر دوو باڵدا دابەش بوون باڵێکیان ئامادە بوون سوێند بۆ دڵسۆزی دەستور بخۆن ئەمان پێیان ووترا ( دەستورخوازەکان ) باڵێکیش ئامادە نەبوو سوێند بە دەستور بخۆن ئەمان پێیان ووترا ( سەرپێچیکەران ).

پاپا گری لە هەڵوێستەکان بەردا کاتێک رایگەیاند بریاری قەدەغەکردنی سوێند خواردن بە دەستور دەدا. ئەم ئاژاوە لە نێو خەڵک بلاو بۆوە، بەو هۆیەوە هاولاتیانیش بەسەر دوو باڵدا دابەش بوون، بەشێکیان لە حاڵەتی سوێند خواردن بە دەستور ترسی لەدەست دانی ئیمانی هەبوو، بەشەکەی دیکە لەتەک چاکسازی کڵێسا وەستایەوە. ئەوەندە نابا لە هەندێک هەرێم ناکۆکی دەکەوێتە نێوان کاسۆلیک و پرۆتستانتەکانەوە، پرۆتستانتەکان لە چاوەروانی رۆژێکی ئاوەهادا بوون تا تۆلەی هەڵوەشاندنەوەی مەرسومنامەی نانت و ئەو چەوسانەوەی لە سەدەی حەڤدەهەمەوە رووبەرووی دەبنەوە لە پیاوە ئاینییەکانی کاسۆلیک بکەنەوە.

لەلایەکی دیکە ئەم قەیرانە ئاینیە هۆکارێکی سەرەکی دەبێ لە بروا پێهێنانی پادشا کە ئەگەر لە فەرەنسا بمێنێتەوە تا دەستور ناچاری بکا وازۆ لەسەر چاکسازیەکانی کڵێسا بکا ئەوسا گوناهێکی تری ئیمانیی دێتە سەر. بۆیە بریاردەدا بەرەو باکووری رۆژهەلاتی پاریس رابکا، کە سوپایەکی پادشایەتیی مەزنی لێیە بە فەرمانده‌یی جەنەرال بوییلەت Bouillet گوایە ئەوسا دەتوانێ بە هێزەوە بگەرێتەوە پاریس و خۆی بەسەر رێرەوەکانی دۆخەکەدا زاڵ کا ، ئەوسا کۆمەڵە هەڵوەشێنێتەوە ، بەڵکو لە بەرنامەیدا بوو بانگەوازی پادشاکانی ئەوروپا بکا تا هاوکاریی بکەن لە زاڵبون بەسەر دۆخەکاندا.

پادشا نەخشەی راکردنی دانا زۆر بە وریایی خۆی و شاژن و منداڵەکانی تا دوا قۆناغ بە سەرکەوتویی رۆیش، گەیشتنە ڤارن Varennesلەسەر روباری میس Meuse. ئەگەر بپەریبایەوە روەکەی دیکەی رووبار دەگەیشتە شوێنێکی ئارام کەس دەستی پێی نەدەگەیشت، بەڵام لەوێ خۆی ئاشکەرا دەکا و دەستگیری دەکەن، بە رسوایی دەیگەرێننەوە پاریس، ئەمە سەرەتای کۆتایی پادشاگەرایی دەبێ، خۆی دەستورەکە بە هێشتنەوەی پادشایەتی دەرکرا، بەڵام لویسی شانزەهەم وەکو دیلێک لەبەر دەستی تایلور مایەوە، رووداوی راکردنەکە لەسەر ئاستی ناوەوە و دەرەوە دەنگۆیەکی مەزنی دروستکرد.

هەواڵــی راکردنــی پادشــا شــاری بێــزار کــرد بەتــایبەت کە نــامەیەکی لە دوای خــۆی جێهێشــتبوو خــۆی لە هەمــوو بڕیارەکــانی کە دابــوی پەشــیمان ببــۆوە و خــۆی لــێ بێبەری کردبوو، تەنانەت رەزامەندیی لەسەر دەستوریش کێشابۆوە. ئەوەی خەڵکی بێـزار کردبـوو، ئەمەیان بە پیلانێکی نێودەوڵەتیی دژی بـزووتنەوەی ئـازادیخوازی فرەنسـی دەزانـی. ئێسـتا دەبێ باس لە چارەنوسی پادشـا بکـرێ هەنـدێک بۆچـوون هەبـوون پێیـان وابـو پادشـایەتی بگواسترێتەوە ( ماڵی ئورلیان ) کە لەتەک شۆڕشی فرەنسی وەستابۆوە، هەندێکیش پێیـان وابو پەلە لە بڕیاردان نەکرێ تا دەستور دەردەکرێ. دیارە پادشا رەزامەندیی لەسەر دەستور دابوو بە مانەوەی دەسەڵاتێکی لاواز.

بەڵام بەهـۆی ئەم رەفتـارەی پادشـا هەنـدێک ئاراسـتەی کۆمـاری سـەریان هەڵـدا کە پێکهاتبون لەم یانە سیاسییانە:

١/ یانەی کوردلیەر Cordelliers.

٢/ یانەی یاکوبییەکان.

ئەم یانانە رۆلێکی مەزنیـان لە ئاراسـتە کردنـی سیاسـەت دەگێـڕا، یـانەی یەکەمیـان ئاراســتەی کۆمارییــان هەبــوو، هــی دوەمــیش گەلەریەکــی تونــدریوانە. هەردووکیــان پشتگیریەکانی پادشایان لەناو دەبردن، یاکوبیەکان هێرشی توندیان دەکردە سـەر کلێسـای کاسۆلیک کە پاڵپشتێکی بەهێزی پادشا بوو، کلێساش بەهۆی هەلوێستی ئەرینیی پادشا لە دەستوری پادشاگەرایی پاڵپشتیان لێی دەکرد، یانەی کـوردلیەر پرۆپاگەنـدەی بەهێـزی دژی پادشا و لە بەرژەوەندی کۆماری دەکرد.

یەکێک لە ئەندامانی (کوردلیەر) یاداشتێکی نوسی بە شان دی مارسەوە هەلواسی تا خەڵک واژۆی لەسەر بکا تیایدا داوای لەکار لادانی پادشا و راگەیاندنی کۆماریـان دەکـرد. لە کت و پڕ هێرش دەکرێتە سەر خەڵکە کۆبوەوەکە و تەقەیان لێ دەکرێ، ئەم رووداوە بەناوی روداوی کوشتارگەری شان دی مارس دەناسرێ کەلە ١٧ی تەموزی ١٧٩١ رویدا. هەندێک ئەو مامەلە توندەی لەگەڵ بـانگخوازانی کۆمـاری و داخسـتنی یانەکەیـان (کـۆردلیەر) ئەنجامـدرا بەوە لێکدەدەنەوە کە بۆرژواکان ئەم روداوەیان بە پێشەکیی شۆڕشێکی کـۆمەلایەتی دەزانـی کە مافی مولکداری لەبەین دەبا، بەمەش ئەوان زیانیان پێدەکەوێ و مەترسی دەکەوێتە سەر سامان و مولکەکانیان بۆیە بەم شێوە مامەلەیان لەگەڵدا کرا.

بەڵام دەبێ ئامارە بە دەستور بدەین کە دەڵێ فرەنسا پادشایەتیی دەستوریە، راگرتنی جولانەوەکانی کۆماریخوازان پشت بەستن بەم بنەما دەستوریە بـوو، بەهەر حـال تیـرۆر دژی

بـزووتنەوە گەلەریە توندڕەوەکان دەسـت پێـدەکا، جیـابوونەوەش روودەدا، ئێسـتا پـارتی کۆماری لەسەروی هەموویانەوە ( رۆبسـبیر ) دەبێ پـارتی بـۆرژوا لەناودارەکانیـان ( سـیس، تالیران ) بون.

ئێستا وێرای رودانی هەولی نەزۆکی راکردنی پادشـا، لەگەڵ ئەوەشـدا میللەتـی فرەنسـی بە یەکگرتوو مـایەوە، تـا ئێسـتا هەلبژاردنـی ئەنجومەنی یاسـادانان نەکـراوە، لە بنەماکـانی دەستور ئەوەبوو دوای دەرچونی دەسـتور هەڵبژاردنـی کـۆمەڵەی یاسـادانان ئەنجـام دەدرێ، ئەندامانی کۆمەڵەی دامەزاربندن مافی خۆکاندید کردنیان بۆ کۆمەڵەی یاسادانان نابێ. گەلێک لە مێژوو نوسان ئەم قەدەغە کردنەیان پـێ هەلەیەکـی مەزن بـوو ، کە کـۆمەلەی یاسـادانان بێبەش دەبێ لەو کەسانەی لە گۆڕانکاری مەزن دەستیان هەبووە و شارەزاییان لە بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا پەیدا کردوە. ئەمە راستە بەڵام دەبێ ئامـاژە بەوەش بـدەین کە ئەم بیرۆکە ئەو ئارەزوانەی لە گۆڕنان کە بەردەوام بوون بوو لە مانەوە لەسەر پۆستی دەسەڵات، بەستنەوەی کەسانێک بە کورسیی دەسەلات لەم قۆناغە سـەرەتاییە کـارێکی نەشـیاو دەبـی، لەکاتێکا ساڵی یەکەمی حوکمڕانیی نوێنەرایەتیە.

هەڵبـژاردنەکە ئەنجامـدرا و چەنـدین گەنجـی خـاوەن بەهـرە دەرچـون، بەڵام هیچیـان بەناوبانگ نەبوون، لە نێویاندا ژمارەیەکی زۆری گەنجی خاوەن هـزری ئـازاد هەبـوون گومـان ئەوەبوو بە هەڵبژاردنی کۆمەلەی یاسادانان دەنگی یانەکان کز دەبێتەوە بەڵام پارتە سیاسی و یانەکان رۆڵی بەهێزیان هەبوو لە ئاراستە کردنی کاروباری وڵات.

بەپێی دابەشیی کلاسیکی و لەسەر بنەمـای دور و نزیکیـان لە هاوڵاتیـانەوە، دەتـوانین ئەندامانی کۆمەڵە بەسەر راست و چەپ و ناوەڕاستدا دابەشـکەین. پـارتی راسـتڕەو فویلانـت Feuillant رابەرایەتیی دەکرد، ئەمان لایەنگری پادشاگەرایی بون هەندێک لە خانەدانەکان کە بۆچونی ئازادیخوازانەیان هەبوو لە نێویانـدا خۆیـان حەشـاردابوو، بەڵام لایەنگـری رژێمـی کـۆن نەبـوو، بەڵکـو بـانگخوازی پادشـاگەرایی بـوون، پابەنـدی دەسـتوری ١٧٩١ بـوون، هاوپەیمانیان لەگەڵ بۆرژوای باڵا، مەبەست و ئامانجێ خۆی هەبوو، ئەویش رێـگەنەدان بـوو بە پـارتی دیموکراسـیی میللـی تـا دەسـتوری ١٧٩١ لە بەرژەوەنـدی گەل هەمـوار نەکـاتەوە، ژمـارەی ئەنـدامانی ئەو پـارتە ٢٦٤ واتە سـێیەکی ئەنـدامانی کـۆمەلەی یاسـادانانیان پێـک دەهێنـا کە ژمـارەی گشـتیی ٧٤٥ ئەنـدام بـوون. چەپڕەوەکـان نـزیکەی نیـوەی ئەنـدامانی راستڕەوەکان دەبون ژمارەیان ١٣٦ ئەندام بوو، زۆربەیان لە لایەنگرانی یـانەی یاکوبیەکـان و جیرونـدییەکان بـوون. دیـاردەیەکی سـەیر هەبـوو کە زۆربەی چەپەکـان لە سـەرکردەی

و: خالید هەرکی

هەرێمەکـان بـوون بەتـایبەتیش لە هەرێمـی جیرونـدیەوە بـوون. لە نێـو ئەو چەپـڕەوانەدا ڕۆژنامەنوسـی ناسـراو ( بریسـۆ) و فەیلەسـوف ( کوندورسـیە ) و ( فرنیـو ) و ( جانسـونیە ) هەبـوون، بە دیـدی مێژونوسـان زۆربەیـان لە بـورژوای شۆڕشـگێڕ بـوون، بەڵام شۆڕشـگێڕیان بەو ئاسـتە نەبـوو بەرگـری لە بەرژەوەنـدییەکانی چینـی هەژار بـکەن، ئەم چەپڕەوانە بەوە تۆمەتبار دەکران کە هاوکار بوون لەگەڵ بۆرژوای دەوڵەمەند کە لە بەنـدەرو کارگەکـانی دروسـت کردنـی کەشـتی وبەلەم کاریـان دەکـرد لەگەڵ بانکەکـانی دژ بە بەرژەوەندیەکانی گەل.

تیمێکی ئەم چەپڕەوانە دژی پادشاگەرایی و لایەنگری کۆماریخوازەکـان بـوون، ئەوەنـدە نابـا نـاکۆکی دەکەوێـتە نێـوان جیرۆنـدی و یاکوبییەکـان و لەیەک جیـا دەبـنەوە، لە نێـو یاکوبیەکـان سـەرکردەی وا هەڵـدەکەوێ کە کاریگەریـان لەسـەر ئاراسـتەکردنی کاروبارەکـان دەبـێ، لەنیویانـدا ( روبسـبیر) و ( دانتـون ) و ( ومـارا ) دواییـنیـان خـاوەنی ڕۆژنـامەی ( دەنگی گەلە ) بوو، یاکوبییەکـان هەرکاتەی هەسـتیان بە دابەزینـی بـۆرژوا دەکـرد بەلای گەلدا دەشکانەوە، هەندێک جار ئەوان دەبوونە زمانحاڵ و بەرگریکاریان.

لەوپەڕی دەسـتەچەپ ژمـارەیەک لە نـوێنەرانی کـۆمەڵەی یاسـادانان لایەنگـری کـوردلی هەبـوون ، بۆچـونی تونـدیان دژی پادشـا هەبـوو، داوای مـافی زیـاتر بـۆ گەل دەکـرد لە بەشداری پێکردنی سەرجەم چین و توێژەانی لە هەڵبژاردنەکـان ، بە مانـایەکی دیکە بلێـێن دژی بۆرژواکان بوون کە تا ئەوکات جلەوی ئاراستەکردنی شۆڕشی فرەنسیان گرتبوە دەسـت و لە بەرەژوەەندی خۆیان دەیان سوراند.

لە ناوەڕاستدا ژمارەیەک لە ئەنداماں هەبـوون ٣٤٥ ئەنـدام دەبـوون، ئەوان دەسـتیان بە دەستور و شۆڕش و سیسـتەمی نوێـوە گرتبـوو، نە خـاوەنی سـەرکردە نە خـاوەنی بۆچـونی تایبەتی بوون.

بەڵێ پارتەکان بەم شێوە لەڕوی ئامانجەوە لەیەک دوور بوون، جگە لە کۆمەڵە شوێنی دیکە هەبوون پارتەکان لێی دادەنیشتن ،ڕوو بەڕوو لەگەل یەکتری لەسەر بۆچونی جیا جیـا گفتوگۆیـان دەکـرد، ئەم شـوێنانە هۆڵەکـان بـوون کە لە بەڕێـوە بردنـی ئەم هـۆلانە خـانمە فرەنسیەکان ڕۆلی بەرچاویان دەگێڕاو کاریگەری باشیان لەسەر شۆڕشی فرەنسی هەبوو. لەم نێوەندەدا خاتو دی ستایل کچی نیکەر دەناسرێ کە کۆیلەی ڕەوشەنبیر و ئاشقی کونـت دی نـاربون بـوو، هـۆڵەکەی ئەو ببـوە بارەگـای پـارتی فویـان، لەم میـانە نـاوی خـاتو ڕولان

دەدرەوشێتەوە کە روحێکی نیشتمانپەروەری هەبوو، ڕۆڵانی هاوسەریشی ڕۆڵێکی مەزنی لە شۆڕشی فرەنسی گێڕا.

ئەمە بون ئەو هێزانەی ڕۆلی ئاڕاستەکردنی دەسەڵاتی فرەنسایان لە ١٧٩١ دەگێڕا، بەڵام وێڕای ئەمانە هێزی دەرەکیش هەبوون دەستیان لە کاروباری دەسەڵات و شۆڕش وەردەدا مەبەستم ئەمانەن:

١/ کۆچبەرە فرەنسییەکان.

٢/ پادشاکانی ئەوروپا.

٣/ پیاوە ئاینییەکانی کاسۆلیک و پاپاخوازەکان.

ئەم هێزانە بە ناوەوەی فرەنسا بەستراببوونەوە کۆچبەرەکان لە خانەدانانی فرەنسا بوون، بە پێکهاتەکانی فرەنسیی ناوەوە بەسترابوونەوە، چاویان لە گەڕانەوە بوو بە هێزەوە بگەڕێنەوە، مەبەستم لەوانی دیکە نیە کە دژی شۆڕش بوون بەڵکو خانەدانە ئازادیخوازەکان کە دەستیان خستنبوە ناو دەستی شۆڕش هەر لەیەکەم قۆناغەوە بەڵام زوو هەستیان بەوەکرد کە شۆڕش لێیان دور دەکەوێتەوە بەرەو گەل هەنگاو دەنێ بۆیە ئەمانیش خۆیان لێی دوور خستەوە.

هەرچی پادشاکانی ئەوروپان هەستیان کرد، بای گۆڕانکاری هەڵیکردووە بەڵکو بەرەو ئەوانیش بچێ، بۆیە ئەرکی سەر شانیانە لە تەک خانەوادەی بوربونی فرەنسی بوەستن کە مافێکی خواوەندیان هەیە بۆ حوکمڕانی فرەنسا، یا هەرنەبی بۆ مافی پادشایەتی دەبێ لە لوتکەی دەسەڵات بمێنێتەوە، بۆیە پادشاکانی ئەوروپا بە هێرشەکانیان گەمارۆی فرەنسایان دا تا لویسی شانزەهەم بە هەموو دەسەڵاتەکانیەوە بگەڕێتەوە سەر تەختی پادشایەتی، ئەمەش بوە مایەی هەلگیرسانی شەڕ لە نیسانی ١٧٩١.

حالی کڵێسە ئەوەبوو بەرگری لە دوا پێگەی خۆی بکات لە ئەوروپا، مولکەکانی کڵێسا لە سەردەمی بزووتنەوەی مارتن لۆسەرەوە بۆتە ئامانجی هەر گۆڕانکاریەکی نوێخوازی لە ئەوروپا، ئەوەتا بزووتنەوەی نوێخوازی لە فرەنسا دەست بەسەر مولکەکانی کڵێسای فرەنسیدا دەگرێ کە یەکێک بوو لە مۆڵگەکانی کاسۆلیک، بۆیە کڵێسای فرەنسیی کاسۆلیک و پاپاخوازی هەموو هەولێکی دەخاتە گەڕ بۆ گێڕانەوەی پێگەی خۆی لە فرەنسا، بەڵام گۆڕانکارییەکان وەکو باهۆز وابون ئەوەندەی نەمابوو پادشاگەرایی و پاپاخوازی بە یەکجاری لە فرەنسا لەناو بەرێ.

# بەشی بیست و دووەم

## جەنگ و تیرۆر

### ٢٦ی نیسانی ١٧٩٢

### ئەیلولی ١٧٩٤

جەنگی ١٧٩٢ بە دەستپێکی قەیرانەکان دێتە ئەژمار کە کۆمەڵگای ئەوروپای هێنایە هەژان، لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا ناکۆکی لە نێوان مێژوونووساندا هەیە لەسەر هۆکارەکانی ئەم جەنگە.

بەربەست هەبوون بۆ رێگەگرتن لە روونەدانی ئەم جەنگە. چی لە ناوەوەی فەرەنسا یا لە دەرەوەی، کە دەبوونە رێگر لەبەردەم هاندانی دەولەتانی ئەوروپی لە بەگژ یەکداچونەوە.

پادشاکانی ئەوروپا لە پێناو بەرگریکردن لە رژێمی پادشایەتی خۆیان تەنگەیان بە کۆچبەران هەڵچنیبوو، ئیمپراتۆری رۆمانیی پیرۆز لیوبولدی دووەم تەرخان کرابوو بۆ بەرگریکردن لە مافی میر و دەرەبەگە کان ، لەکاتێکا ئەو مافانە لە فەرەنسا لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسی لە پادشاکان سەندرابۆوە، لیوبولدی دووەم بەرپرس بوو لە پاراستنی مافی پیاوانی ئاینیش بەهەمان شێوە کە سەر بە خۆیانەوە بوون هەروەها لە هەموو ئەو پیاوە ئاینیانەی فەرەنسا بەر لە دابەشکردنیان بەسەر دابەشیە ئیداریە نوێکەی، زۆری لە ئەکلیرۆسە کاسۆلیکە پاپاخوازەکان دەکرد دەستوری نوێ رەت کەنەوە.

بەڵام وێرای ئەم بەرژەوەندیە روخسارییانەی ئیمپراتۆری، لیوبولد خۆی وەکو بەرپرسیار بینیەوە لە پاسەوانیکردنی ماری ئەنتوانێتی کچی ماریا تریزای پادشای نەمسا کە چارەنوسی دیار نەبوو. لەگەڵ پشتگیری کردن لە پێگەی پادشایەتیی فەرەنسا دوای هەولە شکستخواردوەکەی لویسی شانزەهەم لە راکردن بەرەو دەرەوەی فەرەنسا، لیوبولدی دووەم پێشنیاری خستە بەردەم پادشاکانی ئەوروپی بۆئەوەی کارێکی هاوبەش بکەن لەسەر ئەم هەلوێستەی ناوەخۆی فەرەنسا. بەڵام هاوپەیمانیتییەک کە دژی شۆڕشی فەرەنسی بێ ئەستەم

بوو لە نێوان پادشاکانی ئەوروپا ئەنجام بدرێ ئەمەش بەهۆی ئەوەی بەرژەوەندیەکان یەکیان نەدەگرتەوە لەلایەک لەلایەکی دیکەش بەهۆی سەرقالی لیوبولد و فریدریک ولیام پادشای پرووسیا و کاترینی دووەم تزاریی رووسیا بە کێشەی دابەش کردنی پۆلۆنیا وە بوو کە بۆ جاری سێیەمی بوو ئەم دابەشیەی بەسەردا دەکرێ، بۆیە هەوڵەکانی سەر فرەنسا بەم راگەیاندنە کورتکرایەوە کە لەلایەن هەریەک لە ئیمپراتۆر و پادشای پرووسیا دەرچو لە ٢٧ی ئابی ١٧٩١ بەناوی راگەیاندنی بلنتز Belintz .

لە راگەیاندنی بلینتز هەردووک لایەنی نەمسا و پرووسیا ئارەزوومەندی خۆیان راگەیاند بۆ گەڕانەوەی رژێمی فرەنسی بۆ دۆخی جارانی. گوایە ئەمە پەیوەندیی بە سەرجەم دەولەتانی ئەوروپییەوە هەیە، ئومێدیشیان خواست کە لویسی شانزەهەم دەسەڵات و پێگەی بەهێزی بۆ بگەرێتەوە کە پێشتر بەر لە دەستوری ١٧٩١ هەیبوو، بەڵام ئیمپراتۆر خۆی لەوە دوردەخستەوە لەپێناو ئەم ئامانجە لەگەڵ فرەنسا بکەوێتە شەڕ. بۆیە مەرجی بەشداریی لەم هەولە ئەوەبوو وڵاتە ئەوروپیەکانی دیکەش بەشدار بن، ئیمپراتۆر دڵنیا بوو کە ئینگلتەرا بەتایبەتی خۆی ناخاتە نێو ئەو کێشەیەوە، ئەمەش دەرفەتێکە بۆئەوەی خۆی لە راگەیاندنی بلنتز بدزێتەوە، بەڵام فرەنسیەکان راگەیاندنی بلنتزیان چۆن دەبینی کاتێک بڵاو کرایەوە؟ ووشەکانی بلنتز روون و ئاشکەرا بوون، داوای لە پادشاکانی ئەوروپا دەکرد بە سەربەرزی بەشداری لەم پرسەی فرەنسا بکەن، ئەم راگەیاندنەش لە کاتێکدا هات کە هەستی نەتەوایەتیی فرەنسیەکان گڕی گرتبوو، کەچی هەندێک لە سەرکردە فرەنسیەکان بەدوای هەلێکدا دەگەڕان تا هێرش بکەنە سەر پادشا ستەمکارەکان، بەم شێوە راگەیاندنی بلنتز چەکی یەکلاکەرەوەی دایە دەست جیرۆندییەکان تا شەڕدژی پادشا ستەمکارەکان رابگەیەنێ. بە چاوێکی نیگەرانەوە سەیری بوژانەوەی هێزی دژە شۆڕشیان دەکرد کە پاشخانیان بریتی بوون لە:

١/ کۆشکی پادشایەتی.

٢/ ئەکلیرۆسە کاسۆلیکەکان ( سەرپێچکاران ) ی دەستوری مەدەنی.

٣/ ئۆرستوکراسییەتی فرەنسی کە لە فرەنسا مابوونەوە.

بۆرژوا پێی وابوو ئەگەر فرەنسا لەو شەڕەی ئەوروپا بەشداری بکا بەڵکو ئومێدەکانیان بێتەدی، بە دڵنیاییش پادشا بیرکردنەوەی لەسەر بۆرژوا وابوو کە رەتیدەکەنەوە دژی ئیمپراتۆریەتی نەماسا بەشداری بکەن، چونکە لیوبولدی دووەم برای ماری ئەنتوانی شاژنی

و: خالید هەرکی

فەرەنسا بوو، دواتر بەشدار بوونی فرەنسا دەرفەتی دەدایە لایەنەکان تا پادشای فرەنسا لویسی شانزەهەم و هاوسەری ماری ئەنتوانێت بەوە تۆمەتبارکەن کە دەستیان لەگەڵ ناحەز و دوژمنانی نەمسا تێکەڵاو کردوە، دواجار جیرۆندییەکان و بۆرژوا هەلیان بۆ دەرەخسێ هەوڵی دەسەڵات گرتنە دەست بدەن و دواتریش لە دژەشۆڕش رزگاریان بێ کە پادشا وئرستوکرات و ئەکلیرۆسەکان ( سەرپێچکارەکان ) پشتیوانیان دەکەن.

ئەمە لە کاتێکا بیرکردنەوەی جیرۆندی و بۆرژواکان بەم شێوە دەبێ، خانەوادەی بۆربۆنی پادشای فرەنساش لە بانگخوازانی شەڕ بوو دژی ئیمپراتۆریەتی نەمسا.

بۆچوونی پادشا و ئەوانەی لایەنگری بوون لە پاشماوەی ئرستوکراتەکان پێیان وابوو سوپای فرەنسی ناتوانێ رووبەرووی پادشاکانی ئەوروپا بێتەوە ئەگەر دژی فرەنسای شۆڕش یەکیان گرت. ئەنجامەکەی دەبێتە شکست هێنانی سوپای فرەنسی و دواجار لیوبولد دەتوانێ مەرجەکانی بەسەر حکومەتی پاریسدا بسەپێنێ و دەسەڵاتەکانی پادشای بۆ بگێڕێتەوە.

ماری ئەنتوانێت ئەم راستییە گرنگەی دەزانی، بۆیە پەلەی لە هەڵگیرساندنی شەڕ دەکرد.

لەوکاتەی ئاراستەکان بەهێزەوە بەرەو شەڕ دەچون، هەندێک لە سەرکردەکان دژی ئەم ئاراستەیە وەستابونەوە، دەستوری فرەنسی جەختی لەسەر بنەمایەکی جوان کردۆتەوە کە دەولەتانی ئاشتیخواز تا ئەمرۆ کاری پێدەکەن بە نەتەوە یەککگرتوەکانیشەوە ئەویش ( نابێ بە هێز دەست بەسەر خاکدا بگیرێ ). لە ٢٢ی ئەیلولی ١٧٩٠ (ئەنجومەنی دامەزارندن) (مافی رزگارکردن)ی رەت کردەوە کاتێکیش فرەنسا بە فەرمانی میرێکی ئەلمانی دەچێتە ناو ئەلزاس بە پشت بەستن بە رزگارکردن ئەمە بە داگیرکردن دانانێن بەڵکو بە یەکگرتنەوەی نەتەوەی فرەنسیی دەزانن، کە نەتەوەیەکی یەککگرتووی بەهێز لەژێر چەتری ( کۆمەلەی دامەزارندن ) دابێ.

پارتی یاکوبییەکانی چەپرەو دژی شەڕ بوون، بەهۆی سوربونی جیرۆندییەکان بۆ شەڕ یاکوبیەکان لێیان جیا دەبنەوە، لە رکابەرانی جەنگ چەند سەرکردەیەک دەردەکەن لەوانە (روبسبیر) و(دانتون)، رۆبسبیر گوتارخوێنێکی بە کاریگەر بوو لە گوتارەکانیدا باش دەیتوانی کار بکاتە سەر هەستی گوێگر و لە ئاستی سیاسییەکانی رکابەری دابەزێنی، هەرگیز سازشی لەگەڵ رکابەرە سیاسییەکانیدا نەدەکرد، بریسۆی سەرکردەی جیرۆندیەکان زۆر سوور بو لەسەر راگەیاندنی شەڕ ئەو لەلایەک روبسبیریش لەلایەکی دیکە، دیالۆگێکی

توند لە نێوان ئەو دوو سەرکردە رویدا، رەوتی گشتی تەنگی بە (بریسۆ) هەڵدەچنی رۆژنامە و بڵاوکراوەکان هانی شەقامیان دەدا بۆ شەڕ و رزگار کردنی گەلانی ئەوروپا لە ستەمی پادشاکان، رۆبسبیر هەموو هەوڵەکانی خستنە گەر بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو رەوتە توندە. بەڵام ئارەزووەکانی خەڵک بۆ شەڕ لە بیانوکانی رۆبسبیر بەهێزتر بوون هەروەها زمانلوسی سەرکردەکانی جیرۆندی و دیماگۆگییەتیان لە رواڵەتی رۆبسبێر بەهێزتر بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا بەر لە روودانی شەڕ چەند هەولێکی مرۆیی دران لە پێناو رێگەگرتن لە روودانی. ئەویش لە رێگەی چارەسەر کردنی کێشەی کۆمەڵگای کۆچبەرانی سەربازی لە (تریف) و (ماینس) بەتایبەتی و نیشتەجێکردنی سەرکردەکانیانتا هەرەشەی پەلاماردان لە فەرەنسای شۆڕش نەکەن.

پەیوەندی لە نێوان دەسەڵاتدارانی فەرەنسی و هەڵبژێردراوانی تریف و ماینس بەسترا تا ئەو کۆچبەرانە لەسەر خاکی خۆیان دووربخەنەوە، داواش لە ئیمپراتۆر لیوبورد کرا ئاخۆ هەڵبژێردراوانی تریف و ماینس ئەم پەیمانە جێبەجێ دەکەن یان نا. بەڵام داواکاریەکەی یەکەمجار دلخۆشکەر نەبوو بۆیان چونکە بەپیریەوە نەهاتن، کۆچبەران چەکیان کۆدەکردەوە و ئامادەیی خۆیان بۆ پادشاکانی ئەوروپا دەردەخست کە دژی فەرەنسای شۆڕش بوەستنەوە. زمانی ئاخاوتنی دەسەڵاتدارانی فەرەنسی لەگەڵیاندا توندتر دەبێ، هۆشداری دەدەنە میرەکانی ئەلمانی لەوەی هاوکاری کۆچبەران نەکەن . توند بونی ئەو قەیرانەش بەسترابۆوە بە بەرز بوونەوەی ئاستی نەتەوایەتیی گەلی فەرەنسی کە بەرەو روودانی شەڕ هەنگاو دەنێ و ئەم شەڕەش دەبێتە ئامانجێکی نەتەویی فەرەنسی.

پادشای فەرەنسا لویسی شانزەهەم رازی بوو لەسەر ئەوەی هۆشداریەکی توند بدرێتە بژاردەی تریف، پێی وابوو ئەم هۆشداریە پرسەکە دەگەیەنێتە دووریانێک:

١/ یا ئەوەتا بژاردەی تریف بە داواکەی فەرەنسا رازی دەبن و کۆچبەران و هێزەکانیان لەسەر خاکی خۆیان دوور دەخەنەوە، کە ئەمە پادشا پێی خۆش نییە.

٢/ یانیش بژاردەی تریف پێ لەسەر بریارەکەی دادەگرێ و رازی نابێ کۆچبەران دەرکا ئەوسا شەڕ روودەدا و کارەکان بە دڵی پادشا دەبێ.

هۆشداریەکە لە لویسی شانزەهەم بۆ بژاردەی تریف دەرکرا، ئەگەر تا کانونی دوەمی ١٧٩٢ کۆچبەران لەسەر خاکی میرنشینەکەیان دەرنەکەن و هێزەکانیان پەرش و بلاوە پێنەکەن ئەوا وەکو دوژمنی فەرەنسا حسابیان بۆ دەکرێ.

و: خالید هەرکی

بژاردەی تریف هەستیکرد کە دۆخەکان بەرەو توندی دەچن، بەتایبەتی کە ئەم کێشە لە نێوان فرەنسا و ئەواندا گیری خواردوە ئەوانیش خاوەن هێزێکی ئەوتۆ نین تەنها کەمە هێزێکی کەمیان هەیە لە نێوا سنوورەکانی ئیمپراتۆریەت و فرەنسا، ناتوانێ بەرانبەر بە سوپای فرەنسی خۆی راگرێ تەنها ئەگەر ئیمپراتۆر لیوبولدی دووەم بێتە هاوکاریی، لەبەر ئەم هۆکارانە بژاردەی تریش کاری بۆ بلاوە پێکردنی کۆچبەرو هێزەکانیان کرد.

بەڵام هێزی شەڕخواز چالاک مابوونەوە. کاتێک فرەنسا هۆشداری دەداتە لیوبولدی دووەم کە قەبولی نییە هیچ پەیمانێکیان لەگەڵدا ببەستێ کە دژی ئاسایش و سەروەری فرەنسا بێ،ن دۆخەکان دووبارە ئالۆز دەبنەوە.

وەلامدانەوەی ئەم هۆشداریە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە واتا دەستهەڵگرتن لە هەڕەشەکانی ( راگەیاندنی بلتنز ) ئەمەش کارێکی قورس بوو بۆ لیوبولدی دووەم، دۆخەکان زیاتر ئالۆزیان تێدەکەوێ کە لیوبولد دەمرێ و فرانسوای دووەم وەکو ئیمپراتۆر دێتە شوێنی، ئیمپراتۆرە نوێکە بە پێچەوانەی کۆنەکە بوو، ئامادە بوو بەرگری لە مافەکانی پادشایەتی بکا. تەنانەت ئامادە نەبوو وەلامی ئەو یاداشتەش بداتەوە کە پێشتر لە ئاداری ١٧٩٢ بۆ ئیمپراتۆری پێشو ناردرابوو، بۆیە هێزی شەڕخواز لە فرەنسا سەردەکەوێ.

وێڕای ئەو گۆڕانکاریەی لەسەر دۆسیەی کۆچبەران چووبوە پێش بەڵام شەڕخوازان رەورەوەی شەڕیان بەرەو پێش دەبرد. جیرۆندیەکان لەگەڵ لایەنگرانی پادشاگەری رێککەوتن کە هاوکاری یەکتری بکەن و پۆستە وەزاریەکان بە بانگخوازانی شەڕ بدەن. لەم بوارە (دومۆریز) وەزیری دەرەوە رۆلێکی زۆری گێڕا رۆلێکی دووسەرەی مەترسیدار.

دومۆریز لەو سیاسەتمەدارە ترسناکانە بوو کە رۆڵی سەرکێشیی دەگێڕا ئەم جۆرە سیاسەتمەدارە لە فرەنسا زۆر بوون بەتایبەت لە سەردەمی ناپۆلیۆن و سەردەمی شۆڕشی فرەسنی. ئەو کەسانەی بڕوایان بە دوارۆژی فرەنسایە و بەرژەوەندیەکانی خۆیان پشتگوێ دەخەن و دەست ناخەنە نێو دەستی پادشاکانی ئەورووپی لە دژی فرەنسا، دومۆریز یەکێک بوو لەم جۆرە کەسانە تالیرانیش بەهەمان شێوە و زیاتریش.

دومۆریز لە هاندانی فرەنسا بەرەو جەنگ مەبەستی بوو ژمارەیەک ئامانج بپێکێ. پێی وابو بەم رێگایەوە دەتوانێ هاوپەیمانی لەگەڵ پرووسیا و بەریتانیا ببەستێ، نەخشەکەی بەم جۆرە بوو، دوای ئەوەی لە شەڕەکان سەردەکەوێ بەهێزەوە دەگەڕێتەوە پاریس تا پشتگیری لە پادشا بکا و گورزێکی کوشندە لە جیرۆندیەکان بدا.

بەڵام کە ماوەیەک بەسەردا تێدەپەڕێ هەڵوێستی فرانسوای دووەم تەنها دوژمنکاری دەبێ بەرانبەر بە فەرەنسای شۆڕش، ئێستا پرسی شەڕ هیچ دواخستنێک هەڵناگرێ. لە ٢٠ نیسانی ١٧٩٢ شەڕ رادەگەیەندرێ، دومۆریز بۆ خەراپەکاری ویستی نێوان نەمسا و پرووسیا تێکدا و هانی بەریتانیا بدا لەگەڵیان هاوپەیمانی ببەستێ، لە راستیدا لە بەریتانیا هەندێک دەنگ هەبوون پشتگیری فەرەنسایان دەکرد، بەڵام ئەم دەنگانە نەچونە تەرازوی هاوسەنگی شەڕی فەرەنسا دژی نەمسا و پرووسیا. دواتر سەرۆک وەزیرانی ئەوسای بەریتانیا ولیام پیت بوو، بەهۆی بەشداری فەرەنسا لە جەنگی سەربەخۆیی ئەمریکا. رقی زۆری لە فەرەنسا بوو.

بەریتانیا بێلایەن وەستایەوە، هەریەک لە نەمسا و پرووسیا لەسەر دژایەتی فەرەنسا رێک دەکەون کە کارێکی هاوبەش لە دژیدا بکەن، دومۆریز هەولی زۆریدا تا نێوانیان تێکدا، وا گومان دەکرا لەم هەولەیدا سەردەکەوێ، چونکە هەندێک کۆنە بوغزی شاراوە لە نێوان نەمسا و پرووسیادا هەبوون گومان دەکرا دەتوانرێ نوێیان کەنەوە و ئەو زامانە بکولێندرێنەوە.

بەڵام دومۆریز لە هەولەکانیدا شکستی هێنا، ئێستا شمشێر بووە حوکمڕان ، لەم کارە سوپای فەرەنسی وەکو پلانە کۆنەکەی جوولەی کرد بە داگیرکردنی خاکی نەمسا دەستی پێکرد، ئەوکات لە بەلژیک شۆڕشیکی دژی حوکمی ئیمپراتۆر لە مەیداندا بوو ئەمە بوە هاوکار بۆ سوپای فەرەنسی کە زوو بەزوو بتوانێ خاک داگیرکا، لەیەکەم بەگژیەکدا چونی سوپای فەرەنسی و نەمسایی یەکەمیان شکستێکی مەزن دێنی.

ئەگەر دیراسەیەکی خێرای دۆخی سوپای فەرەنسی بکەین ئەو شکستە بۆ رۆحیەتی تاکی سەربازی فەرەنسی ناگەرێتەوە بەڵکو بۆ قۆناغەکە دەگەرێتەوە کە قۆناغی گواستنەوە بوو لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی نوێ، لێرەشدا بەرپرسیارێتیەکە دەکەوێتە سەرشانی فەرماندە و ئەفسەرانی، دەکەوێتە سەر نەخشەی سیاسی کە بۆ رووبەڕووبونەوە داڕێژراوە، بۆ رەنگدانەوەی جەنگ لەسەر گەلی فەرەنسی.

سەرڤال لە ٩ی تەموزی ١٧٩٢ ەوە وەزیری جەنگ بوو فەرماندەی باڵای سوپا بەدەست مارشال (دی روشامبو) بوو، ناوبانگێکی باش لە بەشدارکردنی جەنگی رزگاری ئەمریکا پەیدا کردبوو، کەسێکی کەم بروا، لەسەرەخۆ بۆ بیرکردنەوە، بەڵکو هۆکاری ئەمە بۆ بەتەمەنیی بگەرێتەوە، لە راستیدا لاڤاییت لەم شەرە بەشدار بوو بەڵام ئەو لە بواری سیاسی زیاتر کاری دەکرد لەوەی بواری سەربازی، بە شێوەیەکی گشتی هەماهەنگیەکی ئەوتۆ لە نێوان مارشال و جەنەراڵەکانی سوپای فەرەنسیدا نەبوو.

و: خالید هەرکی

دۆخی ئەفسەران توندترو ئالۆزتر بوو، پێشتر بەر لە شۆڕش پۆستەکانی ئەفسەران لەلایەن چینی ئۆرستوکراتەوە دەستی بەسەردا گیرابوو، ئەو ئەفسەرانە پێیان وابوو شۆڕش سوکایەتیان پێ دەکا کاتێک دەیانخاتە ژێر فەرماندەی ئەفسەرێک لە چینەکەی خۆیان ئاست نزمتر بێ واتە ئرستوکرات نەبێ، بۆیە ئەو ئەفسەرانە رقیان لەم شۆڕشە دەبۆوە، هۆکاری چینایەتی کاریگەرترین فاکتەری سەر ئەفسەران بوو کە قەبوڵیان نەبو بخرێنە ژێر فەرمانی ئەفسەرێکی بەدەر لە چینی ئرستوکرات یا پادشاگەر، زۆربەیان بەم هۆکارەوە رایانکردە دەرەوەی فرەنسا، نیوەی ئەو جۆرە ئەفسەرانە لە سوپا نەمانەوە بەو هۆیەوە شارەزایی و پسپۆری سوپا لاواز دەبێ، لە ئەنجام لەبەرانبەر سوپای نەمسا و پرووسیای مەشق پێکراو شکست دێنێ.

ئەم شکستە وای پێویستکرد داوای پێکهێنانی سوپایەکی نوێ بکرێ تا بەرگری لە سنوورەکانی باکووری بکا کە ئێستا بۆ هێرشبەران کراوەیە. دوای ئەوەش بەرپرسیارێتیەکان دیاری بکرێن و سزای کەمتەرخەمیش بدرێ.

وەزیری جەنگ هیچی لەبەردەم نەمایەوە تەنها ئەوەنەبێ دەست لەکار بکێشێتەوە، پۆستی وەزارەت بە کەسێکی توند و سەرکێش سپێردرا ئەویش ( برفانت ) بوو، برفانت داوای پرچەک کردنی پاسەوانی نیشتمانیی کرد ئەوانەی لەسەر سنوورەکانن، بەم بڕیارەی ژمارەیەکی زۆری نیشتمانپەروەر دەخاتە بەرەکانی سوپا، بەڵام شارەزاییەکی کەمیان هەبوو لە کاری سەربازی ئەگەر بەراوردیان پێ بکەین لەگەڵ سوپاکۆنەکەی پادشا.

وەزیرە نوێکە پێی وابو کێماسی سوپای فرەنسی لەکاتی هەلمەتی داگیرکردنی بەلژیک تەنها نەبونی فەرماندەییەکی بوێرو شارەزا بوو، میللەت پێی وابو ناپاکی هۆکاری شکستەکە بوو ، بۆمیللەت ئاسانە زوو تۆمەتەکان بخاتە پاڵ لایەنێک، بەڵام قورس و سەخت بوو هۆکاری ئەو شکستە بدۆزیەوە، پەنجەی تۆمەتەکان زۆربەیان ئاراستەی پادشا و لایەنگرانی دەکرا کە ئەوان هۆکاری هەلگیرساندنی شەڕی نێوان ئەوان و نەمسا و پرووسیا بوون، ئەمە لە ئەنجامی پیلانی ئەواندا بوە، گومانی تێدا نیە میللەت لەمەیان راستیدەکرد. لەژێر ئەم ئازار و شکستانە دەنگۆ و ئاوازی نیشتمانپەروەری (مارسیلیزی)ی بەناوبانگ بەرز دەبێتەوە، هانی خەلکی دەدا بۆ رزگار کردنی نیشتمان.

گەل لەسەر کەلاوەی ئەو شکستانە هەنگاویاننا، دژی پادشا رقیان دەڕشت، لەم میانە ئەندامانی کۆمەڵەی یاسادانانی بێ دەسەڵات پادشایان رەخنەباران کرد و داوای دورخستنەوەیان لێی دەکرد یا لانیکەم لەکار وەستان ، لە بەرەبەیانی ١٠ ئاب گەرەکەکانی

پاریس داوای خۆپیشاندانێکی سەرتاسەری لە هاوڵاتیان دەکەن. هەرکە پادشا هەستی بە مەترسیەکان کرد کە لێی نزیک بونەتەوە لە تۆیلەری رایکرد پەنای بۆ کۆمەلەی یاسادانان برد. کاتێک خەلک بەمەیان زانی پەلاماری کۆشکیان داو تالانیان کرد، کۆمەڵەی یاسادانان هەڵدەگەڕێتەوە و سیستەمی کۆماری رادەگەیەنێ. بە دیدی کۆمەلە کێشەیەکی ئالۆز سەریهەڵدا، لە ١٧٩١ لەدەستور بڕیاریان لەسەر سیستەمی پادشایەتیی دەستوری داوە، دورخستنەوەی پادشا دەرچونە لە دەقەکانی دەستور.

لەکاتێکا دەنگۆی بیروبڕواکانی شۆڕش لای ئەفسەران دژایەتیی دەکرا، بەڵام لای ئەفسەر و سەربازە خۆبەخشەکان مایەی قەبولکردن بوو، ئیتر بێ متمانەیی و بڕوابەیەکتری نەبون لە نێوان ئەفسەر و سەربازەکان بڵاو دەبێتەوە، هەر هەلەیەک بە زوترین کات دەبوە تۆمەتی ناپاکی و دەخرایە پال یەکتری، راستە گوێ پێنەدان وکەمتەرخەمی هەبوو بەڵام ناپاکیش لە نێو ریزی ئەفسەراندا هەبوو. دوای یەکەم بەگژیەکداچونی سوپای فەرەنسی لەگەڵ سوپای نەمسایی ئەم پرسە لەلایەن سەربازەکانەوە مەزن کرا دوای دەرکردنی فەرمانی کشانەوە گوایە ناپاکی کراوە، سەربازەکان وەکو پیلانی خیانەتکاری سەیری ئەم پرسەیان دەکرد کە ناپاکی لەگەڵ نەتەوە و شۆڕشی فەرەنسی دەکرێ، ئەوەندە نابا سوپا لەبەریەک دەچێ و پەرش و بلاو دەبێ. هەر گروپە و بونە چەند چەکدارێک دژی ئەفسەرەکانیان وەستانەوە، لەم رووەوە چەند روداوێکی کوشتنی ئەفسەرەکانیش روودەدرێ.

هەرچییەک بێ هۆکارەکانی ئەم روداوە، فەرماندەکانی نەمسایی و پروسی ئەم رووداوەیان بە لاوازی سوپای فەرەنسی دەزانی، هەولیاندا ئەم هەلە بقۆزنەوە بۆ لەناو بردنی شۆڕشی فەرەنسی و گەڕاندنەوەی پادشایەتی بۆ ئاستی جارانی، پرووسیا بە ئاستێکی بالاتر بەشداریی لە هەلمەتەکانی دژی فەرەنسادا کرد، شازادە برونزویک کە یەکێکە لە بەناوبانگەکانی سەرکردەی پروسی فەرماندەیی سوپایەکی نەمسایی و پروسیی کرد، برونزویک سوکایەتی و گالتەی بە سوپای فەرەنسی دەکرد.

دوای ئەوەی سوپای نەمسا و پرووسیا ئامادە دەبن لەگەڵ ئەو هێزانەی خانەدان و کۆچبەرەکان کۆیان کردبۆوە بۆ پەلاماردانی فەرەنسا، شازادە برونزویک بەیاننامەیەک لە (کوبلانز)ەوە بلاو دەکاتەوە، تیایدا داواکاریەکانی خانەوادەی پادشایەتی فەرەنسا دەنوسێ، لە بەیاننامەکەیدا برونزویک روی دەمی ئاراستەی ئەو کەسانە دەکا کە دەستی بۆ خانەوادەی پادشای فەرەنسا درێژ دەکا، دواتر هەڕەشە دەکاو دەڵێ پاریس دەکەمە هۆلی بالندەکان ئەگەر گوێڕایەلی فەرمانەکانم نەبن، ئەم بەیاننامە هەستی نەتەوایەتی خەڵکی

و: خالید هەرکی

ورووژاند بۆ بەرگریکردن لە وڵاتەکەیان، هەستی گیانبازی لە وڵات پەرە دەسەنێ، بانگەوازی هاواری نیشتمان لە مەتسریدایە بەرز دەبێتەوە، ئێستا ململانێکە چوە قۆناغێکی دیکەوە.

میللەت لەم هەلمەتەی سەربازی زۆر بێزار ببو، ئەم مشتو مڕە بە چارەسەریەکی مامناوەندی کۆتایی هات، ئەویش وەستاندنی پادشا لە کار و دەسەڵاتەکانی لەگەڵ دامەزارندنی کۆمەلەیەکی نوێ لەرێگەی هەلبژدنەوە بۆهەمواركردنی دەستور.

لە میانی ئەو رووداوانە دەرکەوت کە شەڕخوازان دۆراندیان، هەموو کارەکانیان لێ ئاوەژوو بۆوە.

رژێمی پادشایەتی لە ١٠ ی ئابەوە رووخاوە، فرەنسا بۆتە دەوڵەتێکی کۆماری، تەنها راگەیاننەکەی ماوە، بەم شێوە رژێمی پادشایەتیی لەناو برد و ئومێدەکانی گەڕانەوەی لە گۆڕنا، دوا هەولی گەڕانەوەی لەلایەن لاڤاییتەوە دەدرێ، لە باکوورەوە جولە بە سوپای فرەنسی دەکا تا بێتەوە پاریس و پادشا بگێرێتەوە سەر دەسەلات، بەڵام ئەم هەوڵەی سەرناگرێ خەڵک بە ناپاکی دەزانن و رێگەی لێدەگرن ئەویش بە ناچاری رادەکاتە دەرەوەی فرەنسا، لە نەمسا دەگیرستەوە.

جیرۆندیەکان بەهەمان شێوە بە دۆڕایی دەرچون، دوای ئەوەی جیرۆندیەکان دەدۆڕێنن رۆبسبیر یاریە مەترسیدارەکەیان ئاشکەرا دەکا کە بوە مایەی شکست پێهێنانیان، رۆبسبیر بوە بەهێزترین ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانیی پاریس ( ئەم ئەنجومەنە بۆ پرسی سیاسی لە کۆمەلەی یاسادانان کاریەگرتر بوو ) جیرۆندیەکانی بەوە تۆمەتبار کرد کە دەستیان خستبوە ناو دەستی پادشا بۆ لەناو بردنی ئەزمونی پاریس و شۆڕشەکەی.

بە تێکچونی پێگەی جیرۆندیەکان، پێگەی بۆرژواکانیش تێکدەچێ، ئێستا سەنتەری هێز لە جیرۆندیەکانەوە بە خێرا دەگواسترێتەوە بۆ یاکوبیە رکابەرە سیاسیەکانیان، خۆی لە راستیدا ئەو یاکوبیانەش لە بۆرژواکان بوون بەڵام جیاوازیی نێوانیان ئەوە بوو پەیوەندیی یاکوبیەکان لەگەڵ جەماوەر بەهێزتر بوو لە پەیوەندیی جیرۆندیەکان لەگەڵ جەماوەر، پێشبینیەکانی روبسبیر لەسەر ئەنجامەکانی شەڕ هاتنە دی، دوای شکستی سوپا لە زەوییەنزمەکان جەماوەر پێویستی بە فەرماندەی بەهێزتر بوو بۆ سوپاکەی کە لەو ئەفسەرە جیرۆندیە بێتوانایانە باشتر بن ، ئاسایی بوو دوای ئەوان یاکوبیەکان جلەوی فەرماندەیی سوپا دەگرنە دەست.

یاکوبیەکان نیشتمانپەروەری بەسۆز بوون، بۆ فرەنسا دڵسۆز بون بەڵام لە هەمانکات توندڕەو بوون، ئەو دۆخەی کە تێیدا ئیدارەی وڵاتیان گرتە دەست دۆخی شکستەکان بوو، بۆیە سەردەمی ڕوداوە توندەکانی بوو لە ماوەی شۆڕشی فرەنسی. ئەم حوکمڕانیە شۆڕشگێریە لە ئابی ١٧٩٢ دەست پێدەکا کە یاکوبیەکان خۆیان بەسەر ئەنجومەنی شارەوانیدا دەسەپێنن و ( کۆمۆنە ) دادەمەزرێنن، واتە لیژنەی مەرکەزی. ئەم لیژنەی مەرکەزیە ( کۆمۆنە ) لە ١٠ی ئاب تا ٢١ی ئەیلول ١٧٩٢ حوکم دەکا تا ڕۆژی بەستنی ( کۆنگرەی نیشتمانیە ).

لە میانی شکستەکانی سوپای فرەنسی لە زەوییەنزمەکان چەند سیاسەتمەدارێک لە نێو یاکوبییەکان دەردەکەون لە نێویاندا ( دانتون ) Dantonو مارا کە خۆیان بۆ ئەم پرسە تەرخانکرد، کاریان بۆ ڕزگار کردنی فرەنسا لە مەترسییەکانی ناوەخۆ و دەرەکی کرد. خۆی یاکوبییەکان جڵەوی حوکمیان گرتە دەست، بەڵام لەتەک ئەوانیش چەند دام و دەزگایەک هەبوون هاوکاریان دەکرد بۆ جێبەجێکردنی کارەکان و بەدواداچوونی ڕووداوەکانی شۆڕش، دەسەڵاتدارانی حوکمرانی پاریس لە مانگی ئاب ئەمانە بوون:

١/ کۆمەڵەی یاسادانان، ئامادە بوو کارەکان ڕادەستی کۆنگرەی نیشتمانی بکات کە بڕیاریان دابوو هەڵبژاردن لە ٢ی ئەیلولی ١٧٩٢ دەست پێبکا.

٢/ کۆمۆن یا لیژنەی مەرکەزی، هەلگری ئاراستەیەکی شۆڕشگێڕی بەهێز بوو، کۆمەلەی یاسادانانی پەک خستبوو تەنها ئەو کارانەی دەبرد بەڕێوە کە لیژنەی مەرکەزی پێیدەسپارد.

٣/ دەستەی جێبەجێکردن، بەرپرسیارێتیان وزاری بوو، دانتون بەهێزترینیان و بەرپرسی دادوەری بوو.

هەرکاتەی هەواڵەکانی شکستی هێزەکانی فرەنسی لەبەرانبەر هێزەکانی نەمسایی و پروسییان پێدەگەیشتن ئاسایی بوو شۆڕشگێڕیەتی یاکوبیەکان بەرز بێتەوە، یاکوبیەکان پێیانەوە دیاربوو کە بەرانبەر بە داگیرکەران توند و خۆڕاگرن، کاتێک لە ٢٦ی ئابی ١٧٩٢ هەوالی لەدەستچوونی ( لینجۆ ) یان پێ دەگا جیرۆندییەکان بەپەلە دەبن تا خۆیان کۆکەنەوە و بەرەو باشوور برۆن، بەڵام دانتون هۆشداریی لەم هەڵوێستە شکستیەی پێدان، لە هەموو پارێزگاکان سوپای خستە ئامادە باشی، دواتر هەواڵەکان دەگەنە پاریس کە فردان گەمارۆ دراوە، وەکو دەزانرێ ئەوێ وەکو کلیلی پاریسە لەلای باکووریەوە، گەل بەرەو چەک

هەلگرتن دەچی بۆ رزگار کردنی نیشتمان و پاراستنی پاریسی پایتەخت لە مەترسیەکان، خەڵک هەموو چەکی هەڵگرت چاڵ و سەنگەر لێدران.

لە پڕ مەترسییەکان زیاد دەبن کە سوپای دوژمن لە پاریس نزیک دەبێتەوە. ئەو هێزەی کۆکرابۆوە بەپەلە بەرەو باکوور دەچی بۆ پێشگرتن لە دوژمن، ئایا ناوەوە پشتگوێ دەخرێ تا ناحەزان بە هەوەستی خۆیان تێکیبدەن؟ دەبێ جولەیەکی پاکسازی ئەنجام بدری بە دەستێکی پۆلایین لە لایەنگرانی پادشا و هەلپەرستان بدرێ، هەرکاتەی شکستێک دەبوو تارمایی ناپاکی زیاتر بەدەر دەکەوت، ئارەزی تۆڵە سەندنەوە لە ناپاک و لادەرانی هێڵی نیشتمانپەروەری بەرز دەبێتەوە، بەڵکو بەر لەو شکستانە بونی رژێمی کۆن لەتەک شۆڕش مایەی قەبووڵکردن بێ بەڵام دوای ئەم شکستانە نابی قەبوڵ بکرێ، تەنها یەک سیستەم و یەک حکومەت و دەسەڵات دەبێ هەبێ، هەندێک رێکار ئەنجام دران کە پێشگرتن بوو لە رووداني کارەسات و کۆکوژی، لەوانە ئەکلیرۆسی ( سەرپێچکار ) کە ئامادە نەبوون سوێند بە دەستوری نوێ بخۆن، ئێستا رێگەیان پێدرا فرەنسا جێبێلن بۆ ئەوەی روداوی تیرۆر و کوشتارگە روونەدا، جگە لەم رێکارە رێکارەکانی دیکە بە توندوتیژی چون بەرێوە، دەبوایە دەسەڵات و رێنمای نوێ بۆ دەستەی جێبەجێکار هەبن، دانتون وەکو وەزیری داد ئەم دەسەڵاتەی پێدان، ئێستا دەسەڵاتی پشکنینی ماڵان و دەستگیر کردنی تۆمەتباران و ناحەزانی شۆڕشیان پێدرا، بەهەزاران کەسیان گرتن و رەوانەی زیندانەکانیان کردن دواتر لە رێگەی کۆمۆنەوە ( لیژنەی مەرکەزی) دادگای تایبەتیان پێکهێنا و دادگاییان کردن، بۆ ژمارەیەکی زۆر لەو گیراوانە حوکمی لەناوبردنیان بۆ دەرکرا، ئەم سیستەمە لە هەموو زیندانەکانی پاریس پیادە کرا.

حوکمی لەناوبردن تەنها بەدەست دادگاکان نەبوو بەڵکوو لە گەلێک شوێن پیادە دەکرا، پاسەوانەکان بەبێ دادگاکردن خەڵکیان لەناو دەبرد، لە ٢ی ئەیلولی ١٧٩٢ تیرۆر و کوشتن لە نێو لایەنگرانی پادشا و دوژمنانی یاکوبی دەبێتە دیاردەیەکی ئاسایی.

لە هەمان رۆژی کوشتارگەری چەند رووداوێکی گرنگ و ناکۆک روودەدەن:

١/ هەڵبژاردنی کۆنگرەی نیشتمانی ئەنجام درا.

٢/ فەردان دوای گەمارۆیەکی زۆر دەکەوێتە دەست دوژمنانی دوای ئەوەی ناپاکی هێزەکانی بەرگری لاواز دەکا و پادشاخوازەکان فەرماندەی پارێزگاری نیشتمانی دەکوژن.

بەڵام ڕوخانی فەردان ئەگەری زۆر بوو، بەم شێوە خەڵک پڕچەککردن پەرە دەسەنێ خەڵکی بە لێشاو بەرەو باکوور دەچن بۆ بەرگریکردن لە شار و نیشتمانەکەیان.

فەرماندەی گشتی بە دومۆریز سپاردرا، دۆخی سوپا لە ئەیلولی ١٧٩٢ جیا بوو لەگەڵ لە سەرەتای شەڕ کە پەلاماری زەویەنزمەکانی دابو. خۆی تا ئەوکات ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرانی دژ بە شۆڕش لە نێو سوپادا مابوونەوە، بەڵام دۆخی ئەمجارەی بەرگریکردن لە نیشتمان لە دژی شالاوەکانی دوژمن جیا بوو لەگەڵ ئەوکاتەی هێرش دەبردایە سەر زەویەنزمەکان بۆ داگیرکردنی کە لەدەرەوەی سنوورەکانی فرەنسا بوون، وردە وردە ژمارەی سەربازەکان زیادی دەکرد ئێستا فرەنسا خاوەنی سوپایەکی ژمارە زۆرە، لەو ژمارە زۆریە گرنگتر ئەوەبوو خەڵک بە جۆشەوە بەرەو پیر سوپاوە دەچوو بە خۆبەخشی دەچووە ریزەکانییەوە. بەپێێ فەرمانەکانی وەزیری جەنگ دومۆریز گردەکانی کە دەیانڕوانیە سەر ڕێگای بەرەو پایتەختی داگیر کردبوو، سوپای پروسی بە سەرۆکایەتی برنزویک هەولی دەدا سەنگەرەکان بە سوپای فرەنسی چۆلکا ، برنزویک نەخشە و پلانێکی مکومی دارشتبو بۆ گەمارۆدانی هێزەکانی فرەنسی، دیموریی ناچار کرد پاشەکشە بکات. لەم هەلوێستە ناسکە سوپای میتنز هاتە ناومەیدانی شەڕ، بە سەرۆکایەتی ( کیلرمان ) لە سەر گردۆلکەکانی ( ڤالمی ) سەنگەریان لە سوپای پروسی گرت.

بە گەرتنی سەنگەرەکانی ڤالمی لە ٢٠ ئەیلولی ١٧٩٢ و فەرماندەیی کردنی هێزەکە لەلایەن ڕاستەوخۆی (کیلەرمان)ەوە دۆخەکان بەرەی جەنگ دەگۆڕدرێن، ناوبراو کەسێکی پۆلاین و زیرەک بوو بەکار هێنانی دەستەواژەی کاریگەر لە هەستی سەربازەکان کاریان دەکردە سەر گۆڕینی دۆخی بەرەکانی جەنگ. برنزویک هێرشەکانی بۆ سەر سوپای فرەنسی توندکرد، بە پشتیوانی نەخشە و پلان و سەربازە مەشقپێکراوەکەی لە هەلمەتەکان سەردەکەوت تا ڕووبەڕووی قارەمانێک بۆوە کە هەرگیز خەیالی ئەمەی نەدەکرد، ئەمە یەکەم هەلەی مەزنی پێشبینیەکانی برنزویک بوو کە تێیکەوت، تا ئەوکات پێێ وابو لەگەڵ چەند هەرچی و پەرچییەک شەڕدەکا کە شۆڕشگێڕە فرەنسیەکان کۆیان کردونەتەوە ئەوانیش لەگەڵ دەنگی یەکەم هاون ڕادەکەن، ئەوەی لە زەوییەنزمەکان ڕویدا لە ڤالمیش دووبارە دەبێتەوە، بەڵام ئەوەی ڕویدا بە پێچەوانەوە بوو. هاونەکان لەیەک نزیکبوونەوە دەنگەکانیان تێکەڵ بەیەک بوون، سوپای فرەنسی سەنگەرەکانیان چۆل نەکرد و بەرگرییەکی باشیان کرد، کاتێک برنزویک هەستی کرد بەرگریەکی توند هەیە هێرشەکان ڕادەگرێ و بەرەو ئەو شوێنە پاشەکشە دەکا کە لێیەوە هاتبوو.

و: خالید هەرکی

ئێستا دومۆریز دوای ئەو سەرکەوتنەی دەگەڕێتەوە سەر نەخشەی سیاسیی جارانی کە لەیەک دوورخستنەوەی نەمسا و پرووسیا بوو. دوای تەواو بوونی شەڕی ڤالمی بە ماوەیەکی کورت هەردووک فەرماندە دومۆریز وبرونزویک بە ئارامی کەوتنە دانوستان، هەریەکەیان بە ئەسپایی رۆلی خۆی دەگێڕا، دانوستانەکان کۆتاییان هات بە کشانەوەی برونزویک لە سەرجەم خاکی فرەنسا.

سەرەکوتنی ڤالمی تەنها سەرکەوتنێکی ستراتیژی نەبوو، بەڵکو کاریگەریەکی بەهێزی لە روی سیاسی و ناوەخۆوە هەبوو، مەترسیەکان مەزن بوون بەڵام بە خۆراگری نیشتمانپەروەران لەناو بردرا، لەو ئان و ساتدا گەل پێویستی بە سەرکەوتن هەبوو ئەمەش ئەو سەرکەوتنەیە، جووتیارانی لورین و شمبانی لە پرسۆز و بەرزی مۆراڵیانەوە بەرەنگاری و رێگری لە سوپای بەزیوی برونزویک دەگرن و دەردێکی پێدەکەن با بەدەواری شەڕی نەکردبێ، لەولاشەوە لە پاریس ئاهەنگی سەرکەوتن دەگێڕدرا.

بەڵام لە پشتی شکستەکانی پروسی هۆکاری دیکەی شاراوە هەبوون بۆ سەرکەوتنەکانی فرەنسی، پادشای پرووسیا لەسەر پلانی دژایەتی فرەنسا ناکۆکیی لەگەڵ شازادە برونزویک هەبوو، دواتر کێشەی پۆلۆنیا دووبارە سەری هەڵدابۆوە ئەویش هۆکارێکی دیکەی لەیەک دوورکەوتنەوەی نەمسا و پرووسیا بوو. لە سەرەتای جەنگ دوژمنانی فرەنسا، نەمسا و پرووسیا یەککگر بوون بەڵام سوپای فرەنسایشپرزە و پەرش و بلاو بوو، کەچی ئێستا لە شەڕی ڤالمی دوژمنانی فرەنسا پەرش و بلاون سوپای فرەنساش یەککگرە، ئەوەندە بەسەر سەرکەوتنی ڤالمی تێناپەڕێ کە فرەنسا لە ٦ێ نۆڤەمبەری ١٧٩٢ لە شەڕی (جیماب) لە گەڵ نەمسا سەرکەوتنێکی دیکە بەدەست دێنێ، ئەم سەرکەوتنە سەرکەوتنێکی سەربازیی راستەقینە بوو، بەڵام وەکو سەرکەوتنی ڤالمی دەنگی نەدایەوە، دەرەنجامەکانی سەربازیی ئەو سەرکەوتن لە سەر ئاستی نێودەولەتی کاریگەری خۆیان هەبوون، ئێستا رێگاکانی برۆکسل بۆ سوپای فرەنسی کراوەن، لە ماوەی داهاتوو دەرەنجامەکانی باشتر دەردەکەون بەتایبەت بە پەرە سەندنی جەنگ لە زەویە نزمەکان و رەنگدانەوەی شکستی فرەنسا لە جەنگی یەکەمیدا بەسەر دۆخی ناوەوەی فرەنسا و کۆنگرەی نیشتمانی کە لە ٢ی ئەیلولی ١٧٩٢ دوە جێگەی (کۆمەڵەی یاسادانانی ) گرتەوە.

لەو رۆژەی کە سوپای فرەنسی لە ڤالمی سەرکەوتن بەدەست دێنن لە ٢ی ئەیلولی ١٧٩٢ لە هەمان رۆژ کۆنگرەی نیشتمانی دەبەستری . دامەزراندنی کۆنگرەی نیشتمانی کاریگەریی لەسەر ئاراستەکردنی سیاسەتی ناوەخۆو دەرەوەی فرەنسا دەبێ، لەم کۆنگرە

هیچ کام لە دوو باڵەکەی چەپ و ڕاست نەیانتوانی بەسەر لایەنەکەی دیکەدا زاڵ بن، ئەوەتا یاکوبیەکان ٥٠ کورسی بەدەست دێنن، جیرۆندیەکان ١٢٠ کورسی، ناوەڕاستیش ٦٠٠ کورسی لێرەوە دەردەکەوێ کە هەولدان بۆ کێشانی لاینێک بێسود دەبێ.

دوای یەک ڕۆژ لە گرێدانی یەکەم کۆبونەوەی کۆنگرەی نیشتمانی واتە لە ٢١ی ئەیلولی ١٧٩٢ بڕیاری هەلوەشاندنەوەی ڕژێمی پادشایەتی دەدرێ بە بڕیاردان لەسەر سیستەمی کۆماری، دوای مشتو مڕێکی زۆر بڕیاردرا بەم تۆمەتانە پادشا بدرێتە دادگا:

١/ دروستکدنی هەڕەشە لەسەر ئاسایشی نەتەوەی فرەنسی.
٢/ دەست خستنە ناو دەستی دوژمنی بێگانە .
٣/ کارکردن بۆ گۆڕینی دەستوری فرەنسی.

هەندێک هێزی سیاسی هەبوون پێیان وابوو بەرگری کردن لە پادشا باشترە لەوەی بدرێتە دەست هەندێک توندڕەو و ئەوانیش کار بۆ لەناوبردنی بکەن، مەبەستی جیرۆندیەکان ئەوەبوو پادشا لە مردن رزگار کەن کە لە چاوەڕوانییەتی. بەڵام لە پەنای ئەم مەبەستە ئامانجی جیرۆندیەکان بۆ بەرژەوەندی بۆرژواکان بوو، چونکە رووخانی پادشا بە رێگەی توندو تیژیەوە دەبێتە مایەی بەرز بوونەوەی سۆزی جەماوەر تا ئەم شۆڕشەی بۆرژوا بکەنە شۆڕشێکی جەماوەریی سەرتاسەری بەم شێوەش دەست دەگیرێ بەسەر مولکی بۆرژواکان و ئازادیەکانی بازرگانی تێدەچن کە مەزنترین سەرچاوەی سامان و داهاتی بۆرژواکانە.

یاکوبیەکان ناحەزی و ڕکابەری سەرسەختی جیرۆندی و پاشاخوزەکان و بۆرژوای باڵا بوون. ئەوان لە سوچێکی دیکەوە سەیری پرسی پادشایان دەکرد:

بەدیدی ئەوان چونکە بە نهێنی پەیوەندیی بە دەولەتانی دژی فرەنساوە کردوە، هەڕەشەی لەسەر ئاسایش و ئارامی فرەنسا دروست کردوە، پێیان وابو لەسەر ئەم تۆمەتانە دەبێ بدرێتە دادگا، ئەوەبوو لە ١٧/١٦ کانونی دووەمی ١٧٩٣ دەنگ وەرگیران ئاخۆ لویسی شانزەهەم تاوانبار و پیلانگێرە دژی ئازادیەکانی گشتی و ناپاکیی لە ئاشتی نەتەوەی فرەنسا کردوە؟ ئەنجامی دەنگدانەکە ٣٨٧ ئەندام بە لەناوبردن دەنگیاندا لەبەرانبەردا ٣٣ بە نەخێر. حوکمی لەناوبردنەکە لە ٢١ی کانونی دووەمی ١٧٩٣ جێبەجێ کرا.

دەرکردنی حوکمی لەسێدارەدان و جێبەجێ کردنی واتە یاکوبیەکان بەسەر ناحەزانیاندا ( جیرۆندی ) سەر کەوتن، لە ڕوێکی دیکەوە کۆتایی هاتنی پادشا بەم شێوە، سەرەتای کۆتاییهاتنی ئەفسانەی حوکمی خواوەندی پیرۆزی پادشاکانە.

و: خالید هەرکی

گەلێک لە مێژوونووسان دەڵێن لە سێدارەدانی پادشا بەم شێوە تراژیدیایە هەستی ئینگلیزەکانی وروژاند و خۆیان خستە خانەی دوژمنی فەرەنساوە. وەکو ئەوەی ئینگلیزەکان هیچ جارێک پادشای خۆیان لەناو نەبردبێ، ( ئینگلیزەکان لە ١٦٤٩ پادشا چارلسی یەکەمیان لەناو برد )، بەڵام لە راستیدا هۆکاری دیکە هەبوون ئینگلتەرا لە ١٧٩٣ دژی فەرەنسا بجەنگێ.

گرنگترین ئەم هۆکارانە پەلامارەکەی فەرەنسا بو بۆ زەوییەنزمەکان لە دوای سەرکەوتنی لە جەنگی ڤالمی و دواتریش لە شەڕی جیماب دژ بە نەمسا بەسەریدا سەردەکەێ و بروکسل وئەنتڤێرپن داگیر دەکا، رووباری ( شلد ) بەروی بازرگانانەوە ئازاد دەکا ئەمەش ئینگلیزەکان بە مەترسییان دەزانی لەسەر بازرگانی خۆیان، وێڕای ئەمانە ئینگلیز چاوی لە داگیرکردنی هەندێک لە دوورگەی فەرەنسی هەبوو لە دورگەی رۆژئاوای هندی.

بەریەککەوتنی بەرژەوەندییەکانی بازرگانی لە هۆکارە سەرەکییەکانی شەڕی نێوان ئینگلیز و فەرەنسا بوو، بونی فەرەنسا لە بەلژیک بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز دەخاتە مەترسی و لە هەر ئانو ساتێکا هێرشی دەکردە سەر هۆڵەندا ، ئەوکات هەر بە راستی فەرەنسیەکان چاویان لە دەستگرتن بەسەر بانکی ئەمستردامدا هەبوو چونکە بۆ ئەوان داهاتێکی باشی دەبوو.

دیارە ئینگلیزەکان توانای هێرشی مەزنی وشکانیان نەبوو لە کشوەرەکانی دیکە دەبوایە پشت بە هاوپەیمانانی ببەستێ بۆ ئەو شەڕانەی کە مەبەستیەتی لە وشکانیی کشوەرەکانی دیکە ئەنجام بدا . بۆیە هاوپەیمانێتیەکی لە دوژمنانی فەرەنسا پێکهێنا لوانەی بە لەناوبدرنی لویسی شانزەهەم نیگەران ببون کە ئیسپانیا یەکێک دەبێ لەو هاوپەیمانانەی ،دوای ئەوە دەولەتۆکەکەنای ئیتالی ( تسکانیاو بوندقیە ( ڤینیسیا ) و پاپاخوازەکان و پادشانشینی سافوای و ناپۆلی هاتنە ناو شەڕەکە لە تەک ئینگلیز و بوونە هاوپەیمان لەگەڵیاندا. بەم شێوە دەولەتانی ئەوروپا هەریەک لە نەمسا و ئینگلتەرا و پرووسیا تەنها سوێد و نەرویژ نەبن هەمویان کەوتنە حالەتی جەنگ لەگەڵ فەرەنسا، بەهۆی ئەم هاوپەیمانێتیەوە فەرەنسا زیاتر لەیەک لایەنی لێ کەوتە مەترسی و گەمارۆدان، ئەمە پێی دەوترا هاوپەیمانی ئەوروپیی یەکەم، لە مارسی ١٧٩٣ بەسترا.

ئەم دۆخە مەترسیدارەی نێودەولەتی کاری لە سەرکردەکانی شۆڕش نەکرد، بەڵکو بە دەرفەتیان دەزانی تا بۆ دونیای بسەلمینن کە فەرەنسا خاوەنی پەیامێکی شارستانیی مەزنە و بانگخواز و پالپشتنی گەلانە بۆ رزگاربون لە ستەمی پادشاکان، سوپاکەشی تەنها لە خز

مەت گەلی فرەنسیدا نابێ بەڵکو لە خزمەت هەموو ئەوگەلانەدا دەبێ کە نیازیانە رزگاربن. ئەم بانگەواز و دروشمانە بونە مایەی ئەوەی هەموو پادشاکانی ئەوروپا ئەگەر ناکۆکیشیان لە نێو خۆیاندا هەبێ بەڵام دەبێ لە دژی فرەنسا یەکگرن.



Charles Francois Dumouriez

پێشڕەوییەکانی سوپای فرەنسی لە زەویەنزمەکانی نەمسایی ( بەلژیکا ) لەلایەن هاوڵاتیانیەوە پێشوازیەکی گەرماین لێکرا چونکە لە ستەم و زۆرداری پادشای نەمسا رزگاریان ببو، ئەوەندە نابا حوکمڕانی فرەنسی لەدەست ئازارەکانی هاوڵاتیانی توشی راچلەکین دێت، زۆرینەی گەلی فرەنسی کاسۆلیک مەزهەب بوون، حوکمی فرەنسیش تەنگی بە پیاوانی ئاینی هەلچنیبوو، هەر لەو سەروبەندانەدا فرەنسا پارەی کاخەزی خۆی بەسەر ئەو وڵاتەدا سەپاند و ، ئەمەش کاریگەریەکی نەرێنیی کردە سەر ئابورییان، فرەنسا دەگاتە لوتکەی حوکمڕانی کاتێک کەمینەی بەلژیکییەکان هەندێک دۆکۆمێنت پێشکەش دەکەن، لەسەر ئەو بنەمایە بەلژیکا لەگەڵ فرەنسا یەکدەخرێ. دۆخەکانی بەلژیکا سەقامگیر نەبون لە شوباتی ١٧٩٣ فەرمان بە دومۆریز درا هێرش بەرێتە سەر هۆڵەندا . دۆخی سوپای فرەنسی ئەوەندە چەسپا و نەبوو لە ئاست سوپاکەی دوژمنانی سەرکەوێ چونکە سوپای هۆلەندی رێکخرابوو و لە ئامادە باشیدابوو، هەروەها سوپای نەمسا کە لەژێر فەرماندەی (کوبورگ) دا بوو. لە ئاداری ١٧٩٣ پەلاماری سوپای فرەنسی دەدا و شکستی پێدێنێ، دوای ئەوە لە هەموو بەلژیکا وەدەری دەنێن، لە شەڕەکانی نرڤیندن Nervinden لە ١٨ ئادار بە تەواوەتی سوپای فرەنسی راودەنێن.

ئەمجارەیان دومۆریز ویستی لە دژی شۆڕشی فرەنسی شکستەکانی لەگەڵ کوبورگ لە رێگەی دانوستان داپۆشێ، ویستی لە فرەنسا هەلگەرێتەوە بە سوپاکەیەوە هێرش بکاتە سەر پاریس و کۆنگرەی نیشتمانی لەناوببا و رژێمی پادشایەتی و شازادەی شارتەر کوری فلیپ وەکو سازشێک بگێرێتەوە سەر تەختی پادشایەتی بەڵام سەربازەکانی پێ رازی ناکری

و: خالید هەرکی

بەم ئەرکە هەلسن بۆیە خۆی و شازادە شارتەر لە ٥ی نیسان ١٧٩٣ لە نێویاندا رادەکاتە دەرەوەی فرەنسا.

لە بەرانبەر ئەم شکستانەی سەربازیی مەترسیدار و ناپاکیە مەزنەی کەسایەتیەکی ناوداری وەکو دومۆریی کە فەرماندەیی سوپای فرەنسیی دەکرد، هەروەها لە بەرانبەر ئەو قەیرانەی دژەشۆرش لە هەرێمی لافاندییە دروستی کردبوو، دەبوایە گۆرانکاریەکی ریشەیی لە بەرێوە بردنی دەسەلات و سیاسەتی ولات ئەنجام بدرێ، ئەم گۆرانکاریانەش ئەم بوارانەی گرتەوە:

١/ چڕ کردنەوەی دەسەلاتەکان لە دەستەیەکی جێبەجێکار بە دەسەلاتێکی زۆرەوە.

٢/ رووخاندنی جیرۆند.

٣/ لەناوبردنی شۆرشە خۆجێییەکان.

بێگومان سیاسەتی جەختکردنەوەی حوکمڕان و دامەزارندنی حکومەتێکی بەهێزی خاوەن دەسەلات واتە گەرانەوە بۆ سەردەمی پادشایەتی، لەراستیدا کۆنگرەی نیشتمانی هەبوو بەلام ئەو بوارەی پێنەدەدرا دەسەلاتەکانی جێبەجێ بکا و رۆلی خۆی ببینێ تا ئەوکاتەی روبسبیر لە ١٧٩٤ لە حوکم نامێنێ، ئەگینا لەو ماوە کۆنگرەی نیشتمانی هەموو هەولەکانی ستنە گەرێۆئەوەی دەسەلاتەکانی جێبەجێ بکا بەلام بواری نەدراوە، چونکە لە ١٧٩٣ وە کۆنگرەی نیشتمانی لەژێر هەژمونی یاکوبییەکاندا بووە، ناچاریش کراوە گەلیک یاسای لە بەرژەوەندی ئەواندا دەرکەن.

لە مانگی ئادار کۆنگرەی نیشتمانی رەزامەندیی لەسەر دامەزارندنی دادگای تێهەڵچوونەوە دا، بریارەکانی ئەو دادگایە تێهەلچونەوەی لەسەر نەدەکرایەوە. ئەم دادگایەش بۆ ئەوانە بوو کە بە تۆمەتی ناپاکی و دژایەتی شۆرش و تێکانی ئاسایشی ناوەخۆو دەرەوە دامەزرابوو، لە یەکی نیسانی ١٧٩٣ ( لیژنەی ئاسودەیی گشتی ) Comittee of Public Security دامەزرا و دانتون بەشداریی تێدا کرد، بەهۆی بەشداریی ئەوەوە دەسەلاتێکی بەهێزی دەبێ، ئەم لیژنە ماوەی دوو ساڵ حوکمی فرەنسای کرد. لە نۆ کەس پێکهاتبوو کە ئەندامی کۆنگرەی نیشتمانی بوون، داراییەکی باشیان لەبەر دەستدا بوو، بریارەکانی خێراو کاریگەر بوون ، کاری ئەم لیژنە چاودێری وەزارەتەکان و بەدواداچوون بوو، کاتێکیش دانتون لەم لیژنە دەردەچێ روبسبیری شۆرشگێر لە شوێن ئەو دادەنرێ.




دامەزارنـدنی ( لیـژنەی ئاسـوودەیی گشـتی ) مانای ئەوەیە دەسـەڵاتی بـاڵای وڵات، بڕیارەکـانی راگەیانـدن شـەڕ و ئاشـتی لە نێـوان جیرۆنـدی و یاکوبییەکاندا بـۆتە کێشە، هەردووکیـان هەوڵیـان دەدا ناوەڕاســـت بـــۆ لای خۆیـــان کێشـــەکەن، یاکوبییەکـان بەوەیـان دەنازانـد کە پێکهـاتەیەکی یەکگرتـوی چـالاکن پەیوەنـدیان لەگەڵ جەمـاوەر بەهێـز و پـتەوە دەسـتی بالایـان لە ئـالوگۆڕی حوکمڕانـدا هەیە، رۆڵـی سـەرەکیان لە شۆڕشـی فرەنسی گێڕا.

رۆبســبیر کـاریگەری زۆری لەســەر خەڵــک هەبـوو لە هانـدانیان بـۆ دژایەتـی کردنـی جیرۆنـدیەکان گـوایە ئەوان هۆکـاری شکسـتەکانی سوپای فرەنسی بوون لە زەوییەنزمەکان، دواتر هاوپەیمانیتی لە نێوان دانتون و روبسبیر بۆ دژایەتی جیرۆندی زۆر بەهێز بوو.

ئاسـایی بـوو جیرۆنـدی Girondi هاوپەیمـانی لەگەڵ هەمـوو نـاحەز و رکـابەرانی یاکوبی Jacobi ببەستێ بێ گوێدانە ناکۆکییەکانیان، لەسەر ئەم بنەمـایە نزیکبـوونەوە لە نێـــوان جیرۆنـــدیی کۆمـــاری و ئۆرســـتوکراتەکان لە هەرێـــم رویـــدا، بەم هاوپەیمـــانێتیە جیرۆندییەکان سواری ئەسپی دۆڕاو بوون.

کارەکان پەرەیان سەند گەیشتنە ئەو ئاسـتەی رووبەڕوو بـوونەوە لە نێـوان جیرۆنـدی و یاکوبی روو بدا، جیرۆندیەکان سوربون لەسەر روخاندنی شارەوانی پاریس چونکە بە مۆلگەی یاکوبییەکانیان دەزانی، بەڵام ئەو شـێوازەی گرتیـانە بەر بـۆ ئەم مەبەسـتە لە سەرلێشـێواوی سیاسی دەچوو، جیرۆند لەوە بەئاگا بوون کە جەماوەری پاریس بەدەست یاکوبییەکانەوەیە، ئەگەر بیانەوەی بەسەر یاکوبییەکاندا زاڵ بن دەبێ جولەی جەماوەری پاریس پەکخەن، بەڵام شێوازێکی هەلەیان گرتنە بەر بۆ ئەم ئامانجەیان، یەکێک لە ناحەزە سەرسەختەکانی یاکوبی بەناوی (ئەسنار ) لە جیات گفتوگۆکردن لەگەڵ جەماوەری پاریس، هەڕەشـەی لەنـاوبردنی لە جەماوەری پاریس دەکرد ئەگەر بەدوای یاکوبیەکان بکەون، جەماوەری پـاریس وێنەیەکـی دیکەی برنزویکیـان لە ( ئەسـنار )دا دەبینـی، پێشـتر ئەویـش هەمـان هەڕەشـەی لە پـاریس دەکرد.

ئەم هەرەشە سەرلێشێواویە و هەڵوێستەكانی جیرۆند لەسەر بەرگریكردن لە پادشا و پاراستنی، راگەیاندنی شەڕی دۆراو و پەیوەندیە شەرمەزار و ناپاكییەكانیان لەگەڵ دوژمنانی فەرەنسا و هاوكاریان لەگەڵ ئرستوكراتەكان لەم پێناوە هەموویان بوونە چەكێكی بەهێز لە دەستی یاكوبیەكانی دوژمنیان. لەهەمان كاتدا بوونە وێنەیەكی ناشیرنی ئەوان لەبەر چاوی پاریسیەكان، لێشاوی جەماوەری پاریس بە هێزەوە بەرەو یانەی یاكوبییەكان دەچون كە بەناوی ئەوانەوە دەدوا و لە دژی بۆرژوا بەرگرییان لێیان دەكرد، كاتێك جیرۆند دەستی بە كردەی توندو تیژی كرد لە دژی یاكوبییەكان . رۆبسپێر هێرشی كردە سەریان و جەماوەری پاریسیش بارەگای كۆنگرەی نیشتمانیی گەمارۆدا، یاكوبیەكان هەندێك داواكاری كۆمەلایەتی و سیاسیان پێشكەش كردن بۆ دورخستنەوەی جیرۆند و سووككردنی باری قورسی هاولاتیان و بژێویان و مسۆگەر كردنی ژیانی پیر و پەككەوتە و دیل و خانەوادەی شەهیدەكانی بەرگری نیشتمانی، گەمارۆی سەر كۆنگرەی نیشتمانی لەلایەن جەماوەری پاریسەوە لە ٣١ی ئایاری ١٧٩٣ وە بەردەوام دەبێ تا ٢ی حوزەیرانی ١٧٩٣. لە رۆژی كۆتایی دۆخەكە دەكەوێتە دەست یاكوبییەكانەوە.

پاسەوانی نیشتمانی بە تەواوەتی كۆنگرەی نیشتمانیی گەمارۆدا و ناچاری كردن بڕیارێك دژی جیرۆند دەركەن.

مانگی ئۆكتۆبەری ١٧٩٣ بە لوتكەی نائارامی و ئاژاوە دێتە ئەژمار، لەم مانگە بە سەدان كەس درانە دادگا، مافی بەرگریش لە هەموو كەس دەسەندرێتەوە كە هەندێكیان تەنها بە گومان درابونە دادگا بە تۆمەتی ناپاكی، بەلام ئەوەی گومانی تیادا نیە ژمارەیەكی زۆر لەو كەسانەی یاریان بە دوارۆژی فەرەنسا دەكرد و دەستیان لە گەندەڵی و ناپاكیدا هەبوو درانە دادگا و بە سزای رەوای خۆیان گەیشتن، لەو مانگە رەشە سەری شاژن ماری ئەنتوانێت بەر مەقسەلەی سەربرین دەكەوێ و لەناوی دەبەن، خۆی و هەندێك لە سەركردەكانی جیرۆند و شازادە فیلیپ و مەدام رولان و زانای گەردونناس بایی و ژمارەیەكی زۆر لەوانەی بە تۆمەتی ناپاكی تاوانبار كران، لە راستیدا یاكوبییەكان دژایەتی ئەوان و ناپاكی نیشتمانیان هاوشان كرد بۆیە زۆر لەوانەی سەریان پەڕێندرا بە تاوانی ناپاكی تەنها دژایەتی ئەوانیان دەكرد ناپاكیان لەگەڵ فەرەنسادا نەكردبوو.

یاكوبیەكان لە سەرووی هەموویانەوە رۆبسپێر و دانتون هێزەكانی ولاتیان ئاراستەی دوو تەوەری مەترسیدار كرد:

١/ رووبەڕوو بوونەوەی هاوپەیمانی نێودەوڵەتی.

٢/ لەناوبردنی شۆڕشەكانی ناوەخۆ لە هەرێمەكان، بەتایبەت لە لاڤاندیە و لیون و دنكرك.

سەبارەت بە لەناوبردنی شۆرشەکانی ناوەخۆ، کێشەی هەرێمی لاڤاندییە لە هەموو کێشەکان ئالۆزتر بوو. لەوێ ئەکلیرۆسی ( سەرپێچکار) زۆر بەتوندی خەڵکیان هاندەدا بۆ هەلگیرساندنی شۆرش.

هەرێم توانیی ببێتە خاوەن سوپایەکی بەتوانا، ئەوەی لەسەرەتای شۆڕش بوە یاریدەدەر بۆ سەرکەوتنەکانی هەرێم ئەوە بوو جوگرافیای هەرێم بە دارستان داپۆشرابوو کە سەخت بوو شۆرشگێرەکانی تیا بدۆزرێتەوە یا کردەیەکی سەربازیی لێ بە سەرکەوتویی ئەنجام بدرێ، بەلاّم کاتێک دەسەلاّت لەدەست یاکوبییەکان سەقامگیر دەبێ، چەند تیپێکی سوپای فرەنسی دەنێرنە سەر هەرێم، لە ئۆکتۆبەری ١٧٩٣ هێرشی توندیان دەکەنە سەر شکستی مەزن دێنن. لە سەرەتای ١٧٩٥ بەیەکجارەکی شۆڕش لە هەرێم هەرەس دێنێ و یاکوبیەکان بەسەریاندا زاڵ دەبن.

سەبارەت بە لیون، پادشاخواز و ئۆرستوکراتەکان خۆیان لەوێ قایم کردبوو، بۆیە بەرگرییەکی زۆر دەکەن گەمارۆکان کاریگەری ئەوتۆیان نابێ تا لە ئۆکتۆبەری ١٧٩٣ بە یەکجاری دەکەوێتە دەست سوپای فرەنسیەوە، بەم سەرکەوتنە سوپا دەتوانی هێرش بباتە سەر تولون. ناپۆلیۆن بۆناپەرت یەکێک بوو لەو ئەفسەرانەی ئەرکی گرتنی تۆلۆنی پێسپێردرابوو بۆئەوەی لەدەست خائین و ئینگلیزیان رزگارکا، چونکە ئینگلیزەکان کەشتیگەلی خۆیان لە بەندەرەکە دانابوو بۆ هاوکاری کردنیان، هێرشە مەزنەکە لە دیسەمبەری ١٧٩٣ دەستی پێکرد کەشتیگەلەکە خۆی رانەگرت پاشەکشەی کرد و بەندەری جێهێشت دوای ئەوەی چەند بەلەمێکی لێ نقوم کرا.

پاش چەند سەرکەوتنێک لە ناوەوە، بۆ پاککردنەوەی فرەنسا لە یاخیبووەکان هەلمەتێکی لە ناوەخۆی هەرێمەکان دەست ، ئێستا حکومەت و سوپا دەستیان خالی بوو دەتوانن تواناکانیان ئاراستەی هێزە دەرەکیەکان بکەنەوە.

لە زنجیرەیەک شەڕدا فرەنسیەکان ژمارەیەک سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، لە شەڕی واتینییە Wattignies و فلۆری Flory ، لەم سەرکەوتنانە خاکی زەویەنزمەکانیان بە تەواوەتی خستە ژێر دەستی خۆیان و بەرەو هۆڵەندا هێرشیان برد، ئەمستردام زوو کۆنترۆل دەکەن و دەست بەسەر کەشتیگەلی هۆلەندیدا دەگرن، ئەوترسەی لە بێگانە هەبوو نەما، گەلێک دەولەت و لایەن ئارەزوی کۆتایی هێنانی شەڕیان هەبوو و ئامادەی رێککەوتنێکی ئاشتیانە بوون. هەر بەدروستیش دەوڵەتان یەک لەدوای یەک لە بازنەی شەڕەکە دەچوونەدەر، پرووسیا یەکەمین دەولەت دەبێ لە گەڵ فرەنسا رێککەوتنی ئاشتی لە ١٧٩٥ بەناوی ئاشتەوایی بازل واژۆ دەکا.

هۆکاری بەستنی رێککەوتنی ئاشتەوایی پرووسیا لەگەڵ فرەنسا ئەوە بوو هیچ سودێکی لەم جەنگە بەدەست نەکەوت ئەو مەرامانەی هەیبون هیچیان نەهاتنە دی، لە جیات سود زیانی پێکەوت، دوواتر ناکۆکیەکانی نەمسا و پرووسیا لەبەر ئەوەبوون بەرژەوەندییەکانیان لەسەر کێشەی پۆلۆنیا و دابەش کردنی کە ناوە ناوە بەگژ یەکتریدا دەچوون یەکیان نەدەگرتنەوە. ئەم کێشە لە نێوان هەرسێ لایەنی نەمسا و پرووسیا و رووسیا مایەوە، هەر جارەی پرووسیا و نەمسا دەیانکردە شەڕ چاوێکیان لە رووداوەکانی کەناری فستولا دەبوو.

لەلایەکی دیکە پرووسیا بە پارە و هاوکاریەکانی ئینگلتەرا شەڕی دەکرد، ئەم حالەتە لە شەڕەکانی سەدەی هەژدەهەم زۆر دووبارە دەبوونەوە، بەڵام لە شەڕی ئەم دواییە ئامانجەکانی پرووسیا لەو شەڕەدا دیار نەبوون وەکو ئەوەی ئینگلیز سوپاکەیانی بەکرێ گرتبێ وابوو. مادام وایە بۆچی لەگەڵ فرەنسا ناکەونە رێککەوتن کە زیاد لە جارێک داوای کردوە، ئەگەر شێوازەکەشی جیا بێ؟

دانوستانەکانی نێوان فرەنسا و پرووسیا دەستیان پێکرد و کۆتاییەکەی لە ١٧٩٥ بە رێککەوتنی بازل هات، مەرجە نهێنی و ئاشکراکانی ئەم رێککەوتنە بریتی بوون لە:

١/ فرەنسا مافی ئەوەی هەبێ کەناری لای چەپی روباری راین داگیربکا تا ئەوکاتەی رێککەوتنێکی گشتی ئەنجام دەدرێ، لەقەرەبوی کەناری چەپی روباری راین پرووسیا لە خاکی ئەڵمانیا بۆی قەرەبوو بکرێتەوە.

٢/ بۆ فرەنسا قەدەغە بێ هیچ ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی لە باکووری ئەڵمانیا ئەنجام بدا، بەو مەرجەی رێککەوتنێکی نهێنی لە نێوان فرەنسا و پرووسیا لەسەر ئەو زەویانە ئەنجام بدرێ.

مێژوونووسەکان پێیان وابوو ئەم ئاشتەواییە رێککەوتنێکی پیشەیی پروسی بوو، لە پال ئەم رێککەوتنە پرووسیا هیچی دەست نەکەوت، لە راستیشدا پرووسیا پێویستیی زیاتر بە ئاشتەوایی هەبوو لەگەڵ فرەنسا لەوەی خاکی فرەنسا داگیر بکا و ئەو کێشەیەش تا هەتایی درێژەی هەبێ و ئەگەری شەڕیش هەمیشە لە ئارادا بێ، بەم شێوە پرووسیا لە چەندین لاوە ئەگەری رووبەڕوو بوونەوەی دەبێ:

لە پێناو چاوتێبڕینی لە پۆلۆنیا، هەروەها چاوتێبڕینی لە خاکی راینی فرەنسی لەگەڵ هەندێک لە میرنشینەکانی ئەلمانی.

دەرچونی پرووسیا لە جەنگ پێشەکیەک بوو بۆ دەرچونی هۆڵەندا لەو شەڕە بە رێککەوتنێک لە ئایاری ١٧٩٥ کە پەیمانی بە فرەنسا دابوو لە دژی ئینگلیز هاوپەیمانیی لەگەڵ ببەستی، لە هەمان ساڵ ولەمانگی حوزەیران ئیسپانیا لە جەنگ دەردەچێ و لە بەرژەوەندی فرەنسا دەست لە دورگەی سان دومینگۆ هەڵدەگرێ، وێڕای ئەمەش پەیمانی پێدا کە دەست لە هەندێک زەویی دیکەش هەڵگرێ.

دەنگۆی ئەم سەرکەوتنانە بۆ گەلی فرەنسی مەزن بوون، سەرکەوتن بەسەر سوپای هەموو دەولەتەکان و رێککەوتن لەگەڵیاندا مانای ئەوە دەگەیەنێ شۆڕشێ فرەنسی هێزێکە بەکەس نابەزێ و خاوەنی پەیامێکی ئازادیخوازانەی جیهانییە. لەراستیدا کەس لە مەیدانی شەڕ نەمایەوە جگە لە نەمسا و ئینگلتەرا نەبێ، دۆخی بەرەکانی شەڕ بەستەڵەکی تێکەوتبوو، دیار بوو فرەنسا هەموو شەڕەکانی بردەوە، دەبێ هۆکارەکانی چی بن لە کاتێکا سەربازەکانی لە سەرەتا بێئومێد دەیان روانی؟

هۆکاری گەوهەریی ئەم سەرکەوتنە مەزنانە ئەمانەن:

١/ هاوپەیمانان بەهۆی ئینگلیزەوە ببونە هاوپەیمان، بەڵام بێ ئەوەی نەخشەیەکی هاوبەش دژی فرەنسا بکێشن، هەردەولەتە و بە تەنیا بەپێی بەرژەوەندی و تواناکانیەوە نەخشەی دژایەتی فرەنسای دەکێشا، دواتر سوپای فرەنسی رووبەڕووی سوپایەکی یەکگرتوی هاوپەیمانان بە یەکجار نەدەبۆوە ، بەڵکو هەرجارەی لەگەڵ دەولەتێک دەجەنگا، جارێک لەگەڵ نەمسا جارێک لەگەڵ پرووسیا و جارێک لەگەڵ سردینیا وجارێکیش لەگەڵ ئیسپانیا ، هەموویان بە تەنیایی.

٢/ یەکێک لەو هۆکارانەی درێژەدانی ئەم هەڵوەشاویە ئەوەبوو کە مەزنترین هێزی هاوپەیمان هێزەکانی نەمسا و پرووسیا بوون ئەمانیش لە نێوان خۆیاندا ناتەبا بوون دەمێک بوو کێشەیان لە نێواندا هەبوو متمانەیان بە سوپای کەتری نەدەکرد.

٣/ زۆربەی قورسایی جەنگ کەوتبوە سەرشانی نەمسا و پرووسیا. ئینگلتەرا پێی خۆش بوو لە دەریا کاربکا، ئەگەر ناچار بوایە بەشداری شەڕی وشکانیی بکردبایە ئەوا بە لۆجستیک هاوکاری سوپای پروسیی دەکرد، ئەمەش کاریکی باوەڕپێکراو نیە تا درێژەی پێبدرێ.

٤/ سوپای هاوپەیمانان تا دوای سەرکەوتنەکانی ڤالمی و جیماب پێیان وابو سوپای فرەنسی لە بەرانبەر سوپای مەشقپێکراوی نەمسا و پرووسیا خۆی ناگرێ. هەندێک

زانیاریی شاش لەسەر سوپای فرەنسی لای هاوپەیمانان هەبوون بەتایبەت کە دوای ١٧٩٣ خۆی رێک خستبۆوە ئەمان بەم زانیاریانەیان نەزانیبوو پێیان وابو هیچ گۆرانێک بەسەر سوپای فرەنسیدا نەهاتووە. دواتر هەستیان کرد کە لەبەرانبەر سوپایەکی بەهێزدان نەک تەنها دەتوانێ بەرگری لە خاکی خۆی بکات بەڵکو دەتوانێ هێرش بەرێ و بچێتە ناو خاکی دوژمنانی و داگیری بکا.

٥/ لە دوای ساڵ ەکانی ١٧٩١-١٧٩٣ هەندێک ئەفسەری خاوەن بەهرە لە نێو سوپای فرەنسی دەرکەوتن و گەیشتنە پلە و پۆستی فەرماندەیی باڵا لەنێویاندا، هۆش، جوردان، بیشجرو، میرا، بۆناپەرت، ئەمانە کوڕی شۆڕش بوون بڕوایان بە ئازادی و سەربەخۆیی هەبوو لە پێناو ئاشتی و ئاسودەیی نیشتمان ئامادەییان هەبوو.

٦/ لیژنەی ئاسوودەیی گشتی بەسەر سێ بەشدا دابەش کرابوو، یەکەمیان بەرپرس بوو لە سەرپەرشتی کردنی شەڕ بە سەرۆکایەتی ( کارنوت Carnot ) ناوبراو کەسێکی وورد و زیرەک بوو لە پێکانی ئامانجەکانی و رزگار کردنی فرەنسا لە دەست دوژمنانی.

٧/ سەربازانی فرەنسی بە جۆش و خرۆش بوون پابەندی پرەنسیپەکانی سەربازی بوون لە ژێر فەرماندا بوون، ئامادە بوون لە پێناو نیشتمانیان قوربانی بدەن، ئامانجیان روون و دیار بوو، سەرجەم ئەفسەر و سەربازانی بڕوایان وابوو کە روو بەرووی هاوپەیمانێتیەک دەبنەوە چوار دوژمنی سەرسەخت لە ژێر ئەو هاوپەیمانێتیەدان لە دژی وڵاتەکەیان یەکیان گرتوە بۆیە بەرگری کردن بە ئەرکێکی پیرۆز دەزانن و خۆراگریان لە پێناو نیشتمان زیاد دەکا.

٨/ یاکوبییەکان جڵەوی کارەکانیان گرتبوە دەست و درێغیان لە لەناوبردنی هەر هۆکارێکی شکستخواردن نەدەکرد. بەهەزاران کەسیان کردە سەربان، لەم سیاسەتەیان زۆر سەرکەوتو بوون، هەرچەندە ئەمە ئەوکاتە دەکرێ کە خوێنی هەزاران کەس دەرژێ و سەریان دەپەرێندری، دەست لە کەس ناپارێزن کە گومانی ناپاکی نیشتمانیی لێ بکەن.

یاکوبییەکان بۆیە حوکمیان گرتە دەست تا فرەنسا لە شۆڕشە ناوەخۆیی و مەترسیەکانی دەرەکی رزگار کەن، ئەم ئامانجەشیان بە باشترین شێوە بەجێ گەیاند، هەر ئەم یاکوبیانە لەکاتی رووبەڕوو بوونەوەیان لەگەڵ جیرۆند لەسەر ئەم ئامانجە ناکۆکیان هەبو بەڵام گۆڕانکاری لە سیاسەتەدارەکان روویدا، بەنمونە دانتون کە زۆر توند بوو لەسەر جیروندیەکان، داوای هێورکردنەوە و ئاسودە بونی دۆخەکانی دەکرد بۆ ئەوەی هاوڵاتیان لە

توندو تیژی دور کەونەوە و لە کاری کوشتن و تیرۆر واز بێنن، لە کاتێکا کاری تیرۆر ببوە کارێکی ئاسایی رۆژانە لە رێگەی دادگاییە خێراکانی دادگای شۆڕشەوە ( دادگای ئاورتە) و کۆتاییەکەی بە سەربڕین دەهات. لە مەزنترین رێکخەرانی بزووتنەوەی تیرۆر ئەوکا هیبیر و شومت بون ئەندامانی (لیژنەی ئاسودەیی گشتی).

لە بواری ئیدارەی خۆجێیی ئاراستە و بۆچونی باشیان هەبوو. بەڵام فاولی فەلسەفیشیان هەبوون، لەم فاولانە ( ئەقل پەرستی ) کە کرابوە ئەلتەرناتیفی کاسۆلیکی. روبسبپیر ئەم فاولانەی بە دەرفەت دەزانی بۆئەوەی بەسەر ناحەزانیدا لە نێو کۆمۆنەی پاریسدا زاڵ بێ. رۆبسپێر زۆر خۆی لە دۆستی دانتون نزیک کردەوە بۆ رووبەڕوو بوونەوەی گەشەکردنی شومیت و هیبیر تا هەردوکیانی گەیاندە سەر پەتی سێدارە و سەری پەڕاندن. دۆخەکان بەم شێوە بوون دۆستەکان لە ژێرەوە ناحەزن خۆیان لە یەکتری نزیک دەکردەوە تا لەناویان دەبردن، هەریەکەو راو بۆچونی خۆی بەسەر ئەویتردا دەسەپاند، کاتێکیش دەستی بەسەردا دەشکا لەناوی دەبرد.

ناکۆکی لە نێوان رۆبسپێر و دانتون لەسەر شێوازی کارکردندا هەبوو، دانتون ئارەزوی ئارامی و ئاسودەیی هەبوو لە بانگخوازانی راگرتنی خوێن رشتن بوو، بەڵام جیاوازی و ناکۆکی لەسەر شێوازی کارکردن لەم ئاستە ناوەستێ مانای ئەوەیە پیلانگێڕی دەکرێ لەلایەن دانتۆنەوە لەسەر رۆبسپێر. رۆبسپێر بە خێرا دەستی خۆی وەشاند، لە ٣١ی مارس دانتون دەسگیر دەکا و بەرەو قەنارەی سەرپەڕاندنی دەبا، ئێستا روبسپێر خۆی گەورەی هەڵوێستەکانە، داوای پەرستنی ( بونەوەری مەزن)ی کرد لە جیاتی ( پەرستنی ئەقل ) ، خۆی کردە مەنزترین بوونەوەر، دەستی بەسەر دۆخەکاندا گرت و کاری تیرۆری پەرەی سەند، ویستی خۆی بەسەر کۆنگرەی گشتیدا بسەپێنێ، ئەم هەنگاوەش مانای کۆتایی خۆی دێت.

رۆبسپێر بەناوی گەل دەدوا و داوای خزمەتگوزاریی بۆ سەرجەم چینەکانی گەل دەکرد، نەک تەنها بۆ چینی بۆرژوا، ویستی بە گوتارێک لەناو کۆنگرەی نیشتمانی قونبلەیەک بتەقێنێتەوە، کۆلەکەی دوژمنەکانی بێنێتە هەژان، بەوە تاوانباری کردن کە لە روداوی (٨ ترومیدر ) ی ٢٦ی تەموزی ١٧٩٤ توندڕەویان بەکار هێناوە.

دوای ئەوەی لە گوتارەکەی دەبێتەوە ئامادە بوان پێیان وابو رۆبسپیر ویستوویەتی سووکایەتی بە دوژمنانی بکا بێ ئەوەی ناویان بێنێ، وای زانیوە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کۆنگرە کەوتونەتە ژێر شمشێرەکەی، بۆیە کۆنگرە بیری لەوە کردەوە ، بەر

لەوەی ئەو دەستی خۆی بوەشێنێ ئەمان کار لەسەر لەناوبردنی بکەن ، هەر لەو کۆنگرە گروپێکی دژایەتیان بۆی رێکخست و گرتیان و بەرەو هەمان چارەنووسیان برد کە زۆر لە هاوشێوەکانی چێشتبویان.

هەرکە بەسەر رۆبسپێردا زاڵ دەبن کۆنگرە کار لەسەر دژە هێزەکان و گەڕاندنەوەی شێوازی حوکم و رێکخستنەوەی و دەرکردنی دەستورێکی نوێ دەکا. واتە رووبەڕووی یاخی بونی یاکوبیەکان دەبوونەوە.

ئاسایی بوو کۆنگرەی نیشتمانی کار لەسەر لەناو بردنی بانگخوازانی ( حوکمی گەل بەدەستی گەل ) بکات یا بەمانایەکی تر بلێین نەهێشتنی مۆلگەی بورژوا گەلەریە یاکوبیەکان. ئەمەش وەکو کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی تیرۆر و چەسپاندنی دەسەڵاتی دەستورێکی بۆرژوازی بوو. بەم شێوە ئەنجومەنی شارەوانی ( کۆمۆنە ) کە بارەگا و شوێنی گردبونەوەی ئەوان بوو لەگەڵ یانەی یاکوبیەکانیان داخستن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ حوکم بەرەو راستڕەوی هەنگاو دەنێ. ئاسایی بوو لەلایەن چەپەکانەوە دژایەتیی لێبکرێ، بە تایبەتیش چەپی توندڕەو.

بەم هۆیەوە یاکوبییەکان لە ١ی نیسانی ١٧٩٥ دەستیان بە جولە و هەڵگیرساندنی شۆڕش کرد، بە ناوی بزووتنەوەی (جرمینال) ەوە ناسرا، جوولانەوەی دووەم لە ئایاری ١٧٩٥ بەناوی ( بریریال ) دەستی پێکرد و سێیەمیشیان لە ئۆکتۆبەری ١٧٩٥.

بزووتنەوەی جرمینال تێکەڵاو بوو لە یاخی بونێکی گەلەری لە دژی بەرز بوونەوەی نرخەکان و جوولەی سیاسەتمەدارە شۆڕشگێڕە یاکوبیەکان. یاکوبیەکان دوای داخستنی یانەکانیان بێدەنگ نەوەستان چونە ریز یانەی ( کۆمەلەی بەرگریکارانی مافەکانی مرۆڤ) ەوە لەگەڵ بابۆف چەپڕەوی کۆمۆنیست بونە هاوپەیمان. لەوکاتەی کۆنگرەی نیشتمانی لە دوا رۆژەکانیدا بوو ئەوان لە دژی کۆنگرەی نیشتمانی جەماوەریان هاندەدا بەڵام پێویستیان بە ئاپۆرێکی جەماوەری بوو تا بزووتنەوەیەکی بەهێز دژی کۆنگرەی نیشتمانی رێکبخەن. ئەو دەرفەتەیان بۆرەخسا کاتێک نرخی نان گران دەبێ و لە بازار نامێنی، بەم هۆکارەوە خەڵکیان هاندا جەماوەری پاریسیان هۆشیار دەکردەوە کە چەندین قوربانیان لەم پێناوە داوە کەچی بە ئاوات نەگەیشتون و بۆرژواکان شۆڕشەکەیان لێ دزیون ، ئەمە بە دید و بوچونی یاکوبییەکان و بابۆف بوو.

سەرکردەکانی بزووتنەوەکە مەبەستیان بوو ئەم گردبوونەوە بکەن بە شۆڕش بەڵام بوو بە راپەرین و خۆپیشاندان ، ئەوەندەی نەمابو بە ئامانجەکانیان بگەن کاتێک لە دەورو بەری کۆنگرەکە نزک دەبەنەوە، بەڵام ئەم خۆپیشاندانە سەرکردەیەکی رێکخراوی نەبوو بۆیە کۆنگرە دەتوانێ بە دەستێکی پۆلایین لێیان بداو بلاوەیان پێبکا. ئەم بزووتنەوە بەهۆی پاسەوانی نیشتمانیەوە لەناو بردرا کە بەباشی رێکخرابوون.

بزووتنەوەی دوەمی ئایاری ١٧٩٥ لە بریریال، جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوی پێشەخۆیدا نەبوو، برسێتی تا ئەوکات کاریگەریی لەسەر هاندانی گەل مابوو، دەولەمەندەکان هەستیان بە مەترسیی برسێتیی گەل نەدەدەکرد ئەوان کە پارە و سامانی باشیان هەبوو پێداویستیەکانی خۆیان پێ دابین دەکرد و گوێیان بە برسێتی خەڵک نەدا، بەو هۆیەوە ژمارەی مردن و خۆکوشتن بەرز دەبێتەوە تەنانەت هەندێک دەیان ووت کە سەردەمی تیرۆری فرەنسا گەلێک باشتر بوە لەوکات، هێزە سیاسیەکان ئەم هەلەیان قۆستەوە داوای دەستوری ١٧٩٣ یان کرد، بۆ جاری دووەم جەماوەر لە دەرگای کۆنگرەی نیشتمانی دەدا بەڵام ئەمجارەشیان لە چوارچێوەی خۆپیشاندان دەمێنێتەوە، دیسان بەهۆی پاسەوانی نیشتمانیەوە بلاوەیان پێدەکەن. بەم بزووتنەوە هێزی بانگخوازی حوکمی گەل بەدەستی گەل لەناو دەچێ.

بزووتنەوەی ئۆکتۆبەری ١٧٩٥ تێکەڵ بوو لە هاوکاریی نێوان یاکوبی و جیرۆندی بۆ قەدەغە کردنی چونە ژورەوەی ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانی بۆ ناو پەرلەمان، بە بیانوی ئەوەی ئەگەر ئەندامانی کۆنگرەی نیشتمانی بچنە ناو ئەنجومەنی پێنجسەد ئەندامی یا ئەنجومەنی پیران کە پێشنیار کرابوو، رێگە لە یاکوبی و جیرۆندییەکان دەگرن بچنە ناو ئەو دوو ئەنجومەنەوە. کۆنگرەی نیشتمانی مەبەستی بوو لەم پرسەدا سەرکەوێ چونکە دەستوری نوێ کە تازە دانراوە دەبوایە جێبەجێ بکرێ.

خۆپیشاندەران توانیان بەسەر زۆربەی پاریسدا زاڵ بن، کۆنگرەی نیشتمانییان گەمارۆ دا بەڵام پەنایان بۆ هەندێک ئەفسەری بلیمەت و بەتوانای وەکو بۆناپەرت و مورا ومینو برد توانیان ئەم بزووتنەوەش نەزۆک کەن، ئەم رێکارە لە تەک هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی نوێ بەپێی دەستور دوا کاری ( کۆنگرەی نیشتمانی ) دەبێ کە لە ٢٦ی نۆڤەمبەری ١٧٩٥ کۆتایی دەهات و دەبێتە ئامادە سازییەک بۆ دروست بونی ئەوەی پێی ووترا ( حکومەتی بەرێوەبردن ).

# بەشی بیست و سێیەم

## حکومەتی بەڕێوەبردن

حکومەتی بەڕێوەبردن دەکاتە ماوەی گواستنەوە لە سەردەمی ئاژاوە و نائارامی و شۆڕش و تیرۆر بۆ سەردەمی حوکمی دکتاتۆری تاکەکەسی ئیمپراتۆریەت لەسەر دەستی ناپۆلیۆن بۆناپەرت Napoleon Bonaperte.

لە هەمان کاتدا دەکاتە ماوەی گواستنەوەی حوکمرانی لە کۆتایی سەردەمی بانگخوازانی حوکمی گەل تا گەڕانەوەی حوکمی بۆرژوا، هەرچەندە ئەوکات ئەو دۆخە نەرەخسابوو بۆ ئەو جۆرە حکومەتە میلییانە کە یاکوبییەکان بانگخوازیان بۆی دەکرد.

چونکە لەوکات دەسەڵاتیشیان بەدەست بوو نەیانتوانی بیچەسپێنن تەنانەت کۆمۆنیستەکانیش کە لەسەر زاری بابوف بانگخوازیان بۆی دەکرد نەیانتوانی و کۆتاییەکەشی بە حکومەتی بەڕێوە بردن هات لە ١٧٩٧.

چونکە شێوازەکانی حوکمڕانیی رابردوو ئەو نەهامەت و کارەساتانەی بەسەر وڵاتدا هێنا، بۆیە بە پێویست زانرا هەمواری دەستور بکەنەوە بە شێوەیەک دایرێژن دەستی بۆرژوا لە حوکمی بەڕێوەبردن و ئیدارەی ئابوری بالا دەست بێ .

ئاراستەکان بەرەو هەموار کردنەوەی دەستور دەچوو، هەروای لێهات لە ١٧٩٥ دەستورێکی نوێ بە ناوی ( دەستوری ساڵی سێیەم ) دانرا، لەم دەستورە گۆڕانکاری مەزنی تیا ئەنجام درا بە بەراورد لەگەڵ دەستوری ١٧٩٣ بەتایبەتی لەسەر پێکهێنانی پەرلەمان و کۆنگرەی نیشتمانی کە لە ١٧٩٢ دامەزرابوو.

هۆکارە سەرەکییەکانی هەمواری دەستور ئەو رووداوانە بون کە لە دوای شۆڕشی فرەنسیی ١٧٨٩ روویاندان و بوونە مایەی ئالۆزی و پشێوی وڵات، سەرهەڵدانی کۆمەڵێک کێشە لە بەردەم حکومەت بەهۆی دەستوری ١٧٩٣ و سیستەمی کۆنگرەی نیشتمانیی ساڵی ١٧٩٢ کە پوختەکەی ئەمانەن:

**یەکەم/**

شۆڕشی ١٧٨٩ دژی ستەمکاری پادشایەتی بوو، ئەنجومەنی چینەکان هەولێکی زۆریدا تا ئەنجومەنێکی نوێنەرایەتی بێنێتەکا کە نوێنەرایەتی هەموو چینەکانی گەل بکا لە حوکمران و چاودێری بەرپرسان. بەڵام ئەوەندە نابا کۆمەڵەی یاسادانان لە بەرانبەر ستەم و زۆرداری سەرکردەکان چۆک دادەدا، لە میانی رووداوەکانی ناوەخۆ و دەرەوە کەسایەتیی ون دەبێ تا کارەکان بەوە دەگەن لەسەر دەستی رۆبسپێر حوکمڕانیەکی ستەمکاری دەبردرێ بەڕێوە، ئیتر تواناکانی کۆنگرەی نیشتمانی لاواز دەبن لە بەرانبەر دەسەڵاتەکانی (لیژنەی ئاسودەیی گشتی) تا ئەوکاتەی کۆنگرەی نیشتمانی دوای لەناوبردنی رۆبسپێر دەتوانێ دەسەڵاتەکانی وەرگرێتەوە. ئەمە لە هزری دانەرانی دەستوری ساڵی سێیەمدا بوو، مەبەستیان نەبوو ئەمە دووبارە بێتەوە، بڕیاریان دابوو دەرفەت بۆ دکتاتۆرێکی دیکە نەرەخسێنن بەم شێوە رەفتار بکا و حوکمڕانێکی خوێناوی بیات بەڕێوە.

لە دەرکەوتنی حوکمێکی لەم جۆرە دکتاتۆر گەلی پاریس و بانگخوازانی حوکمی گەل لێی بەرپرسیارن نەک حوکمی بۆرژوا. ئەم ململانێ ئایدیۆلۆژیانە بوو سەرکردەکانی گەلی بەرەو دەسەڵاتێکی ئاورتە برد بۆئەوەی گورزێکی توند لە بۆرژوا بدەن کە لە سەرەتاوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان سەرکردایەتی شۆڕشیان دەکرد و خۆیان بە خاوەنی دەسەڵات دەزانی، دەستوری ١٧٩٣یان وەکو دەستورێکی بۆرژوا دانابوو. دواتر بانگخوازانی حوکمی گەل (یاکوبیەکان ) ە نە لە کۆنگرەی نیشتمانی نە لە ئەنجومەنی یاسادانان زۆرینە نەبوون، هەر دەبێ یاکوبیەکان کە ئەوانیش بۆرژوای بچوکن روو لە توندو تیژی بکەن و دەستور ببەزێنن تا بۆرژوای باڵا دەستوری ١٧٩٣ لە دژی ئەوان بەکار نەهێنن و لەناویان نەبەن، لە کاتێکا یاکوبیەکان جیرۆندی و پادشاخوازەکانیان بەناوی ( ئاسودەیی گشتی)یەوە لەناو برد. لێرەدا چەند پرسیارێک دێنە پێش:

١/ ئایا گەڵ لە توانایدایە حوکمڕانی بکا و دیموکراسیەت بە تەواوەتی پیادە بکا و (حکومەتی لە گەلەوە بۆ گەل ) بێنێتە کا، تا ئاستێکیش بیردۆزەکەی رۆسۆ لەسەر دیموکراتیی رەها جێبەجێ بکا؟

ب/ یا باشترە جەماوەر ئامادە بکا و فێریان بکا چۆن نوێنەری باش و بەتوانا بۆ حوکمڕانی هەڵدەبژێرن؟

دووەم/

جەماوەری پاریس هێزێک بوو خۆی بەسەر كۆمەڵەی یاسادانان و كۆنگرەی نیشتمانیدا سەپاند بوو، ( پاسەوانی نیشتمانی ) و سوپا ببوە قەلغانی پاراستنی بۆرژوا و هێزی بەرگریكار لە بەرژەوەندیەكانیان، هەرچی جەماوەری پاریس و هەژار و برسییەكانیش بون بونە قەلغانی یاكوبیەكان، بۆ گەیشتن بە دەسەڵات دەبوایە یەكێكیان كەلبەی ئەویتریان بشكێنێ.. لە ماوەی نێوانی ئۆكتۆبەری ۱۷۹۱ تا ۱۷۹٤ هێزی جەماوەری پاریس گەیشتبووە لووتكە، دوای لەناوچوونی رۆبسپێر جەماوەری پاریس كەوتە شەڕێكی نابەرانبەر لەگەڵ پاسەوانی نیشتمانی ( بۆرژوا )، سەرەڕای ئەمە و بەهۆی رووداوەكانی ۱۷۹۱-۱۷۹٤ دانەرانی دەستوری ۱۷۹٥ بەباشیان زانی بارەگاكانی ئەنجومەنی نوێنەرایەتیی نوێ لەبەر دەستی جەماوەری پاریس دوور خەنەوە.

سێیەم/

ئەو ئەقلیەتانەی دەستوری سێیەمیان دانابوو بایەخی ئەندامانی ( كۆنگرەی نیشتمانیان ) دەزانی٬ كە راهاتبون لەسەر رووبەڕوو بوونەوەی كێشەكانی ناوەخۆ و دەرەوە، دواتر سودی بونی ئەندامانی كۆنگرەی نیشتمانی لە ناو ئەنجومەنی نوێنەرایەتیی نوێ چارەسەریەک بوو بۆ ئەو رەخنانەی لە دانەرانی دەستوری ۱۷۹۳ دەگیران كە دەقەكەی بوونی ئەندامانی ئەنجومەنی چینەكانی نەتەوە لەناو كۆمەڵەی یاسادانان قەدەغە دەكا.

چوارەم/

ئەزمونی پەرلەمانی لە یەک ئەنجومەنی ( كۆمەڵەی یاسادانان دواتریش كۆنگرەی نیشتمانی) زۆر كەسی بە توانا و پسپۆری لە بەشداری پێكردنی كارەكانی ئەنجومەنەكان یا ژیانی پەرلەمانی و دەستوری دوور خستەوە ، دواتر ئاراستەیەكی بەهێز هەبوو بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی پیران لەتەک ئەنجومەنی نوێنەران. بۆ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێكی ئەوتۆ بەم ئەنجومەنە بدرێ كە ببێتە گرفت بۆ ئەنجومەنی نوێنەران. ئەمەش نزیک بونەوەیەكی ئاشكەرایە لە سیستەمی حوكمڕانی ئینگلیزی، لەهەمان كاتیشدا هەنگاونانە بەرەوە بەهێز كردنی بۆرژوا لەنێو پەرلەمان.

**پێنجەم/**

پێشتر باسمانکرد کە هەڵبژاردنی کۆمەڵەی یاسادانان لەسەر بنەمای مافی هەڵبژاردنی سنووردار بوو. هەلبژاردنی ( کۆنگرەی نیشتمانی ) لەسەر بنەمای دەنگدانی گشتی بوو. هەلبژاردنی سنووردار حوکمی بۆرژوای پەرلەمانی دەستەبەر دەکا، هەڵبژاردن لەسەر بنەمای دەنگدانی گشتی حوکمی گەل دەستەبەر دەکا، دەبوایە دانەرانی دەستوری ١٧٩٥ یەکێک لەم دوو سیستەمە هەڵبژێرن:

١/ دەبوایە دەنگدەر یا لەو کەسانە بێ کە باج دەداتە دەوڵەت یا مولکدار بێ. لە مافی هەڵبژاردن بێبەش دەبێ ئەوەی باج نەدا وخاوەنی زەوی وزار نەبێ بەم شێوەش زۆرینە دوور دەخرێتەوە لە مافی دەنگدانی پیرۆز .

ب/ بڕیاردان لەسەر دەنگدانی گشتی بۆئەوەی خاوەن توانا و پسپۆڕەکان بێنە هەڵبژاردن بۆحوکمرانی وڵات .

ئەمە ئەو ئاراستانە بوون کە بەسەر دانەرانی دەستوری سێیەمدا زاڵ بوون. دیارە کۆنگرەی نیشتمانی بوو ئەو دەسەڵاتە دکتاتۆریەی لەناوبرد کە بەناوی (حوکمی گەل بۆ گەل ) پیادە دەکرا. بۆیە دەبوایە دەستوری ١٧٩٥ لەسەر دیاردەی حوکمڕانی بۆرژوا چڕ بێتەوە، ئەمەش دیارترین ئاراستەکانی بۆرژوا بوون:

ا/ دانانای پەرلەمانێکی دوو ئەنجومەنی یەکێکیان بەناوی ئەنجومەنی پێنجسەدی بێ، تەمەنی ئەندامانی کەمتر نەبێ لە ٣٠ ساڵ. هەر ساڵێک سێیەکی ئەم ئەندامانە بگۆڕدرێن و مافی دانانی یاسایان هەبێ. لەگەڵ دەرکردنی ئەو بڕیارانەی لە ئەنجومەنەکانی دیکەوە بۆی دێن کە ئەنجومەنی پیران دەبێ ژمارەیان لە ٢٥٠ ئەندام دەبێ تەمەنی ئەندامانی لە ٤٠ ساڵ کەمتر نەبێ، دەسەڵاتی یاسادانان تەنها لەدەست ئەم ئەنجومەنە دەبێ.

ب/ ئەم پەرلەمانە نوێیە، مافی خۆیەتی لە پاریس یا لە هەر شارێکی دیکەی فرەنسا کۆببێتەوە. مەبەست لەم برگە ئەوەیە پەرلەمان لە ژێر دەستی جەماوەری پاریس دور بخرێتەوە. تا کارەساتی جیرۆندیەکان دووبارە نەبێتەوە کە ناردیانن بۆ قەنارەی سەربڕین و تا ئەوانەی هەوەستی دکتاتۆریەتیان لە گیانـدایە لە ڕێگەی جەماوەرەوە پەرلەمان ناچار نەکەن بڕیاری تایبەتی لە بەرژەوەندی خۆیانیان پێ دەرکەن.

ج/ سیستەمی هەڵبژاردنی سنوورداریان گرتەبەر کە هەموو کەسێکی بالق مافی دەنگدانی نەبێ، بەڵکو ئەو مافە تەنها بە باجدەر و خاوەن مولکەکان بدرێ. بەم یاسایە

و: خالید هەرکی

مافی دەنگدان لە نزیکەی سێ ملیۆن هاوڵاتی سەندرایەوە، واتە مافی خۆکاندید کردن و دەنگدان تەنیا بۆ بۆرژواکان بوو.

لە رووی دادوەرییەوە، کاری دادگای شۆڕش لەناو بردرا، شێوازی دادگایی تایبەتیش نەما. لە جیات ئەوە هەندێک یاسای سەردەمیان دانان کە لەگەڵ دۆخی دادوەری فرەنسا بێنەوە. بۆ ئەوەی هیچ حوکمێکی نادادپەروەرانە بەسەر کەس جێبەجی نەکرێ، هەموار کردنی یاساکانی دادوەریی دادگای شۆڕش مانای سەرەتای کۆتایی یاکوبیەکانە.

لە رووی ئیدارییەوە چاو بە بابەتی حوکمی ئیداری مەرکەزی خشێندرایەوە و مشتومڕ لەسەر حوکمی لامەرکەزی کۆتایی هات. دەسەڵاتی زیاتر بە پارێزگاکان دران تا کارەکان بە خێراتر رەها بکرێن.

سەبارەت بە پرسی دەسەڵاتی جێبەجێکردن کە پێی دەوترا ئەنجومەنی بەرێوەبردن ( حکومەتی بەرێوەبردن یا دیرکتوار ) لە پێنج ئەندام پێکدێ کە ئەنجومەنی پیران لە نێو ئەو لیستە دەست نیشانیان دەکا کە ئەنجومەنی پێنجسەدی بۆیان دەنێرێ، هەر ساڵی یەکێک لەم پێنج کەسە ئەندامێتیی لەدەست دەدرێ.

دەسەڵاتەکانی ئەم ئەنجومەنەی ئیداری بە شێوەیەک دیاری کراوە کە نەبێتە دکتاتۆریەت. دەسەڵاتی ئەوەی هەیە بانگێشتی هێزی چەکدار بکا بێ ئەوەی خۆی فەرماندەیی بکات. بەرپرسیارە لە پاراستنی ئاسایشی ناوەوە و دەرەوەی وڵات بێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی ئاورتەییان بدرێتە دەست، لیژنەکانی جێبەجێکردنیان هەڵوەشاندنەوە و لە شوێن ئەواندا شەش وەزیریان دانا کە ( ئەنجومەنی بەرێوەبردن ) دەستنیشانیان بکا بێ ئەوەی ئەنجومەنی وەزیرانیان هەبێ، ئەم وەزیرانەش راستەوخۆ لە بەرانبەر ( ئەنجومەنی بەرێوەبردن ) بەرپرسیارن.

سیستەمی حوکمڕان لە رێگەی لیژنەوە تەنها تایبەت نەبوو بە فرەنسا، ئەم شێوازە لە هەندێک دەوڵەتی دیکەش بەکار هاتوە، نزیک یا دوور، ئەوەتا لە مێژووی رۆمانیدا حوکمی کۆنسوڵەکان هەبوە، لە سویسرا ئەنجومەنی فیدراڵی هەبوو کە پێکهاتبو لە چەند کەسێک لە نێوانیاندا سەرۆکی کۆمار هەبوو، مەبەستی سەرەکی لەم جۆرە حوکمڕانیە بۆ دروست نەبونی دکتاتۆر بوە کە رای خۆی بەسەر هەموو وڵاتدا نەسەپێنی.

لە ٥ی نۆڤەمبەری ١٧٩٥ حکومەتی بەرێوەبردن بەیاننامەیەکی لەسەر بەرنامەی سیاسی خۆی دەرکرد، کورتیەکەی بەم شێوەیە:

١/ لە سیستەمی نوێدا پادشاگەرایی شوێنی نییە.

٢/ نەهێشتنی حزبایەتی و دەمارگیری.

٣/ قەدەغە کردنی هەر سیاسەتێک کە ئامانجی تۆڵە سەندنەوە و نانەوەی ئاژاوە بێت.

٤/ سەقامگیرکردنی ئارامی و ئاسوودەیی ناوەخۆ.

٥/ رووکردنە بوارەکانی ئابووری و داهێنانی زانستی و هونەری.

لە دیارترین بەرەنگاربوانی حکومەتی بەڕێوەبردن فەیلەسوفی کۆمۆنیست بابوف بوو. ئەو لە ئاسۆی (بەختەوەری گشتی)ی دەیروانیە پرسەکە، پێی وابو دەبێ ئەم دەستکەوتانە هەموو کەسێک بگرێتەوە نەک تەنها بۆرژوازییەکان، ئەمەش لە رێگەی نەهێشتنی مولکداری تایبەتی و دانانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاو و دامەزارندنی کێڵگەی بەکۆمەڵ دەکرێ. چونکە حکومەت دژی ئەم بۆچونانە بوو بۆیە بابۆف روی لە کاری نهێنی کرد دژ بە حکومەتی بەڕێوەبردن و لە پێناو بنیادنانی کۆمەڵگا لە رێگەی توندو تیژیەوە. ساڵی چوارەم لە بەهاری ١٧٩٦ دۆخی گۆڕانکاری دەرەخسێ لە کاری نهێنیەوە بۆ یاخیبوونی ئاشکەرا.

حکومەتی بەڕێوە بردن هەستی بە مەترسیەکانی ئەم رێکخستنە کرد بۆیە لە رێگەی ئەنجومەنی پەرلەمانەوە یاسایەکی دەرکرد دژی هەرهێزێک کە بە روی بەرنامەکانی حکومەت بوەستێتەوە، ئەم یاسایە سزای لەسێدارەدانی بۆ هەرکەسێک بە رەوا دادەنا ئەگەر هەوڵی گەڕاندنەوەی رژێمی پادشایەتیی لەسەر ساغ بێتەوە، یانیش دەستوری ١٧٩٣ ببوژێنێتەوە یا مولکەکان لەژێر ناوی ( چاکسازی کشتوکاڵییەوە ) دابەشکات، حکومەت لە وتوانایدایە ئەم بانگخوازە کۆمۆنیستە لە قۆناغی سەرەتاییدا لەناوبەرێ، بەو ئەگەرەوە بابۆف لە ١٧٩٧ بەرەو مەیدانی سەرپەراندن بردرا.



فرانسوا نوئیل بابۆف

هەروەهـا حکـومەت رێکـاری تونـدی لە دژی یاکوبییەکـان گـرتە بەر، تونـدڕەوەکانی لە نـاوبردن بەڵام میانڕەوەکـان لە بەڕێـوەبردنی سیاسـەتی دەولەت بەشـداریان دەکـرد، دوو لە ئەنـدامانی حکـومەتی بەڕێـوەبردن لە یاکوبیەکـان بـوون، ئەو ئەنـدامانە لە نێـو حکـومەت و پەرلەمـان کـاری سیاسـیان دەکـرد، هەر ئەم کـارکردنەش بـوو ئامادەسـازیی بـۆ روخـانی حکومەتی بەڕێوەبردن و پەرلەمان و دەستوری ساڵی سێیەم ١٧٩٥ کرد.

ئەو پێـنج کەسـەی ئەنـدام بـوون لە ئەنجـومەنی حکـومەتی بەڕێـوەبردن، کە کـاری حکومەتیان پێسپێردرابوو لە نێو خۆیاندا تەبا نەبون، گەلێک گومانیان لەسـەر بـوون لەسـەر پرسـی بەرتیـل وەرگـرتن بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا حکـومەت هەر بەردەوام دەبێ لە کارەکـانی خۆیدا، خەڵک ئەم گەندەلیانەی بەوە پێ قەبول بوو گوایە لەو کەسە مەزنانەوەن کە وڵاتیان لە دەسـت تیـرۆر وگەڕانەوەی پادشـا و پیلانەکـانی ئینگلیـز و نەمسـا رزگـار کـردوە بـۆیە چاوپۆشیان لێیان دەکرد. وێڕای ئەمانە هەمووی سوپای فرەنسی مەزنی و بەهێزیی بەخـۆوە بینیبـوو لە هەمـوو لایەکیشـەوە بـڵاوەی کردبـوو، لە نـاوجەرگەی نەمسـا بە سـەرۆکایەتی

جەنەراڵ (مورو، جوردان) لە خۆشەویستترین مولکەکانی نەمسا سوپایەکی تر دادەمەزرێ بە فەرماندەیی ناپۆلیۆن بۆناپەر بۆ داگیر کردنی ئیتاڵیا.

یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی قەیرانەکان بەگژ یەکداچون و ناکۆکیەکانی نێوان پەرلەمان و ئەنجومەنی بەڕێوەبردن بوو. هەر یەک ساڵ یەک ئەندامی ئەنجومەن دەهاتە گۆڕین کەچی پەرلەمان لە یەک ساڵدا سێیەکی ئەندامانی لە ڕێگەی هەلبژاردنەوە دەهاتنە گۆڕین، بەم هۆیەوە پێکهاتەی حزبی لە نێو ئەنجومەنی بەڕێوەبردن جیا دەبێ لەگەڵ هی پەرلەمان. لە هەلبژاردنەکانی ١٧٩٨ میانڕەوان بەسەر یاکوبیەکاندا سەردەکەون، بەڵام لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردن لانی کەم سێ ئەندامی یاکوبیەکانی تیادا بوو، ئەنجومەن دابەشی دوو لەت دەبێ یاکوبیەکان و لایەنگرانی پادشا، ئەم ناکۆکیە لەسەر پەرلەمانیش ڕەنگی دایەوە، ( کارنو ) ئەندازیاری سەرکەوتنەکانی شەڕلایەنی ڕاستی گرت بۆیە لایەنەکەی دیکە کە یاکوبیەکان بوون پێیان وابو هەلویستەکە ناسکە و ئەمجارەیان سەرناکەون بۆیە پێداگریان لەسەر مانەوەی حکومەتی بەڕێوەبردن کرد کە وەک خۆی بمێنێتەوە.

بۆناپەرد لە ئیتاڵیا سەرکەوتنی بەدەست هێنا بوو ئامادە بوو هێز بداتە حکومەتی ئیدارە لە دژی پەرلەمان، نەمساش ئاگربەستی ( لیوبن )ی ئەنجام دابوو خۆی لە ئاشتەوایی (کمپو فۆرمیو Campop Formio) دەدزیەوە، بەو هیوایەی کودەتایەکی پادشاگەرایی ئەنجام بدرێ کە لە خزمەتی حکومەتی پاریسدا بێ، بەڵام ناپۆلیۆن ئەم خەونەی لە گۆڕ دەنێ کاتێک هێزێک بە فەرماندەیی ( ئوجیرو ) بە هەر هۆیەک بێ دەنێرێتە ناو پاریس و لە ٢٧ی ئابی ١٧٩٧ کودەتاکە ئەنجام دەدا، ئەم کودەتایە بە ناوی کودەتای ( فروکتیدو ) هاتە ناسین، دوای ئەو کودەتایە ڕێکاری پێویست گیرانە بەر بۆ گونجاندنی کارەکانی حکومەتی بەڕێوەبردن لەگەڵ ناپۆلیۆن بۆ کۆنترۆل کردنی دۆخەکە، بەم شێوە یاکوبیەکان هاوکاری سوپایان کرد لە دژی پادشخوازەکان و گەڕاندنەوەی دەستوری ١٧٩٣.

لە ٥ی ئەیلولی ١٧٩٧ پەرلەمان ڕەزامەندیی لەسەر ئەو ڕێکارە تایبەتیانە دا، (کارنۆ )یان دورخستەوە و هەلبژاردنەکانی ٤٩ پارێزگایان هەلوەشاندنەوە. ١٧٧ ئەندامی پەرلەمانیان لە ئەندامێتی پەرلەمان دورخستەوە بەم شێوە یاکوبیەکان بوونە زۆرینە لە نێو پەرلەمان و حکومەتی بەڕێوەبردن. لە ١٧ی ئۆکتۆبەری ١٧٩٧ ناپۆلیۆن توانیی لە ئیتاڵیا پەیماننامەی ( کەمپوفورمیو Campo Formio ) بسەپێنێ، بەڵام لە دوای ئەوە دۆخەکان دەگۆڕدرێن، لە ١٧٩٨ ناپۆلیۆن وەکو فەرماندەی لەشکرێکی فەرەنسی دەچێتە

میسر، ئەوەنـدە نابـا لە ئـابی ١٧٩٨ بەهـۆی تێکشـکاندنی کەشـتیگەلی فرەنسـی لەلایەن ئینگلیزەوە ناپۆلیۆن و سوپاکەی لە میسر گەمارۆ دەدرێن و دەگیرسێنەوە. ، دواتر دەوڵەتی عوسمانی ورووسیا و ناپۆلی و نەمسا و لەگەڵ ئینگلیز هاوپەیمانێتیەکی نوێ دادەمەزرێنن ( هاوپەیمـانی نێـودەولەتیی دووەم ) دژی فرەنسـا ، سـوپای فرەنسـا لە بەرانـبەر سـوپای هاوپەیمانان پاشەکشە دەکا.

کاتێکیش حکومەتی ئیدارە ویستی هەندێک ئەندامی پەرلەمـان کە دژیـان بـون دووریـان خاتەوە، پەرلەمان بە توندی دژیان وەستایەوە، دیارە حکومەتی بەرێوەبردن بەو شکستانەی سوپای فرەنسی شکۆ و دەسـەڵاتی لەدەسـت دەدا، بۆیە پەرلەمـان هەول دەدا ئەم دەرفەتە بقـۆزێتەوە لەم ئـان و سـاتەدا بتـوانێ هێـز بخـاتەوە بەر پەرلەمـان و بڕیارەکـانی بەسـەر حکـومەتی بەرێوەبردنـدا بسـەپێنێ، پەرلەمـان لەم هەوڵەیـدا سـەردەکەوێ (ئەنجـومەنی بەرێوەبردن ) دووبارە پێکهێنرایەوە لە ( سییز و بارا و دیکو و مولان و جوهییە).

بەڵام دۆخەکان ئارام نابنەوە، یاکوبیەکان سودیان لە ئازادکردنی رۆژنـامەگەری وەرگـرت دەسـتیان کـرد بە پرۆپاگەنـدە، یاکوبیەکـانی تولـوز لە شـارەکەی خۆیـان مانیـانگرت لە جارونیای سەروو پادشاخوازەکانیش یاخی بـوون، لە دەرەوە شکسـتەکانی سـوپای فرەنسـی یەک لە دوای یەک دەهـاتن، تەنـانەت دەسـتەواژەی ( نیشـتمان لە مەترسـیدایە ) دووبـارە هاتەوە سەر زبان.

ئا لەم دۆخانەدا بوو لە ئابی ١٧٩٩ ناپۆلیۆن دەگەڕێـتەوە پـاریس، ئەوکـات جەمـاوەری فرەنسـا بەدوای فریادرەسـێکدا دەگەڕان، رۆژنامەکـان زۆریـان بە شـان و بـاڵی ناپۆلیۆنـدا هەڵدەگوت، کارەکانیان دەهێنانەوە بەرچاو، هەر ئەو نەبوو ئاشتەوایی کمپو فورمیوی بەسەر نەمسادا سەپاند؟ لە گەلێک شـوێن ئەو دەنگۆیە هەبـوو کە حکـومەتێکی بەهێـز دادەمەزرێ بتوانێ رووبەڕووی ئەم هەلوێست و دۆخـانە بێـتەوە. دواجـار هەردەبـێ بە دەسـتوری سـاڵی سێیەمدا بچنەوە. کە دژایەتیەکی زۆر هەبوو بۆ ئەم پێداچونەوە، بە پشت بەسـتن بە سـوپا ( سییز ) بە کودەتایەک هەڵدەستێ.

سـییز بەدوای جەنەراڵێکـدا دەگەرا فەرمانـدەیی ئەم ئەرکەی پـێ بسـپێرێ، ئەم خەسلەتانەی لە ناپۆلیۆن بینیەوە هەردوکیان : نـاپۆلیۆن بونـاپەرت و سـییز شـەوو رۆژیـان بەسـەر یەکنـا بـۆ ئامادەکاری کودەتـا، لەم هەولەیانـدا تـالیران هاوکـاریی کـردن، لوسـیان بوناپەرتی برای ناپۆلیۆن بۆناپەرت وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی پێنجسەدی دەست نیشـانکرد، توانرا رەزامەندی سەرۆکی ئەنجومەنی پیران وەربگیرێ.

لایەنەکانی کودەتا دەستیان بە بلاوکردنەوەی پرۆپاگەندە بە هەموو لایەکەوە کرد تا هەموو چین و توێژێک پرسی هەموار کردنەوەی دەستور بە ئاسایی وەرگرن. بە بۆرژوازەکان راگەیەندرا کە مەترسی لەلایەن چەپە توندڕەوەکانەوە هەیە کاری تێکدان و ئاژاوە ئەنجام بدەن، بیرۆکەی ئاشتی و هەمواری دەستوریان بەیەکەوە بەستەوە.

نەخشەکانی ناپۆلیۆن بۆ ئەم کودەتایە لەسەر ئەوە چر کرایەوە کە خوێن نەرژێ. ناپۆلیۆن مەبەستی بوو لە رێگەی مافی دەستوریەوە بگاتە دەسەڵات نەک بەرێگای توندو تیژی، کارەکان بەپێی نەخشەکە بەرێوە دەچو

فەرماندەیی پاریسیان بە ناپۆلیۆن سپارد، هەریەک لە سییز و دیکو و بارا دەستیان لە ئەندامێتی ئەنجومەنی بەرێوەبردنی حکومەت کێشایەوە، بەو ئومێدەی دوو ئەندامەکانی دیکەش هەمان شت بکەن، بەڵام کە ئامادە نەبون دەست لەکار بکێشنەوە ، سەرۆکی کودەتاکە دەستگیری کردن. دواتر کۆبونەوەی پەرلەمانیان گواستەوە ( سان کلو) کە دەکەوێتە لێواری پاریس، لەوێ ناپۆلیۆن بەرنامەی خۆی بۆیان خستە روو، ناپۆلیۆن گوتارێکی خوێندەوە بەڵکوو ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران و پیران رازی بکا بەڵام وا نەهات، دژی وەستانەوە و ئەم هەولەیان بە دووبارە بوونەوەی (کرومویل ێ نوێ) ناوزەد کرد ناپۆلیۆنیان بەو دە شوبهاند. ئەم هەلوێستە ناپۆلیۆنی ناچار کرد هێز بەکار بێنێ، ئەندامە نارازیەکانی لە ئەنجومەن دەرکرد ئەوانی دیکە کە لایەنگری هەمواری دەستور و سپاردنی حکومەت بەدەستی هەریەک لە ( بوناپەرت و سییز ودیکو) بوون دەنگیان بۆ پێشنیارەکە دا، بە کودەتای (پرومییر) کۆتایی بە سەردەمی شۆڕشی فرەنسی دێت و سەردەمی ناپۆلیۆن بۆناپەرت وەکو کونسول دەست پێدەکا، دوای ئەوە کونسولی یەکەم و دواتریش لە ئۆکتۆبەری ١٧٩٩ تا ١٨١٤/١٨١٥ ئیمپراتۆر .

# بەشی بیست و چوارەم

## ناپۆلیۆن بۆناپارت Napoleon Bonaparte

## لە سەرەتای دەرکەوتنییەوە تا پلەی کۆنسوڵی




ناپلیۆن




هاوسەرەکەی

ناپۆلیۆن بۆناپەرت یەکێکە لەو بلیمەتانەی دونیا کە دەستی لە هەموو بوارەکانی سەربازی و سیاسی و ئیداری و هیتردا هەبوو. بەڵام ناوبانگی سەربازیی وایکردوە بێتە ناسین، هەر بە هەلکەوت لە ( ئەجاکسیو ) لە دورگەی کورسیکا لە ساڵی ١٧٦٩ لەدایک دەبێ، واتە هەر دوای یەک ساڵ لە یەکخستنی ئەم دوورگەیە بە فرەنساوە. خانەوادەی ناپۆلیۆن هەرچەندە مولکدارێکی بچوک بوون بەڵام خاوەن پێگەی خۆیان بوون، باوکیان لەسەر بنەمای هاوچەرخ بایەخی بە پێگەیاندنی منداڵەکانی دەدا، نوسینەکانی رۆسوی دەخوێندەوە ( گرێبەستی کۆمەڵایەتی)، سۆزی بۆ هزری کۆماریی شۆرشگێڕ دەچوو، لە ساڵی ١٧٩٣ بەدواوە ناوی بۆناپەرت کەوتە سەر شانۆی رووداوەکان.

بۆناپەرت لەو ئەفسەرانە بوو کە لە ساڵی ١٧٩٣ بەشداریان لە رزگار کردنی تولوندا کرد و لە ژێر چنگی ئینگلیزیان دەرهێنا، دەگوترا کە لەو شەڕ ئازاتیەکی کەم وێنەی نواندوە، ئەوکاتە زیاتر ناو دەردەکا کە لە ئەیلولی ١٧٩٥ لە دژی هێرشی شۆرشگێران بەرگریی لە کۆنگرەی نیشتمانی کرد، بەڵام ئەستێرەی بەهۆی دوو رووداوی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەدرەوشێتەوە.

وا رویدابوو چاوی بە ( جوزفین دی بوهارنیەی بێوەژنی کونت دی بوهارنیە ) دەکەوێ ئەوەی قەنارەی شۆرش سەری پەڕاندبوو. ئەو ژنە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی تایبەتیی هەبوو لە هاوشێوەی ئەو خانمانە بوو کە خاوەن هۆڵ بوون لە سەردەمی شۆرش، دەبێ ناپۆلیۆن نرخی ئەو خانمەی زانیبێ بۆیە هاوسەرگیریی لەگەڵدا ئەنجام داوە، بەڵام تا ئێستا پرسیارێک هەیە بێ وەڵامە، ئایا ناپۆلیۆن ئاگاداری ئەو پەیوەندیەی نێوان جوزفین و برادەرەکەی بارا بوو؟ ئەو پەیوەندی لە شێوەی پەیوەندییەکانی ئەو سەردەم بوو.

هۆکاری دووەمی سەرکەوتن و ناودەرکردنی ناپۆلیۆن بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە حکومەتی بەرێوەبردن سوور بوو لەسەر گرتنەبەری سیاسەتێکی نوێی دوژمنکارانە بەرانبەر ئەوو دوو دوژمنەی لە مەیدانی شەڕ مابوونەوە ئەمانیش: نەمسا و ئینگلتەرا بوون .

پێشتر باسمان کرد، پرووسیا لە رێگەی ئاشتەوایی بازلەوە لە ١٧٩٥ لە شەڕ چوەدەر. دواتر هاوپەیمانانی تریش دەردەچن، بەڵام هەریەک لە نەمسا و ئینگلتەرا سوربون لەسەر مانەوەیان و درێژەدان بە جەنگ. لای حکومەتی بەرێوەبردن بیردۆزی داگیرکردن و فراوان بوون پەرەی سەندبوو. پێی وابو داگیرکردنی بەلژیک و سافوای و ئەفینیون سنوورەکانی توندتر دەکا لەگەل رەچاو کردنی ئەوەی کە پرووسیا دەستی لە زەویەکانی کەناری لای چەپی رووباری راین هەلگرتەوە، لەم روانگەیەوە هەندێک لە عەسکەرتارەکان پێیان وابوو

داگیرکاری و بەرفراوان بون لە ناو خاکی ئەڵمانیا بەرەو ڤیەننا جگە لەوێش مولکەکانی نەمسا، ئەمانە دەبنە مایەی ئەوەی نەمسا و ئینگلتەرا ناچار بکا ئاشتەواییەکی ئابڕومەندانە لەگەڵ فرەنسا ئەنجام بدەن کە لە بەرژەوەندی فرەنسای شۆڕشدا بێ.

سوپای فرەنسی بە فەرماندەیی ( جوردان و مورو ) بە مەبەستی گرتنی ڤیەننا بەرەو ئەڵمانیا جوولەیان کرد. سوپای سێیەمی فرەنسیش کە بە فەرماندەیی ( شیرر) بوو بەرەو بیدمونت و لمبارديا رۆیشتن تاوەکو بیانکاتە بارمتە بۆ ناچار کردنی نەمسا بۆ واژۆکردنی پەیمانی ئاشتەوایی. هەر لەوکاتەدا سوپایەکی دیکە ئامادە کرا بۆ هەڕەشەکردن لە ئینگلتەرای، لە رێگەی هاوکاری کردنی شۆڕشگێرە ئیرلەندیەکان.

لە ئاداری ١٧٩٦ فەرماندەیی سوپای ئیتاڵیا لە جیات شیرر بە ناپۆلیۆن سپێردرا، لەم گۆڕانکاریە گەوهەریە کەس پێشبینیی نەبو چ وەرچەرخانێکی سیاسی و سەربەزی بەم هۆیەوە روودەدا.

ئێستا بلیمەتی ناپۆلیۆن دەرفەتی بۆ رەخسا، فەرماندەی سوپایەکی نەتەویی لە ژێردەستە کە بڕوای بە پەیامەکەی هەیە، ئامادەیە ئەوپەڕی قوربانی لە پێناو ئامانجەکەیدا بدا و فەرمانی سەرسوپاکەیان جێبەجێ بکەن. ناپۆلیۆن بە ئاستێک ریزی بۆ ئیتاڵیا هەبوو کە هاوڵاتیانی بەقەدەر ئەو ریزیان بۆی نەبوو، ناپۆلیۆن بەهای ئیتاڵیایەکی یەکگرتوی بە شێوەیەک لا گرنگ بوو کە هیچ ئیتاڵییەک ئەم بەهایەی بەقەدەر ئەو نەدەبینی، توانیی لە زۆربەی شەڕەکان سەرکەوتنی مەزن بەدەست بێنی گرنگترینیان ( مندوفی ) لە ٢١ی نیسانی ١٧٩٦ کە بوە مایەی جیاکردنەوەی سوپای بیدمونی لە نەمسا و بیدمۆندیشی ناچار کرد ئاشتەوایی شیراسکۆ ( کیراسکۆ ) لە ٢٨ی نیسانی ١٧٩٦ واژۆ بکا، دواتریش پادشای بیدمونت ( سردینیا ) لە پەیماننامەی پاریسی ١٥ی ئایاری ١٧٩٦ دەستی لە سافۆی و کونتات نیس و تاندی و بویل هەلگرت.

پاش شکست پێهێنانی سوپای بیدمونت ، لە شەڕی ( لودی ) لە ١٠ی ئایاری ١٧٩٦ شکست بە سوپای نەمساش دێنێ، دوای ئەوە وەکو رزگارکەرێک خۆی دەگەیەنێتە ناو میلان نەک وەکو داگیرکەر، ئیتر لە چەندین شەڕی دیکە بەسەر سوپای نەمسادا سەردەکەوێ، لە شەڕی ( ریفولی ) لە ١٤ی کانونی دووەمی ١٧٩٧ لەو شەڕدا قەلای ( مانتوا ) ی بەنابانگ دەگیرێ، بەو هۆیەوە نەمسا ناچار دەبێ ئاگربەستی ( لیوبن ) لە نیسانی ١٧٩٧ واژۆ دەکا. بەڵام کاتێک هەواڵەکانی ناوەخۆی فرەنسا ئەوە دەگەیەنن کە دۆخی ناوەخۆیان شلەژاوە و ئەگەری کودەتا هەیە ئیتر نەمسا لە جێبەجێ کردنی

ڕێککەوتنەکە پاشگەز یا سارد دەبێتەوە، بەڵام ناپۆلیۆن لە ڕێگەی کودەتای ( فریکتیدور )ەوە ئەم خەونەی لە گۆڕنا و نەمسای ناچارکرد لە ١٧ی ئۆکتۆبەری ١٧٩٧ واژۆ لەسەر پەیمانی ( کامپۆ فۆرمیۆ Campo Formio ) بکا، هۆکاری ئەو واژۆکردنە بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە نەمسا ئومێدەکانی کودەتای نەگەیشتە جێ و دۆخی ناوەخۆی فرەنسا ئەوە نەبوو کە مەزندە دەکرا یا بەهۆی شکستە یەک لە دوای یەکەکانی سوپای نەمساوە بێ بەڵکو ئیمپراتۆر خۆی پێویستی بە پشوویێک هەبوو تا دووبارە سوپاکەی و ئیدارەی ڕێکخاتەوە کە ماوەیەکی دوور بوو لە ١٧٩١-١٧٩٧ ئەو سوپایە هەر خەریکی شەڕ بووە.

ناپۆلیۆن بە گوێرەی تێگەیشتن و ئارەزوی خۆی رەفتاری کاری نێو دەوڵەتیی دەکرد. پێی وابوو ئەو بەرگریە توندەی سوپای نەمسا لە بەرانبەر سوپای فرەنسا کردی ڕێگر بوو لە بەجێگەیاندنی ئامانجەکانی، پێی وابو گەلی فرەنسی دوای ئەو هەموو سەرکەوتنانە پێویستیی بە وەستاندنی شەڕ هەیە.

دانوستانەکانی نێوان هەردوو لایەنی فرەنسی و نەمسایی بەڕێوەچوون تیایدا نەمسا رەزامەندیی لەسەر خالەکانی پەیمانی ( کامپۆ فورمیۆCampo Formio ) دا کە بریتی بوون لە:

١/ فرەنسا زەوییەنزمەکانی نەمسایی ( بەلژیکا ) و دوورگەی ئیونیان Ionian و کەنارەکانی دەلماشی Dalmatia وەردەگرێ.

٢/ نەمسا لە بەرانبەر وەرگرتنی ڤینیسیا ( بوندقیە ) و ئەو شوێنانەی سەر بەون، دەست لە مومتەلەکاتی لە ئیتاڵیا هەلدەگرێ.

٣/ نەمسا دان بە کۆماری سیزالپین Cisalpine ( ئەلبی باکووری ) دەنێ کە لە لمباردیا دروست بوو میلانیش دەگرێتەوە، هەریەک لە پۆلۆنیا و فرارا و رافنا و ریجیوا لەگەڵ کۆماری سیزالبین یەکدەگرن.

نەمساش دان بە کۆماری لیگوریا Liguria دەنێ کە شوێن کۆماری ( جنوە )ی گرتەوە.

لەم ڕێککەوتنە هاوپێچێکی نهێنی هەبوو کە نیازە مەترسیدارەکانی ئیمپراتۆری بەرانبەر بە ئەڵمانیا دەردەخست، لەو هاوپێچە ئیمپراتۆر رازی دەبێ دەست بەسەر بەشێکی باڤاریا و ساڵ زبورگدا بگرێ و کەناری چەپیش بۆ فرەنسا بێ، بەو مەرجەی پرووسیا لەم ڕێککەوتنە هیچی بەر نەکەوێ. بەم شێوە نیازەکانی ئیمپراتۆر دەردەکەوێ کە چۆن پارێزەری

و: خالید هەرکی

ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆزە، ئینجاش رازی دەبێ لەبەرانبەر پێدانی بەشێک لە خاکی ئەڵمانیا بە فرەنسا ئەویش بەشێک لە خاکی ئەڵمانیا داگیر بکا.

هەروەها ناپۆلیۆن پاپا پیوسی سێیەمی رازی کرد کە پەیماننامەی ( تولانتیو ) لە شوباتی ١٧٩٧ لەگەڵدا واژۆ بکا، لەو رێککەوتنە پاپا رازی دەبێ بە دەست بەرداربون لە ئەفینیون فرەنسا و پێدانی نەخشەی ناوازەی کۆن بە ناپۆلیۆن. لە راستیدا رێککەوتنێکی قورس بوو بۆ پاپا بەڵام ئەو پێی نیگەران نەبوو، چونکە لەوە ئاگادار بوو ئەو مەرجانەی ناپۆلیۆن پێی داون سوکتر بوون لەو مەرجانەی حکومەتی بەرێوەبردن بەسەریدا سەپاندبوو.

شێوازی مامەلەکردنی ناپۆلیۆن لەگەڵ دوژمنەکانی و بەستنی پەیمانەکانی لە ئیتاڵیا بە دیدی زۆربەی مێژوونووسان پێشەکیی جێبەجێ کردنی نەخشەکەیەتی بۆ گەیشتن بە بلوتکەی دەسەلات بوو.

کاتێک ئەو دەگاتە ئیتاڵیا و لێێ جێگیر دەبێ وەکو پادشایەکی بێ تاج رەفتار دەکا، دەستی دەخستە ناو کاروباری ئەو کۆمارانەی بە شێوازی خۆی دروستی کردبوون، بۆچونەکانی خۆی بەسەر حکومەتی بەرێوەبردندا سەپاند کە کۆماری ئەلبی باکووری ( سیزالپین) بوو، چونکە بەپالپشتی سوپای فرەنسیەوە دامەزراوە ناتوانێ لەسەرپێ بمێنێ بەبێ سوپای فرەنسی، ناپۆلیۆن بووە فەرماندەیەکی بەهێز و بەتوانا، دامەزرێنەری کۆمارەکان و پیاوی یەکەمی فرەنسا و ئەوکەسەی شکۆ و سەروەریی بە فرەنسا بەخشی.

چونکە گەلی فرەنسی شانازیان پێیەوە دەکرد کە خاوەنی سەرکردەیەکی لەم شێوەن، داوایان کرد بگەرێتەوە فرەنسا، لەوێ وەکو سەرکردە و بلیمەت و زانا و مامۆستا و هەنەرمەند پێشوازیان لێی کرد. بەڵام بە دیدی زۆربەی مێژوونووسان ئەم مەدح و سەنایە هەمووی رتوش و دەستکرد بوە ویستویانە تایبەتمەندی و شانازییەکان لە کەسایەتی ئەو کۆکەنەوە تا دەسەڵاتە بالاکانی ولاتی پێبدەن، ئێمەش پێمان وایە ناپۆلیۆن لەسەرەتاوە بایەخی بە زانست و فێرکردن دەدا، بۆیە ئەوەی پەیوەندیی بە ناپۆلیۆنەوە هەبوو لە کەساتیەکان بە فەرمانگەی زانستی و فێرکاریەکانەوە دەبەسترانەوە، ئەمە کارێکی رواڵەتی و راستیە هەلبەستراو نییە.

لەو کاتەی لە فرەنسا دەبێ فەرماندەی ئەو سوپا زەبەلاحەی فرەنسای پێدەسپێرن کە بۆ هێرش کردنە سەر ئینگلتەرا ئامادە کرابوو، بەڵام وا پێدەچوو ناپۆلیۆن نیازی ئەمەی نەبێ، بە حکومەتی بەرێوەبردنی راگەیاندبوو کە ئەم سوپایە ئاراستەی شوێنێکی دیکە

بکەن، هەریەک لە ناپۆلیۆن و تالیران پێیان وابوو هێرش کردنە سەر میسر لە ڕوی داگیرکاری و دەستکەوتی ئابوریەوە بۆ فرەنسا سودی زۆرە لە هەمان کاتیشدا ململانێیە لە دژی ئینگلتەرا.

هەڵمەتی فرەنسا بۆسەر میسر ئەزموونێکی تاڵ بوو بۆ ناپۆلیۆن، لە سەرەتاوە هەستی بە مەترسیەکانی ئەم هێرشە دەکرد. کەشتیەکانی ئەم هەلمەتە لە دەریای سپیی ناوەڕاست لەبەرانبەر کەشتیە شەڕکەرەکانی ئینگلتەرا ڕایاندەکرد ئەمەش مەزنترین هەلە بوو ناپۆلیۆن تێیکەوت، بەڵکو بتوانێ بگاتە میسر بەڵام ناتوانێ بگەڕێتەوە، ئەوەی ڕویدا کەشتیگەلی ئینگلیزی لە شەڕی ( ئەبی قیر )ی دەریایی بەسەر کەشتیگەلی فرەنسیدا سەردەکەوێ، دوای ئەوە ناپۆلیۆن هەستی کرد کە ئومێدەکانی لە میسر ڕووخان.

ئەوکاتەی ناپۆلیۆن لە میسر دەبێ لە ئەوروپا و لە فرەنساش ڕووداوی مەترسیدار ڕوودەدەن لەوانە لەلایەن فرەنساوە و لەلایەن دوژمن و ناحەزانیەوە ئەوانەی حەز بە گەشەبوونی هێزەکانی فرەنسی ناکەن.

لە لایەن فرەنساوە وەکو لافاوێک دەوری ئەوروپای دابێ وابوو، دوای ئەو ڕێککەوتنانەی لەگەڵ نەمسا و بیدمونت وپاپا ئەنجامی دا، حکومەتی بەڕێوەبردن سیاسەتی دەستگرتن بەسەر شوێنەکان پیادە دەکا، لەم ڕوانگەیەوە بیدمونتی خستەوە سەر سنوورەکانی فرەنسا و پادشاکەی و شازادەی تسکانیا و لە میرنشینەکەی وەدەرنان. لە ڕۆما کۆمارێکی دامەزارند بە حوکمڕانی کۆنسولەکان و پیوسی سێیەمی لێ وەدەرنا، ئیتر ئەم کۆمارە لە فرەنساوە دەبردرا بەڕێوە هەروەکو کۆماری باتافیە لە هۆڵەندا و کۆماری هلفتیە لە سویسرا.

کاتێک هەواڵی تێکشکانی کەشتیگەلی فرەنسی لە شەڕی( ئەبی قیر ) دەگاتە ئەوروپا، پادشای ناپۆلی فەردیناندی چوارەم خۆی لێدەبێتە شێر، خوشکی ماری ئەنتوانیت مارەدەکا و هێرش دەباتە سەر کۆماری ڕۆما و لە ماوەیەکی کورت بەسەریدا سەردەکەوێ، فرەنسیەکان هێز کۆدەکنەوە و پەلاماری دەدەن خۆی و خانەوادەی دەردەکەن و لە شوێن ئەو کۆمارێک دادەمەزرێن، ئەم سەرکەوتنانەی فرەنسی و هەناسە وەبەرهاتنەوەی جارێکی دیکە نەمسا تەنگەتاو دەکا، ناچار دەبێ چەک پەیدا بکا و لەگەڵ بەریتانیا ڕێک بکەوێتەوە.

ئێستا دوژمنێکی دیکە بۆ فرەنسا پەیدا بوو ئەویش ڕووسیایە. دوای مردنی کاترینی دووەم، قەیسەر پول لە ١٧٩٦ تاجی پادشایەتی دەنێتە سەر، قەیسەری نوێ ڕقی زۆری لە

و: خالید هەرکی

فرەنسیەکان بوو بەهۆی ئەوەی خانەوادەی بۆربۆن لەسەر دەستی ئەوان توشی نەهامەتی و کارەسات ببۆوە، لەسەر ئەو روداوانەی لەسەر دەستی ئەوان ( فرەنسیەکان) روو دەدەن ئەمەشی لێ ببوە ترسێکی دیکە . بۆیە لە هاوپەیمانی نێودەولەتیی دووەم بەشدار دەبێ کە دژی فرەنسایە، فەرماندەی سوپاکەشی بە سوفوروف دەسپێرێ، ئەم گەلەکۆمەکیەی سەر فرەنسیەکان بوە مایەی شکست پێهێنانی سوپای فرەنسی لە گەلێک بەرەی جەنگدا، فرەنسیەکان لە ناپۆلی و سویسرا وەدەر نران، بە سەرکەوتنی سوفوروف لە ئابی ۱۷۹۹ لە جەنگی ( نوفی ) بەسەر فرەنسیەکاندا، فرەنسیەکان ئیتالْیا لەدەست دەدەن. بەلاّم ئەوەندەی پێناچی کە ناکۆکیەکانی نێوان نەمسا و رووسیا دەتەقنەوە. ئەمەش لە بەرژەوەندی فرەنسادا دەبێ.

هەریەک لە نەمسا و رووسیا بە چاوی گومانەوە سەیری جولەی یەکتریان دەکرد، بە تایبەتی نەمسا لە گەیشتنی سوپای رووسیا بە ئیتالْیا و ناوچەرگەی ئەوروپا، توشی دڵەراوکێ دەبێ، سوفوروف لەگەڵ سەرکردە نەمساییەکان هەمان هەلْوێستی ئالْوگۆڕ دەکرد کە بێبڕوایی بوو. ئەم بێ متمانەیی و بێ بڕواییە بوە مایەی ئەوەی هێزەکانی فرەنسی لە یەکی ئۆکتۆبەری ۱۷۹۹ بەسەر هێزی هاوپەیمانەکاندا سەرکەوێ، لەو کاتەوە هاوپەیمانی پەلی لێ کەوتەوە.

ئا لەم دۆخەدا ناپۆلیۆن بە نهێنی دەگاتەوە فرەنسا و وەکو فەرماندەیەکی سەرکەوتوو چاوی بە گەلی فرەنسی دەکەوێ ئەوانیش پێشوازیەکی گەرمی لێ دەکەن، رووداوەکان یەک لەدوای یەک دەبن تا حکومەتی بەرێوەبردن دەروخێ، ئیتر ئەو و سییز و دیکو سێ کۆنسول دەبن دەسەلاّتی بالایان بەدەست دەبێ. لە راستیشدا ململانێی دەسەلاّت لە نێوان دوانیاندا هەبوو، لە نێوان سیزی خاوەن بیردۆزی سیاسی و هزری قول لەگەڵ ناپۆلیۆنی شمشێر بەدەست، دواجار ناپۆلیۆن سەردەکەوێ کارەکانیش بەرەو دکتاتۆریەتی سەربازی هەنگاو دەنێن، لە راستیدا هەم سیز هەم ناپۆلیۆن بەرنامەی دامەزراندنی حوکمێکی دیموکراسیان هەبوو، ریفراندۆمی میللی رەزامەندیی لەسەر رێکخستنە سیاسیەکانی ناپۆلیۆن دابوو، بەلاّم ئەمانە هەموو نابنە رێگر لەبەردەم رەوتی دکتاتۆریەتی سەربازی کە لە سەردەمی کونسۆلْییەتەوە دەستی پێکردبوو.

# بەشی بیست و پێنجەم

## فرەنسا لە سەردەمی ئیمپراتۆڕیەتی ناپۆلیۆنی یەکەم

### ١/ ناپۆلیۆن بەرەو لووتکە (١٧٩٩-١٨٠٧)

ناپۆلیۆن لە چەشنی ئەو سەرکردانە نەبوو کە لە دوای شۆڕشی فرەنسی دەرکەوتبـون. ئەو نەوەی شۆڕشی فرەنسی بوو، لەو کەسانە بوو کە بڕوای بە بیروڕا و ئامانجەکانی هەبوو، بەڵام بە بڕیاری خود بەتایبەت لەوکاتەی کە بوو بە کۆنسول، وا بیر دەکرێتەوە کە هۆکـاری ئەو ئاژاوە و نا سەقامگیریەی فرەنسا لە نەوەتەکانی سەدەی هەژدەهەم بەخـۆیەوە بینـی لە ئەنجامی نەبـونی کەسـێکی بەهێزو فەرمانـدەیەکی بەتوانـا بـوە کە خەڵـک لە دەوری خـۆی کۆکاتەوە و بەسەر تەنگژەکاندا زاڵ بـێ و دەسـەڵاتەکان لە دەسـت خـۆی قەتیسـکا، لەسـەر بنەمـایەکی نـوێ دەولەت بنیـاد بنێـتەوە و فرەنسـا بکـاتە دەولەتێـک لە ئەورووپـا گـوێی بـۆ راگیرێ.

بەڵام گەلی فرەنسی لە ململانێی سەرکردە بۆرژوا و مللییەکان بێزار ببـو، خـۆی بەدوای سەرکردەیەکدا دەگەرا لە نیو مەحـافلی نێـودەولەتی خـاوەنی هەلوێسـت و وتەی خـۆی بـێ. دیارە ئەمە ئامانجی نـاپۆلیۆن بۆنـاپەرت خـۆی بـووە. بەڵـکو لەمەش زیـاتر، ئیتـر ئەمە ئەو دەرفەت و دۆخە بوو کە گەلی فرەنسی و نـاپۆلیۆنیش بەدوایـدا دەگەڕان، ئەمە دوای ئەوەی چەندین پیلانی لەناوبردنی ئاشکەرا دەبـن کە لەلایەن کەسـایەتیی فرەنسـیەوە نەخشـەی بـۆ کێشرابوو، بەڵام ماوەی سێ ساڵ دەبـا تـا نـاپۆلیۆن لە کۆنسـوڵی یەکەم و کۆنسـوڵی هەتـا هەتایە لە ١٨٠٣ دەگاتە پلەی ئیمپراتۆر.

بۆئەوەی تاجی ئیمپراتۆریەت بە فەرمی لەسەر بنێ دەبوایە پشت بە دوو یاسای مەزنـی تێکهەڵکێشراو ببەستێ:

و: خالید هەرکی

١/ کڵێسای کاسۆلیکی.

٢/ گەلی فرەنسی بەتایبەت جووتیار و شارنشینەکان، کە زۆرینەیان کاسۆلیک بوون.







کەوابێ ناپۆلیۆن دەبێ پاپاخوازەکان رازیکا و پەیوەندییەکانی لەگەڵ پاپا پیوسی حەوتەم Pius خۆشکا، لە راستیدا پیوسی حەوتەم سوپاسگوزاری ناپۆلیۆن بوو چونکە ئەو دەرفەتەی نەبوو سەرکەوتنەکانی ئیتاڵیا ببینێ و ویلایەتەکان پارچە پارچە بکرێن. ئەو رێککەوتنەی ناپۆلیۆن نیازی وابوو لەگەڵ پیوسی Pius حەوتەم واژۆ بکا لە ١٨٠٢ لە گرنگترین هۆکارەکانی بەهێز بونی پەیوەندیەکانی نێوان پاپا و حکومەتی فرەنسی بوو.

ئەوەی زیاتر ناپۆلیۆن و پاپاخوازەکانی لەیەک نزیک کردەوە ئەو لەیەک تێگەیشتنەی ناپۆلیۆن بوو لە پاپاخوازەکان، دانوستانەکان دڵخۆشکەر بوون بۆ رێککەوتن لەگەڵیاندا، ناپۆلیۆن رازی بوو لەسەر گەڕاندنەوەی دەستوری کڵێسا بۆ فرەنسا، بەم رازی بوونە قەشە و پیاوانی ئاینی دەگەڕینەوە شوێنی خۆیان و هەمان مافی جارانیان پێ دەدەرێتەوە کە بەر لە شۆڕشی فرەنسی هەیانبوو. بەڵام ناپۆلیۆن مافی دامەزارندنیانی بەدەست خۆی هێشتەوە، بە مانایەکی دیکە بڵێین دەسەڵاتەکانی ناپۆلیۆن لە سەرووی دەسەڵاتەکانی کڵێسا مانەوە.

دەبێ لێرە ئەوە بڵێین، کاتێک ناپۆلیۆن ئەم رێککەوتنە لە ١٨٠٢ لەگەڵ پاپا ئەنجام دەدا تەنها مەبەستی پەلکێش کردنی لایەنگرێتی پاپاخواز نەبوو، بەڵکو ئەوەی باش دەزانی کە زۆرینەی گەلی فرەنسی کاسۆلیک مەزهەبن، ئیتر دەستەواژەی ( چاکە پەرستی ) یا

(ئەقل پەرستی) یا هەر پەرستنێکی دیکە بێ کە لەسەردەمی شۆڕشی فرەنسی دەرکەوتن هیچ لە کاسۆلیکیەتی ناخی گەلی فرەنسی ناگۆڕێ، بۆیە پێی وابو باشترە سنوورێک بۆ پەیوەندیە ناخۆشەکانی لەگەڵ پاپاخوازەکان دابنێ، لەمەشیان سەرکەوت، بەم شێوە پاپا ئامادەبوو رێورەسمی تاج لەسەرنانی ناپۆلیۆن ببا بەرێوە، کە لە ۱۸۰۳ ئەنجام درا.

دەبوایە ناپۆلیۆن بە پێکهاتەی حکومەت و سیستەمەکەیدا بچێتەوە و هەندێک گۆڕانکاری و هەمواری تێدا ئەنجام بدا تا لەگەڵ ئامانج و دۆخی نوێدا بگونجێن، دەبوایە داروودەستەی ئیمپراتۆر دامەزرێنێ ئەم داروودەستەش لە ژمارەیەک کەساتیی هەلگری مەدالیای سەربازی و مەدەنی و خاوەن نازناوی شازادە و میر پێک بێت.

لەم روانگەیەوە توانی ژمارەیەک لە ئەندامانی خانەوادەی بگەیەنێتە پلە و پۆستی شایستە بەم پێگانە، سور بوو لەسەر ئەوەی دەستەکانی دەبێ کراوەبن لەسەر بەرێوە بردنی وڵات و هەموو دەزگاکانی، دەبوای دەمی هەندێک بگرێ ئەوانەی توانای تیروتوانجیان لە دەسەڵاتی پادشایەتی هەیە، لەوانە یاکوبیەکان یا هەر گروپێکی دیکە کە بە بەرگریان لە مافەکانی خەڵک دەکرد، هەوڵی سەرنەکەوتووی کوشتنی کردە دەرفەتێک بۆ دوورخستنەوەی یاکوبیەکان لە گۆرەپانی رووداوەکان ، چەند دەرفەتێکی دیکەی هەمان شێوە بە هەل دەزانێ تا دەسەڵاتەکانی بەسەر دەستور و یاساو پەرلەماندا بسەپێنی، لەم روانگەیەوە دەستووری سڕ کرد و سیستەمی ئەنجومەنی تریبیونی دانا Tribune لەم سیستەمەوە دەسەڵاتەکانی ناپۆلیۆن زاڵ دبن بەسەر ئاراستەکردنی سیاسەتی وڵات، سنووری گفتوگۆی لە نێو ئەنجومەنی تریبیون دیاری کرد .

دیارە دۆخ و هەلوێستەکانی نیو دەولەتی ئەوەی پێویست دەکرد حوکمێکی دکتاتۆری بێ. نەمسا و ئینگلتەرا مەبەستیان بوو درێژە بە شەڕ بدەن لە دژی فرەنسا، هەردوکیان خاوەن هێزێکی مەزن بوون مەترسیان لەسەر فرەنسا دروست دەکرد، ئەمە مانای ئەوە نییە ناپۆلیۆن مەبەستی بوو ئاشتییان بەسەردا بسەپێنی، ناپۆلیۆن بە دلسۆزی هەولی ئاشتەوایی لەگەڵ ئینگلتەرادا، بەڵام ئەوکات پادشای ئینگلتەرا جۆرجی سێیەمبوو. سەرۆک وەزیرانیشی سیاسەتمەداری بە توانا و بەناوبانگ ولیم پیت W. Pitt بوو، جۆرجی سێیەم لەوە دڵنیا بوو کە رژێمی کونسۆلیەت بەتەواوەتی تواناکانی گەڕانەوەی خانەوادەی بۆربۆن بۆ سەر حوکمی فرەنسی لەناو دەبا. بەڵام ئەو خۆی لە هەوڵی گەڕانەوەی خانەوادەی بۆربۆن دەپاراست. مێژوونوسان هۆکاری رەتکردنەوەی رێککەوتنی ئینگلتەرا و فرەنسا بۆ ئەم هۆکارە دەگەڕێننەوە، بە دیدی ئێمەش ئەمە تەنها هۆکارێکی روکەشی بووە، چونکە هۆکاری

و: خالید هەرکی

گەلێک لەمە بەهێزتر هەبوون بونە مایەی درێژە پێدانی شەڕ و رازی نەبونی جۆرجی سـێیەم و پیت لەسەر رێککەوتنیان لەگەڵ فرەنسا.

ئینگلـتەرا کەوتبـووە دوورگەیەکـی ئەوپەری دەریـا و دوورەدەسـتی سـوپای فرەنسـی، کەشتیگەلی ئەو لە توانایدا بوو رێگری لە هەر هێرشێکی دەریایی بکات کە دەکرێتە سـەری. دواتر سوپایەکی فرەنسی لە میسـر گیـری خواردبـوو، دەکـرێ بڵـێین بـارمتەی ئینگلیـز بـوو ئەویـان مسـۆگەر تـر بـوو بـۆ ئینگلیزەکـان، دواتـر تـاقە هاوپەیمـانە بەهێـزەکەی ئیگلیـز کە ئیمپراتۆری نەمسایە ئامادە نەبـوە لەگەڵ کۆنسـۆل ی یەکەم نـاپۆلیۆن بۆنـاپەرت رێککـەوێ تەنها ئەگەر ئەو لەدەست دراوانەی لە ماوەی ١٧٨٩-١٧٩٩ لەدەستی داوە بۆ بگێـرێتەوە، لە کاتێکا کۆنسۆلی یەکەم ئامادەی ئەم مەرجە نەبوو، بۆیە هەر دەبوایە خولێکی دیکەی شەڕ ئەنجام بدرێ.

ئێستا شمشێر حوکم دەکا، ناپۆلیۆن دەستی لەوە وەشاند کە بەردەستە ئەویش نەمسا بوو، نەخشەکەی هەروەکو پێشتر دایرشتبوو دوو لەشکری ئامادە کـرد یەکیـانی نـاردە سـەر ئیتاڵیا ئەویتریان بۆ ناوجەرگەی نەمسا، خۆی لەشکرێکی برد بەرێوە ، چیـای ئەلبـی بڕکـرد لە رێرەوی (سان بەرناردشۆی) بەناوبانگەوە دابەزیە ناو ئیتاڵیا، دەبوایە یان بچێـنە جنـوە تا مەسینا و سوپا گەمارۆدراوەکە رزگارکا یا میلان و ناوجەرگەی لمباردیا داگیرکا بـۆئەوەی ئەو دەشتاییە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. داگیرکردنی یەکەمیـانی پـێ باشـتر بـوو، ئەوکـات سوپای نەمسا خۆی ئامادە کردبوو بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپای فرەنسی لە مـارنجو، لەوێ نەمساییەکان یەکەم جار توانیان سوپای فرەنسـی بە فەرمانـدەیی نـاپۆلیۆن ببەزێـنن، بەڵام دواتر فەرماندە ئازاکەی فرەنسی ( دیزیە) بێ ئاگادار کردنەوە دەگاتە مەیدانی شـەڕ و شکست بە سوپای نەمسا دەێنی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەرکەوتنەی مارنجو بۆ ناپلیۆن دێتە ئەژمار.

دۆخـی بەرەی جەنـگ لە بـاکووری نەمسـا بـاش نەبـوو فەرمانـدەی فرەنسـی مـورات Murat لە ( هونلانـدن ) سـوپای نەمسـای تێکشـکاند، بەم شکسـتەی نەمسـا دەرگاکـان بەرەو ڤیەننا والا کران. ئەگەر نەمسا لە بەرەی سێیەمیەوە (بەرەی روسـی) لەژێـر هەڕەشـە نەبوایە بەڵکو دەیتوانی درێژە بە شەڕ بدا و بەرگری بکا.

قەیسـەری رووسـی ( پـۆلی یەکەم ) زۆر پابەنـدی نـاپۆلیۆن ببـو بە سـەرکەوتنەکانی سەرسام بوو، لەبەر ئەو مەترسییە نەمسا پەلەی کرد لە ئەنجامدانی دانوستان و گەیشتن بە

رێککەوتنێک لەگەڵ رووسیا بەر لەوەی قەیسەر کارەکە ئالۆزکا ، لە ٩ی شوباتی ١٨٠١ رێکەکوتنی لونیڤیل Luniville لە نێوانیان ئەنجام درا.

ئاشتەوایی لونیڤیل لە راستیدا جەخت کردنەوەیە لە ئاشتەوایی کمپۆ فورمیو، بەتایبەت سەبارەت بە چارەنووسی وڵات، کۆمارەکانی ئیتالی کە ناپۆلیۆن دایمەزارندبوون نوژەن کرانەوە.

١/ کۆماری ئەلبی باکووری، تسکانیا و دوورگەی ئەلبی خرایەسەر.
٢/ کۆماری لیجوریا لە جنوە.

لە تەک ئەم دوو کۆمارە دوو کۆماری دیکەش دادەمەزرێن ئەوانیش:

١/ کۆماری باتافیا لە هۆڵەندا.
٢/ کۆماری هلفتیا لە سویسرا.

لەم رێککەوتنەی ئاشتەوایی نەمسا نزیکەی حەوت یەکی خاکەکەی لەدەستدا، ناچار بوو بە بڕیارەکانی کۆنگرەی ( رشتاد ) رازی بێ کە دووبارە رەسمکردنەوەی سنوورەکانی ئەڵمانیا بوو بەو شێوەی کە حکومەتی پاریس دەیەوێ. ئەمە بە سەپاندن لەسەر میرە ئەلمانیەکان جێبەجێ کراو لەلایەن ( ریشستاگ )یشەوە رەزامەندیی لەسەر درا، خۆی فرەنسا لەم سەینوبەینە زۆری دەستکەوت، سنوورەکانی پەڕینەوە تا راین، باڤاریاش ئەوەندە بەهێزکرا بوە درکێک لە کەلاکی ئیمپراتۆریەتی نەمسا، لەراستیدا نەمسا پێگەی خۆی لە ئەڵمانیا لەدەستدا، بەڵام کەم بوونەوەی ویالەیەتەکانی ئەڵمانی بوە مایەی بەهێز بوونی ئەڵمانیا، چونکە ئەوان لە کۆنگرەی ریشستاگ سوکایەتی زۆریان پێکرا بۆیە چاویان لەو رۆژە بوو جارێکی دیکە هەڵسنەوە تا خۆیان رەسمی سنوورەکان و سیاسەتیان بکێشنەوە دەرفەت بە لایەنانی تر نەدرێ لە پاریسەوە ئەم کارەیان بۆ بکرێ.

لەوکاتەی دۆخی شەڕەکان لە ئیتاڵیا و نەمسا لە بەرژەوەندی فرەنسا دەگوزەرا، لەولاشەوە مەیدانی شەڕی دەریایی هەمیسان لە بەرژەوەندی فرەنسا بوو.

قەیسەری روسی پۆلی یەکەم سەرۆکایەتی (کۆڕبەندی بێلایەنی چەکداریی) دەکرد ، ئەم کۆڕبەندە هەریەک لە دانیمارک و سوێد و رووسیای تێدا ئەندام بوون، ئەم وڵاتانە ئەوانە بوون کە زیانیان پێکەوتبوو لە پشکنینی کەشتیەکانیان لەلایەن کەشتیگەلی بەریتانیەوە بە بیانوی گەڕان بەدوای ئەوکالایانەی کە سەرچاوەی دروستکردنیان لە وڵاتانی دوژمنی

و: خالید هەرکی

ئینگلتەرایە. بەپێی ئەم کۆربەندە ئەو وڵاتە بێلایەنانە دەبوایە ریز لە بێلایەنیان بگیرێ لەوەی خۆیان ئازادن بازرگانی لەگەڵ هەر لایەنێک بکەن، بۆیە ئینگلتەرا مافی پشکنینی نابێ. بەڵام ئینگلتەرا لە دەریاوە زیاتر شەڕی فرەنسای دەکرد لەوەی وشکانی بۆیە هەموو رێگا و شێوازەکانی بەکار دەهێنا کە زیان بە فرەنسا بگەیەنێ تەنانەت ئەگەر ئەم رێگایانە دژی بنەماکانی یاسای نێو دەولەتیش بن.

ئەمە بووە مایەی یەکگرتنی ئەو دەوەتانە، کۆمبونی کەشتیگەلی دەوڵەتان لە دژی ئینگلتەرا ئاماژەیەکی مەترسیدارە بۆ زاڵ بوونی فرەنسا، بەم هۆیەوە لەندەن بڕیار دەدا گورزێک لە ( کۆربەندی بێلایەن ) بوەشێنێ بەر لەوەی کەشتیگەلەکانیان کۆکەنەوە. لە کتوپڕ بێ هۆشداری جەنگ کەشتیگەلی ئینگلیزی بەندەری کۆپنهاگن گەمارۆ دەدا و کاشتیگەلی دانیمارکی کە مەزنترین کەشتیگەلی کۆربەندی بێلایەن دەبێ، تێکی دەشکێنێ.

بەریتانیا وا خۆی نیشان دەدا کە بەرگری لە ئازادی دەریا و یاسای نێودەولەتی دەکا کەچی خزمەتی بەرژەوەندیەکانی خۆی دەکرد، خۆ ئەگەر یاسای نێو دەولەتی یا بنەماکانی ئازادی دەریا بەر بەرژەوەندیەکانی ئەو بکەوتایە ئەوا هەمویانی بە دیواردا دەکێشا. دیارە تێکشکاندنی کەشتیگەلی دانیمارکی نمونەیەکی زیندووە بۆ سەلماندنی ئەم راستیە.

بەم لێدانەی دەریایی لەلایەن ئیگلیزەوە لای ناپۆلیۆن وا دەخویندرایەوە کە سەروەری دەریا لەلایەن ئینگلیزەوە قۆرخ کراوە. لەوکاتدا بەتایبەت دوای دەرچونی هێزەکانی فرەنسی لە میسر لە ١٨٠١ بۆ فرەنسا کارێکی قورس بوو بە ئینگلتەرا بوەستێ و تۆڵەی بکاتەوە، ئینگلیزیش بە هەمان شێوە بەوەی دەزانی کە دوای ئەوەی نەمسا لە رێککەوتنی لونیڤیل لەگەڵ فرەنسا رێککەوتوە لەم دەستکەوتە زیاتری پێ ناکرێ.

ئەوەی دواتر هانی رێککوتنی ئەم دوو هێزەیدا ( فرەنسا و ئینگلتەرا ) پیت بوو دوژمنە سەرسەختەکەی ناپۆلیۆن دەست لەکار دەکێشێتەوە دوای ئەو جێگرەوەی ( ئەدنگتون ) بڕوای بەوە هەبوو کەوا کاتەکە هاتوە رێککەوتنێکی ئاشتەوایی لە نێوان ئەوان و فرەنسادا بکرێ، دانوستانەکان دەست پێکران کۆتاییەکەی بە رێککەوتنی ( ئاشتەوایی ئەمیان ١٨٠٢) Treaty of Amiensهات.

ئاشتەوایی ئەمیان دانی بە دۆخی حالیحازر نا بێ ئەوەی دەستکاری هیچ بکات جگە لەوەی، ئینگلتەرا (سیلان) دەگرێتە خۆ کە هۆڵەندا دەستی لێ هەلگرتوە لەگەڵ ترینیداد کە ئیسپانیا دەستی لێ هەلگرتوە بەو مەرجەی ئینگلتەرا رازی بێ فرەنسا ئەو شوێنانەی

پێشتر دەستی بەسەردا گرتبوون بۆی بگەڕێندرێتەوە، بەڵام فەرەنسا دەستکەوتەکانی لە لونیڤیل لەگەڵ نەمسا بەدەستی هێنابوون وەکو خۆی مانەوە.

بەپێی ئەو ڕێککەوتنە دەبوایە سوارەکانی قەشە یوحەنا دوورگەی مالتە وەرگرن، ئینگلتەرا چەند مەرجێکی قورسی بۆجێبەجێکردنی ئەم برگەیە دانابوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئینگلیز ئەم خاڵەی جێبەجێ نەکرد هەمیشە بیانوی دەهێنایەوە چونکە بەسەر دەریای سپیی ناوەڕاستەوە زاڵ بوو. ئەمە یەکێک بوو لەو هۆکارانەی ڕێککەوتنی ئامیان تەنها ئاگربەستێک بێت تا دوبارە خولێکی دیکەی شەڕ دەست پێدەکەنەوە.

لەکاتێکا فەرەنسا بە چاوێکی گومانەوە سەیری داگیرکاری ئینگلیزی دەکرد بۆ دورگەی مالْتا، لە هەمانکاتدا بەریتانیاش بە چاوێکی مەترسیەوە سەیری بوونی فەرنەسای دەکرد لە زەویەنزمەکان ( بەلژیک و هۆڵەندا ) بەریتانیا مافی خۆی بوو لە بەرفراوانبونی فرەنسا ترسی هەبێ چونکە زیان بە بەرژەوەندیەکانی سەربازی و ئابووریی بگەیەنێ.

دواتر سەرمایەدارانی بازرگانە ئینگلیزەکان پێیان وابوو ڕێککەوتنی ئامیان دەرگای بازارەکانی فرەنسا بەروی بازرگانەکان دەکاتەوە کە کالاکانی وڵاتانی دەرەوە بە کەشتیە بەریتانیەکانیان بۆ دەبەن، ناپۆلیۆن پێی وابو زوو یا درەنگ خولێکی شەڕ هەر دەبێتەوە ئیتر دەبێ کار لەسەر ئەوە بکا تا بتوانێ زیان بە ئابوری ئینگلتەرا بگەیەنێ و خۆی بە پاراستنی بەرهەمەکانی خۆجێییەوە سەرقال بکا تا بەر شالاوی بەرهەمەکانی بێگانە نەکەون.

بۆیە ناپۆلیۆن یاسای پاراستنی گومرگی دەرکرد، ئەم یاسایە لە خزمەتی بەرژەوەندی بازارەکانی فرەنسادا دەبێ کە لە ڕووی پیشەسازییەوە بەبەراورد لەگەڵ ئینگلتەرا لە پاشە. داخستنی بازارەکانی فرەنسی بەرووی سەرمایەدار و بازرگانەکانی بێگانە یەکێک بوو لەو هۆکارانەی فشار خستنە سەر ئینگلتەرا بۆنەوەی لەگەڵ ناپلیۆن لەسەر هاوکاری و بەرنامەیەکی ئابوری ڕێککەوێ.

بەڵام ناپۆلیۆن لەو کەسانە نەبوو بخرێتە ژێر فشار، داخستنی بازارەکانی فرەنسی بەڕوی ئینگلیزدا تاقە ڕێگەی زیان پێگەیاندن بوو بە بەرژەوەندییەکانی ئینگلتەرا.

دواتر گەلی ئینگلتەرا ئەوکات لە هێرشێکی توندی پڕۆپاگەندەی دژ بە ناپۆلیۆندا بوون. بەتایبەتی ڕۆژنامەگەری سنگی کردبۆوە، لاپەرەکانی بەڕوی ناحەزانی ناپۆلیۆن کردبوونەوە جا ئەو ناحەزانە لە پیاوانی شۆڕشی فرەنسی بن یا خانەوادەی بۆربۆن ، داوای گەڕانەوەی خانەوادەی بۆربۆن و لویسی هەژدەیان دەکرد بۆ پادشایەتی فرەنسا. ئینگلیز

داوایەکی ناپۆلیۆنی رەت کردەوە بۆ دوورخستنەوەیان، تا دواجار خۆی بەدوای رێکارێکدا دەگەڕێ بیگرێتە بەر دژی بەرژەوەندییەکانی گەلی ئینگلیز بێ.

کاتێک رۆژنامەکانی ئینگلیزی پرسەکەیان مەزن کرد زیاتر ئاماژەیان بە جولەی دبلۆماسی و سەربازی فەرەنسی دا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دورگەی هیندی، ئینگلیز زیاتر ئارەزووی بۆ شەڕ لا پەیدا دەبێ، بیرۆکەی وەدەست هێنانی پێگەیەک لە رۆژهەلات لای ناپۆلیۆن دووبارە سەری هەڵدایەوە. دەستی بە ناردنی نێردەی دبلۆماسی کرد بۆ لای سولتانی عوسمانی، نێردەی ( سباستیانی ) لە گرنگترین نێردەکانی بوو، بەتایبەت ئەو راپۆرتەی سەبارەت بە توانای فەرەنسا لە داگیر کردنی میسر بێ زیان لەو پرسانە بوو کە رێککەوتنی لەسەر بوو.

لە بواری ململانێی داگیرکاریی فەرەنسی و ئینگلیزی، ئاراستەکانی ئینگلیز دژی بەرژەوەندییەکانی بوو، بە فەرماندەیی رەشپێستێک بەناوی توسان ( Toussin ) شۆڕش لە دورگەی سان دومنگوا St. Domingo هەڵدەگیرسێ. توسان توانیی خۆی وەکو حاکمی ئەو دورگەیە بناسێنی، خۆی بە کۆنسۆلی یەکەم دایە ناسین و دەستورێکی لەسەر شێوازی دەستوری فەرەنسی دەرکرد، بەڵام ناپۆلیۆن بەوە رازی نابێ و سور دەبێ بە گێرانەوەی بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی، هەرکە رێککەوتنی ئامیان واژۆ دەکرێ فەرەنسا کەشتیگەلێک بە ژمارەی بیست هەزار سەربازەوە بۆ سەر ئەو دوورگە دەنێرێ و دەتوانێ بیگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسا، وێڕای ئەم جولانە لە هیند چالاکی مەزن ئەنجام دەدرا بۆ گێڕانەوەی ئەو کۆلۆنیالانەی کە پێشتر لەدەستی دابوون.

ئەم هەوڵانەی فەرنسی ببوونە سەرچاوەی مەترسیەکانی ئینگلیز، کەوتبوونە ئەو بڕوایە کە ناپۆلیۆن لە توانایدایە دەسەڵاتەکانی لە قووڵایی دەریا هەبێ. ئەمەش بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز دەخاتە مەترسی، کەوایە لە بەرژەوەندی ئینگلیز دایە رێگری لەم هەولانەی فەرەنسادا بکا.

بەڵام بیردۆزی هاوسەنگی نیودەولەتی لە هۆکارە بنەرەتیەکانی بەرفراوان بونی شەڕ بوون کە تەنها فەرەنسا و ئینگلتەرا نەگرێتەوە. دوای ئاشتەوایی ئامیان پێگە و هێزی فەرەنسا یەکجار بەرز دەبێتەوە، بەڵام بزاوەکانی فەرەنسا وێڕای بێزار بونی رووسیا و پرووسیا و ئینگلتەرا ، ئیمپراتۆریەتی نەمساشی بێزار کرد. کۆماری ئەلبی باکووری تەنها سەر بەوەوە بوو، ناپۆلیۆن دەستورێکی بەسەر سویسرادا سەپاند کە لە خزمەت فەرەنسادا بوو، بۆیە ئینگلتەرا لەسەر هەڵوێستەکانی لە بەرانبەر بە فەرەنسا سور بوو تا لە ئاداری ١٨٠٣ دوبارە

شەڕ لە نێوانیاندا روودەداتەوە، ئەمە لە هەمان کاتەدا بوە کە نەمسا و رووسیا ترسیان لە بەهێز بوونی فرەنسا لێ پەیدا بووە.

قەیسەری رووسیا پۆلی یەکەم کە بە ناپۆلیۆن سەرسام ببوو، کۆچی دوایی کردبوو، ئەسکەندەری یەکەم جێی گرتبۆوە، ئەویش جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ پۆلدا هەبوو، ئەسکەندەر بەپێی بەرژەوەندییەکانی رووسیا سەیری رووداوەکانی دەکرد نەک بە گوێرەی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی، بەوهۆیەوە بوارەکانی بەگژیەکدا چوونی ئەسکەندەر و ناپۆلیۆن زۆر و هەستیار دەبن.

رووسیا ئومێدی وابوو، بە ئاراستەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەر حسابی هەردوو دەولەتە مەزنەکەی ئیسالٚ امی پەل بهاوێژێ و بەرفراوانبێ ( دەولەتی عوسمانی و دەولەتی فارسی )، هەر لەو کاتانە فرەنسا چاوی لەوە بوو دەسەڵاتەکانی لە ئەستانە و قاهیرە و تەهران بەهێز و جێگیر بێ، زاڵ بوونی فرەنسا لەو شوێنانە لەناوبردنی ئومێدەکانی رووسی دەگەیەنێ.

لە هەمان کات دید و بۆچوونەکانی ئەسکەندەر لەسەر حوکمی پادشاگەرایی رەها بەهێز و جێگیر بوو، کاری لەسەر ئەوە دەکرد حوکمی پادشاگەرایی رەها لە هەموو ئەوروپا بچەسپێنێ و سامانی پادشاکان پارێزراوکا، بۆیە خۆی وەکو بەرگریکار لە مافەکانی لویسی هەژدەهەم دەزانی کە داوای گەڕاندنەوەی تاجی پادشایەتی خانەوادەی بۆربۆنی دەکرد.

حکومەتی قەیسەری رووسیا لەوە دڵنیا بوو ئەگەر لەگەڵ فرەنسا بکەوێتە شەڕ زیانێکی ئەوتۆی بەر ناکەوێ. چونکە مەیدانەکانی شەڕ لە خاکی رووسیاوە دوور دەبن، ئینگلتەرا بەرژەوەندیەکانی بازرگانی رووسیا لە بەرزایی دەریا دەپارێزێ وێڕای ئەوەی کە ئینگلتەرا ئامادەیە لە هەرشەڕێک کە رووسیا تێی دەکەوێ هاوکاری سوپای رووسیا بە لۆجستیک بکا. سەرەڕای ئەمەش ئەگەر ئینگلتەرا لەتەک رووسیا بکەوێتە شەڕ نەمسا هاندەدرێ تا ئەویش بێتە رێز بەرەی جەنگەوە لە دژی فرەنسا.

بەڵام بەپێێ ئەزموونەکانی نەمسا لە شەڕکردن لەگەڵ فرەنسا ئەوەی بۆ روون بۆتەوە کە نابێ پەلە بکا لە بەشداریکردن، باش بیربکاتەوە بەر لەوەی لەگەڵ ناپۆلیۆن بکەوێتە شەڕ، چونکە نەمسا لەم رووەوە زیانی زۆری بەدەست فرەنساوە پێگەیشتوە، خاک و سامانی زۆری لەدەست دا بەو هۆیەوە ئیمپراتۆری نەمسا ناچار بوە دوو رێککەوتنی نابروبەرانە

و: خالید هەرکی

لەگەڵ فرەنسا وازۆ بکا ( رێککەوتنی کمپۆ فورمیو و لونیڤیل )، بۆیە ئامادە نییە بۆ جاری سێیەم خۆی رووبەڕووی ئەم هەلوێستە شەڕمەزاریانە بکاتەوە.

ئیترشکستە یەک لەدوای یەکەکانی ئیمپراتۆری نەمسا وادەکا لە ژوانی شکستەکانی فرەنسا دابێ بەڵکو تۆلەی خۆی لێی دەکاتەوە، ئەو رێککەوتنەی قەیسەری رووسیا لەگەڵ ئینگلتەرا وازۆی کردبوو هاندەرێکی باش بوو تا چاوێک بە سیاسەتەکانی خۆیدا بخشێنێتەوە، کاتێک ناپۆلیۆن سەردانی ئیتاڵیا دەکا دەنگی نارەزایی و داوای جەنگ لە نەمسا بەرز دەبێتەوە، ناپۆلیۆن بەخۆی دەنازاند کاتێک لە ١٨٠٥ تاجی پادشایەتیی لە میلان لەسەردەنا، حکومەتی نەمسا پێی وابو ناپۆلیۆن مەبەستیەتی هەموو هێزەکانی ئەورووپا بخاتە ژێر رکێفی خۆی وەکو ئیمپراتۆرێک لە شێوەی ئیمپراتۆرەکانی رۆمانی، یا لانی کەم لە شێوەی ئیمپراتۆر چارلسمان. ئێستا پرسەکە لەبەردەمی ئیمپراتۆری نەمسا بووە پرسی مان و نەمان. بۆیە لە ١٨٠٥ دەچێتە ریز وڵاتانی هاوپەیمانی بترسبورگ.

پیت توانیی لەم هاوپەیمانیە نێودەولەتیەی سێیەمدا کە روسی او نەمسا و ئینگلتەرا و پادشای سوێدی دەگرتەوە سەرەکوتن بەدەست بوێنێ، چونکە دەستەکوتی لێی هەبوو. لە بەشداریکردنی سودی زۆری هەبوو بەتایبەت بۆ رووسیا، چونکە سوێد لەسەر کەنارەکانی بەلتیک ناکۆکیی لەگەڵ رووسیادا هەبوو ململانێیان بوو. رووسیاش ترسی لەوەبوو ئەگەر لەم ساتە هێز بنێرێتە ناوجەرگەی ئەورووپا و لەگەڵ فرەنسا بکەوێتە شەڕ ئەوسا ترسی لە کەنارەکانی بەلتیک دەبوو نەبادا لە کت و پڕ پەلامار بدرێ.

مەزندە دەکرا پرووسیا لەم هاوپەیمانێتیە بەشداربێ، بەڵام بێلایەنیی هەڵبژارد، جگە لەمە ناکۆکیەکی مەزن هەبوو لە نێو جومگەکانی دەسەڵاتی پروسی، ئاخۆ حکومەت چ سیاسەتێکی دژایەتی لەم جەنگە دەگرێتە بەر، بەتایبەتی کە ناپۆلیۆن گفتی ئەوەی بە پادشای پروسی دابوو هانۆڤەری ( ئینگلیزی)ی پێبدا، بەڵام لە بەرژەوەندی پرووسیادا بوو چاوەروانی ئەنجامەکانی یەکەم دەست وەشاندن بکا.

دیمەنی گشتی و پێشبینیەکانی ئەو هاوپەیمانێتیە ئەوە بوون کە سەرکەوتنی مەزن لە دژی ناپۆلیۆن بەدەست دێنن، دوای ئەم سەرکەوتنانەش هاوپەیمانی و دەولەتانی ئەورووپی ئەم مەرجانە بەسەر فرەنسادا بسەپێنن:

١/ گەڕانەوە بۆ سنوورە کۆنەکانی.

٢/ گەڕاندنەوەی خانەوادەی بۆربۆن بۆ سەر حوکمی فرەنسا.

٣/ بەستنی کۆنگرەیەک بۆ چارەسەری پرسە نێودەوڵەتییەکان.

٤/ دامەزارندنی سیستەمێکی فیدرالی بۆ پاراستنی ئاشتی و ئارامی لە ئەوروپا.

بەڵام ئەم هاوپەیمانێتیە لە بەرانبەر هێزێکی زەبەلاحی وەکو فرەنسا لە ناوەوەیدا لاوازە، بیروبرواو بنەماکانی ئاشتیخوازانە وەکو بلقی سەرئاویان لێهاتبوو، هەموو دەولەتە ئەوروپیەکان مەیلی داگیرکاریان لا چەسپا بوو هەر یەکێ دەیویست لەسەر حسابی ئەویتر سنوورەکانی بەرفراوانکا. لە روێکی دیکەوە ئەقلیەتی سەرکردە ئەوروپیەکانی ئەوکات نەگەیشتبوە ئەو ئاستەی هەموو سوپاکانی هاوپەیمانی بخەنە ژێر فەرماندەی یەک سەرکردەوە. هەرچەندە ژمارەی سوپای هاوپەیمانان دوو بەرانبەر بە سوپای فرەنسا دەبوو بەڵام ئاراستەکان یەک مینبەر نەبوون، هەر دەولەتەو لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی جولەی بە سوپاکەی دەکرد. کەچی سوپای ناپۆلیۆن یەککگرتوو بەرفەرمانی سەرکردە بوون بەیەک پلان و فەرمان جوولەیان پێدەکرا، ئامادەی خۆبەختکردن بوون هەستیان دەکرد کە هەلگری پەیامێکی پیرۆزن بەرپرسیارێتی بەرێوە بردنیان گرتۆتە ئەستۆ.

لە رووی پێداویستی و لۆژیک و هۆکارەکانی هاتووچۆ و ئاستی چۆنایەتی چەکەوە، لەشکری ناپۆلیۆن لە هەموو روێکەوە لە لەشکری هاوپەیمانان پرچەک و بەهێزتر بوو، ئەم خەسلەتە باشانە قەرەبوی کەمی لایەنگرانی بۆ ناپۆلیۆن کردەوە کە تەنیا ئیسپانیا بوو، ئەو شێوازەی کە ئیسپانیای پێرازی کردبوو لە سەرەتاوە دیاربوو کە درێژەناکێشێ.

رژێمی پادشایەتیی ئیسپانیا یەکێک بوو لە رژێمە پادشاکانی ئەوروپای گەندەل. ناپۆلیۆنیش لەو پەیوەندیە نهێنیەی نێوان شاژن و وەزیرەکەی ( جودوی ) ئاگادار بوو. خانەوادەی شاژن لەوە دەترسان ناپۆلیۆن ئەم نهێنیە ئاشکەراکا، هەر بەم هۆکارەوە پادشای ئیسپانیا رێککەوتنێکی ئابرویەرانەی لەگەڵ فرەنسا واژۆ کرد تیایدا دەستبەرداری لویزیانا دەبێ لە ئەمریکا، پەیمانی ئەوەشی پێدەدا کە پۆرتوگالی هاوپەیمانی ئینگلتەرا داگیرکا. دواجار ناپۆلیۆن ناچاری دەکا ساڵانە برێکی زۆر لە پارە بداتە گەنجینەی فرەنسا.

ئەمە دۆخی وڵاتانی هاوپەیمانانی دژ بە فرەنسا بوون کاتێک ناپۆلیۆن لە کێشەدا بوو لەگەڵیان و دەستی بە داگیرکردنی هانۆڤەر و ناپۆلی کرد لە ١٨٠٣. بەڵام چارەنوسی جەنگ لەسەر ئەو سەرکەوتنە وەستابوو کە لە دەریا و وشکانی بەدەستی دێنن.

ناپۆلیۆن لەسەرەتاوە هەستی بەو زەرورەتە دەکرد کە دەبێ گورزێکی بەهێز لە ئینگلتەرا بدا. چونکە ئەو تاقە دەولەتێکی دوژمن بوو کە ناتوانێ بەبی ئەوەی لە دەریا

بەسەریدا زاڵ بێ بتوانێ دەستی لێ بوەشێنێ ئەمەش کارێکی سەختە بۆ ناپۆلیۆن، چونکە لە دەریاوە سوپای ئینگلیزی بەهێزترە، بۆیە ناپۆلیۆن پلانێکی دیکەی لەسەر دوو بنەما دانا:

١/ لێدانی سوپای دوژمن لە کشوەر .

٢/ کۆکردنەوەی کەشتیگەلی ئیسپانی و فرەنسی لە بەندەری تولون و رچفورت و برست وەکو خۆسازدانێک بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیزی لە هەر دەرفەتێک کە دەرەخسێ.

ناپۆلیۆن لە پلانی یەکەمیدا سەرکەوت کاتێک لە شەڕی ئولم Ulm و شەڕی سێ ئیمپراتۆرەکە ( ئوسترلیتز Usterlitz ) سوپای نەمسا تێکدەشکێنێ، بەڵام لە پلانی دوەمیدا کە کۆکردنەوەی کەشتیگەلیەکان بوو تێیدا سەرناکەوێ، لە شەڕی دەریایی ( کەناری پیرۆز Trafalgar دا لە هەمان ساڵ ١٨٠٥ شکست دێنێ .

سەرکەوتنی ناپۆلیۆن لە شەڕی ئوسترلیتز سەرەتایەک بوو بۆ زاڵبوونی لە ئەوروپا بەڵام شکست هێنانی لە شەڕی دەریا لە ( کەناری پیرۆز) ئەوە دەگەیەنێ کە ئینگلتەرا لە دەریاوە زاڵ و بەهێزترە بۆیە دەبێ ئەم ململانێیە بەردەوام بێ لە نێوان ئەم دوو هێزە .

دوای شەڕی ئوسترلیتز بۆ جاری سێیەم نەمسا ناچار دەبێ رێککەوتنێکی ئابروبەرانە لەگەڵ فرەنسا واژۆ بکا، لە رێککەوتنی پرێسبورگ Pressburg بڕیاردرا کە فرانسوای دووەم دەست لە نازناوی ئیمپراتۆری رۆمانی پیرۆز هەڵگرێ، هەر بەپێێ ئەو بڕیارە نازناوی بوو بە ئیمپراتۆری نەمسا دیارە هەر ئەمەش زیاتر لێی دەوەشایەوە. بەتایبەت دوای ئەوەی بەپێی رێککەوتنی پرسبورگ سێیەکی دانیشتوانی لەدەست دەدا، ئێستا روون و ئاشکرایە کە ئیمپراتۆر لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا بەهێزتر نەمایەوە، کەچی بژاردەی باڤاریا و تنبورگ نازناوی پادشایان وەرگرت و مومتەلەکانیان زیاد کرد، هەروەها خاوەنی بادن یش لەسەر حسابی نەمسا زەویەکانی بەرفراوان کردن.

ئێستا ناپۆلیۆن بەپێی گونجان و ئەقلیەتی خۆی دەستی بە رێخستنەوەی ئەڵمانیا کرد، لەسەر بنەمای دابەش بونێکی سیاسیانەی سێ کوچکەیی رێکیخستەوە، بەشێکی لە باکوور پرووسیا بەسەریدا زاڵە، بەشێکی لە باشوور نەمسا بەسەریدا زاڵە، لە رۆژهەلاتیش بەشکی بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی هێشتەوە کە یەکێتی راین بوو.

ئەنجومەنی دایت لە راتسبون ناچار دەبێ رەزامەندی لەسەر ئەم دابەشیە بدا، ئەوکات کەس نەبوو دژی بڕیارەکانی ناپۆلیۆن بوەستێتەوە، ئەمە ئەو رێکارانە بوون کە ئازاری سەرکردەکانی بە پرووسیان دەوروژاندن، ئەوان ئەم دۆخەیان لا قورس بوو ، دیارە پادشا فریدریک ولیامی سێیەم ( ١٧٩٧-١٨٤٠ ) خۆی لایەنگری پیادەکردنی سیاسەتێکی میانرەوانە بوو لەگەڵ فرەنسا، بەڵام ناپۆلیۆن بواری بەم رەوتە میانرەوانە نەدەدا راو بۆچونی خۆیان بەسەر پرووسیادا بسەپێنن، ناپۆلیۆن لە گەرمەی ئەو سەرکەوتنانەدا بوو لەخۆی بایی ببو سوکایەتیی بە سوپای پروسی دەکرد، ئەو خۆی یاریی بە سیاسەتی پرووسیا دەکرد، جارێک گفتی ئەوەی پێدەدا کە هانۆڤەری بداتێ جارێک لێی پەشیمان دەبۆوە، جارێک وەکو فەرماندەی ئەوروپا ناوی پرووسیای دەبرد جارێکیتر لێی پەشیمان دەبۆوە.

ئەوەی بوە هۆکار، سەربازە پروسیەکان بەرگری لە ئابڕوی خۆیان بکەن دژی پلانەکانیان بوەستنەوە و لێی ڕاپەڕن، ئەوەبو کە شازادە ( مۆرا ) داوای خاکی پروسیی دەکرد بخرێتە سەر فرەنسا، بەو هۆیەوە هۆشداریەکی توند درایە ناپۆلیۆن کە هێزەکانی بکێشێتەوە بەری رۆژئاوای روباری راین. ئیتر ئەو شەڕە روودەدا کە پرووسیا دەیویست و ناپۆلیۆنیش لە چاوەڕوانییدا بوو.

هەرچەندە ئەوکات رووسیا لە شەڕدا بوو بەڵام پرووسیا چاوی لێبوو هاوکاری لەشکریی بکرێ، بە مەزندەی خۆی هاوپەیمانە و ئامادەیە بۆ ئەم هاوکاریە، هەروەها ساکسونیش وەکو هاوپەیمانێکی بچوک هاتە هاوکاریی.

لە شەڕی یینا Jena لە ١٨٠٦ سوکایەتی بە فەرماندە و سەربازانی پروسی کرا و خرانە ژێر نالی ئەسپەکانی ناپۆلیۆن و بە زۆری زۆردار خرانە ژێر پابەندی بەلێندان. لە فریدلان Friedland شکستێکی مەزنی بەسەر سوپای روسیدا هێنا کە کۆتایی ئەم شەڕە دەبێ.

دوای ئەوەی خۆی و سوپاکانی لە وشکانیی ئەوروپا شکست دێنن، ئێستا قەیسەر ئەسکەندەری دووەم بەتەنیا لە مەیدانی شەڕ ماوەتەوە، جگە لە ئینگلتەرا کەسی دیکەی لەگەڵدا نەماوە، بەڵام ئینگلیز لە دەریایە و لێیەوە دوورە دەستی ناگاتە ئەو ململانێیە خوێناویە. تا ئێستا ئەو لە وشکانی هیچ زیانێکی پێ نەکەوتوە، قەیسەر ئەسکەندەری دووەم هەولیدا ئینگلتەرا لەم شەڕەیدا هاوکاری زیاتری بکا بەڵام بێ سود بوو، کاتێک داوای قەرزی لێکرد، ئینگلتەرا ئەمیشیانی پێنەدا، لەتەک ئەم داواکاریانە ئەسکەندەری دوەم

و: خالید هەرکی

داوایکرد سوپای فرەنسی سەرقالکا لەو بەرەی کە رووسیا شەڕی تیادا دەکا، بەڵام حکومەتی ئینگلتەرا ئەمەشی رەت کردەوە، قەیسەری ناچار کرد هەولی رێککەوتن لەگەڵ ناپۆلیۆن بدا، ئەوەبوو لە ١٨٠٧ رێککەوتنی ( تلست Tilist ) ی مۆر دەکەن.

لەم دانوستانەی کە بە رێککەوتنی تلست گەیشت ناپۆلیۆن سور بوو لەسەر ئەوەی ئەو مامەلەی لەگەڵ ئیمپراتۆری نەمسادا کردی هەمان مامەلە لەگەڵ قەیسەر ئەسکەندەری دووەمدا نەکا، ناپۆلیۆن مەبەستی بوو قەیسەر لە دوژمنەوە بکا بە هاوپەیمان، دیارە قەیسەر خۆی ئامادە بوو ئەم رۆلە بۆ ماوەیەک بگێڕێ، بەتایبەت دوای ئەوەی نێوان قەیسەر و ئینگلیز تێک دەچێ، بۆ متمانە بەخشین ناپۆلیۆن رێگەی بە قەیسەردا فینلەندا داگیرکا، لە ئەنجامی بەرفراوان بونی دەسەلاتەکانی روسی بە ئاراستەی تەهران و دەولەتی عوسمانی لە ئەورووپا رویاندەدان گرژیەکانی نێوانیان سوک دەبن، بەو مەرجەی بەرفراوان بونی رووسیا تەنگەبەری ( بسفورد و دەردەنیل ) نەگرێتەوە .

رێککەوتنی قەیسەرو ناپۆلیۆن کە دژی پرووسیا بوو زۆر بەڕونی دیار بوو، پرووسیا لە تلست زیانی زۆری بەر کەوت، مولکەکانی پرووسیا کە دەکەوتنە سەر راین درانە شانشینی وستفالیا و دواتریش بە براکەی ناپۆلیۆن سپێردرا، میرنشینی وارشۆ لەو خاکانە دامەزرا کە هی پۆلۆنیا بوون و کەوتبوە ژێر دەستی پرووسیا.

دەبێ وا تێنەگەین کە دامەزارندنی میرنشینی وارشۆ دژی بەرژەوەندیەکانی تەنها پرووسیا بوو. بەڵکو دژی بەرفراوان بون و بەرژەوەندیەکانی رووسیاش بوو، چونکە ئەم میرنشینە دەکەوێتە هەلکەوتێکی جوگرافی کە فرەنسا دەتوانێ لەوێوە چاودێری جولە و بزاوەکانی رووسیا بکا.

ئیمپراتۆر و قەیسەر لەسەر ئەوە رێککەوتن داوا لە ئینگلتەرا بکەن دەست لە سەروەری دەریا هەلگرێ، ئەگەر گوێڕایەل نەبوو ئەوا بڕیاری گەمارۆی کشوەری بەسەردا جێبەجی دەکەین کە ناپۆلیۆن بەنیاز بوو لە هەموو کەنارەکانی ئەورووپا جێبەجی بکا بەڵکو ئینگلتەرا ناچار دەکا ملکەچی رێککەوتنێکی ئاشتەوایی ببێ.

دەلێن بڕیارە نهێنییەکانی ئەو رێککەوتنە بە ئاسانی بەدەست ئینگلتەرا نەگەیشت. تۆمەتەکە دەخرێتە سەر تالیران کە پێی وابوو ماوەی حوکمڕانی ناپۆلیۆن سنووردارە و ئەوەندەی نەماوە لەسەر حوکم دەبێ بەرژەوەندیەکانی فرەنسا بپارێزین. گوایە داگیرکاریەکانی فرەنسا تا راین دەڕوا لەوە بەولاوە داگیرکاری ناپۆلیۆنن.

بەهەر حال حکومەتی ئینگلتەرا بە بڕیارەکانی تلستی زانی، بە خێرا و بۆ جاری دووەم لە کەشتیگەلی دانمارکیی دا، بۆئەوەی ناپۆلیۆن بە کۆکردنەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان رانەگا و کارێکی هاوبەش ئەنجام نەدا.

هەر چۆنێکی بێ رێککەوتنی تلست لەگەڵ قەیسەر مانای ئەوەیە ناپۆلیۆن گەیشتە لووتکەی سەرکەوتن و گەشە سەندنی، لەوە بەولاوە بۆ پاراستنی دەستکەوت و نازناوەکەیەتی، بۆیە بەر لەوەی بچینە سەر قۆناغی داروخانی باشترە هەندێک باس لە کارە خزمەتگوزاریەکانی بکەین کە لە پێناو بنیادنانی ناوەخۆ ئەنجامی دابوو.

ناپۆلیۆن لە سەرەتای حوکمڕانییدا بایەخی بە دامەزراندنی سوپایەکی بەهێز دابوو، لەگەڵ دەرکردنی یاسای دادوەری و ئیداری و زانستی کە فەرەنسا بگەیەنێتە ئاستێکی باڵا.

هەوڵی زۆر درا بۆ دارشتنی یاسای مەدەنی و دادوەری، بەڵام زۆری کێشە و گرفتەکان بوونە رێگر لەبەردەم ئەم کارە، کاتێکیش ناپۆلیۆن دەستی خالی دەبێ کاتەکانی تەرخان دەکا بۆ دانانی یاسایەکی گشتگیر بۆ فەرەنسا کە پێی وترا ( Napoleonic Codes ) ئەم یاسایە زۆر لە بنەماکانی شۆرشی فەرەنسیی تیابوو بەتایبەت لەسەر یەکسانی و مافەکانی مرۆڤ، لەسەر بە ئاشکەرا دادگایی کردن وسەپاندنی باج بەسەر هاوڵاتیان بە یەکسانی، بۆ یەکەمین جار بوو سیستەمی سوێندخواردنی خستە ناو دادگای فەرەنسی.

سەبارەت بە شانەی یەکەمی کۆمەلگا کە ( خێزانە ) ناپۆلیۆن دەسەڵاتی رەهای بە گەورەی خیزاندا، کە باوکە، هاوسەر و منداڵەکانی خستنە ژێر دەسەڵاتی باوک، لە هەمان کات ئەو ستەمەی لابرد کە باوکەکان لە منداڵەکانیان دەکرد لە کاتی دابەش کردنی میرات، پێشتر تەنها کورە گەورەکە واتە نۆبەرە مافی بەرکەوتنی میراتی هەبوو، بەڵام بەپێی یاسای نوێ هەموو منداڵەکان مافی میراتی باوکیان بە یەکسانی هەبوو.

بۆئەوەی هەموو کۆمەلگای فەرەنسی بخاتە نێو یەک قەوارەی کەلتور و رەوشەنبیرییەوە بڕیاریدا سیستەمی خوێندن لە فەرنسا لە سەرەتایی و ناوەندی یەکبخرێ و فەرەنسا خاوەنی یەک سیستەم زانکۆبێ.

ناپۆلیۆن هاندەری زانست و زانایان بوو، بەهۆی سیاسەتی دکتاتۆریانەی گەلێک کار هەرەسیان دەهێنا، سەرەتای ئەم هەرەس هێنانە لە ئەنجامی شکستی گەمارۆی سەر ئینگلیزی دوژمنە سەرسەختەکە دەست پێدەکا.

# بەشی بیست و شەشەم

## فرەنسا لەسەردەمی ئیمپراتۆر ناپۆلیۆنی یەکەم

### ٢/ ناپۆلیۆن لە لووتکەوە تا رووخانی (١٨٠٧-١٨١٤/١٨١٥)

ساڵی ١٨٠٧ ساڵی لووتکەی هێزی ناپۆلیۆن و فرەنسا بوو، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا هۆکارەکانی دارمان دەستیان پێکرد و زۆر بەخێرایی ئەو بنیادە مەزنە دەرمێ. لە گرنگترین هۆکارەکانی ئەو دارمانەش ئەمانەن:

١/ هۆکارەکانی سەربازی.

٢/ هۆکارەکانی ئابووری.

٣/ هۆکارەکانی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی.

مانای ئەوە نیە ئەم هۆکارانە لەیەک جودا بن و پەیوەندیان بەیەکەوە نەبێ، لە راستیدا ئەم هۆکارانە بەیەکەوە بەسترابوونەوە، ئەمە ئەو هۆکارەبوە کە لە دواجار ئەوروپا بەسەر ناپۆلیۆندا زاڵ دەبێ، ئێستا بە ووردی باس لەم هۆکارانە دەکەین.

#### ١/ هۆکارەکانی سەربازی:

سەرکەوتنەکانی ناپلیۆنی وشکانی جوان بوون، ئەم سەرکەوتنانە بون کە دەولەتانی ئەورووپیی ناچار کردن رێککەوتنی ئابرووبەر واژۆ بکەن، بەڵام لەگەڵ بەریتانیا جیا بوو، جەنگ لە ١٨٠٣ وە بەردەوام بوو ئینگلتەرا توانیی خۆی راگرێ تا دوایی ئەمەش مایەی سەرسامیە. لە راستیدا سەروەری ئینگلتەرا لە دەریا هۆکاری خۆراگریی بوو، وێرای ئەمەش دەزگا ئابوریەکانی لەم شەڕانە توشی تێکدان و لەناوچون نەبوون، مەیدانی شەڕ لە

ئەوروپای وشکانی بوو بۆیە ولآتانی ئەوروپی چاویان لەوەبوو ئینگلتەرا بە مانەوەی لە مەیدانی شەڕ تۆڵەی ئەوانیان بۆ بکاتەوە، بەڵام ئینگلتەرا ئامادە بوو دەستی هاوکاری بۆ ئەو لایەنە درێژ بکا کە مەبەستی تۆلە سەندنەوە دەبێ لە ناپۆلیۆن.

فراوانبوونی مەیدانی جەنگ بۆ فرەنسا تێچووی زیاتری دەوێ، لەهەمان کاتیشدا دەرفەتی زیاتر بە دوژمنەکانی دەدا بە سیاسەتی سەربازیاندا بچنەوە. ناپۆلیۆن شێوازی نوێی لە لەشکرکێشی و هێرش و درێژەدانی شەڕ و بەکار هێنانی هەموو جۆرەکانی چەک بەکار هێنا، دواتر سەربازە ئەوروپییەکان لێیان وەرگرتەوە و لاساییان کردەوە بەڵام دوای ئەوە ناپۆلیۆن چیتر ئەو شێوازو نەخشانەی بەکار نەدەهێنا، رووی لە دادەهێنانی دیکە کرد، بلیمەتی هەرچەندەکی هەبێ سنووری هەیە، ئێستا بلیمەتی ناپۆلیۆن تەواو دەبێ ئەویش جیاوازیی نامێنێ لەگەڵ هەر بلیمەتێکی دیکەی ئەوروپی دەبێ لەسەر بنەمای سیستەمی نوێ سوپاکەی رێکبخاتەوە، ئەمە گرنگترین هۆکارەکانی شکستی سەربازیی ناپۆلیۆن بوو لە دوا رۆژەکانی حوکمڕانیی.

### ٢/ هۆکارەکانی ئابوری:

ئەم هۆکارە ئابووریانە پەیوەندیەکی توندیان لەگەڵ هۆکارەکانی سەربازیدا هەیە، بەتایبەت کاتێک پەیوەندیی بە سیاسەتی گەمارۆی ئابوریدا دەبێ، هەرچەندە ناپۆلیۆن هەموو قورسایی خۆی خستبوە سەر ئەم تەوەرە بۆ ناچار کردنی ئینگلتەرا لە رێککەوتن و دانوستان.

دوای سەرکەوتنی لە ( ییا ) ناپۆلیۆن دەچێتە ناو بەرلین لەوێ مەرسومنامەیەک بەناوی مەرسومنامەی بەرلین لە ١٨٠٦ دەردەکا، بەپێی ئەو مەرسومنامە کەشتیە بازرگانییەکانی ئینگلیز لە هەموو بەندەرەکانی ئەوروپا و دەولەتانی بێلایەن قەدەغە دەکا بۆ ئەوەی بازرگانی لە ئینگلتەرا بوەستێ، ناپۆلیۆنی یەکەم پێی وابو ئەگەر کەشتییەکانی ئینگلتەرا لە بەندەرەکان قەدەغە بکا بازرگانی ئینگلتەرا لەبەین دەچێ ئەوسا ناچار دەبێ لەگەڵی بکەوێتە دان وستان.

و: خالید هەرکی

ناپۆلیۆن لە مەرسومنامەی بەرلین و میلانۆ ئینگلتەرا پێشێلکاری سەروەری دەریا تۆمەتبار دەکا گوایە بە ڕێگەی هێزەوە خۆی بەسەریدا سەپاندوە. ئینگلتەرا لە وەلامی ئەم تۆمەتانە دەڵێ تۆش پێشێلی یاسای نێو دەولەتیت کردوە کە کەشتییەکانی ئێمەت لە بەندەرەکانی ئەوروپا لە ولاتە هاوپەیمان و بێلایەنەکانت قەدەغە کردوە. هەر لەو کاتەی کەشتیگەلی ئینگلیزی بەندەری فەرەنسی گەمارۆ دەدا. بەدوای هەر بەندەرێکدا دەگەڕان کە بتوانن بازرگانیی تیادا بکەن تا کالاکانیان پێ بگەیەننە ئەوروپا.

چونکە بازرگانییەکی گەرم لە نێوان ئەوروپا و دوو دونیا کۆن و نوێکەدا هەبوو، ئینگلتەرا بەڕێگەی کەشتیگەلەکانیەوە ئەم بازرگانێتیەی دەگواستەوە، ناپۆلیۆن باجی قورسی خستە سەر بەرهەمەکانی هەموو کۆلۆنیەکان بە بیانوی ئەوەی بە ڕێگەی کەشتیەکانی بەریتانیەوە گواستراونەتەوە. یا گوایە لە کۆلۆنیەکانی ئەوانەوە هاتوون، لەکاتێکا زۆربەیان سەرچاوەکانیان بەریتانی نەبوون.

ئاسایی بوو لەم جۆرە حالەتانەدا هەموو دەولەتانی ئەوروپی لە ناویاندا فەرەنسا و بەریتانیاش توشی قەیرانێکی دارایی و جەنگی ئابوری ببن. هەردووک لا فەرەنسا و بەریتانیا هەولی زۆریان دا بەرگەی ئەم دۆخە ناهەموارە بگرن.

بازرگان و پیاوانی کاری بەریتانی و کۆمپانیاکانی بەهۆی وەستانی مامەلەی بازرگانی ئەوروپیەکان گەلێک جار توشی حالەتی مایەپوچی دەبوون. ژمارەی بێکاری زیادی دەکرد، بەتایبەتی چونکە ئەم دۆخە لەو کاتەدا دێت کە شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا بوژابۆوە. یا بەمانایەکی دیکە بلێێن بەریتانیا پێویستی بە زیاتری بەندەری بازرگانی هەبوو بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمە کەلەکە بوەکانی.

بەلام بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم قەیرانە بەریتانیا سودی لە کۆلۆنییەکانی وەردەگرێ بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمەکانی بەو هۆیەوە وزە و توانای زیاتری پێ دەبەخشرێ.

دیارە فەرەنساش بە هەمانشێوە بەدەست گەمارۆی بەریتانیەوە ڕووبەڕووی قەیران ببۆوە، بەهۆی بەرهەم هێنانی چەوەندەر توانیی لە کێشەی کەمی شەکر و بەرز بوونەوەی نرخی ڕزگاری بێ، بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتفی کەرەستەی ڕەنگی توانیی چارەسەری ئەمیش

بکـا، دواتـر فرەنسـا لە دەوڵەتـانی کە لە گەردونـی فرەنسـا دەخـولێنەوە لەگەڵ بـازاری ئەوروپی چارەسەری ئەو کالا لێگیراوانەی بەریتانیا بکات، بەو هـۆیەوە بـاری قورسـی سـوک دەبێت، بەڵام ڕەنگدانەوەی گەمارۆی ئابوری بەسەر هەریەک لە بەریتانیا وفرنەسـا جیـاوازیی دەبێ.

بازرگانیتی بەریتانیا لەگەڵ کۆلۆنیەکانی هەروەکو خۆی دەمێنێتەوە. ئەم کۆلۆنیانە هیچ جولەیەک ناکەن بۆ داوای سەربەخۆ بون، چـونکە سـەردەمی شۆڕشـەکانی ئاسـیایی نەبـوون ئەوکات، بەتایبەتی هیند، دواتر گەمارۆکە ئینگلتەرای نەهەژاند بەڵام بـۆ فرەنسـا دۆخەکە بە تەواوەتی بە پێچەوانەوە بوو.

گەمارۆی ئابووریی سەپێندراو لەلایەن ناپۆلیۆنەوە بەسەر دەولەتانی ئەوروپی کاریەگەری زۆری بە سەریانەوەهەبوو، یاسای توندی بۆ گەمارۆی ئـابوری دانـابوو، دەولەتـانی ئەوروپـی پێیان وابو ئەم قوربانیە لە پێناو شەڕێکدا دەیدەن کە پەیوەنـدیی بەوانەوە نییـە. بەڵکـو لە پێناو شەڕێکە پەیوەندیی بە ناپۆلیۆن و ئینگلتەراوایە. هەندێک لەو وڵاتە ئەوروپیانە هەولـی دەرچونیـان دەدا لەم گەمـارۆیە کە لە کەنارەکـانی رووسـیا و سـوێد و بەلتـیکەوە دەسـت پێدەکەن تا دەگاتە کەنارەکانی پۆرتۆگال.

هەردەوڵەتە و شێوازی تـایبەتی خـۆی هەبـوو بـۆ دەرچـون لەم کۆتوبەنـدانە. سـوێد خۆی بەمە دەرباز کـرد کە تـاجی حـوکمڕانیی دایە مارشـالێکی نـاپۆلیۆن کە گەلـی سـوێدی خۆیـان نەیانـدەزانی چەنـدە نێـوانی ئەم دوو پیـاوە نـاکۆکە. پادشـای هۆڵەنـدا لـویس بۆناپەرتی برای ناپۆلیۆن دەبێ داوا لە ناپۆلیۆن دەکا هەنـدێک لەو کۆتوبەنـدانەی خـراونەتە سەر هۆڵەندا سوکیان کا، بەڵام ناپۆلیۆن داواکەی رەت دەکـاتەوە، ئەمـیش لە کـاردانەوەی ئەمە دەست لە پادشایەتی هەلدەگرێ، ناپۆلیۆنیش هۆڵەندا دەخاتەوە سـەر ئیمپراتـۆریەتی فرەنسیەوە.

لە کاتێکا باری دەولەتانی ئەوروپی رۆژ لەدوای رۆژ قورستر دەبێ لەولاشەوە نـاپۆلیۆن داوایان لێدەکا باجی زیاتر بدەنە گەنجینەی فرەنسا، ئەوروپیەکان دەپرسن ئەم باجە لەپـای چییە ئێمە دەیدەین؟ ئێستا وڵات لە پێناو رابواردنەکانی ئیمپراتۆری فرەنسا قوربـانی دەدا، ناچار دەبن رێگا بۆ هێنانی کالای ئینگلیزی بە قاچاخ بـکەنەوە، ئەم کـارە پـەرەی پێـدەدرێ

تا بە تەواوەتی گەمارۆکە هەرەس دێنێ و رێگری لە قاچاخبەری ناکرێ. بەم شێوە مەودای دورکەوتنەوە لە نێوان گەلی ئەورروپی و فرەنسا زیاد دەبێ تا دەرفەتەکان بە دروستی دەرەخسێ بۆ راپەرینی ئەورروپا دژی ئیمپراتۆریەتی فرەنسیی زۆردار. بەڵام راپەرین لەم ساتەوەختە پێویست دەکا دەولەتانی ئەورروپی جارێکی دیکە خۆیان رێکخەنەوە تا بتوانن بەرەنگاری فرەنسای بەهێز ببنەوە، لەم میانە سێ دەولەت بە بیانووی نوێبوونەوەی نەتەوی و چاکسازی کۆمەلایەتی، بەم کارە هەڵسان، ئەم پرۆسەی نوێبونەوە زۆر بەخێرا مەترسیی لای ئیمپراتۆری فرەنسا دروست دەکا.

### ٣/ هۆکارەکانی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی:

ئەو شکستە ئابروبەرانەی رووبەرووی نەمسا و پرووسیا بونەوە و ئەو سوکایەتیەی بە پادشای ئیسپانیا کرا پێویست کرا گەلانی ئەم وڵاتانە بەخۆیاندا بێنەوە، زۆر بەپەلە لە هۆکارەکانی ئەم شکستانە بکۆڵنەوە، لەم روەوە پرووسیا پێش هەموویان دەکەوێ.

سەرکردەکانی پرووسیا لەوە بەئاگا بوون کە حکومەتی پروسی بە سوپاکەی شەڕی دژی ناپۆلیۆنی دەکرد وگەلی پروسیش لە چاوەرانی ئەنجامەکەیدا بوون، ئەگەر سوپا ئەو شەڕەی بردبێتەوە. گەڵ دلخۆش دەبێ، ئەگەر بزانێ کە سوپای فرەنسی ئەوانی لەتکردوە ئەوا خۆی گۆشەگیر دەکا. ئێستا ئەرکی ئەو سەرکردانە پرکردنەوەی ئەو بۆشاییەیە کە لە نێوان حکومەت و گەل دروست بووە بۆ ئەوەی مۆرالی میللەت بەرزکاتەوە و بگەیەنێتە ئاست خۆراگری و قوربانییەکانی. ئەو جەنگەی دەگوزەرێ بۆ تاقیکردنەوە و ئەزموون وەرگرتن نییە بەڵکو شەڕێکی مان و نەمانی بەرگریی نیشتمانییە، مەبەست دروست کردنی سوپایەکی نەتەویی بەهێزە، ئەم ئامانجەش قورسە چونکە تەنها بە پەرەپێدانی چۆنێتی سوپا ناکرێ بەڵکو بە پەرەپێدانی پەیوەندیەکانی نێوان جووتیار و حکومەت و نیشتمان دەکرێ. لە گرنگترین چاکسازییەکان، نەهێشتنی یاسای کۆیلایەتی بوو، ئێستا ئەو کۆیلانە بە خاکیانەوە بەستراونەتەوە پابەندی فەرمانەکانی حکومەتیانن کە بەرگریی لێ بکەن، بەڵکو لەم دۆخە سوپای پروسی شکست بێنی بەڵام جووتیارەکان ئامادەن ئەم ئازارە هەرسکەن و خۆیان بۆ بەرگرییەکی دیکە ئامادەکەن تا خۆی لەسەر خاکی خۆیدا بسەپێنێ

چونکە ئەم سوپایە سوپای جوتیارانە سوپای کرێگرتەکان نەماوە، سوپایەکی نەتەوەی بوو هەر لە سەربازەوە تا بالاترین ئەفسەر و فەرماندە، سوپا نوێکەش خوێندنگا بوو بۆ فێرکردنی ڕەوشت و ئابڕوومەندی، ئیتر تەنها بە کاری باش و قوربانی دان دەتوانرێ مەدالیای ریزلێنان هەلگرێ.

هەروەکو جووتیارانی پروسی ئازادییان وەرگرت ، فەرمان بە شارنشینەکان درا خالە گومرگییەکانی نێوان شارەکان هەلگرن و بازرگانی ئازاد بێ لە نێوان شارەکان، بەم بڕیارەش شارەکان لە پاشماوەی چەرخی ناوەڕاست رزگاریان دەبێ. لە بواری پەروەردە و فیرکردندا، زانکۆی بەرلین دامەزرا کە دووربێ لە دەستی ناپۆلیۆن. بەم شێوە چاکسازییەکان بە هاوشانی بنیادنانەوەی نەتەوی و بەهێز کردن و رێکخستنەوەی سوپا دەرۆیشت هێمنانە هەنگاو دەنرا لە چاوەروانی خولی داهاتوی شەڕی نێوان پرووسیا و فرەنسا، ئەوانەی بە ئامادەکاریەوە خەریک بوون هەمان ئەوانە بون کە هاندەری چاکسازی بون، لە سەروی هەموویانەوە شاژن لویز و شارنهورست و فون شتاین.

لە نەمساش بزووتنەوەیەکی چاکسازی هەموو بوارەکانی ئیداری و سوپایی گرتەوە بەلام بە بەراورد لەگەڵ پرووسیا نەختێک هێواشتر دەچوو بەرێوە ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە نەمسا ولاتێکی فرە نەتەوی بوە زۆرینەیان لەژێر کاریگەری کەلتوری ئیمپراتۆردا بوونە گۆڕانکاری بە ئاسانی ئەنجام نادر دەبونە گرفت لەبەر دەم چاکسازیەکانی کۆمەلایەتی، وێرای ئەمە نەمسا بە ئاستی پرووسیا کەسانی چاکسازیی بۆ ئامادە نەکردبوون ئەو کەسانەی بۆ ئەم بوارە خۆبەخشانە هاتنە مەیدان کەمتر بوون لەوەی پرووسیا .

بەهەرحاڵ چاکسازی لە نەمسا ئەنجام دراو لە داهاتوو دەبنە بەربەستێکی مەزن لەبەردەم سوپای ناپۆلیۆن.

بەهۆی ئەو سوکاتیەی ناپۆلیۆن بە پادشای ئیسپانیا و گەلەکەی کرد، چاکسازی لەو ولاتە کە کۆنەپارێزترین ولاتی ئەوروپایە زۆر بە قورسی دەچو بەرێوە، سەرەتا ناپۆلیۆن ئەو دەرفەتە دەقۆزێتەوە کە خانەوادەی بۆربۆنیی گەندەڵ ناتوانی هێرش بکاتە سەر پۆرتوگال و کەناڵەکانی بازرگانی لە ئینگلیز بگرێ ، سوپایەک دەنێرێتە ئیسپانیا بۆ ئەم ئەرکانە، وا مەزندە دەکا کە خانەوادەی پادشای بۆربۆنی کەوتونەتە ژێر دەسەلاتی خۆی، ئەگەر دوریانخاتەوە گەلی ئیسپانی پشتگیریی لێدەکەن، بەلام پادشا بۆ دەرچون لەم تەنگژە

و: خالید هەرکی

دەستی لە کار کێشایەوە و کوڕەکەی دانایە شوێن خۆی، کەچی ناپۆلیۆن هەردووکیانی (باوک وکوڕ)ی دورخستنەوە و جۆزیف ی برای دانایە شوێنی، ئەوەی مەزندە دەکرا وا نەبوو لە هەموو شوێنێک لە دژی ناپۆلیۆن و بەرنامەکەی راپەرین ، ( لیژنەی ناوەندی) دامەزرا داوا لە کورتیز( پەرلەمان ) ی ئیسپانیا کرا بزووتنەوەیەکی چاکسازی دەستوری دەست پێبکرێ.

سوپای ئیسپانی ئامادە کرا بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپای فرەنسی. سوپای فرەنسی خەسلەتێکیان هەبوو خۆبەزل زان بوون، پێیان وابو جوگرافیای ئیسپانیا شاخاوییە دەتوانن رێگری لە شەڕی پارتیزانی بکەن. بەڵام سوپای ئیسپانی لە شەڕی ( بایلین ) لە حوزەیرانی ١٨٠٨ سەرکەوتنێکی مەزن بەدەست دێنێ تەنانەت فەرماندەی سوپای فرەنسیان ناچاری خۆوەدەستەوەدان کرد. بەم شکستە شکۆی ناپۆلیۆن و سوپاکەی لە ئەوروپا دەشکێ سوپای فرەنسی ئەو سوپایە نامێنی کە دەڵێن هەرگیز نابەزێ. ئەوەتا لاوازترین گەلی ئەوروپی سوپای فرەنسیی بەزاند. بەم سەرکەوتنەی سوپای ئیسپانی دەولەتانی زیان پێکەوت و چاویان لەو دەرفەتە بوو کە تۆلەی شکستەکانیان لە سوپای ناپۆلیۆن بکەنەوە، ناپۆلیۆن لەوە دڵنیا بوو کە نەمسا لە وناوە گورزێکی لێ دەوەشێنێ، نەمسا ئەم شکستەی بە دەرفەت زانی دوبارە گەرایەوە مەیدانی جەنگ، ناپۆلیۆن وەکو ئامادەسازی سوپاکەی دەکێشێتەوە بۆ کەناری دانوب تا لەوێ رووبەڕووی سوپای نەماسیی ببێتەوە.

لە واگرام شەڕ لە نێوان سوپای نەمسایی و فرەنسی رویدا، هەرچەندە سوپای نەمسایی بە تاکتیک و ئامرازێکی نوێ پرۆسەی شەڕیان دەبرد بەرێوە بەڵام دواجار بە هەولێکی زۆر ناپۆلیۆن لەم شەڕە سەردەکەوی بەسەریدا.

لە راستیدا نەمسا لەم شەڕە دۆڕا بەڵام خۆ شەڕ لە ئیسپانیا بەردەوامە و دەکرێ لە هەر پارچەیەکی دیکەی ئەوروپا هەمان شەڕ لەگەڵ سوپای فرەنسی رووبدا. ئەمجارەیان بەرگری لە وڵاتێکی سەربەخۆوە توشی ناپۆلیۆن دێ نەک وڵاتێکی ژێر دەستی ئەویش رووسیایە، قەیسەری رووسیا ئەسکەندەر لەم گەمارۆیەی خرابوە سەریان بێزار ببو زیانی زۆری پێ کەوتبوو، رێگەی بە کالاکانی بەریتانی و بازرگانەکانیدا بێنە وڵاتەکەی، ئەمەو بێزاری قەیسەر لەوەش هاتبوو کە پرسی قوستەنتینیە (ئاسیتانە) یەکلایی نەدەکرایەوە، قەیسەر مەبەستی بوو ناپۆلیۆن رازیبێ رووسیا دەست بەسەر قوستەنتینیەدا بگرێ، بەڵام ناپۆلیۆن خۆی دەهێنا و دەبرد چونکە ئەو بایەخی ئەو فراوان بونەی رووسیای دەزانی کە

مەبەستیەتی بگاتە دەریای سپیی ناوەڕاست. مانەوەی دەوڵەتی عوسمانیشی پێباش بوو تا هەردەم ببێتە بەربەستێک بۆ روسەکان.

دواتر هاوسەرگیری ناپۆلیۆن لە شازادەی نەمسا قەیسەری بێزار کردبوو چونکە دەیزانی ئەمە هاوسەرگیرییەکی سیاسییە ، بەمەبەستی یەکخستنی سیاسەتی نەمسا و فرەنسایە لە دژی رووسیا. ئیتر هەریەک لە قەیسەر و ناپۆلیۆن بڕوا و متمانەیان بە یەکتری نەما، ناپۆلیۆن پێی وابو ئەگەر قەیسەر لە ڕێککەوتنی تلست بکشێتەوە دەبێ گورزێکی لێ بوەشێندرێ لە شێوەی ئەو گورزەی لە شەڕی فریدلاند لە ١٨٠٦ لێی وەشاند. ئەمە لێکدانەوەیەکی هەڵەی ناپۆلیۆن بوو چونکە لە فریدلاند رووسەکان هێرشیان کردبوە سەر ئەوروپا، بەڵام لە ١٨١٢ ناپۆلیۆن هێرشی کردبوە سەر ناوچەرگەی رووسیا، جگەلەمەش لە ١٨٠٦ ناپۆلیۆن بە سوپایەکی نەتەوی هێرشی کردبوە سەر روسەکان بەڵام لە ١٨١٢ فرەنسا بە سوپایەکی تێکەلاو لە فرەنسی و ئەڵمانی و ئیتاڵییەکان هێرشی کرد.

بەم سوپایە زەبەلاحە ناپۆلیۆن هێرش دەکاتە سەر رووسیا بێ ئەوەی هیچ ڕووبەڕوو بوونەوەیەک بکرێ. سوپای روس لەبەردەم سوپای ناپۆلیۆن پاشەکشە دەکا تا دەیگەیەننە مۆسکۆ لەوێ ناپۆلیۆن ئەو هەلە دەکا لە بنکەکانی دور دەکەوێتەوە دەستی پێیان ناگا کاتێک مۆسکۆ دەسوتێ سوپای فرەنسی ناچار دەبن بگەڕێنەوە دواوە لەم ساتە بەرگری میلی و سوپای روسی بەدوایان دەکەون، هەڵە گەورەکەی ناپۆلیۆن ئەوە دەبێ بەکام ڕێگای کە رۆیشتبون بەو ڕێگایە دەگەڕێنەوە، زیانێکی زۆر بەر سوپای ناپۆلیۆن دەکەوێ لەو ژمارە سەربازەی کە بردبونی مەزندە دەکرێ نیوەی لەناو چووبێ، کاتێکیش سوپاکەی فرەنسا دەگاتەوە ناوچەرگەی ئەوروپا سوپای قەیسەر لە چاوەروانیەتی، بەم شێوە ناپۆلیۆن نەک لەسەر دەستی سوپا دەبەزێ بەڵکو لەسەر دەستی یەکگرتنی سوپا و گەل دەبەزێ و ئەو زیانەی پێ دەکەوێ، بەم سەرکەوتنە ئەوروپا هەڵسایە سەرپێ بانگەوازی دژایەتی و ڕاپەڕین لە سوپای فرەنسی و وەدەرنانیان هەموو شوێنێک دەگرێتەوە، خاکی ئەوروپا دەبێتە خاکێک دژی سوپای فرەنسی. گەلی پروسی لە هەموو گەلەکان زیاتر ئارەزوو جۆشی شەڕکردنیان هەبوو لە دژی سوپای فرەنسی ئیتر پادشاکەیان ناچار دەکەن دژی ناپۆلیۆن بکەوێتە شەڕ، دوای ئەو نەمساش بڕیاری بەشداری لە شەڕ دەدا.

لە راستیدا سۆز و جۆشی پروسیەکان بۆ شەڕی دژ بە ناپۆلیۆن زۆر بوو بەڵام هێزی ناپۆلیۆن بەتوانا مابۆوە، پرووسیا ئەوە نەبوو بتوانێ سوپای ناپۆلیۆن بەم پێکهاتە ببەزێنێ، بەڵام بەشداریکردنی نەمسا لە تەک پرووسیا لەو کاتەی کە ناپۆلیۆن تازە لە دوو شەڕی (

و: خالید هەرکی

لوتزن وبوتزن Lutzen , Butzen ) دا بەسەر سوپای پروسی سەرکەوتبوو و تای تەرازوی هێزەکان بەلای هاوپەیمانی ( پرووسیا، نەمسا، رووسیا ) دا دەگۆڕێ، سەرەڕای هەلمەت و هاوکاریەکانی سوپای ئیسپانی و ئینگلیز کە بەرەو مەیدانی جەنگ دەهاتن، ناپۆلیۆن پێی وابو ئەگەر لەم شەڕە سەرکەوێ دەتوانێ پارسەنگ بگۆڕێ و بەسەر هەموو ئەورووپادا زاڵ بێ هەروەکو لە شەڕی (ئسترلتز) بەڵام ناپۆلیۆن جارێکی دیکە ( ئسترلز ) نابینێتەوە گەلی ئەورووپی هەموو بوو بە دوژمنی ناپۆلیۆن سوپا لەدوای سوپا بۆ مەیدانی جەنگ دەنێرێ، ئێستا ئەو شەڕی گەلی ئەورووپی دەکا نەک حکومەتەکانی.

بیرکردنەوەی ناپۆلیۆن لە وەدەست هێنانی سەرکەوتن بەڵکو لە جێی خۆی بێ، بەلام بیرکردنەوەی هاوپەیمانانیش ئەوەبو کە درێژەدانی شەڕ نیشانەی ئەوەیە ناپۆلیۆن هێزی نەماوە. هەولەکانی چارەسەری ئاشتییانە شکست دێنن، لە شەڕی ( لیبزگ یا شەڕی گەلان لە ١٨١٢/١٠/١٦ شکستێکی مەزنی ناپۆلیۆن دەبێ دوای ئەو شکستە هێزەکانی هاوپەیمانان لە باکوورەوە دەچنە ناو خاکی فرەنسا و هێزەکانی ئیسپانی و ئیگلیزیش لە باشوورەوە، هەرچەندە گەلی فرەنسی بە توندی بەرگرییان لە ولاتەکەی کرد بەڵام هێزەکانی هاوپەیمانان توانیان بەسەریاندا زاڵ بن . لەم ئان و ساتە ناپۆلیۆن گوێرایەلی ئامۆژگاری هەندێک لە جەنەراڵەکانی دەبێ لە بەرژەوەندی کورەکەی کە پادشای رۆما بوو دەست لە ئیمپراتۆریەت ، لە ١٨١٤ فرەنسا جێدەهێلی و بەرەو دورگەی ( ئەلبا ) ی ئیتالی دەڕوا، دوای ماوەیەک بەخۆی ناوەستێ دووبارە دەگەڕێتەوە فرەنسا گوایە بۆ رزگارکردنی لەدەست لویسی هەژدەهەمی بۆربۆنی کە لەسەر نوکی شمشێری ئینگلیزەکان و پروسی و نەمسایی دەگەڕێتەوە سەر حوکمی فرەنسا. بۆ رزگار کردنی فرەنسا لە بێ شکۆمەندیی گەلی فرەنسی دەرفەتێکی تری پێدەدەن، بەڵام بابەتەکە بلیمەتی مەیدان نەبوو هێزی هاوپەیمانی یەکلاکەرەوە زاڵ بوو. سەرەتا بەسەر ( بلوخر)ی پروسیدا سەردەکەوێ، بە دەستوبرد هێزەکانی کۆدەکاتەوە روو بەروی هێزەکانی هاوپەیمانان دەبێتەوە کە بە فەرماندەی ( ولنگتون ) بوو، هەردەبێ ئەمجارەیان ناپۆلیۆن ببەزێنن، بەزاندنی دواجاری ناپۆلیۆن لە واتەرلۆ لە ١٨١٥ دەبێ. دوای ئەوە بۆ ( سانت هیلانە ) دوری دەخەنەوە، لە ١٨٢٢ هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکا و تەرمەکەی لە سەردەمی لویس فیلیپ دەهێننەوە فرەنسا، کە دەبێتە زانستێک بۆ زیندووکردنەوەی فرەنسا.

# بەشی بیست و حەوتەم ( دوابەش )

## فەرەنسا لە دوای رووخانی ناپۆلیۆن

دوای شکستی ناپۆلیۆن گەڕانەوەی لویسی هەژدەهەمی بۆربۆنی بۆ سەرتاجی پادشایەتی فەرەنسا چی بەسەر ئەورووپادا دێ؟ بۆ وەلامی ئەم پرسیارە بڕیاردارا کۆنگرەیەکی نێودەولەتی لە ڤیەننا ببەسترێ.

دەبوایە بەشداربوانی ئەم کۆنگرە نەخشەیەکی نوێی ئەورووپا دارێژنەوە، ئەو رووداو و گۆرانکاریانەی لە ئەنجامی شەڕەکانی شۆڕشی فەرەنسی و ناپۆلیۆنەوە بەسەر ئەورووپادا هاتن سیما و نەخشەی ئەورووپایان گۆڕی.

سەبارەت بە فەرەنسا ، سەرکەوتووەکان لە ئەندامانی کۆنگرە بڕیاریاندا مەرجی قورس بەسەر فەرەنسادا بسەپێنن، لەو مەرجانە بن کە لە پەیماننامەی پاریس لە ١٨١٤ لە ئەنجامی دەست لەکار کێشانەوەی ناپۆلیۆن رەزامەندیان لەسەر دابوو، بۆیە پەیماننامەی پاریسی دووەم لە هی یەکەم توندتر بوو.

لەم پەیماننامە فەرەنسا دەست لە ( میرنشینی بویلون Bouillon ) و بەشێک لە زەویەنزمەکان هەلگرێ، سنوورەکانی دەگەڕێنەوە سالّی ١٧٩٠ واتە کەمتر لەوەی لە پەیماننامەی ١٨١٤ دەستی کەوتبوو، سزایەکی مەزنی شەڕیان بەسەردا سەپاند لەگەل داگیر کردنی بەشێک لە خاکی.

فەرەنسا بوێرانە رووبەرووی شکستەکانی بۆوە، گەلی فەرەنسی دەبێ بسەلمێنێ کە توانای گێرانەوەی تواناکانیان هەیە بەخێرایی دوای ئەو شکستە مەزندە نەکراوە، ئەمە دوای روخانی ناپۆلیۆن روو دەدا هەروەها دوای شکستی فەرەنسا بەرانبەر بە ئەڵمانیا لە ١٨٧٠.

و: خالید هەرکی

فرەنسا لەژێر سایەی لویسی هەژدەهەم کە خرابوە ژێر بارێکی قورسەوە، توانیی سزاکانی جەنگ بدا، هەروەها توانیی هەر دوای سێ ساڵ لە شەڕی واتەرلۆ لە ١٨٠٨ هاوپەیمانان رازی بکا تا سوپاکەیان لە فرەنسا بکێشنەوە.

دیارە هەڵوێستەکانی نێودەوڵەتی هاوکاربون تا فرەنسا تواناکانی ببوژێنێتەوە، نەک هەر تواناکان بەڵکو پێگەی نێودەولەتیشی. بە پێی سیاسەتی هاوسەنگی نەدەبوایە فرەنسا لەژێر داگیرکاری ئەوروپادا بێ چونکە نەمسا و ئینگلیز مەبەستیان بوو فرەنسا بێتەوە سەرخۆی پێگە و تواناکانی بۆ بگەرێنەوە.

دوای رووخانی ناپۆلیۆن رووسیا بوە هێزێکی زەبەلاح هەڕەشەی لەسەر وڵاتانی ئەوروپادا دەکرد، ئەگەر لەگەڵ هەندێک دەولەتیش بەتایبەت پرووسیا هاوپەیمانیی ببەستبایە ئەوا بە تەواوەتی دەیتوانی بەسەر ئەوروپادا زاڵ بێ. بۆیە فرەنسا بۆ نەمسا و ئینگلیز گرنگ بوو، ئەم زەرورەتە لە کاتی کۆنگرەی ڤیەننا لە دابەش کردنی دەستکەوتەکاندا باشتر دەرکەوت، رووسیا چاوی لە دەستکەوتی زۆر بو گوایە ئەو لە باکوور سوپای ناپۆلیۆنی تێکشکاندوە، دابەشییەکانیش بەم شێوە بوون:

١/ رووسیا وارشۆی بەرکەوت، بەڵام بە دیدی هاوپەیمانان ئەمە مەترسیدارە چونکە هاوسەنگی هێز تێکدەدا.

٢/ نەمسا کەناری دالماسی بەرکەوت جگە لە گەڕانەوەی میلانۆ و زاڵ بونی بەسەر دەوڵەتۆکەکانی ئیتاڵی.

٣/ بەلژیک خرایە سەر هۆڵەندا تا ببنە دەولەتێکیَ بەهێز بتوانن لە داهاتو بە رووی هێرشەکانی فرەنسا بوەستنەوە.

٤/ پرووسیا هەندێک لە زەویەکانی ئەڵمانیای وەرگرتەوە کە لە داهاتوو بوە رێخۆشکەر بۆ ئەوەی فەرماندەیی ئەڵمانیا بچەسپێ.

٥/ هەرچی ئینگلتەرا بوو دەستکەوتی زۆری بەرکەوت بەڵام لەودیو دەریاوە، وەکو : کاب، ماڵتا، سیلان، موریشوس، بەندەری جنوەشی لەگەڵ بیدمۆنت یەکخست.

٦/ سوێدیش نەرویژی بەرکەوت هەرچەندە نەرویژ پێی ناخۆش بوو بچێتە ژێر فەرمانرەوایی ئەو، بەڵام ئەسکەندەری قەیسەری روس پێی لەسەر پەیمانی خۆیداگرت کە گفتی بە

سوێد دابوو نەرویژی پێبدا، کاسلری سەرۆک وزیرانی بەریتانیا هەڕەشەی لە نەرویژکرد ئەگەر رازی نەبێ بچێتە ژێر حوکمڕانی سوێدەوە.

ئێمەش هەندێک تێبینیمان لەسەر ئەم یەکلاییکردنەوە هەیە:

١/ ئەم یەکلاکردنەوە جەختی لەسەر ( مافی شەرعیەت ) کە گەڕاندنەوەی پادشا لە کارلادراوەکانی سەردەمی شۆڕشی فرەنسی و ناپۆلیۆن بوون، بەڵام حساب بۆ نەتەوایەتی نەکرا. ئەو حکومەتانەی دوای ناپۆلیۆن هاتن کاریان لەسەر چەسپاندنی دەسەڵاتەکانیان و دژایەتی بزووتنەوە پێشکەوتوخوازەکان و نەتەویەکان دەکرد، گوایە هەر چاکسازیەکی پێشکەوت و دەبێ دەستوری بێ ئەمەش واتا لەدەست دانی دەسەڵاتەکانی پادشا دێت، ئەگەر ئامانجەکانی نەتەوایەتیش جێبەجێ بکرێن دەبێ هەندێک لە پادشاکان دەست لەکار بکێشنەوە.

خەباتی گەلی ئەڵمانی و ئیسپانی دژی ناپۆلیۆن وهەستی بەلژیکییەکان و ئیتاڵییەکان بە ستەملێکردن لە مافە نەتەوایەتیە کانیان کە کەوتونەتە ژێر دەستی حکومەتی بێگانە یا گەندەڵ ئەمانە بوونە رێخۆشکەر بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی لەو وڵاتانە.

ئەم یەکلایی کردنەوانە دژی هەستی نەتەوایەتی بوون بۆ هەندێک لە گەلانی ناوچەکە، بەنمونە هەلوێستی وڵاتانی هاوپەیمان لە گەلی نەرویژی کە رازی نەبوو بخرێنە ژێر حوکمی سوێدی دواتر هەڕەشەیان لێکران، هەروەها دۆخی بەلژیک کە بە نەخوازراوی خۆی خرایە ژێر حوکمی هۆلەندی دواتر بە شۆڕش رزگاریان دەبێ. نمونەی سێیەم باکووری ئیتاڵیا دەخرێتە ژێر حوکمی راستەوخۆی نەمسا، گەل رقی لەو حوکمە دەبۆوە.

٢/ دەوڵەتە مەزنەکان ( رووسیا و پرووسیا و نەمسا و ئینگلتەرا ) کاتێک بەم یەکلاییکردنەوە هەلدەستان خۆیان بە خاوەنی ئەوروپا و پارێزەری ئاشتیی دەزانی کە لە شەڕێکی دیکەی هاوشێوەی شەڕی ناپۆلیۆن بیپارێزن، بەڵام مەبەستیان نەبوو ئەمە ئاشکەرا بکەن کە مەبەست لە پاراستنی هاوسەنگی هێز رێگە نەدانە بە بەریتانیا لەودیو دەریاوە سنوورەکان بەرفراوان بکا، دواتر ئەم هاوسەنگی هێزە هەمیشە لە بەرژەوەندی ئینگلتەرادا بوە هەر لایەنێکیش مەبەستی بوایە لە کۆلۆنییەکانی بەشداری بکا بە بیانووی تێکدانی هاوسەنگی نێودەوڵەتی رێگریی لێدەگرت.

و: خالید هەرکی

ئەمە ئەو رێککەوتن و یەکلایی کردنەوانە و رەخنەکانمان بوون، کە گرنگترین کار بوو ئەوروپا پێیەوە سەرقال بوو، مەبەستمان ئەمەیە:

١/ هەوڵە بەردەوامەکانی فەرنسا بۆ گەڕانەوەی بۆ ئاستی بەهێزی جاران و گرتنەوەی پێگەی نێودەوڵەتی خۆی لە هاوسەنگی نێودەوڵەتی و ئاڕاستەکردنی کارەکان.

٢/ دەرکەوتنی شۆڕشی چاکسازی دەستوری دژی پادشاگەرایی ستەمکار.

٣/ سەرهەڵدانی شۆڕشی نەتەوی بۆ راستکردنەوەی دۆخە هەڵەکان کە دەوڵەتە مەزنەکان لە ١٨١٤-١٨١٥ بڕیاریان لەسەر دابوو.

دەبا ئێستا هێزە سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتیە مەزنەکان دیاری بکەین کە رۆلیان هەبوو لە ئاراستەکردنی چالاکیەکان لە هەموو بوارەکاندا. وێڕای ئەو چارەسەرییە سیاسیانە دۆخی تری نوێ چەسپابون کە دەوڵەتە مەزنەکان و سیاسەتمەداران لەتواناياندا نەبوو لێی دەرچن.

( بنەمای مولکیەتی شەرعی ) ئەو مولکانەی بۆ خاوەنەکان گەڕاندنەوە کە پێش شۆرش هەیانبوو، ئەوەتا جووتیاری ئەوروپا بەتایبەتی فرەنسا دەستکەوتنی مادیان وەدەست دێنن بەو هۆیەوە رێچکەی ژیانی ئابوری وکۆمەلایەتیان دەگۆڕدرێ، ئەو زەویانەی لەژێر دەستیاندا بون بۆیان مانەوە، ئێستا باجە کۆنەکە نادەن، سیستەمە ستەمکارەکە نەماوە، رژێمەکانی دوای ١٨١٥ دەستکاری دۆخی جووتیاریان بە هیچ شێوەیەک نەکرد تا توشی قەیران و کێشە نەبن. لە راستیدا لە سەردەمی پادشای فرەنسا چارلسی دەیەم ( ١٨٢٣- ١٨٣٠ ) هەندێک ئاراستەی کۆنەپەرستانە لە فرەنسا هەبوون، بەلأم نەیانتوانی دەستکاری دەستکەوتەکانی جووتیار بکەن.

ئەمە مانای ئەوە نییە دۆخی بژێوی جووتیاران سەقامگیر بوو بەلأم ئیتر نەیانتوانی نە حکومەت نە نا حکومەت دەست لە دەستکەوتەکانیان بدەن، بەلأم هۆکارێکی تر هەبوو ناوە ناوە هەڕەشەی لە جووتیاران دەکرد ئەویش هۆکاری ئابوری بوو، هەرچەندە شێوازی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی دواکەوتووانە بوو بەلأم هەر لە پێشەوەی بەرهەمە پیشەسازیەکاندا بوو، هەر کێشە و قەیرانێکیش رووبەڕووی ئەوروپا ببوایە سەرەتا لە کشتوکاڵەوە دەستی پێدەکرد.

بازرگان و پیشەوەران زیانی زۆریان لە ئەنجامی دارمانی گەورە مولکدارەکان لێدەکەوێ، گەڕاندنەوەی مولکەکان کارێکی ئەوتۆی ئەرێنی ناکاتە سەر ئەم دۆخە، بۆیە ئاراستە گشتییەکان بەرەو پیشەسازی دەچوون، لەم رووەشەوە بەریتانیا بەسەر هەموو لایەکدا زاڵە لەروی تەکنەلۆژیای گواستنەوە و پیشەسازی بۆیە سەرمایەداری بەریتانی دەبوژێتەوە و سوودمەند دەبێ، توانای بەرهەمهێنانی دەرەکیان دەبێ لە بواری قەرزپێدان بەتایبەتی و لە وڵاتانی فەنسا و رووسیا  ئەڵمانیا.

پیشەسازی دەستکرد گەشەدەکا و بەرەو پیشەسازی ئامێری دەچێ. لەم بوارە بەریتانیا پسپۆری و شارەزایی زۆری پێشکەش کرد بۆ هەناردە کردنی ئامێر وشارەزایی، بەو هۆیەوە پیشەسازی بەلژیکا دەبوژێتەوە بوژانەوەی لە هی فرەنسا زیاتر وخێراتر دەبێ چونکە پیشەسازی ئامیری لە فرەنسا تا دوای شۆڕشی ١٨٣٠ پەرە ناسەنێ. ئەمەو پەرەسەندنی پیشەسازی لە ئەڵمانیا وئیتاڵیا و نەمسا هێواش دەبی بەڵام رووسیا لەم بوارە جێ دەمێنی.

ئەگەر گەڕاندنەوەی مولکەکان و پەرەسەندنی ئابوری کاری کردبێتە سەر ئاراستە کردنی سیاسەتی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەهەم ئەوا بەبێگومان دەوڵەتانی راسپێردراوی دەولەتە مەزنەکان و زیانلێکەوتوانی شکستی ناپۆلیۆن رۆلی گرنگیان دەبێ لە ئاراستە کردنی کاروباری وڵاتەکانی خۆیان لەسەروی هەموویانەوە ئەم هێزانە:

١/ ئەفسەرانی سوپای ناپۆلیۆن و فەرمانبەرانی کە لە گەڵ فەرمانگەی ئیمپراتۆری فرەنسی کاریان دەکرد.

٢/ ئەو رۆشەنبیرانەی رقیان لە هەولەکانی پیاوانی ئاینی بو گەڕێنەوەیان بۆ سەر دەسەلات لەگەل هەولەکانی پادشاکان بۆ مانەوەی دەسەلاتەکانیان یا سەپاندنی هەژموونیان بەسەر دەستوردا. زانکۆکان بەرهەلستی ستەمی پادشاکانیان کرد لە گەڕانەوەی خانەدانەکان بۆ سیستەمی دەرەبەگایەتی، ئەمەو رەوشەنبیران داوایان دەکرد ریز لە ئازادی تاک و ئازادی رۆژنامەگەری بگیرێ مافی وەرگرتنی دەستوری بۆ گەل دەستەبەر بکرێ، ئێستا رەوشەنبیران خۆیان بە پارێزەری مافی تاک دەزانی، پێیان وابو ئەمە مەرجی بنەرەتی پێشکەوتنی مرڤایەتییە.

رۆشەنبیران لە هەموو توێژەکان زیاتر پابەندی بنەماکانی شۆڕشی فرەنسی بوون، ئەوان لە هەمو ئەوروپا بە کۆچبەری پەراگەندە ببوون بەتایبەت لە شارە مەزنەکان، لە راستیدا پەیوەندیەکی ئەو تۆ لە نێوان ئەو رەوشەنبیرانەدا نەبوو بەلام هەرکاتەیَ لە هەر شارێک بزووتنەوەی ئازادیخوازانە سەری هەڵدابا بەخێرا پەرەی دەسەند دەگەیشتە شارەکانی دیکە بێ ئەوەی پەیوەندیەکی شۆڕشانەیان لە نێواندا هەبێ.

لە نێوئەو رووناکبیرانەدا هەندێک زانای مەزن هەلدەکەون مەبەستیانە بنەمایەکی نوێ بۆ ئەوروپا دارێژن، لەو زانایانە : کارل کارلوس و هنری سان سیمون داوای هاوهەڵوێستی یا یەکێتیان بۆ وڵاتانی ئەوروپا دەخواست کە لە شێوەی فیدرالی بێ. سان سیمون داوای دەکرد ئەو رێکخراوە ئەوروپیە کار بۆ دابینکردنی ئاشتی و ئارامی بکا لەگەڵ هەولی چارەسەر کردنی کێشەکانی ئەوروپی لە نێو خۆیاندا و هاوکاری ئەو وڵاتانەی کە لە ناپۆلیۆن زیانیان پێکەوتوە، ئەم هزرو بیرۆکانە لە دەرکەوتندا بوون کاتێک کۆنگرەی ئەوروپی لە نێوان دەوڵەتە مەزنەکاندا دەبەسترێ.

یەکەمین کۆنگرەی لەم بابەتە لەسەر فرەنسا لە ١٨١٨ لە لاشابیل دەبەسترێ، ئەوکات سێسالَ بەسەر حوکمڕانی لویسی هەژدەهەم تێدەپەرێ بەڵام ئەو دەتوانێ بەسەر تەنگژەکاندا تێپەرێ و زیانی جەنگ بداتەوە، داواشی لە هاوپەیمانان کرد هێزەکانیان لە خاکی فرەنسا بکێشنەوە، سەردەمی کۆنگرەکان دەرهاوێشتەیەکی ئاسایی شکستی ناپۆلیۆن بوو دیارە کە هیچ دەوڵەتێک ئەوەندە بەهێز نابێ بتوانێ ئاراستەی سیاسەتەکانی ئەوروپا بگۆڕێ و یەکیان بخا. وێڕای ئەوەی ئەوروپا دژی زاڵبوونی یەک دەولەت بوو بەسەر ئەوروپادا بەتایبەتیش ئەگەر ئەو دەولەتە فرەنسا بێ، یا ناپۆلیۆن بێ یا یەکێک لە خانەوادەی بێ بۆیە هاوپەیمانی چوارقۆلی لەدایک دەبێ. ( نەمسا، رووسیا، پرووسیا، ئینگلتەرا ) ئیتر ناوە ناوە کۆنگرە دەبەستن لە پێناو چارەسەری کێشەکانی ئەوروپا.

هەر لەو سەردەمە ( هاوپەیمانیی پیرۆز) دادەمەزرێ( رووسیا، نەمسا، پرووسیا) لە نێوان قەیسەر ئەسکەندەر و کاسلریە و کاننگ. ئیتر لەو کاتەوە هەریەک لە رووسیا و ئینگلتەرا بە ئاراستەیەک کاریان بۆ سیاسەتی ئەوروپا دەکرد، هاوپەیمانیی پیرۆز بە مەبستی دورخستنەوەی هەژمونی ئینگلیز بایەخیان بە بنەماکانی هاوپەیمانێتی دەدا هەر چی ئینگلتەرایە دەستی بە هاوپەیمانی چوارقۆلیەوە گرتبوو لەم میانە رووبەڕوو بوونەوە لە نێوان رووسیا و ئینگلتەرا دروست دەبێ بەڵام رووبەڕوو بوونەوەی سەربازی نا.

کاتێک بەهۆی شۆڕشەکانی ناپۆلی و بیدمون و ئیسپانیا دۆخی پادشاکان تێکدەچی، دەڵەتە مەزنەکان لە تروبا و لە ١٨٢٠ کۆنگرەیەک دەبەستن، لەم کۆنگرە قەیسەری رووسیا ئەسکەندەر پێشنیاری کرد هاوپەیمانان هێزی سەربازی دژی شۆڕشەکان بەکار بێنن بۆ سەرکوتکردنیان بەڵام ئینگلتەرا دژی ئەم پشنیارە بوو، بەریتانیا لە یاداشتێکی دوور و درێژدا پشتگیریی بۆ شۆڕشەکان دەرخست، گوایە ئەم شۆڕسشنە ناوەخۆیین هەر ئەوان دەتوانن رژێمی ستەمکاریان بگۆڕن بە رژێمێکی دیموکراسی.

مێژوونووسەکان وای دەبینن کە بەریتانیا مافی خۆی بوو گاڵتە بەو هاوپەیمانیتیە سێقۆلیە کریستیە بکا کە بۆ پاراستن و هێشتنەوەی دەسەڵاتی ستەمکاری پادشاکان دامەزراوە دژی شۆڕشەکانی ئازادیخواز. ئینگلتەرا سوربو لەسەر ئەوەی دەبێ هاوپەیمانی چوارقۆڵی ئەرکی پاراستنی ئاشتی بگرێتە ئەستۆ. لە راستیدا ئینگلتەرا لەگەڵ هزری خاچپەرستیدا بوو ئەگەر لە بەرژەوەندی خۆیدا بوایە ئەوەتا چۆن بەسەر نەرویژیدا سەپان کە بخرتێە ژێر حوکمی سوێدی. ئەوەندە نابا پشتگیری شۆڕشی یۆنانی دەکا لە ١٨٢١ کە شێوازێکی ئاینیی وەرگرتبوو لەتەک رێبازی نەتەوی. ئەمەو بەریتانیا پشتگیریی لە بزووتنەوەی ئازادیخوازی ئەمریکای لاتینی کرد، ئەمەش نەک وەکو پشتگیری بۆ ئازادیخوازان بەڵکو بۆ ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی ئیسپانیا بێنەدەر ئەوسا خۆی دەستی باڵای دەبێ لە بازرگانی و دەستێوەردانی ئەو وڵاتانە. هەر بۆیە پشتگیریی لە شۆڕشی یونان و رزگار بونی پیرۆ و بەرازیل و کۆلۆمبیا و بەلژیک دەکرد، چونکە هەموو ئەو بزوتنەوانە هێزو تینێکیان بە ئینگلتەرا دەبەخشی، لە کاتێکا لەساڵی ١٨٤٠ زۆر بە توندی لە چین دەدا چونکە رێگە نادا (ئەفیون)ی بەریتانی هاوردەی وڵاتەکەیان بکرێ. هەروەها لە ١٨٥٧ زۆر درندانە سەرکوتی شۆڕشی هیندیی دەکا چونکە داوای چونەدەرەوەی هێزەکانی داگیرکەر دەکا.

شۆڕشی ئاینی و نەتەویی یۆنانی دژی دەولەتی عوسمانی بوە مایەی ئەوەی لە ١٨٢١لە کۆنگرەی ( ڤیرۆنا ) داوا لە دەولەتانی مەزن بکرێ سیاسەتێکی هاوبەش دژی دەولەتی عوسمانی بگرنە بەر. ئەوەی مایەی سەرنجە دەولەتانی ئەوروپی دوو هەلوێستی جیایان لە شۆڕشی یونانی و بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی ئەمریکای لاتین وەرگرت؛

١/ بەریتانیا کە پشتگیریی لە بزووتنەوەی رزگاری پیرۆ و بەرازیل کرد لە هەمانکات پشتگیریی لە شۆڕشی یۆنانی دەکرد چونکە دەولەتی عوسمانی و ئیسپانیای پێ لاواز دەبوو، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی پێگەی بەریتانیا لە رۆژهەلات و دەریای سپیی ناوەرسات بەهێزتر بێ.

٢/ بەڵام مترنخ ( وەزیری یەکەمی نەمسا، پێی وابوو شۆڕشی یۆنان تەنها جولانەوەیەکە دژی دەسەڵاتە شەرعیەکانی پادشاکەیان، بۆیە دەبێ دەولەتە مەزنەکان دەست وەرنەدەن و پشتگیری ئەو شۆڕشە نەکەن، ئیتر هەرسێ دەولەتە ئۆتۆکراسیەکەی هاوپەیمانیی پیرۆز دەستێوەردانی ئینگلتەرایان پێ رەوا نەبوو پێیان وابو دەستێوەردانە لە کاروباری ناوەخۆی وڵاتان.

لە کاتی هەوڵەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە دەستگرتن بەسەر یۆنان و لەناوبردنی شۆڕشەکەیان بەریتانیا هاوکاریی دەکا و کەشتیگەلی بەریتانی بە هانای یۆنانەوە دەچێ کە توانیی کەشتیگەلی میسری و عوسمانی وجەزائیری لە ( نوارین ) لە ١٨٢٧ تێک بشکێنێ. بەڵام بۆ روداوی هەمان شێوە تەنها گوتاری ئاگرینی بۆ داون. بەنمونە کاتێک سوپای نەمسا شۆڕشی بیدمونت و ناپۆلیی سەرکوتکرد، و کاتێک سوپای فرەنسی شۆڕشی گەلی ئیسپانیی سەرکوت و لەناوبرد کە تەنها داوای دەستوریان دەکرد.

ئەم گۆڕانکاریانە هۆکاری ئەوە بوون بەریتانیا پەلە بکات لە کۆتایی هێنانی سەردەمی کۆنگرە و سیاسەتی بەستنی کۆبونەوەی نێودەولەتی، ئەوەتا وەزیری بەریاتنی جورج کاننگ G. Canning داوا دەکا هەردەولەتە خۆی چاودێری بەرژەوەندیەکانی بکا. هۆکاری روخاندنی سیاسەتی کۆنگرە نێودەولەتیەکان لەلایەن بەریتانیاوە ئەمانەن:

١/ چوار دەولەتە مەزنەکەی ئەوروپا هاوسەنگ بوون لە توانایاندا بوو بەیەکەوە هەر بڕیارێک بدەن کە بیانەوێ، هیچ کامیان بە تەنیا ناتوانێ بڕیاری خۆی بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێ، بەڵام ئەگەری ئەوە هەبوو بەبێ بەریتانیا هاوپەیمانێتیەک ببەستن، بۆیە لە بەرژەوەندی بەریتانیادا بوو دۆخ و هەلوێستەکان بەم شێوە بمێننەوە تا هاوسەنگی هێز لە ئەوروپا نەگۆردرێ. چونکە لەم کاتە بەریتانیا زاڵە بەسەریاندا.

٢/ لە هەر کۆنگرە و کۆبوونەوەیەکی لەم شێوە بەریتانیا تەنها خاوەنی یەک دەنگ بوو، واتە هیچی بەسەر ئەندامەکانی دیکەوە زیاد نیە، ئەمەش پێگەی بەریتانیا لاواز دەکا و ئەو هێزو زاڵ بونەی نامێنێ.

٣/ کۆبوونەوەکان دەکرێ ببنە دادگای کارەکانی دەوڵەتان. بەریتانیاش پێویستی بەم حالەتە نییە تا لەسەر کارەکانی بێتە دادگایی کرد، ئەمە دژی بەرژەوەندیەکانی دەبێ بەتایبەت لە کۆلۆنیەکانی.

بە کۆتـایی هـاتنی سـەردەمی کۆنگرەکـان ، دەولەتـان دەگەڕێـنەوە سـەردەمی بەر لە شۆڕش و ناپۆلیۆن کە هەریەکەو لە کـاری خـۆی بەرپرسـیارە. گەلانـی ئەوروپـاش ویسـتیان تۆپەکە بۆ هەمان رێچـکەی شـۆڕش بگەڕێـتەوە و داوای سـەربەخۆیی خۆیـان دەکەن. دواتـر دەسەلاتی تاکرەوی رووبەروو بـۆوە لەگەل داواکاریەکـانی گەل بـۆ دەسـتورێکی میللـی. ئیتـر ماوەی سالانی ١٨١٤ تا ١٨٤٨ پـڕ دەبـێ لە هەولـی شۆڕشـی خوێنـاوی لە پێنـاو ئـازادی و سـەربەخۆیی نەتەوەکـان بەتـایبەتیش لە رووبەڕوو بونەوەیـان لەگەڵ نەمسـا و لە فرەنسـاش لەگەڵ خـــانەوادەی بۆربـــۆن، بەڵام لویســـی هەژدەهەم لە فرەنســـا دەتـــوانێ دارەکە لە ناوەڕاستەوە بگـرێ کەچـی چارلسـی دەیەم کەسـێکی سـتەمکار و زۆردار و تونـدڕەو بـوو لە مافەکانی پادشایەتی بۆیە شۆڕشی ١٨٣٠ ی مەزن هەڵدەگیرسێ.

## ا/ خانەوادە حوکمڕانەکانی ئەوروپا

### ئیمپڕاتۆڕەکانی ئیمپراتۆڕیەتی ڕۆمانیی پیرۆز

**خانەوادەی هابسبورگ لە نەمسا**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ماکسیمالیانی یەکەم | ١٤٩٣-١٥١٩ |
| ٢ | چارلسی پێنجەم | ١٥١٩-١٥٥٦ |
| ٣ | فردیناندی یەکەم | ١٥٥٦-١٥٦٤ |
| ٤ | ماکسیمالیانی دووەم | ١٥٦٤-١٥٧٦ |
| ٥ | رودلفی دووەم | ١٥٧٦-١٦١٢ |
| ٦ | متیاس | ١٦١٢-١٦١٩ |
| ٧ | فردریناندی دووەم | ١٦١٩-١٦٣٧ |
| ٨ | فردریناندی سێیەم | ١٦٣٧-١٦٥٧ |
| ٩ | لیوبولدی یەکەم | ١٦٥٨-١٧٠٥ |
| ١٠ | جوزیفی یەکەم | ١٧٠٥-١٧١١ |
| ١١ | چارلسی شەشەم | ١٧١١-١٧٤٠ |
| ١٢ | ماریا تریزا | ١٧٤٠-١٧٤٥ |
| ١٣ | فرنسوای یەکەم | ١٧٤٥-١٧٦٥ |
| ١٤ | جوزیفی دووەم | ١٧٦٥-١٧٩٠ |
| ١٥ | لیوبولدی دووەم | ١٧٩٠-١٧٩٢ |
| ١٦ | فرنسوای دووەم | ١٧٩٢-١٨٠٦ |

لە ساڵی ١٨٠٦ بەدواوە ئیمپراتۆر بەناوی ئیمپراتۆری نەمسا ناودەبردرا.

**خانەوادەی هابسبورگ لە ئیسپانیا**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | چارلسی یەکەم | ١٥١٦-١٥٥٦ |
| ٢ | فیلیپی دووەم | ١٥٥٦-١٥٩٨ |
| ٣ | فیلیپی سێیەم | ١٥٩٨-١٦٢١ |
| ٤ | فیلیپی چوارەم | ١٦٢١-١٦٦٥ |
| ٥ | چارلسی دووەم | ١٦٦٥-١٧٠٠ |

**خانەوادەی هونزلرن**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | جورج ولیام | ١٦١٩-١٦٤٠ |
| ٢ | فردریک ولیام (بژاردەی مەزن) | ١٦٤٠-١٦٨٨ |
| ٣ | فردریکی سێیەم | ١٦٨٨-١٧١٣ |
| ٤ | فردریک ولیامی یەکەم | ١٧١٣-١٧٤٠ |
| ٥ | فردریکی دووەم (فردریکی مەزن) | ١٧٤٠-١٧٨٦ |
| ٦ | فردریک ولیامی سێیەم | ١٧٨٦-١٨٤٠ |

**خانەوادەی تیۆدۆر**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | هنریی حەوتەم | ١٤٨٥-١٥٠٩ |
| ٢ | هنریی هەشتەم | ١٥٠٩-١٥٤٧ |
| ٣ | ئەدواری شەشەم | ١٥٤٧-١٥٥٣ |
| ٤ | ماری | ١٥٥٣-١٥٥٨ |
| ٥ | ئەلیزابیتی یەکەم | ١٥٥٨-١٦٠٣ |

**خانەوادەی ستیوارد**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | جیمسی یەکەم | ١٦٠٣-١٦٢٥ |
| ٢ | چارلسی یەکەم | ١٦٢٥-١٦٤٩ |
| ٣ | ماوەی شەڕی ناوەخۆ و کۆماری | ١٦٤٩-١٦٦٠ |
| ٤ | ئۆلیڤەر کرمویل | ١٦٥٣-١٦٥٨ |

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | ریچارد کرمویل | ١٦٥٨-١٦٦٠ |
| ٦ | چارلسی دووەم | ١٦٦٠-١٦٨٥ |
| ٧ | جیمسی دووەم | ١٦٥٨-١٦٨٨ |
| ٨ | ولیامی سێیەم | ١٦٨٩-١٧٠٢ |
| ٩ | ئان | ١٧٠٢-١٧١٤ |

**خانەوادەی هانۆڤەر**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | جۆرجی یەکەم | ١٧١٤-١٧٢٧ |
| ٢ | جۆرجی دووەم | ١٧٢٧-١٧٦٠ |
| ٣ | جۆرجی سێیەم | ١٧٦٠-١٨٢٠ |
| ٤ | جۆرجی چوارەم | ١٨٢٠-١٨٣٠ |

**خانەوادەی ڤالوا**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | لویسی یانزەهەم | ١٤٦١-١٤٨٣ |
| ٢ | چارلسی هەشتەم | ١٤٨٣-١٤٩٨ |
| ٣ | لویسی دوانزەهەم | ١٤٩٨-١٥١٥ |
| ٤ | فرانسوای یەکەم | ١٥١٥-١٥٤٧ |
| ٦ | هنریی دووەم | ١٥٤٧-١٥٥٩ |
| ٧ | فرانسوای دووەم | ١٥٥٩-١٥٦٠ |
| ٨ | چارلسی نۆیەم | ١٥٦٠-١٥٧٤ |
| ٩ | هنریی سێیەم | ١٥٧٤-١٥٨٩ |
| ١٠ | فرانسوای دووەم | ١٥٥٩-١٥٦٠ |
| ١١ | جارلسی نۆیەم | ١٥٦٠-١٥٧٤ |
| ١٢ | هنریی سێیەم | ١٥٧٤-١٥٨٩ |

خانەوادەی بۆربۆن لە فەرەنسا

| | | |
|---|---|---|
| ١ | هنریی چوارەم | ١٥٨٩-١٦١٠ |
| ٢ | لویسی سیانزەهەم | ١٦١٠-١٦٤٣ |
| ٣ | لویسی چواردەهەم | ١٦٤٣-١٧١٥ |
| ٤ | لویسی پانزەهەم | ١٧١٥-١٧٧٤ |
| ٥ | لویسی شانزەهەم | ١٧٧٤-١٧٩٢ |
| ٦ | کۆمەڵەی یاسادانان و کۆنگرەی نیشتمانی | ١٧٩٢-١٧٩٥ |
| ٧ | حکومەتی بەڕێوەبردن | ١٧٩٥-١٧٩٩ |
| ٨ | کۆنسۆلگەری | ١٧٩٩-١٨٠٤ |
| ٩ | ئیمپراتۆریەتی ناپۆلیۆنی یەکەم | ١٨٠٤-١٨١٥ |
| ١٠ | لویسی هەژدەهەم | ١٨١٤/١٨١٥-١٨٢٤ |

خانەوادەی بۆربۆن لە ئیسپانیا

| | | |
|---|---|---|
| ١ | فلیپی پێنجەم | ١٧٠٠-١٧٤٦ |
| ٢ | فردیناندی شەشەم | ١٧٤٦-١٧٥٩ |
| ٣ | چارلسی سێیەم | ١٧٥٩-١٧٨٨ |
| ٤ | چارلسی چوارەم | ١٧٨٨-١٨٠٨ |
| ٥ | جۆزیف بۆناپەرت | ١٨٠٨-١٨١٣ |

میرنشینە مەزنەکانی مۆسکۆ

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ئیڤای سێیەم (مەزن) | ١٤٦٢-١٥٠٥ |
| ٢ | بازیلی سێیەم | ١٥٠٥-١٥٣٣ |
| ٣ | ئیڤای چوارەم | ١٥٣٣-١٥٨٤ |

قەیسەرەکانی رووسیا (تزاریەکان)

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ئیڤایی چوارەم ( مەترسیدار) | ١٥٤٧-١٥٨٤ |
| ٢ | تیۆدۆری یەکەم | ١٥٨٤-١٥٩٨ |
| ٣ | بوریس کودونوف | ١٥٩٨-١٦٠٥ |
| ٤ | ماوەی ئالۆزیەکان | ١٦٠٤-١٦١٣ |

**خانەوادەی فازا لە سوێد**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | چارلسی نۆیەم | ١٦٠٤-١٦١١ |
| ٢ | جستاف ئەدولفی دووەم | ١٦١١-١٦٣٢ |
| ٣ | کریستینا | ١٦٣٢-١٦٥٤ |
| ٤ | چارلسی دەیەم | ١٦٥٤-١٦٦٠ |
| ٥ | چارلسی یانزەهەم | ١٦٦٠-١٦٩٧ |
| ٦ | چارلسی دوانزەهەم | ١٦٩٧-١٧١٨ |
| ٧ | فردریک | ١٧٢٠-١٧٥١ |

**خانەوادەی رومانۆف لە رووسیا**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | میخائیل | ١٦١٣-١٦٤٥ |
| ٢ | ئەلکسیسی | ١٦٤٥-١٦٧٦ |
| ٣ | تیۆدۆری دووەم | ١٦٧٦-١٦٨٢ |
| ٤ | ئیڤانی پێنجەم و بترسی یەکەم | ١٦٨٢-١٦٨٩ |
| ٥ | بەترسی یەکەم ( مەزن) | ١٦٨٩-١٧٢٥ |
| ٦ | کاترینی یەکەم | ١٧٢٥-١٧٢٧ |
| ٧ | بەترسی دووەم | ١٧٢٧-١٧٣٠ |
| ٨ | ئانا | ١٧٣٠-١٧٤٠ |
| ٩ | ئیڤانی شەشەم | ١٧٤٠-١٧٤١ |
| ١٠ | ئێلیزابیت | ١٧٤١-١٧٦٢ |
| ١١ | پەترسی سێیەم | ١٧٦٢-١٧٦٢ |
| ١٢ | کاترینی دووەم (مەزن) | ١٧٦٢-١٧٩٦ |
| ١٣ | بۆلی یەکەم | ١٧٩٦-١٨٠١ |
| ١٤ | ئەسکەندەری یەکەم | ١٨٠١-١٨٢٥ |

# ب/ نەخشەکان




ئیمپراتۆریەتی چارلسی پێنجەم لە ساڵی ١٥٢٥



دابەشبوونی کاسۆلیک و پرۆتستانتەکان لە ئەوروپا ساڵی ١٦١٠




زەویەنزمەکان ساڵی ١٦٠٩




**شۆڕشی زەویە نزمەکان**




گەمارۆی فرەنسا لەسەر مولکەکانی ئسپانی، دەوروبەری ساڵی ١٦١٧




فرەنسا لەسەردەمی جەنگی ئاینییدا




ئەوروپای ساڵی ١٦٤٨




**ڕشیلیۆ و سیاسەتی هاوپەیمانی دژ بە خانەوادەی هبسبورگ**




**داگیرکاری ئەوروپیی سالانی دەوروبەری ۱۷۰۰**




ناشتەوایی وستڤالیای ١٦٤٨

و: خالید هەرکی




بەرفراوانی پەتروسی مەزن لەسەر حسابی بەلتیق




**بەرفراوانی روسی بە ئاراستەی رۆژئاوا**




## بوژانەوەی براندن بورگ - پروسیا




**بوژانەوەی براندن بورگ - پروسیا**
**لەسەدەی هەژدەهەم**




**مولکەکانی ئەوروپی لە ئەمریکای باکورو دەریای کاریبی لەکاتی روودانی جەنگی حەوتساڵە**




**بەلکان لە سەدەی هەژدەهەم**




ئیتاليا له سه‌روبه‌ندی شۆڕشی فره‌نسی




**سەردەمی شۆڕش و ناپۆلیۆن**




ئەوروپا لەساڵی ١٨١٠




ئەوروپا لە ساڵی ١٨١٥

و: خالید هەرکی

## سەرقەلەمێک لە بیۆگرافیای وەرگێڕ:



FB: Xalid Herki
www.serben.com
xalidherki@serben.com

خالید عومەر میکائیل ناسراو بە (خالید هەرکی) لە دایکبووی پایزی ١٩٥٥ لە هاوینەهەواری مەسیف سەلاحەدین (سەربەن، پیرمام) لە باوەش خانەوادەیەکی هەژاری کرێکاری ژیاوە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە مەسیف تەواو کردوە ئامادەییش لە هەولێر و بکالۆریۆس ( زانستە سیاسیەکان) لە دەرەوەی ولات (هۆلەندا). ژیانی منداڵیی بە هاوشانی خوێندن هاوینان کاری کرێکاریی کردوە، وەکو باقی هاوشاری و هاو خانەوادەی لە منداڵیەوە تام و ئازارەکانی چەوسانەوە، بەدەست رژێمی گۆڕبەگۆڕ چێشتوە، پشکی لە باجی کورداب لە شاخ دەکا و ماوەیەکیش لە زیندانەکانی بەعس و حـ خۆشی منداڵێتی بێبەش دەبێ. دوای بالق بوونی بە شداری دەکا، لە ١٩٧٥ لە بانکی کشتوکاڵی شەقلاوە وەکو فەرمانبەر دادەمەزرێ بەلام بەهۆی کاری رێکخستنەوە لە ١٩٧٧ دەستگیر دەکرێ و بە دەساڵ حوکمی زیندانی دەدرێ دوو ساڵ و نیوێک لە ئەبوغرێب دەباتە سەر تا لە ١٩٧٩ بەر لێبوردنی گشتی دەکەوێ لەگەڵ هاورێیانی.

وێرای کاری سیاسیی لە ساڵی ١٩٧٣ بۆ یەکەمجار لە رۆژنامەی برایەتیی ئەوسا نوسینی بڵاو کردۆتەوە، دوای راپەرینیش لە رۆژنامەو گۆڤارەکان بە پێی توانا بەشداریی هەبوە، لە سەرەتای دووهەزارەکانەوە خوی داوەتە وەرگێران تا ئێستا ئەو ژمارەی خوارەوەی بە چاپ گەیاندوە و هەندێکیش بە رێگاوەیە لەوانە ماکسیم گورکی. بەو ئومێدەی ئەم کارە خۆبەخشیەشی لە هەمان مەبەست بکاتەوە.

لە روی کۆمەلایتیەوە ، لە ١٩٨٠ ژیانی هاوسەریی لەگەڵ حربیە جەوهەر کەریم پێکهێناوە و خواپێداوی دوو کچ و سێ کوڕە بەناوەکانی جوتیار، شەنگار، بژار، پاڵە، هێرۆ..

# لە چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١- (جەنەراڵ دیگۆل... پیاوی جەنگ و حوکمران)، نوسەری دیارنییە... چاپی یەکەمی لەلایەن خانەی وەرگێڕان لە سلێمانی چاپ کراوە لە ٢٠٠٩. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

٢- کوردو ئەرمەن .... پەیوەندیە مێژووییەکان..نوسینی فارس عوسمان، لەلایەن سەنتەری لێکۆڵینەوەی فکری و ئەدەبیی نما لە ٢٠١٢ چاپ کراوە. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

٣- کوردستان و کوردەکان ..نوسینی ئەرشاک سافراسیان، چاپی یەکەمی لەلایەن سەنتەری لێکۆڵینەوەی فکری و ئەدەبیی نما لە ٢٠١٠ چاپکراوە. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

٤- نوری سەعید... پیاوی ئەرکە قورسەکانی بەریتانیا، نوسینی حامد الحمدانی، لە چاپخانەی شەهاب لە هەولێر لە ٢٠١٥ چاپکراوە. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

٥- مێژوی هاوچەرخ..ئەوروپا لە شۆڕشی فرەنسیەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی، نوسینی د. عبدالعزیز سلیمان نەوار و د. عبدالمجید نەعنەعی، چاپی یەکەم و دوەمی لە چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر لە ٢٠١٢ چاپکراوە. چاپی سێیەم لە چاپخانەی رۆژهەلات لە ٢٠١٢ چاپکراوە. چاپی چوارەم لە چاپخانەی رۆژهەلات لە ٢٠١٨ چاپکراوە. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

٦- ترۆتسکی ..نوسینی ئارنج هاو، لە چاپخانەی رۆژهەلات لە ٢٠١٢ چاپکراوە. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

٧- گیڤارا .. نوسینی ئەندرۆ ستکلیر چاپی یەکەمی لە سەنتەری لێکۆلینەوەی فکریو ئەدەبیی نما لە ٢٠١٣ چاپکراوە، چاپی دوەمی لە چاپخانەی رۆژهەلات لە ٢٠١٣ چاپکراوە. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

٨- مکیاڤللی.. سێبەری شەیتان لەسەر زەوی، نوسینی ،ئەحمەد ناسیف و مەجدی کامل، چاپی یەکەمی لە چاپخانەی رۆژهەلات لە ٢٠١٤ چاپکراوە، چاپی دووەمی لە ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاو کردنەوە چاپکراوە لە ٢٠١٨. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

و: خالید هەرکی

٩- ستالین... سەربوردەی سیاسیی. نوسینی ئیسحاق دویچەر.. لە ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاو کردنەوە چاپکراوە لە ٢٠١٨. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

١٠- مێژوی بزوتنەوە نەتەوایەتیەکان لە ئەوروپا، نوسینی نورالدین حاتوم، لە ناوەندی ئـاوێر بۆ چاپ و بلاو کردنەوە چاپکراوە لە ٢٠١٨. لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

١١- دەوڵەتداری ... دامەزراندن و بەڕێوەبردنی. لە نوسینی خۆی.. لە چاپخانەی ئەحمەد لە هەولێر لە ٢٠١٨ چاپکراوە.

١٢- هنـری کیسـنجەر. سـاڵانی نوێبـوونەوە.. لە دوو بەرگـدا .. چـاپی یەکەمـی لە ٢٠١٩ لە چاپخانەی رۆژهەلات چاپکراوە.

١٣- ماکسیم گۆرکی ، بیرەوەری رۆژنامەگەریم ( ئامادەیە بۆ چاپکردن )